# ڕۆشنبیری نوێ



العدد ١٢٣ ايلول ١٩٨٩م صفر ١٤١٠ هـ



● ژیننامەی سەرکردەی دامەزرێنەر
میشیل عفلق

● ماموستا مسعود محمد
رێکەو تنامەی
ئاشتی‌ی ١٩٦٤او سەر
هەڵدانی ناکۆکی‌یەکەی
نیوان شۆرشی کورد.

● دکتور کمال مظهر
چەند راستی‌یەکی نوێ دەربارەی کوردو
ڕاپەڕینی ١٩٤١

# لەم ژمارەیەدا

ژماره

ئەیلولی ١٩٨٩ صفری ١٤٠٩

**گۆڤارێکی وەرزانەی لێکۆڵینەوەیە**

**دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی دەری دەکات**

## سەرنووسەر
## مصلح جەلالی

**سکرتێری نووسین: عبدالرزاق بیمار**



**ناونیشان**

دەزگای رۆشنبیری و بڵاوکردنەوەی کوردی وزیریە تەنیشت المعهد القضائی ت٤٢٥١٨٤٦

# رۆژا ٨ ی ئاب ١٩٨٨ ئەو روژە یا مە دڤیاو مە دروستکری



جمال بروارى

هەر ژ روژیت ئیکی دەمی رژیما ئیرانی ئاگری شەری هەل کری، ونەیاری کریە سەر وەلاتی مە ل ٤ی ئیلونا سالا ١٩٨٠ عیراقی هەل ویستاوی یا خویاو وئاشکەرا بوو بەرامبەری ئاشتیی وحەزدکر شەر بهیتە راوەستاندن وئاشتی وتەناهی ل دەڤەری بەلاڤ ببیت.

عیراقی گەلەك هەول دا ئاگری شەری هەل نەبیت، وشەر نەبیت. بەلی نیازو ئنیەتیت خراب یت حاکمیت ئیرانی بزووت هەل دکرن بو ئاگری شەریو ودەهولیت شەری لیدان.

هەر ژ روژا حاکمیت ئیرانی هاتینە سەر حووکمی دلی وان پی یەقژ نەبوو بەرامبەری عیراقی، ودلی وان یی پر کەرب وکین بوو، ودڤیان دەستیت خویت چەپەل وبخوونی صور دریژ کەنە دناف کاروباریت مەدا. حاکمیت ئیرانی خەونا وان ئەوبوو ئمبراطوریەتەکا فارس دانن لسەر کیستی میللەتیت دەڤەری، وانا دڤیا عیراقی بکەنە پاریەك بسانایی بخوون وداعیرن وبکەنە دیڤەلانك وپارچە پارچە بکەن.

عیراقی گەلەك جارا حاکمیت ئیرانی ئاگەهدار کرن وگەلەك ژ پیروت هنارتن لسەر ریکا وەزارتا دەرڤە بو کومەلا دەولەتیت نیث کرتن تیدا ئاگاهداریا رژیما ئیرانی کرن لسەروان کریاریت حرب ویە دروست بەرامبەری عیراقی. ئوئاگەهداریا وان کر کو ئەو یی یەری بئاگری دکەن.

حاکمیت ئیرانی بەدلی بو خو پیڤە بچن وریکا ئاقلی بگرن دەست دان نەیاریت چەکدار لسەر توخیبی عیراقی وگوندو باژیرو ومەخفەریت مەیت توخیبی دانە بەر تویپت گران.

دیسا عیراقی بیهن فرەهی وبصەبر چوو خلمەتی راپوویت رەسمی هنارتن لسەر ریکا وەزارەتا دەرڤە بو کومەلا دەولەتیت ئیك گرتی تیدا حاکمیت ئیرانی ئاگەهدارکرن کو ئەو نەیاریت ئەو دکەنە سەر گوندو ومەخفەرو باژیریت مە ل مەندەلی وزرباطیە وخانقین ونەفت خانە مەعنا وی ئەوە ئەوی دەهولیت شەری لیدەن وە دیارە نیازیت شەری یی دلی وان دا هەی. دگەل هندی خاکمیت ئیرانی بەری فروکیت خویت شەرکەر دانە سەر گوندو باژیریت سەر توخیبی مە وگەلەك جارا دناف ئاسمانی مەدا هاتن.

عیراقی هەر بیهناخو فرەهکر وحەز نە دکر ئاگری شەری هەل ببیت. جارەك دی ب ریکیت دبلوماسی ئاگەهداریا حاکمیت ئیرانی کر لسەروان نەیاریت وانا کرینە سەر ئاخ وئاف وئاسمانی مە چو ریکیت دبلوماسی سەر نەگرت دگەل حاکمیت ئیرانی وچوپویتە براپوتیت عیراقی هنارتین نەکرن، ویتر دمجد بوون نەیاریی وشەری بفروشنە مە وژمیژە وانا کارو کوکی شەری کربوو وکر بوونە نەفیر عام وبزووتیت شەری پیش کرن ودەهولیت شەری لیدان.

عیراقی گەلەك بزاڤ کروبهەمی ریکا نەدیڤا ئاگری شەری هەل بیت بەلی حاکمیت ئیرانی دمجد بوون ریکا شەری بگرن

وشەرخواز بوون عیراقێ دەمێ دیتی چورێك فایدە نادەن دگەل حاکمێت ئیرانێ مەجبور بوو بەرەڤانی یا خو بکەت وسینگێ نەیارا بگریت ونەیارێ ژ وەلاتی دورکەت. ئەو بوو ل ٢٢ ی ئیلونا سالا ١٩٨٠ هێزێت مە یێت قارەمان خوشمێر ومێرخاسێت عیراقێ بەرهنگاری هێزێت دوژمنی بوون و وپاشڤە برن وچوونە دناف ئاخا دوژمنی دا وگەلەك باژێرێت دوژمنی ستاندن.

## دناڤ ئاخا دوژمنی دا عیراق هەر ئاشتی خواز بوو.

دناف ئاخا دوژمنی دا وعیراقا سەرکەتی وخودان هێزو شییان دیسا عیراقێ حەز دکر شەر بهێتە راوەستاندن وهەمی گرفتاری برەنگێت ئاشتی بهێنە چارەسەرکرن و عیراقێ هاریکاری دگەل وان هەمی بزاڤا کر ئەوێت هاتینە کرن بو راوەستاندنا شەری جە چی ژ لایێ کومەلا دەولەتێت ئێك گرێ ئان ژی ژ لایێ بزاڤا دەولەتێت بێ

لا ئان ژ لایێ دەولەتێت بوسلماناڤە. عیراقێ ژدل هاریکاری دگەل ڤان بزاڤا هەمیا کر وژدل حەز دکر شەر بهێتە راوەستاندن وئاشتی ل دەڤەرێ بەلاڤ ببیت وهەر ئێك تەنا ورەحەت دناف وەلاتێ خودا بژیت وکەسی مایێ خو دیێ دی نەکەت.

دیسا وەکی هەمی جارا حاکمێت ئیرانێ تبلێت خو دگوهێت خو رادکرن دا گول بانگێت ئاشتیێ نەبیت ودرێژاهیێ بێخیتە شەری مەخصەدا حاکمێت ئیرانێ ئەو بوو بگەهنە ئارمانجێت خوێت چەپەل وبەرنامێ خو یێ بەرفەرەیێ جێبەجێ بکەن لسەر کیستێ عیراقێ.

## بو چی حاکمێت ئیرانێ درێژە ددا شەری؟

هەر وەکی مە گوتی مەوقفێ عیراقێ ژ ئاشتیێ نەهاتە گوهورین وعیراقێ حەز دکر شەر بهێتە راوەستاندن وپتر خوون نە هێتە رژتن ئەو بوو عیراقێ خو ڤەکێشا ژناف کوراتی یا ئاخا ئیرانێ دا هەمی هەجیەتا ل حاکمێت ئیرانێ ببریت وپتر دەلیڤێت ئاشتیێ ڤەکەت. هەر چەندە عیراقێ دزانی نیازێت حاکمێت ئیرانێ دچاك نینن ودلێ وان یێ خرابە وژ ڕێکا نەیارێ ناهێنە خارێ.

ئەو بوو لە شبەڤا حاکمێت ئیرانێ ئێرش کرینە سەر باژێرێ بەسرا ل هەیڤا تیرمەهێ ل سالا ١٩٨٢ خومەینی فەتوەك لێدا دفەتوا خو دا داخازا بسەردا گرتنا عیراقێ کر ودیسا هەر دفەتوا خودا داخازا، کورێت میللەتێ عیراقێ کر دا بچنە بەراهیکا عەسکەرێ ئیرانێ وپێشەوازیا وان بکەن.

پشتی ئێرشا وان شکەستی لسەر دەستێت مێرخاسێت عیراقێ وزیانەکا مەزن گەهەشتیە وان بچەکی وجەبلخانەی وژمارەکا مەزن ژ کوشتیا وبریندارا وئێخسیرا، خومەینی پێ حەسیا کووورەیا هێزێت وی گەلەك یا نزم بووی دخیطابا خودا گووت «هین دێ چاوا بەرەڤانیێ ژ ئیرانێ کەن وهوون نەشێن بەرەڤانیێ ژ بوسلمانا بکەن»

حاکمێت ئیرانێ چو دخو نەهێلا وئێرش لدیف ئێرشێ کرنە سەر توخیبت مە بەلێ هەمی ئێرشێت وان شکەستن لسەر دەستێت مێرخاسێت عیراقی، ئەو ئێرشێت حاکمێت ئیرانێ گەلەك کاروکوك بو دکر بدرێژاهیا سالا کار بو دکر وچەك ژ هەمی ئەردا دکری، بەلێ هەمی دەما شکەستن وسەر شوری بەهرا وان بوو.

حاکمێت ئیرانێ چو دخونە هێلا بگەهنە باژێرێ بەسرا، وبەسرا بگرن بەلێ خەونێت وان هەمی بشاڤێ دا چوونە خارێ، ونەگەهەشتنە مرازا خو، بەسرا بو کەلا مێرا ئاخا عیراقێ بو ئاگرو ئێتین بەربوو دوژمنا، دار قەرەمێت هورێت بەسرا ومیسان بوونە بزووت دوژمن پێ سووت: هەمی ئێرشێت دوژمنی کرینە لسەر توخیبێت مە شکەستن وسەر نەکەفتن، وزیانەکا مەزن بدوژمنی کەت.

دیسا ل ژووریا وەلاتی دوژمنی گەلەك جارا خو جەرباند دابهێتە دناف ئاخا مەدا بەلێ دیسا بسەرنەکەفتن، دوژمنی بەریکانێ دکر لسەر میللەتێ مە یێ کورد یا ژدوژمنی ڤە رێکا کوردستانێ یا

بساناهی یە ویا ڤەکریە ودێ بساناهی هێنەد ناڤدا، بەلێ میللەتێ مە یێ کورد دگەل برایێت خوێت عەرەب سینگێ دوژمنی گرتن دول و نوهالێت کوردستانێ کرنە گورستان بو دوژمنی، هەمی توخیبێت عیراقێ بوونە کەلا ل سینگێ دوژمنی، خونا کوردو عەرەبا ل دەشت و چیا تێکەل بوو ئاخا عیراقێ پێ ئاڤدا وپاراست.

پشتی شکەستنێت مەزن ئەوێت بحاکمێت ئیرانێ کەتی وبەرنامێ وان بسەرنەکەتی ونەگەهشتینە ئارمانجێت خوێت چەپەل بەروکێت نافخو دناف ئیرانێ دا گەلەك خلولە بوو وکارەك مەزن کرە سەر سەروبەرێ سیاسی دناف ئیرانێ دا. گەلەك گرفتارێت مەزن دناف ئیرانێ دا پەیدابوون، گرفتارێت ئابوری وکومەلایەتی وسیاسی.

حاكميت ئيراني دريژاهي د شەري د پەردەكي د نيتە سەر وان گرفتاري وئالوزيادا ئەويت گەلەك مشە بووين وبكەتە سويچا شەري. حاكميت ئيراني مفلس بوون ژ لايي عەسكەري وژ لايي سياسي ڤە نەحسمە پشتي گەلەك هەڤركاني دناڤ رژيمي دا پەيدا بووين نە خاسمە پشتي ئيرشيت وان شكەستين ئەويت كرينە سەر باژيري بەسرا باژيري باژيرا. ئەو ئيرشيت وان گەلەك زرنا بو ليداي وئاميرەتيت پروپاگندا روژئاڤا ديسا گەلەك زرنا بو وان ئيرشا ليدا. ودەمي ئەو ئيرشي گەلەك جارا دهاتنە پاش ئيخستن ئەوژي نيشانا دەست خاليا وان يا سياسي بوو ويا عەسكەري.

ڤەت ل بيرا خومەيني نەبوو ديماهيكەك زووي دانيت بو شەري، ژ بەر هندي دەست دا خيلافاتا پەيداكەت، دناڤ بەرا شينستيت رژيما خودا لبن خيڤەتا شەري وبەردەوام بوونا شەري ووانا هاندەدەت، دريژاهيي بدەنە شەري. وهەمي مەخسەدا وي ئەو بوو شەربي بەردەوام بيت.

سەروبەري رژيما ئيرانيه يي ئالوز وگرفتاريت سياسي وعەسكەري هەنبەت كارەك نەباش كرە سەر بەروكيت وان يت عەسكەري وهيزا ئيرشيت وان داكەت.

## چاوا بەرنامي خومەيني هەرفت.

هەرچەندە حاكميت ئيراني گەلەك هەول دا بگەهنە وي بەرنامي وان داناندي وبگەهنە ئارمانجيت خو، بەلي بەرنامي وان بسەرنەكەت ژ بەر ڤان ئەگەريت خاري:ـ

١ ـ خلولەيا رژيمي ودەزگەهيت وان يت عەسكەري.

عەسكەري وان ئەوي دگوتني عەسكەري پينجي ل عالەمي نەشيا خول سينگي عەسكەري عيراقي بگريت وئيران سي جار هندي عيراقي يە

٢ ـ ژيك ڤەبوون دناڤ دەزگەهيت تەشريعي وتەنفيزي يت رژيما ئيراني.

٣ ـ زووي زووي پي ناسينا وان ئاشكەرا بوو وسلكيت شورەشا وان سپي بوون. ول ئيكەمين ئمتحان وشكەستنا وان يا عەسكەري ل روژيت ئيكي ل شەري، رژيما ئيراني داخازا هاريكاريا عەسكەري ژ هەصيونيا وئمپرياليا كر ژ چەكي وچەبلخانەي وسەحوسيا دا پتر پيلانا دژي عيراقي بگيرين

٤ ـ طاگيريا وان يا ميللي زوو زوويي كيم بوو دگەل بەردەوام بوونا شەري

٥ ـ موعارەزەكا مەزن دناڤ ئيراني دا پەيدا بوو دژي رژيمي.

## ئەگەريت سەركەتنا عيراقي

١ ـ ويران كرنا دەستەسەريا روحي يا خومەيني وهيدي هيدي كيم كرنا طاكيريا وي يا ميللي وسپي كرنا سلكيت وي.

٢ ـ ويران كرنا بەهرا پتر ژ هيزوزاخا ئابووريا ئيراني وپەلخاندنا ئاميرەتا عەسكەري يا رژيمي ولاوازكرنا دەوري وي يي نەيار وژيك ڤەكرنا ڤەواريا وي يا سياسي.

٣ ـ بەرگريا هەل بژاردنا نەتەوايەتي وسەركەتنا وي ئەو بوو ريكا عيراقي هەل بژارتي ل شەري. . بەرامبەري رەڤين وشكەستنا ريكا طائيفي ئەوا ئيراني دڤيا لسەر عيراقي فەرز بكەت ول دەڤەري بەلاڤ بكەت.

٤ ـ عيراق شيا نيازيت رژيما ئيراني ئاشكەرا بكەت بەرامبەري عيراقي ووەلاتيت عەرەبي.

ئەو كارە هەمي بوونە ئەگەرا هندي كوريك ل ئيراني بهيتە گرتن و دبەرنامي وان داناندي بسەرنەكەڤيت.

ولسەر ڤان ئەگەرا هەميارا باوەريا عيراقي يا مووكم ب وي خلمەتا كوريت وي بەرەڤاني بو دكەت وشارەزاهيا قوومانداريا وي وئەوجهي بەركەتي ويي ژ هەژي ئەوي عيراقي هەي دناڤ دەولەتادا وزيرەكي وميراني يا كوريت ملەتي عيراقي وپشكداريا هەمي ميللەتي دشەري دا ئەڤە هەمي ئەگەريت سەركەتنا عيراقي بوون.

## خوشميريت عيراقي دەرگەهيت ئاشتيي ڤەكرن.

ل هەشت ساليت رەبەق سەركەتن بەهرا عيراقي بوو، ميرخاسيت عيراقي ب قومانداريا سەروكي قارەمان قارەماني سەركەتني وئاشتيي شەريت ميرانە كرن بەرەڤاني يا ئاخا عيراقي كرن بەرەڤاني يا دەست كەفتيت شورەشا تيرمەهي كرن ئاخ وئاڤ وئاسماني عيراقي پاراست. بەلي دگەل هندي هەر ئاشتي خواز بوو هەر خودانا عەيني موقف بوو بەرامبەري ريبازا ئاشتيي.

## رزگاركرنا باژيري قوربانيي ودەرگەهي سەركەتنا مەزن.

ل شەريت رەمەزانا موبارەك ميرخاسيت سەروكي قارەمان قارەماني سەركەتني وئاشتيي ل شەرەكي ميرانە سينگيت خودانە چەپەرا وەكي شير و پلنگا بسەر چەپەريت دوژمني دا گرت وئاخا ڤاو ئەوا دوژمني داگيركري كرنە ئاگر وئوتين بسەري دوژمني دا وبسەر دوژمني دا گرت و دوژمن ژي دەرئيخست وباژيري ڤاو باژيري قوربانيي ودەرگەهي سەركەتنا مەزن رزگاركرن ل داستانەكا ميرانە، پشتي زيانەك گەلەك مەزن بدوژمني كەتي ژ كوشتيا و بريندارا

ونێخسیرا وژ چەکی وچەبلخانەی وئالایێ عیراقیێ جارەك دی بلند بوو لسەر ئاخا فاو، بفیێ چەندیێ پشتا دوژمنی شکەست. ورەڤینەکا مەزن ڤیێ کەت.

## رزگارکرنا عەردێت دی یێت نیشتمانی ونێزیکرنا رێگا ئاشتیێ.

پشتی رزگارکرنا باژێرێ قوربانیێ ودەرگەهێ سەرکەتنا مەزن هێـزێت مە یێت قارەمـان ناڤیێ خودیێ لێ ئینا ل شەرێت توکلنا علی الله یا ئێکیێ ویا دوویێ ویا سێ ویا چاریێ عەردێت دی یێت مە یێت نیشتمانی رزگارکرن ودوژمن ژ گزیرتا مجنون وزبیدات دەریخستن وژ گرکێت دی یێت ستراتیجی ل ژ ووریا وەلاتی پشتی زیانەك مەزن بدوژمنـی کەتـی رەڤین ل هەمی بەروکێت شەری کەفتـە دوژمنی وئێدی نەشیبا خو ل سینگیێ هێزێت مە یێت قارەمان بگریت دیـا زیانەك گەلەك مەزن بدوژمنی کەت بچەکی ومروڤا وژمارەك گەلەك مەزن ژ دوژمنی هاتنە ئێخسیر کرن:

ئەڤ سەرکـەتنـە هەمی وئەوشەرێت مەزن هەمی سەروکیێ قارەمان صدام حسین قووماندار یا وان دکر.

## چاوا رژێما ئێرانیێ بریارا ٥٩٨ قەبیل کر؟.

پشتی سالـەك رەبـەق لسـەر بریـارا جفاتا تەناهیا دەولەتی بوری پاش رژێمـا ئیـرانیێ بریـارا جفـاتـا تەناهیا دەولەتی قەبیل کرپشتی شکـەستێت مەزن ڤیێ کەتین ل شەرێت رەمـەزانـا موبارەك وتوکلنا علی الـله وپشتی حاکمێت ئیـرانیێ زانی ئێـدی شەر فایـدیێ وان نادەت مەجبـور بوون بریـارا ئاشـتیێ قەبیـل کەن، هەروەکی خومـەینی بئەزمانیێ خوگووتی «قەبیل کرنا بریارا ئاشتیێ هەر وەکی ڤەخوارنا فنجانا ژەهرێیە» مێرخاسێت عیراقیێ وەل خومەینی کر تاما ژەهریێ بزانیت وتامکەتە ژەهریێ بەری بمریت.

روژا ٨ی/١٩٨٨/٨ روژا عیـراقیێـە کورێت میللەتیێ عیراقیێ ئەڤ روژە یا دروستکری بزەند وباسکێت خوبزیرەکی وبچەلەنگی وب مێـرانیـا خووبشـارەزاهیـا ئەنـدازیـاری سەرکەتنیێ ومێرخاسیێ عیراقیێ سەروکیێ قارەمان قارەمانیێ سەرکەتنیێ وئاشتیێ صدام حسین

مێـرخـاسێت عیراقیێ داڤێت ڤیێ روژێ یێت رستین داڤ داڤ ب لولیـا تڤـەنگیێ دەرگـەهێت ئاشتیێ ڤەکـرن، ئەوروژ بوئەوا هەمی میللەتیێ عیراقیێ ل ژێری وژ ووریاو وەلاتی ژدل شاهی بوکرین

سلاڤ ل وان مێرخاسا بن ئەوێت ئەڤ روژە داڤێت بورستین دا هەمی سالا شاهیا بوبکەن.

روژێـت مە هەمـی سەرکـەتـن وشـاهـینـە روژێت مە هەمی سەرفـەرازینـە وسـەربلنـدینە ل ژێر ئالایێ سەروکیێ قارەمان صدام حسین خودیێ ژێیێ وی درێژکەت

---

ملخص البحث

## بمناسبة اسبوع قادسية صدام: اليوم الذي كنا نتمناه وصنعناه.

من اليوم الاول من العدوان الايراني على قطرنا في ٤ ايلول ١٩٨٠. وبعد مجابـة العدوان بالرد الحاسم وقف العراق موقفا صريحا من الحرب اذ دعا دعوة صادقة للسلم وأيد قرارات الهيئات الدولية والمنظمات والجهات العالمية والاسلامية لوقف نار الحرب واحلال السلام بين الدولتين المجاورتين.

واذاكان هذا هوموقف العراق بعد اندلاع الحرب العدوانية التي شنهـا النظـام الايـراني والتي استمرت لثماني سنوات، كان موقفه قبـل الحـرب يتسم بالمـرونـة والصبر الطويل ونشدان السلم تجاه جميـع خروقـات الايـرانيين واعمالهم العدوانية المنافية للاعراف الـدوليـة. فكـانت الحكـومة العراقية تنبه وتحذر الجانب الايراني مرارا وتكـرارا بصـدد مغبـة تلك الاعمـال العـدوانيـة الحـاقـدة، فأرسلت وزارة الخـارجيـة مذكـرات عديـدة الى الحكومة الايرانية وأطلعت منظمـة الامم المتحـدة على اعتـداء ايـران على قرانـا ومخـافـرنـا الحدودية ومدننا مندلي وزرباطية وخانقين ونفط خانة. فكـان المـوقف واضحـا وهـو ان ايـران تدق طبـول الحرب. واراد حكـام ايران الاستفادة من اطالة امد الحرب ليعيدوا توازنهم الذي اختل بعد الضربات السـاحقة الموجهة الى قواتهم المسلحة ولكي يتستـروا على مشـاكلهم الـداخليـة المعقـدة وتنفيـذ مخططـاتهم المـريضـة في تصـديـر (الثورة) الى الخارج لكن العراق المقتدر حطّـم جميـع آمـال خميني وبـرامجـه التـوسعيـة عن طريق الانتصـاراتـالمتلاحقة الباهرة لقواتنا المسلحة وعن طريق التمكن من كشف زيف دعـوى الخمينيين وتبصيـر الـرأى العـام العـالمي بالوجه القبيح لنظامهم.

وفي الـوقت الـذي تنامت قوة العراق واقتداره وتمكنه من تحرير اراضيه وصب الويل والدمار على ابعد مركز ايراني مهم اخذ النظام الايـراني يشعـر بالـوحـدة والمهـانة حتى قبل خميني مرغما وكمن يتجرع السم بقرار مجلس الامن المرقم (٥٩٨) في ١٩٨٨/٨/٨ وهكـذا صنـع ابناء العراق بقوة سواعدهم وحكمة وشجاعة قائدهم المنتصـر صدام حسين حفظـه الله هذا اليـوم المجيـد الذي انهى عهد الحرب وفتح باب النصر والسلام على ربوع العراق الحبيب.

# هۆیەکانی سەرکەوتنی مەزنی عیراق لە قادسیەی دووەم دا

- ریبوار أحمد -

هەر لەو رۆژەی تیکۆشەرانی پارتی بەعسی عەرەبی سۆشیالیست و تیکرای گەلی کۆلنەدەری عیراق، شۆرشی تەمموزی مەزنیان لە ١٧ - ٣٠ی تەمموزی سالی ١٩٦٨دا بەرپاکردو، پارت دەستەلاتی لە ولات دا گرتە دەست و، دەستی بە جیبەجی کردنی تاقیکردنەوەکەی کرد، تاقیکردنەوەی بنیاتنانی عیراقی نوێ، دوژمنانی شۆرش وتیکرای مرۆڤایەتی، بەتایبەتی دایەرەکانی ئیمپریالیزم ودام ودەزگاکانی قەوارەی زایۆنی و کۆنەپەرستەکان، بەچاوی دانان وبۆچوون ولیکدانەوە تایبەتیەکانی خۆیانەوە، دەیانروانی یە تاقیکردنەوەی شۆرش و، رادەی کارتیکردنی تاقیکردنەوەکەو ئەنجامەکانی لە تیکرایی سەروەریی ولات و سەربەخۆبوونی بریاری سیاسی، لە هەردوو گۆرەپانی عەرەبی ونیو دەولەتانەو، ئینجا بۆسەر سەرجەمی گەشەپیدانی باری وشیاریی تیکرا خەلکی نیشتمانی عەرەب و، هەلبەتیشە، بەگویرەی لیکدانەوەی خۆیانەوە، ئەم بارە نوێیە، کار لە بەرژەوەندەکانی ئەوان دەکات و، رەنگە نەخشە بۆدانراوەکانی ئەو سەردەم و پاشەرۆژیشیان، سەرەولیژ بکات.

ئەم جۆرە لیکدانەوەو هی تریش زۆروایان کرد، چاری ناچار پیلانیکی نوێبابەت دابنین ورژیمی کۆنەپەرستی ئیرانیش، لەبریتی ئەوان، بە راپەراندنی رابسپیرریت و هەموو جۆرە یارمەتی یەکیش بۆئەم مەبەستە بخەنە ژیر توانایەوە.

ئەوە بوو، رژیمی ئیران، تووش بووو پیلانەکەی راپەراند، پاشان پەنجەی پەشیمانی گەست و دوای هەشت سالی بەزین وخاك ویران بوون، چاری‌ناچار، سەری بۆ ویستی عیراقیەکان شۆرکردو دانی بە واقیع دا ناو بە بریاری ئەنجومەنی ئاسایشی نیودەولەتان ژمارە ٥٩٨ رازی‌بوو... ئیستاش، چونکە قایل بوونەوەکەی لە هەستیکی دلسۆزو باوەرەوە هەل نەهینجراوە، دەبینین وا سالیك زیاترە خەریکی: رۆژی خۆکیشانەوەو رۆژی ئەمرۆو سبەینی ورۆژی فروفیل ورۆژی خۆ هەلخەلەتاندن و بگرەو بینەو... تاد - یە.

سەرکەوتنی مەزن و چەند راستی یەك:

ئیمە، لیرەدا، نامانەوێ پەنجە بۆبەزینە بەردەوامەکانی رژیمی ئیران رابکیشین، تەنیا چەند راستی یەك دەخەینەروو کە دەوری مەزن و بنەرەتیان لە وەدیهینانی سەرکەوتن بووە:

● سەرۆکی لیهاتوو صدام حسین، لە رۆژانی یەکەمی سەپاندنی جەنگ بەسەر عیراقدا، پەنجەی بۆئەوە راکیشا کە ئیمە جەنگ دەبەینەوە... جەنگ دەبەینەوەو سەردەکەوین، چونکە خاوەن تواناو ورەیەکی شاراوەی یەکجار گەورەو مەزنی گەلین و تەنانەت پیویست بەوە دەکات چۆن بتەقینریتەوەو بۆخزمەتکردنی مەسەلە بنەرەتەکانی گەل ونەتەوە، کاتی پیویست، بخریتە گەر. (المنهاج الثقافي: ل١٢٠).

بەلێ.. توانای عیراقیەکان لەبن ناهێت و هەردەم تازە دەبیتەوەو، بەردەوام وەدەر دەدات... ئەمەیشی لە داستانەکانی جەنگ دووپات بووەو دەوری بنەرەتی خۆیشی لە وەدیهینانی سەرکەوتنی یەکجارەکی بینی.

دوژمنان گرەویان لەسەر ئەوە دەکرد، عیراقیەکان بەرگەی شەر ناگرن و یەك نین و دوولی‌و رارایشیان دەربارەی یەکیەتی گەلی عیراق، پیشان دەدا.

عیراقیەکان ئەم «بیردۆز»ەی دوژمنانیان سەرەوخوار کردو بە هەستی شایستەی تەواوی نیشتمانپەروەریتی یەوە، یەك دل وگیان ویەك بیرویەك مەسەلە، روویان لە پاراستنی شەرەف وخاك وئاوی ولات کردو، بە باوەریکی قوولی چەکدارانەوە، ئاگریان بەردایە لەشکری عەجەم و سەرکەوتنی مەزنیان وەدی‌هینا. (علي طعمة: ل١٨١).

● ئەو سەرکەوتنە مەزنەی لە جەنگەکەمان دا بەسەر ئیرانی دوژمندا وەدیهینرا، ئەنجامی سەرجەمی ریبازی سەرلەبەری بنیاتنانی شۆرشگیرانە بوو کە سەرکردایەتی میژوویمان، لەپیشەوە فەرماندەی لیهاتووی میژوویمان سەرۆك صدام حسین، رەگی داکوتاند، کە

ئەمیش لە توانـای بەرزی وورەی گەلی عیـراقـدا هەڵێنجـراوە . . . ئەو سەرکـەوتنـە مەزنـەی بە شێـوازە نایـابەکەی و دیارده ئیجابییە گەورەکانیەوە وەدی هـات، لە رەوت وریـبازی بنیاتنانی شۆڕشگێرانە جیاناکرێتەوە . . . «دەتوانین ئەوەش بڵێین کە جەنگەکەمان بوارێکی بەپیت بوو بۆ دەربرینی ئەو پلەو ئاست بەرزەی رێبـازی سەرلـەبـەری بنیـاتنـانی شۆڕشگێـرانـە پێی گـەیشتـووەو لە دەربـرینی ئەوسەرکـەوتنـەی، ئەم بنیـاتنـانـە، وەدەستی هێنا . . » (التوجیه السیاسی : ل١٢١).

سەرکردایەتی کردنی راستەوخۆی فەرماندەی مێژوویی بەرێز سەرۆك صدام حسـین، بۆ گشت لاپەرەکانی جەنگ، لەرووی نەخشەدانان و سەرپەرشتکردنی راستەوخۆی مەیدانییانەی راپەراندنیان، لە پەنای بیری روونـاك و زرنگـانـەو ئەقـلی کامـل و ستراتیژیی و تێکـەڵبـوونی گیانی بەگیانیانـەی بەرێزی لەگـەڵ ژان و ژیانی سەربازە دلێرەکانی خۆی لە کۆرەکـانـی جەنـگـدا، بوون بە مایەی ئەوەی بە لێکـدانــەوە وردو زانستییەکانی خۆیەوە، رووداوەکانی جەنگ شی بکاتەوەو بە شێوەیێکی داهێنەرانەش پەندە بە پیتەکانی هەڵبهێنجێ و لەپێناوی رەوتی ئەو جەنگە درێژخایەنەدا لەدژی دەستدرێژیی رژێمی ئێران بخاتەکارو لە پاڵپشتی دا ئەو زانستیانەی بەگشت سەرکردەو فەرماندەکانی سوپای دەدان کە دەبێ لە کاتی جەنگدا، بە گشت لاپەرەکانیەوە، سوودی لێ وەربگرن و بۆ واقیع تەرجـەمـەی بکەن . . . ئەمانە هەموویان دەوری هەرە گەورەو بنەرەتی خۆیان لە وەدەستهێنـانی سەرکـەوتن نواند «جریدة الثورة ژ ٦٠٥٧».

سەرباری باوەری تەواوی بە سەرکەوتنی یەکجارەکی بەسەر دوژمن دا، کە هەر لە سەرەتـای سەپاندنی جەنگ بەسەر عیراقدا تا وەدەستهێنانی سەرکەوتنی یەکجارەکی، بەردەوام دووپاتی دەکردەوە.

بەرێز سەرۆکی فەرمـانـدە لە نامـەی پێنجەمیدا بۆ گەلانی ئێران لە ١٩٨٦/٨/٢دا، پاش ئەوەی رژێمی ئێران دروشمە شرەکەی راگەیاند ئەوەی ئەم سالـە، ساڵی براندنەوەی جەنگە بۆ بەرژەوەندی ئێران، لەم رووەوە، دوو راستیی بنەرەتی دووپات کردەوە، کاتێ فەرمووی: «ئێمە کەبـەنـاوی گەلی مەزنـەی عیراق و سوپـا دلـێرەکـەیەوە، ئەوە دووپـات دەکـەینەوە کە ئێوە دەبەزن و تێك دەشکێن، هەروەك جارانی پێشوو، لەم دووپاتکردنەوەدا پشت بە دوو راستیی بنەرەت دەبەستین کە سەرباری هەموو راستییەکانی ترن، ئەمانەن:

یەکـەم: لە ئاست بەراووردکـردنی گشت رەگـەزەکـانی لەشکـرکێشی (سەوق کردنی) گشتی لە نێوان ئێمەو ئێوەدا، تای سەرکەوتن بەلای ئێمە دایە . . تواناکـانـمان گەورەتـرن . . . تواناکانمان لە بەکارهێنانی گشت رەگـەزەکـان، بەکـارهێنـانێکی ئەوتۆ ئەنجامی سەرکەوتن بەلای ئێمەدا بێت، لە تواناکانی ئێوە بەکارترن . . . .

دووەم: راستیی دووەمیش ئەوەیە: گەلـە مەزنـەکـەمـان، بەرەوانی لە خاکـەکـەی دەکـات . . . بەرگـریی لە شەرەفەکەی و بیروباوەرو شەرەفی نەتـەوەی عەرەب دەکـات . . . باشیش دەزانێت، پاش ئەوەی گشت هەوڵ و کۆششەکانی ئاشتی لەگەڵ ئێوەدا بێ سوود بوون، رێگای تر نییە بۆ پاراستنیان جگـە لە بەرگـریی خۆڕاگـرانەی پاڵەوانانە نەبێت . لەبەر ئەمـە، هەر سەرنەکەوتنێکتان بۆ وەدیهێنانی ئەم دروشمە پووچەتاندا و گشت دروشمـە دوژمنکـارێتی یەکـانی ترتـان، وردو خاشتان دەکات و بەجـارێك دەتانخاتە دەرەوەی کات و مێنبەری سیاسەتەوە . . . ئێمەش باوەری تەواومـان بە سەرکـەوتن هەبووەو هەیەو، پەناش بەخودا، هەر سەردەکـەوین و سەرکـەوتـنـی یەکـجـارەکـی بەسـەرتـانـدا وەدەست دەهێنین . . . » (صدام حسین/ نامەی پێنجەم: ل٥١)

ئەم باوەربوونە بە توانای گەل لە وەدی هێنانی سەرکەوتنی یەکجارەکی بەسـەر دوژمن دا، بۆ ئەم راستییانـەی باسمان کردن دەگەرێتـەوەو، لەمانەش رەنگی دایەوە:

١ . گیانی خەبـاتگێرانـەی تێکرای گەل کە لە بەرپەچدانەوەی هێرشی دوژمن داو، لە پووچەڵ کردنەوەی پیلانە گەندەڵەکانی و لە وەدیهێنانی سەرکەوتن دا، لە جوانترین و نایابترین وێنەی تێکۆشاندا نواندی .

٢ . شەرکردنی ئازایانەو پاڵەوانانەی رۆڵەکانی هێزی چەکدارمان، کە بە گیانی چەرخی پەیامی ئیسـلامیدا شەریان دەکـردو، داستـانـەکـانی خۆنـەویستن و قوربـانی دانی بێ وێنەش لە پێناوی سەربەرزیی گەل و سەروەریی نیشتمان، باشترین بەڵگەن . (الثورة العربیة : ل٦) .

٣ . دەوری خەباتگێرانەی مەزنی سوپای میللی لە تەك هێزی چەکداری پاڵـەوانـماندا، کە هێزێکی تری سەرباری خستە سەر تواناکانی هێزی چەکدار . . چ لە بواری بەشداریکردنی پتەوی لە بەرەکانی جەنگدا، چ لە بواری راپەراندنی ئەرکەکانی دا بێت لە بەرەی ناوخۆ.

٤ . بەشـداریکـردنی فراوانی کەرتی پێشرەوو نێوجەوانان لە کارەکانی بەرگـریی نیشتمانی و ئەرکەکانی تر کە ئیرادەی جەنگاوەران لە بەرەکانی کوشتاردا پتەو دەکەن . . . سەرەرای سەرهەڵدانی رادەی بەرزی هەست بە کارکـردنـی بەردەوام و، پێگـەیشتنی ئابمت بەرزی باری وشیاریی نیشتـمانی و نەتـەوەییان و پتـەوبـوونی باوەری تەواویان بە بیروبـاوەرو چەمکەکانی پارتی بەعسی سۆشیالستی عەرەب و، ئامادەیی تەواویان بۆ چوونە ناو بەرەکانی جەنگ . . لە کاتی پێویـست دا ـ ، ئەمانە هەموویان بەڵگەی گیانی ورە بەرزی و زیندوویی ئەم نەوە نوێیەی سەردەمی شۆرش بوون لە کاتی جەنگ و ئێستاش .

٥ ـ رەنگـدانـەوەی دەوری بەکـاری ئافـرەتان لە پتەوکردنی سەرکەوتنە بەردەوامـەکانی جەنگ . . . . لە دیاردەو جۆرەها رەفتاریشیاندا ئەوەیان سەلماند کە خاوەن توانایەکی مەزنی ئەوتۆن دەتوانن بە ئەرکی خەباتگێرانە هەڵبستن و، لە تەك براکانیشیاندا بەشداریی پتەو بکەن لە بەهێزترکردنی

رەوت و ڕێبازی شۆڕش و چەسپاندنی گیانی سەرکەوتن بەسەر دوژمنانی ئازادیو سەربەستیو گەشەسەندن و تێکرا مرۆڤایەتی دا؛

٦ . ڕادەی هەست بەرزیو بەرشتتربوونی کارکەران لە بوارەکانی کارو بەرهەمهێنان داو وەگەڕخستنی ورەو توانای لەبن نەهاتوویان، بەو جۆرە کە خواست و ویستەکای سەرکردایەتیی مێژووییان وەدی بهێنن لە گەیشتنە ئەوپەڕی باری پەرەپێدان و بەردەوام گەشەکردنی، بەتایبەتی لە سەردەمی جەنگ دا.

٧ . هەوڵ و کۆششی فیکریو ڕۆشنبیریو ڕاگەیاندن کە وەك بەخشندەی گەورە سەریان هەڵداو بەشداری‌یەکی گەورەیان نواند لە پتەوکردنی ورەی بەرزی ڕۆنەکی هێزی چەکدارمان و تێکرای گەلەکەمان.

٨ . سەرهەڵدانی نرخ و بەهای شۆڕشگێرو بنەڕەتانە لە سەردەمی جەنگ داو، خوێنەویستن و بەری ئەوپەڕی قوربانی‌دان و ڕوو لە شەهیدبوون کردن وا لەم پێناوەدا کە دەوری مەزنی خۆیان لە دروستکردنی کەسایەتی نوێی عێراقیدا گێڕا.

٩ . سەرهەڵدانی بەهای باشتر بەکارهێنانی سامان، بەگوێرەی پەیرەوێکی پەرەپێدانی شۆڕشگێرانەو، بە ئاسۆیکی نەتەوەیی و سۆشیالستیانەی ڕووکارو ئامانج دیار بۆ بەهێزتر کردنی توانای جەنگین و پتەوکردنی ئابووری‌یەکی پەرەسەندووترو پێشکەوتووتر بتوانێت گشت پێویستییەکانی جەنگ دابین بکات. . . سەرباری «سەرهەڵدانی توانای ئاست بەرزیی سەرکردایەتیی مێژوویمان بۆ بەردەوام گەشەسەندنی ڕێبازی پەرەپێدان کە پێویستییەکانی جەنگی درێژخایەن دابین بکات و بەردەوامیی پێشکەوتنی سەرسەبەری ئابووریو کۆمەڵایەتیو ڕۆشنبیریش مسۆگەر بکات. . بە مەیش پارتەکەمان بۆ یەکەمین جار لە مێژووی پارتە شۆڕشگێڕەکاندا چەمك و بەجێکەیەندی نوێی بۆ ئابووریی پەرەپێدان و ئابووریی جەنگ خستەڕوو، بەو جۆرەی، کە لە جەنگی ڕەوامانداد، ببنە دوو ڕووی یەك کارو. ئیتر چەمك و بەجێکەیەندە لاسایی‌یەکانیش بەسەر بڕین و بوونیان نەمێنیت». (التوجيه السياسي : ل١٢٥).

گرنگی دان بە سوپاو چەکدارکردنی

:

سەرکردایەتیی سیاسیمان، بەردەوام گرنگی زۆری داوە بە بەهێزکردنی سوپاو چەکدارکردنی بە باشترین چەك و چەشنەهاکردنی سەرچاوەکانی چەك. . . ئەم گرنگی‌پێدانەش، بە شێوەیکی سەرپەڕو دیارو تایبەتەوە لە کاتی جەنگی ڕەوامانداد، ڕەنگی دایەوە.

سەرکردایەتیی مێژووییمان لە پێشیدا فەرماندەی ئێهاتوومان سەرۆك صدام حسین زۆر چاك دەیزانی پەیداکردنی چەك و چەشنەهاکردنی، پەیوەندیی زۆر پتەوی بە سەربەخۆبوونی بڕیاری سیاسی عێراقەوە هەیە. . . لەبەر ئەوە، دەبێ زوو بە زوو هەوڵ و کۆششی لەرادەبەدەری ئەوتۆ بدرێت، کە بەهۆیەوە بتوانرێت سەرچاوەی چەك پەیداکردنی ئەوتۆ دەستەبەر بکرێت کار نەکاتە سەر سەربەخۆیی بڕیارو، لە پاڵیشیدا، هەموو هەوڵ و توانا بخرێنە کار، وڵات، بە شێوەیکی گشتی، لە دروستکردنی چەك و زیدەکردنی هەموجۆر بوونی چەك و هێنانەناوەی تەکنولوجیای نوێی دروستکردنی چەکی پێشکەوتووەوە، پشت بە خۆی ببەستێت و ڕۆژێ لە ڕۆژان، خوانەخواستە، ناچار نەبێت نەرمی لە بڕیاری سیاسی پیشان دا بدات و، لە هەندی ڕووەوە ببێتە قوچی قوربانی ئەم نەرمییەو وڵات نەبێتە خاوەن بڕیاری سەربەخۆ، ئەمەیش بێ‌گومان لە ئەنجامدا کاردەکاتە سەر ئەنجامە ڕاستەوخۆو ناڕاستەوخۆکانی جەنگ و ڕەنگە واش بکات درێژە بە کاتی وەدی‌هێنانی سەرکەوتنی یەکجارەکیمان بدات. . یان لەنگەر بە تای تەرازووی سەرکەوتن بدات.

ئەم جۆرە شیکردنەوە وردو مەوزووعی‌و زانستانەی بەڕێز سەرۆك صدام حسین بوونە مایەی ئەوەی خێراو پشت بەخۆبەستن، دەست بکرێت بە دانانی بنکەیەکی مەزن و بەهێزو پەرەسەندووی پیشەسازیی سوپایی‌و هەموو پێویستییکیش بۆ ئەم مەبەستە باوبکرێت. . . ئەوەبوو کۆڵنەدەرانی ئەم کەرتە توانییان بە کاتێکی پێوانەوە جۆرەها چەك دروست بکەن و، چەکی ئەوتۆش بخەنە ژێر توانای هێزی چەکدارەوە، دەرفەتی سەرکەوتنی یەکجارەکیمان بەسەر دوژمندا نزیك بکاتەوەو، دوژمن خەوی پێوە ببینێت. . بەتایبەتی دروستکردنی مووشەکە دوورهاوێژەکانی حوسەین و عەبباس، بەم دوواییەش، «فڕۆکەی ئاگادارکردنەوەی زووبەزوو ـ عەدنان یەك». . . سەرباری چەشنەها تۆپ و تانك و زرێپۆشی پێشکەوتوو و چەك و جوبەخانەو پێویستییەکانی تری ئەوتوی جەنگ، کە دەوری هەرە مەزنی خۆیان لە وەدی‌هێنانی سەرکەوتنی مەزن گێڕا.

هەستی ڕاستەقینەو بنەڕەتی نەتەوەیی :

:

ئیمە کاتێ یادی یەکەمی سەرکەوتنی مەزن دەکەینەوەو، پەنجە بۆ هەندێ لەو هۆیانەی سەرکەوتنی مەزنییان لە ٨ی ئابی ١٩٨٨دا وەدی‌هێنا، ڕادەکێشین، دەبێ ئەوەش دووپات بکەینەوە کە ئەو سەرکەوتنە مەزنەی عێراقییەکان وەدییان هێنا، هەستی بنەڕەت و ڕاستەقینەی نەتەوەیی لەلایەن تێکرای جەماوەری عەرەبدا دەرکاند. .

پاشان، ئەو جەنگەی عێراق بۆ پاراستنی دەروازەی ڕۆژهەڵاتی نەتەوەی عەرەبدا کردی، لە بنەڕەتدا با جەنگێکی نیشتمانیش بێت، بەڵام لە پوختەکەیو ئەنجامەکانیدا، جەنگێکی نەتەوەیی ڕزگاریخوازانە بوو و بە شێوەیەکی ئیجابییانەش کاری‌کردە سەر خەباتی عەرەبی.

ئەو سەرکەوتنە مەزنەی عێراق لە شەڕە نیشتمانی‌و نەتەوەییەکەیدا وەدی‌هێنا، تاقیکردنەوەیەکی تاك و دیارو عەمەلی بە خەباتی عەرەبی

ئەدات لە پێکران و توانا هەبوون بۆ جەنگ کردن لەگەڵ قەوارەی زایۆنی و سەدنەوەی خاکی زەوتکراو. . . هەر ئاواش، بۆ سوودوەرگرتن و بە بەرهەم هێنانی ئەم سەرکەوتنە لەپێناوی پتەوکردنی سەربەخۆیی وڵاتانی عەرەب و لەناوبردنی هەموو جۆرە هەبوونێکی بێگانە لە ناوچەرگەی پشتهانی گەورەی عەرەبدا. (المنهاج الثقافي: ل٣١).

سەرچاوەکان

وزارة الدفاع - دائرة التوجيه السياسي - مديرية ادارة الثقافة - رسائل بقوة وسلام من الرئيس القائد المهيب الركن صدام حسين الى شعوب وحكام ايران، الرسالة الخامسة، مطبعة التوجيه السياسي، بغداد، (بلا تاريخ)

٢. علي طعمة. صدام حسين - الفكر والممارسة، منشورات مؤسسة الهيثم، بيروت، ١٩٨٣

٣. وزارة الدفاع - دائرة التوجيه السياسي. المنهاج الثقافي للتوجيه السياسي - الجزء الثاني (بلا تأريخ)

٤. الجمهورية العراقية - القيادة القومية - مكتب الثقافة والاعلام الثورة العربية، العدد الأول لسنة ١٩٨٥.

٥. جريدة الثورة، العدد (٦٠٣١) من ٢٩/١١/١٩٨٦ «القائد صدام حسين ودوره العسكري في شل حركة العدو».

٦. گۆڤاری «رۆشنبیری نوێ» - ژمارە (١١٣)ی ساڵی ١٩٨٧.

## ملخص المقال

# عوامـــل النصر العـــراقي العـــظيم في القادسية الثانية

- ريبوار أحمد -

لقد جسدت معركة قادسية صدام، حالة النضج الراقية التي بلغتها ثورتنا وشعبنا والقيم الثورية الاصيلة التي جسدها بناؤها الثوري الشامخ والتي كان من شأنها خلق الانسان الجديد الناهض الواعي والملتحم بقيادته والمبني بناء انسانيا بحيث أضحى هو بحد ذاته قيمة كبيرة وبتفاعل هذه القيم الكبيرة التي يمثلها مجموع الشعب ببنائه الثوري الجديد كانت القدرة المعنوية الرفيعة لمستوى الشعب والتي تمثلت في معركتنا العادلة بالعامل المعنوي وفعله الهائل في أحراز النصر العظيم.

ان النصر الكبير الذي تحقق جاء حصيلة مسيرة البناء الثوري الشامل الذي ارسته قيادتنا التأريخية وعلى رأسها البطل الفذ القائد صدام حسين، والذي تجسد في الروح النضالية والجهادية العالية لابناء الشعب ومظاهر البطولة الرائعة لابناء قواتنا المسلحة الذين قاتلوا بروح عصر الرسالة والاجداد العظام. اضافة الى التلاحم المصيري للشعب والادوار الفاعلة لمختلف القطاعات والشرائح الاجتماعية في تأدية مهماتها الصعبة في ميدان البناء وميدان الحرب.

ويركز المقال على الحقائق الاساسية التي اكدها القائد صدام حسين خلال معركتنا العادلة من أن الأرجحية تكون لصالح العراق في شتى النواحي، وان شعب العراق العظيم، إستناداً الى تلك الحقائق لقادر كل القدرة على احراز النصر العظيم.

ويختتم الكاتب مقاله بالأهمية البالغة التي أولتها القيادة بتنويع مصادر التسليح، ثم بناء قاعدة صناعية عسكرية متينة لعبت دورها، الفعال في تقريب إحراز النصر. كما ان ابداع القيادة بلغ مديات مذهلة حين مزج بين الحرب والبناء فلم تكن الحرب تعطيلا لعملية البناء الشامخ، بل تضاعفت مسيرة البناء وحركة النهوض الشامل خدمة لمعركتنا ولادامة إحتياجاتها ومتطلبات النصر العظيم.



# ژیننامەی سەرکردەی دامەزرینەر هەڤاڵی نەمر ماموستا مشیل عەفلەق

پیشەکی:
هەردوو سەرکردایەتیی نەتەوەو هەریمی حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالست هەواڵی کۆچی ئیجگاریی ماموستا میشیل عەفلەقی سەرکردەو دامەزرینەری حزبیان راگەیاند کە لە ئیوارەی هەینیی ۲۳ی حوزەیرانی ۱۹۸۹ گیانی پاکی بە یەزدان سپارد. دەنگوباسی مەرگی لە هەموو لایەکی جیهان دا دەنگیدایەوەو بەوپەری ریزو شکۆداری، تەرمەکەی لە بەغدا بە خاك سپێردرا و رۆڵەکانی گەلی عیراق بە کوڵ بەشداریی ماتەمی کۆچ کردنەکەیان کرد.

ماموستا، کە ئەمینی گشتی حزبی بەعسی عەرەبی سوشیالست بوو، خاوەن بیرو دانایەکی هەڵکەوتوو، سەرکردەیەکی خەباتی شۆرشگێری نەتەوەیی بێوینە بوو. رۆڵەیەکی بەجەرگ و تێگەیشتووی شارستانەتیو کەلەپووری عەرەب و ئیسلام بوو، توانی لە سەردەمێکی جەنجاڵ دا حزبەکەی لە کۆری خەبات دا دژی ئیمپریالزم و زایۆنیو کۆنەپەرستی سەربخات و ئاڵاکەی بە بەرزییەوە هەمیشە شەکاوە بێت. هەتا هەتایە بیرو رێبازی هەڤاڵی نەمر میشیل عەفلەق بە نەمری دەمێنیتەوەو هەموودەم ئاسۆیەکی گەشە لە بەردەم قۆناغی دوارۆژی نەتەوەدا.

ئیمەش بەم بۆنەیەوە کورتەیەکی ژیانی خەباتگێری ئەم نەمرەتان پێش کەش دەکەین.

- رۆشنبیری نوێ -

## لاپەڕەکانی خەبات و شۆڕش:

هەڤال میشیل عەفلەق لە ڕۆژی نۆزدەی کانونی دووەمی ساڵی ١٩١٠ لە دیمەشق هاتۆتە دنیاوە، کوڕی خێزانێکە کە بنەماڵەی یوسف عەفلەقی باوکی لکێکە لە بنەماڵەی ئەبو عسلە لە (ڕاشیا الوادی) لە (بقاع)ی لوبنان. خاتوو ڕەسمییەی دایکیشی دەچێتەوە سەر بنەماڵەی زیدان لە حیمص.

لەو ماڵە دا لە گەڕەکی ناسراوی (المیدان) کە یەکێکە لە گەڕەکە کۆنەکانی دیمەشق هەڤاڵ میشیل عەفلەق پێگەیشت و بنەماڵەکەی بەشێکی بە نرخی ئەو گەڕەکە کۆنە خەباتگێڕە بوو کە قەڵای نیشتمانپەروەری و عەرەبایەتی و خاکی شۆڕشە نیشتمانییەکان بوو، کەوا شۆڕشی سوریای ساڵی ١٩٢٥ لەوێ دا دەستی پێکرد، هەروەها لە هەموو شۆڕشەکانی فەلەستینیش دا بەشداریی کردوە.

جا لەم ژینگە نیشتمانییە عەرەب پەروەری یەدا چاوی هەڤاڵ میشیل عەفلەق بەسەر وێنەی ئاهەنگ و شادیی گەل دا کرایەوە کە بە بۆنەی دامەزرانی یەکەم دەوڵەتی سەربەخۆی عەرەب لە ساڵی ١٩١٨دا بە سەرۆکایەتیی فەیصەلی کوڕی حسین سازکرا، پاشان دیمەنی دڵڕووشێنی داگیرکردنی فەرەنسەیی‌یەکان و دیمەنی بەشداریی خەڵکی گەڕەکی مەیدان لە شەڕی مەیسەلوون دا دژی سوپای داگیرکەر کە ساڵی ١٩٢٠ سەربەخۆیی سوریای لە ناو برد.

خوێندنەوە سەرەتاکانی هەڤاڵ میشیل عەفلەق لەگەڵ ئەو ژینگە نیشتمانیی و عەرەب پەروەرە دا یەکدیگیربوون و دکتۆر شکری زیدانی خاڵیشی دەورێکی باشی هەبوو لە ڕێنمایی کردنی خوێندنەوەیدا، بۆیە خوێندنەوەکانی لە دەوری ئەدەب و مێژووی عەرەب و هەڵبەستی نیشتمانیی و ئەدەبی (مەهجەر)دا چەقی بەست هەروەها خوێندنەوەی ژیانی پێغەمبەری عەرەب (ص) لە کتێبی قارەمانانی کارلایل و هەندێ وتاری زانستیی و کۆمەلایەتیی إسماعیل مظهر و الشمیل. لە ڕوویکەوە (لزومیات)ی ئەبوعەلاو دیوانی شیعری (متنبی)و ڕۆمانەکانی جورجی زیدان دەربارەی مێژووی عەرەب و نیسـ خوێندەوە. ئەمانە هەمووی کارێکی گەورەیان کردە سەر پەرەسەندن و قوول کردنی هوشیاریی نیشتمانیی و نەتەوایەتیی هەڤاڵ میشیل عەفلەق، بۆیە ڕووداوەکانی شۆڕشی چەکداری سوریای ساڵی ١٩٢٥و ژیان لە ڕۆژانی شۆڕشەکەو گوێ گرتن لە دەنگوباسەکانی، هۆیەکی تازەی گەشەکردن و پەرەسەندنی ئەم هوشیارییە بوو، بە تایبەتی کە هەر لەو سەردەمەش دا شۆڕشێکی عەرەبیی دی لە (ڕیفی مەغریبی) دژی هەمان ئیستیعماری فەرەنسا بەرپا بوو، کاتێکیش کە ئیستیعماری فەرەنسا ناچار بوو، سیاسەتی وتوویژ پەیرەو بکات، نیشتمانپەروەران حزبێکیان پێکەوە نا بە ناوی (الکتلة الوطنیة)و لە یەکەم مەجلیسی تأسیسی و لە دانانی دەستووری ساڵی ١٩٢٨دا بەشدارییان کرد، شتێکی بەڵگە نەویست بوو کە بنەماڵەکەی خۆی لە ناو ئەم کۆمەڵ بەستە نیشتمانییەدا بنوێنێ کە سەرکردایەتیی خەباتی سیاسی کردو یوسف عەفلەقی سەرۆکی بنەماڵە لە چالاکییەکانی دا بەشداری بکات، میشیلی کوڕیشی هەر لەسەر ئەم هەڵویستە جێگیر بوو، سەرەڕای هەموو گۆڕانەکانی باری سیاسی هەتا قۆناغی خوێندنی ئامادەیی تەواو کردو گەشتی بۆ ئەوروپا کرد بۆ تەواوکردنی خوێندن.

میشیل عەفلەق، لە تەمەنی هەژدە ساڵی دا چووە پاریس بۆ خوێندن لە کولیجی ئادابی سوربۆن و وەرگرتنی باوەڕنامەی بەرایی زانکۆ لە بواری مێژوویدا. جگە لەوەی بیکەن بە چالاکییەکانی قوتابیان بوو، بە جارێك بوو بە ئەندامی دوو کۆمەڵە، یەکێکیان بە ناوی (الجمعیة العربیة السوریه)و ئەوی دی بەناوی (جمعیه الثقافة العربیة)و کۆمەڵەی یەکەمیان سیاسی بوو داوای سەربەخۆیی و بەرگریی لە کێشەی فەلەستینی دەکرد. هەروەها داوای یەکیەتییەکی سەرتاپای عەرەبیی دەکرد، بەڵام کۆمەڵەکەی دی ڕۆشنبیری بوو، کۆڕو کۆبوونەوەی ڕێك دەخست بۆ باس کردنی کردەوەی ئەدیبە کۆنەکانی عەرەب و ناسینی ئەدەب و فیکری عەرەبی، هەروەها هەوڵی دەدا لە ڕێگەی چالاکییەکانی دا ئەوە بخاتەوە بیری عەرەب کە گشتیان ڕوەی یەك ڕۆشنبیری و یەك شارستانەتین.

هەڤال میشیل عەفلەق لە پاریس مێژووی بە ڕێبازی پرۆگرام دەخوێند بەو پێیە کە بابەتی لێشارەزابوونیەتی، بەڵام خوێندنەوەی خۆی هەر لەو چەرخە دا قەتیس نەکرد. بەڵکو بە خوێندنەوەی بەرهەمی بەرزترین خاوەن بیرە ئەوروپاییەکان ـ هاو چەرخەکانیان و ئەوانەش لە چەرخی نۆردەهەم دا ژیاون وەکو نیچە، مارکس، دستویفسکی، تولستوی، بیرگسون، ئەناتول

فرانس و ئەندرێ جید، ئەگەرچی حەزی بە بیروراو شێوازی ئەو نووسەرانە دەکرد بەلام هەرگیز نەتەوەکەی خوی بیر نەچووەوە بە مێــژووی، شارستانـەتی، تایبـەتی‌یـەکـانی، چۆنیـەتی حاڵی‌و گیروگــرفتــەکــانی‌و ئازاری بە دەست ئیستعمارو دواکـەوتن و چەوساندنەوەوە. ئەوسا کەوتە لێکۆڵینەوە لە رابردوو بە وردی‌و بە قووڵی، وەشیکـردنـەوەی ئێستـا بە ناکۆکی‌و کێشەو بەرەکانی بۆ ئەوەی ـ لە دوایی دا ـ لە دوارۆژ بروانێ، دوا رۆژێك کە دەورێکی بەرجـەستـەو دیـاری ئەم نەتـەوەیـە لە سیاسـەتی جیهان و شارستانەتی‌دا خوی تێ‌دا مات داوە.

لە پاریس، کە قوتـابیـانی زوربەی هەریمەکانی عەرەب کو دەبـوونـەوە، وتـوویـژی لەگـەڵ قوتابی‌یە عەرەبەکان بە تایبەتی مەغریبی‌یـەکـان دنیای ئەکرد کە گیروگرفتەکان و چارەنووسی هەریمـەکانی عەرەب یەکێکەو دەیچەسپاند کە پیلانێکی گەورەو فراوانی دژی نیشتمانی عەرەب پێویستـە ئیرادەتیکی یەکگـرتوو بەرەنگـاری بکـات تا تێکی بشکێنێ‌و وەڵامی بداتـەوە. کەوابێ رێکخـــراوە ناوچـەیی‌یـەکـانی بێرەو نەوی، داخـوازی‌و دروشمەکانیان هەر چۆنێك بێ سوودی نی‌یە بەڵکو دەبێ یەك تاکە رێکخراوو یەك سەرکردایەتی‌و باوەرێکی روون کرداری سیاسی لە هەموو نیشتمانی عەرەبی رێك بخات و لە پێناوی جێگیرکردنی یەکیەتی عەرەبی لە جێی لەت لەتی‌و لە پێناوی سەربەستی لە جێی دکتاتوری‌و ئیستیعمار و لە پێناوی سوسیالزمیکی مروڤایەتی لە جێی کونەپەرستی‌و دەرەبەگ خەبات بکات.

ئەو بیروڕایـانـە لای زۆر لە هاورێیـان و دۆستـانی میشیل عەفلەق پەسند بوو بە تایبەتی صلاح الدین البیطار کە ئەو وەختە فیـزیـای دەخوێند لەوێ دا پەیمانیان بەست لە پێناوی مەسەلەی یەکتادا پێکەوە کار بکەن و ژیانی خۆیان بەختی ئەو ئامانجە بەرزە پیرۆزە بکەن کاتێك کە دەگەرێنەوە نیشتمان.

مامــۆستــا میشیــل عەفلەق و هاورێیـەکـەی ساڵی ۱۹۳۳ گەرانـەوەو هەر دووکیـان لە قوتـابخـانـەیەکی سانەوی بە ناوی قوتابخانەی یەکەمی (التجهیز) لە دیمەشق بوون بە مامۆستا. ئەو بابـەتی مێژوو کومـەلایـەتی، بەیتـاریش فیزیاو گەردوو نزانی دەگوتەوە. دەستیان کرد بە بلاوکردنەوەی هەندێ بیروڕای بنەرەتی کە لە مەولا بوون بە بیروڕاکانی سەرەتای حزب

ئەگەرچی ماموستا عەفلەق بەهرەیەکی ئەدەبی ئاشکراو دوا رۆژ روونی لێ دیاری داو چەند کورتە چیرۆك وچەند هەڵبەستێکی بلاو کردەوە رەخنەگران ئاستێکی نوێی بەهرەنواندنی ئەو قوناغەی ئەو سایان لێ بەدی کرد، بەلام زۆری پێ نەچوو وازی لەو رێنماییانە هینـا بە هوی تێکـەڵ بوونی لە کاری سیـاسی‌و تەرخـان کردنی زوربـەی کاتی خۆی بۆ نووسـین دەربـارەی یەکیەتی عەرەبی‌و نەتەوایەتی عەرەبی‌و نامەی نەتەوەو شەخسیەت و ئامادەیی پێ‌نانە قۆنـاغێکی شۆرشگـێری رزگـاریی رەسـەن و قووڵی ئاسـۆی شارستانەتی‌و مروڤایەتی تەرخان کرد.

پاشان ئەم بیروڕایانە وایان لێ‌هات دڵی ژمارەیەك لاوی نەتەوە پەروەری خوێن گەرم لە قوتـابیـانی قوتـابخـانـەو زانکـۆکـانیان رادەکێشـا، ئەوانـەی کە هەڵـوێستێکی نەوەیی تاك و باوەرێکی شۆرشگێری نوێ کۆی دەکرنەوە، بەلام ئەو کۆبوونەوەیە نەبوو بە کومەلیکی سیاسی یان بزووتنەوەیك هەتا مەرجە پێویستیەکانی ئەم کردەوەیە نەهاتنە دی. لە سەرەتای سالانی چل دا ئەوو بەیتاری هاورێ یەکەم کۆمەڵێکی سیاسی رێکوپێکیان بە ناوی (الاحیاء العربي) پیکـەوە نا کە بەیـاننـامـەی یەکـەمی لە ساڵی ۱۹٤۱دا بلاوکـرایـەوە. زۆری پێ نەچوو ئەم کۆمەڵە نەتەوایەتیی خۆی‌و جیاوازیی لە رێکخراوە هەریمی‌یەکانی سوریا چەسپاند کاتیك کە پشتگیریی راپەرینە رزگاریخوازەکەی عیراقی مایسی ساڵی ۱۹٤۱ کردو بزووتنـەوەی یاریـدەی عیراقی دامـەزرانـد کەوا هەمـوو ئەندامانی کۆمەڵە ساواکەو سەدان لاوی نەتەوە پەروەری خوێن گەرمی تر تیی‌دا بەشدار بوون. لە حورەیرانی ساڵی ۱۹٤۳ بەو لاوە بەیاننامەی بزووتنەوەکە بە ناوی (البعث العربی)یەوە دەر دەچوو.

ئەم رێکخــراوە نوێیـە سوودی لە هەلی هەڵبـژاردنی گشتی وەرگرت کە لە تەمووزی ۱۹٤۳دا لە سوریا ساز کرا، کەوا بیرورا بنـەرەتـەکـانی خۆی خستـە روو، بیروزەینی گەلی بۆ چوونـە قۆناغێکی نوێی خەباتی شۆرشگێری عەرەبی ئامادە کردو مامۆستا میشیل عەفلەق لە هەلبژاردنا خوی پالاوت و بەیاننامەکەی یەکەم و کۆنترین دروشمی حزبی پێوە بوو: (امة عربیة واحدة ذات رسالة خالـدە) واتا نەتەوەیەکی تاکی عەرەب، خاوەن نامەیەکی نەمر. ئەویش و صلاح الدین بیطار پێش ساڵێك وازیان لە مامۆستایی قوتـابخـانە هینا بوو بو پەرژانە سەر جی‌بەجی‌کردنی کاروباری حزب و ساڵی ۱۹٤٥ یەکـەم نووسینگـەی حزبیـان لە دیمـەشق

کردەوە، لەو میژووەدا یەکەم ناهەنگی سویند خواردن لە ئەمەی حزبدا ریك خرا، ئەوسا ژمارەی ئەندامانی لە ٤٠٠ کەس زیاتر نەبوو، لەکاتی بومبا باران کردنی دیمەشق لەلایەن فەرەنسەیی‌یەکانەوە لەو ساڵەدا حزبیان لەسەر دەستووری سەرباری ریك خست. لە تەمووزی ١٩٤٦ روزنامەی روزانەی (البعث)یان دەرکرد، لە نیسانی ١٩٤٧ هەڤاڵ میشیل عەفلەق کونگرەی دامەزرینەری یەکەمی حزبی کردەوەو دەستووری حزب و پەیرەوی ناوخوی بریاری لەسەر دراو خویشی بە عەمید «ئەمینی گشتی» هەڵبژیردرا. لەو ساوە تا ئیستا ئەم ئەرکەی لە ئەستو گرت، جگە لە چەند ساڵیك (١٩٦٥ ـ ١٩٦٨) سەردەمی پیلانەکەی ٢٣ی شوباتی ١٩٦٦

ساڵی ١٩٤٧ حزب بو هەڵبژاردنی بەرلەمان ناودیری کرد بەڵام پیلان گیرانی دەستەی حوکمران نەی هیشت بە نوینەر دەربچیت. لە نیسانی ١٩٤٨دا خوی‌و صلاح الدین بەیتاری هاوریی کومەڵەکانی جەنگاورە بەعسی‌یەکانیان لە شەری فەلەستین دا سەروکایەتی کرد، پاش گەرانەوەی لە فەلەستین، لەسەر چالاکیی سیاسی‌و فیکری خوی رویشت و لە تەیموی ١٩٤٨ گیرو بە شەش مانگ حەپس حوکم درا، پاشان لەگەڵ هەڤاڵانی لە دژی دکتاتوریی سوپایی خەباتی کرد. تا ئەکەی کومەیك لە هەڤاڵە بەعسی‌یەکان و سەرکردەی حزبە نیشتمانی‌یەکان گیرا تا رووخانی دکتاتوریەت لە ساڵی ١٩٥٤ دا.

لە ماوەی نیوان ساڵانی ١٩٥٥و ١٩٥٨دا ناودارترین داواکەرانی یەکیەتی نیوان سوریاو میصر بوو و رەنجیکی فیکری‌و سیاسی زوری لەم بارەیەوە پیشکەش کرد. دوای سەرهەڵدانی شورشی ١٤ی تەمووزی ساڵی ١٩٥٨ی عیراق یەکسەر ماموستا میشیل سەری لە بەغدا داو پشتگیریی شورشی راگەیاند. لە ماوەی جیابوونەوەکەدا ١٩٦١ ـ ١٩٦٣ ماموستا میشیل عەفلەق تووشی ئازاردان هات، هەتا کە حزب لە ساڵی ١٩٦٣ دا بەشداریی لە حوکم دا کردەوە. بە تووشی و خوبەو و بووێژەکانی کەوتە هەڵسەنگاندنی تەجرەبەکانی پیشوو دەرهینانی ئەو دەرسانەی کە دەبنە هوی قووڵ کردنی تەجرەبەی حزب و بە هەمەی مەترسیی ناوخوو دەرەوەی دەپاریزن، کەوا هەستی بە مەترسیی کومەڵ بەستنی سوپایی‌یەکان دەکرد کە خویان بەسەر ریی حزب و بەسەر باری سیاسیی گشتی لە سوریای ئەو وەختەدا ئەرز کرد.

ئەم هەست کردنەش راست دەرچوو، کەوا لە شوباتی ١٩٦٦، کودەتایەکی ئەم کومەڵە بەسی‌یە سوپایی‌یە کونیان لی کراوە لە ژیر پەردەی ناوی حزب دا سەرکردایەتیی رەوای حزبی لادا، بویە هەڤاڵ میشیل عەفلەق ناچار بوو خوی بشاریتەوە تا دوو مانگ هەتا توانی لە شامەوە بگاتە لوبنان، سەرەرای هاتوچوی بەردەوام و گورینی شوینی دانیشتنی، خوی‌و هەڤاڵە بەعسی‌یە رەسەنەکانی لەکەی دا لە خەبات دا بەردەوام بوون. تا حزب لە بەرامبەر ئەو پیلانە زورانەی بە تەمای شیوانی فکرەو خەباتی بوون نەبەزانە خوی رابگریت، ئەم ماوەیەش زوری پی نەچوو، تا حزب لە عیراق شورشی ١٧ ـ ٣٠ی تەمووزی تەقاندەوەو هیلی رەسەنی میژوویی حیزبی پەیوەند کرد. ماموستا میشیل عەفلەق پەیوەندی لەگەڵ هەڤاڵانی بەغدا دەکردو ناو بەناویش سەری دەدان. ئاگاداری چالاکی‌و هەنگاوە گەورەکانیان دەبوو لە زور مەیدان داو زور وتارو خوتبەشی دەخویندەوە کە بریتی بوون لە پوختەی فیکرو تاقیکردنەوەی دوورو دریژی.

لە ناوەندی ساڵانی حەفتاش دا، بەیرووتی بەجی‌هیشت و بە یەجکاری لە بەغدا نیشتەجی بوو کە بارەگای سەرکردایەتیی نەتەوەیی حزبی لی‌یەو کە بەشەنگو شوخ ترین شیوەیەکی مزگینی بەخشی سەردەمیکی عەرەبیی تازە ئاشکرا دەکات کەوەی بەعسی دادەریژری، سەردەمیك کە ئەو ئامانجانەی بە دریژایی ژیان خوی‌و هەڤاڵانی لە پیناوی دا خەباتیان کردووە دیتە دی. ئامانجی: یەکیەتی، سەربەستی‌و سوشیالزم.

لە کتیبی «في سبيل البعث»ەوە

# السيرة النضالية

## للقائد المؤسس

# الرفيق الخالد ميشيل عفلق

نعت القيادة القومية لحزب البعث العربي الاشتراكي الرفيق الاستاذ ميشيل عفلق يوم ٢٣ حزيران ١٩٨٩ ، وكان لهذا النبأ صدى عظيماً في انحاء العالم ولا سيما في الوطن العربي والقطر العراقي . فتناقلت وكالات الانباء والاجهزة الاعلامية خبر هذا الحدث الجلل وأفاضت في تعريف الناس بشخصيته وبأهمية دوره في قيادة الحركة القومية العربية وريادته الفكرية في تأسيس الحزب وتغذيته بأفكاره وتوجيهاته . فكان الفقيد علما من اعلام النضال والفكر والذي اصبح حزبه قائدا للثورة العربية والكفاح البطولي ضد الاستعمار والصهيونية . وكان ظهور الرفيق ميشيل عفلق في ساحة الكفاح الوطني انتصارا للروح القومية الاصلية وانتصارا لقيم الاسلام والعروبة التي ساعدت المناضل العربي في تثبيت اركان شخصيته وتأصيل أفكاره وتطلعاته للمضي نحو المستقبل المضيء بايمان ثابت وعقيدة صائبة هادية .

ويكفي الفقيد الخالد فخرا ان حزبه في القطر العراقي قام بثورة عظيمة في ١٧ ـ ٣٠ تموز ١٩٦٨ وان قائد الثورة والحزب الرفيق صدام حسين جعل من مبادىء الحزب راية خفاقة في سماء العز، ودحر العدوان الغاشم وحطم الامال المريضة للنيل من العراق العظيم والتأثير على مبادىء الحزب . وهكذا فان مجموع الشعب بعربه واكراده يمضون خلف الرئيس المناضل في زمن النصر والسلام الى سوح البناء والتقدم والحرية .

وتثمينا من مجلتنا للدور النضالي والفكري العظيم للقائد المؤسس الرفيق ميشيل عفلق قدمنا باللغة الكردية موجزا لسيرة حياته ، على ان ننشر في المستقبل دراسات وابحاث عن الفقيد المغفور له وعن فكره ونضاله .

# چەند ڕاستی یەکی نوێ دەربارەی شوێنی کورد لە ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١ دا

د. کەمال مەزهەر

کۆلیجی ئاداب - زانکۆی بەغداد

لەبەر ئەوەی زۆر لایەنی مێژووی گەلی کورد بێ دەستکاری ماوەتەوە بۆیەکا هەر ئەوەندە مێژوونووس توخنی باسێك کەوت دەرگا ئاواڵەو زانیاری ون ئاشکرا دەبێ. دوای ئەوەی لە ژمارەی ڕابردووی «ڕۆشنبیری نوێ»دا وتاری «لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحموود»مان بلاوکردەوەو تێیدا باسی شوێنی گەلی کوردمان لە ڕاپەڕینی مایس دا کرد، چەند زانیاری یەکی نوێمان لە خەڵك و سەرچاوەی جیاوازەوە پێگەیشت کە تۆمارکردن و لێکدانەوەی بەشێکیان بە پێویست دەزانین تا لە فەوتان ڕزگاریان بکەین و هەمان کاتیش باشتر لە شوێنی کورد لەو ڕاپەڕینەدا تێبگەین.

بەشێك لە زانیاری یەکانی ناو ئەم وتارە بۆ ڕوون کردنەوەی زیاتری پێوەندیی نێوان شێخ مەحمودو فەهمی سەعیدە، ئەو باسەی بایەخی تایبەتیی خۆی هەیە بۆ دەست نیشان کردنی هەڵوەستی ڕاستەقینەی شێخ مەحمود کە هەن دەیانەوێ بە زۆری زۆردارەکی بیکەنە داردەستی ئینگلیزو فەرمانڕەوایانی ڕژێمی پاشایی. لەو شوێنەی وتارەکەدا بەپێی پێداویستی لێکۆڵینەوەی مێژوویی و بە مەبەستی دەست نیشان کردنی لایەنە سەلمێنەرەکان و لەبەر هۆی تر ناچار بووین بگەڕێینەوە سالانی پێش بەرپابوونی ڕاپەڕینی مایس و لێکدانەوەی هەندێك باس کە پێوەندییان بە سروشتی بزوتنەوەکانی شێخ مەحمودەوە هەیە.

دیارە بەشداری بوونی فراوانی جەماوەری کوردستان لە ڕاپەڕینی مایسدا کارێکی ئەوتۆی کرد ئینگلیزو لایەنگرانی ئینگلیز پەنا بەرنە بەر هەر ڕێگەیەك بۆی هەبێ کوردی لێ بتەکێننەوە. بۆ جێبەجێ کردنی ئەم مەبەستە فرۆکەکانی ئینگلیز بە ناوی وەصی یەوە گەلێك بەیاننامەیان بە زمانی کوردی بەسەر دانیشتوانی شارو شارۆچکەکانی کوردستاندا بلاوکردەوە. لەم دواییەدا وێنەی یەکێك لەو بەیاننامانەمان دەست کەوت کە لە ناو دۆسی یەکانی «وەزارەتی ناوخۆ»دا لەگەڵ بەڵگە تایبەتی یەکانی کۆشکی پاشایی لە کتێبخانەی نیشتمانی هەڵگیراوە.[1]

بەیاننامەکە، کە بە ناوی وەصی یەوە بلاوکراوەتەوە، ڕۆژ و مانگی چاپی بەسەرەوە نی یە. بەڵام بە ناوەرۆکیدا دیارە کە دەبێ دەورووبەری کۆتایی مایسی ساڵی ١٩٤١ چاپ کرابێ و بلاوکرابێتەوە، چونکە

بەیاننامەکە لە بەندی سێیەمیدا بە ناوی وەصی‌یەوە دەڵی «... من ئەوا ئەگەڕێمەوە». ئینگلیزەکان و دەستەودایەرەشیان کاتێك کەوتنە باسی گەڕانەوەی وەصی کە خۆری ڕاپەڕینی مایس بە خێرایی کەوتە ئاوابوون.

ئەوەبوو ئینگلیزەکان دەستوبرد کەوتنە خۆ، چونکە سوور بوون لەسەر ئەوەی بە زووترین کات ڕاپەڕینی مایس دابمرکێننەوە. لەو بروسکە تایبەتی‌یەیدا کە چەرچلی سەرەك وەزیران دەربارەی ڕوداوەکانی عیراقی ئەو ڕۆژگارە ڕۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٤١ ناردوویە بۆ وەزیری هەندەرانی بەریتانیا بێ پێچ و پەنا گوتویە «کەی پێویست بوو دەبێ تا ئەوپەڕی هێز بەکار بهێنین» بۆ لێدانی ئەو ڕاپەڕینە.[٢]

بەر لەوە کاربەدەستە سەربازی‌یەکانی ئینگلیز کەوتبوونە جێبەجێ‌کردنی ئەم فەرمانە. پێش تەواو بوونی مانگی نیسانی ساڵی ١٩٤١ دوو جاران هێزی خۆیان هێنایە بەسرەو دەوروبەری‌یەوە. لە فەلەستینیشەوە هێزیان بەرەو حەبانی‌یە خستە ڕێ. هەرچەندە هێرشی فڕۆکە عیراقی‌یەکان کەمێك پێشکەوتنی ئەم هێزەی دواخست، بەڵام تا ڕۆ ـ ی حەڤدەی مایس گەیشتە بنکەی حەبانی‌یە.

لە ڕۆژی دووی مایسەوە جەنگ ـە نێوان لەشکری عیراقی‌و هێزەکانی ئینگلیز لە حەبانی‌یە دەستی پێکرد. دوای نیوەڕۆی هەر ئەو ڕۆژە ئینگلیزەکان هێزەکانی لەشکری عیراقی‌یان ناچار کرد لە بەسرە بکشێنەوە. ڕۆژی حەوتی مایس شاری عەشاربشیان گرت. لە ڕۆژی نۆزدەی مایسەوە هێرشی گەورەی ئینگلیز بەرەو فەلوجەو بەغدا دەستی پێکرد. هەر ئەو ڕۆژە هێزەکانی لەشکری عیراق ناچار بوون لە فەلوجەو دەوروبەری بەرەو بەغدا بکشێنەوە دوای دوو ڕۆژ هێزەکانی ئینگلز شاری فەلوجەیان داگیرکرد، هەوڵی دەرکردنی ئینگلیزەکان لە فەلوجە بە کوشتن و بریندار بوونی ٢٧٣ سەربازو ١١ ئەفسەر بە فیڕۆ چوو.[٣]

کشانەوەی فەلوجە پشتی بەرگری‌ی لەشکری عیراقی شکاندو ئەو ساکە وەصی‌و دەستەو دایەرەی لە ئوردونەوە بەرەو عیراق گەڕانەوە. ڕۆژی ٢٥ی مایس وەصی‌و ژمارەیەك لە سیاسی‌یە بەناوبانگە هەڵاتووەکان بە فڕۆکەی تایبەتی هاتنەوە حەبانی‌یە. ڕۆژی یەکی حوزەیرانیش، دوای ڕاکردنی ڕەشید عالی گەیلانی‌و سەرکردەکانی تری ڕاپەڕینی مایس، وەصی هاتەوە بەغدا.

بەو جۆرە دەبێ ئەو بەیاننامەیەی وەصی لە ماوەی ئەو حەفتەیەی نێوان بیست و پێنجی مایس و یەکی حوزەیرانی ساڵی ١٩٤١دا بڵاوکرابێتەوە. وەصی بەر لەوەش دوو بەیاننامەی تری بە زمانی عەرەبی بڵاوکردەوە، یەکەمیان ڕۆژی هەشتی مایس و دووەمیشیان ڕۆژی بیست و چواری مایس لە قودس چاپ کراون.[٤] بەڵام

عهـ ندای وصی عرش عراق بوخلق نجیب عراق

١ — کومه لی له عاصیه کان عسکری له زیر ریاست رشید عالی وچند کسیکی لگل او که به پاره ی بیگانه ودوزمن کراون منان بزور سلاح له دیار خوم حدایان کرد وله أدای واجبات مقدسه وصایت کور خوشکم ملك خوشویست هموتان محرومیان کرد

ام کومه له اشقیا بهزار درو افکار عراقیه‌یان تسمیم کرد

٢ — نتیجه ام حیله بازی ودروکردن ارض مقدس عراق له نعمتی کی تی بو گورا وبوه ساحه یکی جنك وجدال

٣ — واجباتی من آشکارا ، من أوا اگریمو که حق استرجاع شرف وطن خومان بکم وبوجاری دومین له زیر سایه حکومتی که شرعی بو وطن عزیزمان او رفاه وسعادتی پیشوی تأمین بکم

٤ — ایستا من هو کور کان مخلص عراق دعوت اکم که ام شرزمه عاصیه کان در بکەن واعاده حریت واستقلال خویان تأمین بکەن

٥ — ای کوره کان عزیزم عسکره کان بگرینه جی خوتان بسلام ، رانتظار اعاده حیات قانونی واستقلال مملکت خوتان بکەن . ولیعش جلالة الملك فیصل الثانی

وصی عرش عراق
عبد الأله

(١) دەقی بەیاننامەکەی وەصی بە زمانی کوردی

ناوەرۆکی بەیاننامە کوردی‌یەکە لە هیچ کامیان ناکات.

ئەمەش دەقی ناوەرۆکی بەیاننامە کوردی‌یەکەی وەصی‌یە وەك خۆی بڵاوی دەکەینەوە[٥] (بڕوانە وێنەکەی).

«نیدای وەصی عەرشی عیراقی بۆ خەڵقی نەجیبی عیراق

١ ـ کۆمەڵێ لە عاصی‌یەکانی عەسکەری لە ژێر ڕیاسەتی ڕەشید عالی‌و چەند کەسێکی لەگەڵ ئەو کە بە پارەی بێگانەو دوژمن کڕراون منیان بە زۆری سیلاح لە دیاری خۆم جودایان کردو لە ئەدای واجباتی موقەدەسی وصایەتی کوڕی خوشکم، مەلیکی خۆشەویستی هەموتان، مەحرومیان کرد.

ئەم کۆمەڵە ئەشقیایە بە هەزار درۆ ئەفکاری عراقی‌یەیان تەسمیم کرد.

٢ ـ نتیجەی ئەم حیلە بازی‌و درۆکردنە ئەرزی موقەدەسی عیراق لە نیعمەتێکی تێدا بوو گوڕڕاو بووە ساحەیەکی جەنگ و جیدال.

٣ ـ واجباتی من ئاشکرایە، من ئەوا ئەگەڕێمەوە کە هەتا إسترجاعی شەرەفی وەطەنی خۆمان بکەم و بۆ جاری دووەمین لەژێر سایەی حکومەتێکی شەرعی بۆ وەطەنی عەزیزمان ئەو ڕەفاهو

سەعادەتەی پێشو تأمین بکەم.

٤ ـ ئێستا من هەموو کورەکانی موخلیصی عیراق دەعوەت ئەکەم کە ئەم شەرزەمەی عاصی یەکان دەربکەن و ئیعادەی حوڕی یەت و ئیستیقلالی خۆیان تأمین بکەن.

٥ ـ ئەی کوڕەکانی عەزیزم، عەسکەرەکان بگەڕێنە جێی خۆتان بە سەلام، وەئینتیزاری ئیعادەی حەیاتی قانونیو ئیستیقلالی مەملەکەتی خۆتان بکەن. ولیعش جلالة الملك فیصل الثاني.

وەصی عەرشی عیراقی
«عبدالاله»

بە ناوەڕۆکی ئەم بەیاننامەیەدا دیارە وەصی دەستی بە کوردی زانێکدا نەگەیشتووە بۆیەکا زمانەکەی وا شەق و پەقە. دوور نیە یەکێکی وەك جەمیل مەدفەعی، کە ئەویش بەخێری بە ڕەگەز کوردە، بۆی نووسیبێ. ڕێشی تێ دەچێ بۆ نووسینی پەنایان بردبێتە بەر سەربازێکی لیوی[٦] کورد، یا ئاشووری کە ئەو ساکە ژمارەیەکیان لە حەبانی یە لە ناو هێزەکانی ئینگلیزدا کاریان دەکرد.

دەبێ لەگەڵ دامرکاندنەوەی ڕاپەڕینی مایسدا ژمارەیەکی زۆر لە سەربازی کورد هەڵاتبن، چونکە وەصی لە بەیاننامەکەیدا داوای گەڕانەوەیان دەکات، کەچی ئەو باسە لە دوو بەیاننامە عەرەبی یەکە دا نی یە. ئەمە زۆر ڕێی تێدەچێ چونکە یەکێك لە ئەفسەرە بەشدارەکانی ڕوداوەکانی ئەو ڕۆژگارە لە کتێبێکی خۆیدا باسی ئەوەی کردووە چۆن لەگەڵ بەرپابوونی ڕاپەڕینی مایسدا سەربازە هەڵاتووەکانی ناوچەی خانەقی و مەندەلی و دەوروبەریان گەڕاونەتەوە بنکەکانیان لە نزیك حەبانی یەوەو لە شەڕی دژی ئینگلیزدا بەشدار بوون.[٧] دیارە ئەوانەو، لەوانەیە هی تریش، لەگەڵ گەڕانەوەی عیراقدا بۆ دۆخی جارانی داویانەتەوە شاخ.

شایانی باسە لە ئەفسەرانی کورد عیزەت عەبدولعەزیزو مستەفا خۆشناو لەو شەڕەی نزیك فەلوجەدا بەشدار بوون. مستەفا خۆشناو یەکێك بوو لەو بیست و سێ ئەفسەرەی لەو شەڕە دا لە لایەن ئینگلیزەوە بە دیل گیران. هەمووش دەیزانین چۆن بەسەر یەکەوە چەند ساڵێکی نەخایاند کاتێك ئەم دوو ڕۆڵە نیشتمانپەروەرەی نەتەوەی کورد وەك سەردارانی ڕاپەڕینی مایس لە لایەن دوژمنانی گەلەوە هەڵواسران. ئەمە بۆ خۆی دەرسێکی مێژوویی گەورەیە بۆ ئەوانەی بە داخەوە لە مێژوو ناگەن، یا بە ئەنقەست فەرامۆشی ئەکەن.

هەن لەوە دوو دڵن کە چۆن دەشێ فەهمی سەعید هەموو هاوەڵەکانی دەربارەی ڕێك کەوتنەکەی خۆی لەگەڵ شێخ مەحمودا ئاگادار نەکردبێ. دیسان دەڵێن ئەو کارە شتێکی سەیر نەبوو بۆ گێژاوی ئەو پاشا گەردانی یەی سەرکردایەتی ڕاپەڕینی مایسی تێکەوتبوو. جگە لەوە شێخ مەحمود، وەك گەلێ کوردی تری ناسراوی ئەو ڕۆژگارە، دڵی لە صەلاحەدین صەباغ کرمێ بوو، ئەوانەی مەحمود الدرە بێ ناو هێنان بە تایبەتی باسی کردوون. الدرە دەڵێ «ژمارەیەك لە سەردارانی کورد لە ناو ڕیزەکانی لەشکرو لە دەرەوەی لە (صەباغ) دڵنیا نەبوون».[٨]

وێڕای ئەوە فەهمی سەعید پیاوێکی مەندو نهێنگر بوو، زۆریش باوەڕی بە ڕاوتەگیری خۆی بووە. لەم بارەیەوە صەلاحەددین صەباغ نووسیوی یە دەڵێ:

«فەهمی . . . پێ داگرە لەسەر ڕای خۆی، بە زانینی خۆیەوە دەنازێ، هەرچەندە لە توانای زیاترە».[٩]

سەرباری ئەو بەڵگەو ڕاستی یانەی جاری پێشوو باسمان کردن بەڵگەیەکی مێژوویی ونی تەنانەت لەوانیش گرنگتر بە دەستەوەیە کە بۆچوونی ڕێك کەوتنی شێخ مەحمودو فەهمی سەعید زیاتر دەسەلمێنێ. بایەخی یەکەمی ئەو بەڵگەیە لەوەدایە کە پێوەندی ی دێرینی نێوان ئەو جووتە نیشان دەدات و دەیگێڕێتەوە دەوروبەری کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٨، واتە سیازدە ساڵ و چوار مانگی ڕەبەق بەر لە بەرپا بوونی ڕاپەڕینی مایسی ١٩٤١ گەر مانگی نیسان بکەینە سەرەتای، سەرباری ئەوەی مەودای قووڵی و لایەنی تایبەتی ی پێوەندی ی ئەو دوو سەردارە بە ڕوونی نیشان دەدات. جا با کەمێك بە درێژی بکەوینە لێدوانی بەڵگەی نوێمان.

دوای شەڕی دەربەندی بازیان (حەڤدەی حوزەیرانی ١٩١٩)و بەدیل گرتنی شێخ مەحمود بە برینداری لای «بەردە قارەمان»ەوەو پێشکەش کردنی بە دادگەیەکی تایبەتی کە بڕیاری خنکاندنی دەرکردو دوایی ئەو بڕیارە کرایە دە ساڵ بەندیو سزای دە هەزار ڕوپی[١٠] و دوای ئەوەی شێخ بە دەسبەسەری نێردرایە دوورگەی هەنجام کە کەوتۆتە کەنداوی عەرەبەوە ئینگلیزەکان بە نیازی بەرهەڵستی کەمالی یەکانی تورکیا لەگەڵ شێخ ڕێك کەوتن و ڕۆژی دوازدەی ئەیلولی ساڵی ١٩٢٢ هێنایانەوە بەغداو لەوێوە ڕێگەیان دایێ بگەڕێتەوە سلێمانی.

شێخ کە مارانگازی دەستی ئینگلیزو ئاتاجی پشتیوان بوو ئەمجاریان کەوتە هاریکاری ی کەمالی یەکان کە ئەو ساکە وەك یەك ڕزگاریخواو دوژمنی ئینگلیز بوون. ڕژێمی سەربەخۆو دامودەزگای تایبەتیو کابینەی وەزیرانی دامەزراند، ئەوەی لەبەر نەوتەکەی کەرکوك و دڵی عەجەم و هیوای ڕێك کەوتن لەگەڵ تورکدا بۆ ئینگلیز دەستی نە ئەدا. هەر لەبەر ئەوەش بە لای ڕۆژنامەی «تایمس»ی لەندەنی یەوە گێڕانەوەی شێخ مەحمود لە دەسبەسەری تاکە هەڵەی مەندوبی سامی بەریتانی سێر پێرسی کۆکس بوو کە لە ماوەی دووررو



(٢) شێخ مەحمودو ماجید مستەفا لە ئیستگەی شەمەنەفەری کەرکوك
(ساڵی ١٩٢٧)

درێژی کاری هەمە جۆریدا لە ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست کردی.[11]

بۆ ڕاست کردنـــەوەی ئەو «هـەڵـە»یـە فرۆکـەو زرێ پۆش و لیـوی‌و خۆفرۆش دیسان کەوتنەوە پەلاماردانی شێخ و لایەنگرانی. لە ژێر ئەو فشارەدا شێخ ناچار بوو بەرەبەیانی چواری مارتی ساڵی ١٩٢٣، واتە ڕۆژێك دوای بۆمبابارانی شاری سلێمانی، بداتەوە شاخ.

لەو ساوە نیشتمانپەروەرانی کورد بە ڕابەری شێخ مەحمود کەوتنەوە زۆرانبـــازی لەگــەڵ هێـــزەکـــانی ئینگلیـــزدا کە بێ بەزەیی دەستیـــان دەوەشـــانـد. فرۆکـەکـانی ئینگلیـز خاکی کوردستـانیـان کردە شوێنی تاقی کـردنـەوەی چەك و تفـاقی نوێ.[12] هەرچـەندە ئینگلیز بەو جۆرە توانی‌یان شێخ و لایەنگرانی سەرەتا لە جاسەنەو دەوروبەری‌و دوایی لە پێنجوینیش دەرپەڕێنن، بەڵام ئەوە نەبووە هۆی تەواوبوونی بەرگری‌ی ئازادیخـوایـانی کورد. لەبـەر ئەوە داگیـرکەران ناچار بوون دیسان پەنا بەرنەوە بەر گفت و گۆ.

دوای چەند دیدەنی‌و هاتوچۆیەك و دوای ئەوەی شۆڕشگێران بۆ دوا جار ڕۆژی بیستی نیســـانی ساڵی ١٩٢٧ پێنجــوینیـان لەدەست چوو شێــخ مەحمــود ناچــار بوو لە ناوەنـدی حوزەیـرانی هەر ئەو ساڵـەدا ڕێـك کەوتننـامـەیـەك لەگـەڵ میـری مۆر بکات کە بە پێی بەندەکانی پەیمـانی دا لە گونـدی پیـرانی کوردستـانی ئێـران نیشتـەجێ بێ‌و بێ ڕەزامـەنـدی کاربـەدەستـان نەیـەتە ناو خاکی عیراقەوەو دەست نەخاتە کاروباری‌یەوە، بەرامبەر گێڕانەوەی موڵکەکانی‌و ڕێگەدان بە گەڕانەوەی ژمـارەیـەك لە لایـەنگـرانی‌و ناردنی بابە عەلی‌ی کوڕی بۆ خوێندن لە بەغدا کە دیارە کاربەدەستان ویستویانە بیکەنە نیمچە بارمتەیەك.

هەمووی چەند مانگێکی نەخایاند کاتێك شێخ مەحمود لەم نیمچە ڕێك کەوتنە، کە بۆ خۆی بوو نەك بۆ کورد، پاشگەز بۆوە. دیسان خولیای هەڵسانەوەو ڕاپەڕین بۆ مافی کورد داوێتیەوە لە کەلەی. یەکێك لە نزیکـەکـانی شێـخ بۆ مێـژ وونـووسی شارەزا عەبدولڕەزاق حەسەنی گێـڕاوەتـەوە چۆن ئەو ساکـە شێـخ لە نامەیەکی تایبەتی‌ی خۆیدا بۆی نووسیوە نیازی‌یە سنوور ببڕێ‌و دیسان بێتەوە ناو خاکی عیراق ئەگەر زانیوی‌یە ئەو کارەی «دەبێتە هۆی لە سێدارەدانی».[13]

لەوە دەچێ ئەم هەواڵە بە گەرم و گوڕی گەیشتبێتەوە فەیسەڵی یەکەم. بە دەم و دووی ئەو ناسیـــاوەی شێخـــد و دەرئـەکـەوێ هەر بۆ خۆی هەواڵـەکـەی بە فەیســەڵ گەیـانـدبێتـەوە. چونکـە نە وەڵامی شێخدا بە دڵسۆزی ڕاوێژی کردووە بە تایبەتی دەنگی خۆی نگەییبێتەوە.



(٣) وێنەیەکی دەگمەن کە شێخ مەحمودو فەهمی سەعیدی کۆکردوتەوە (ساڵی ١٩٢٨)

فەیسەڵی یەکەم پیاوێکی دووربین بوو، لەو ڕۆژانەدا لە سەرانسەری ڕۆژهەڵاتی نزیك و ناوەڕاستدا کەم کەس لە سیاسەتبازیدا دەیتوانی شان لە شانی بدا. ئەو ساڵانەش یەکجار بەپەرۆش بوو عیراق هێمن و ئاسودە بنوێنێ تا وەکو لە «کۆمەڵەی نەتەوەکان»[١٦] بە ئەندام وەرگیرێ. هەمووی دوو سێ ساڵ لەوەوپێش پەیمانی دابووە ئەو دەزگا جیهانی یە گشت داخوازی یە ڕەواکانی گەلی کورد جێ بەجێ بکات. جا بۆ ئەوەی بەربەستی هەراوبگرێکی نوێ بکات سەرەتای ساڵی ١٩٢٨ بێ ئەوەی ئینگلیز پێ بزانن لە ڕێگەی فەهمی سەعیدەوە پێوەندی لەگەڵ شێخ مەحمود دەکات. فەیسەڵی یەکەم کرداری وای کەم نەبوو. ئەو هەنگاوەش پێویست بوو، چونکە ئینگلیزەکان هێمنی عیراقیان مەبەست نەبوو، ئەوان دەیانویست قەیمومەتی[١٧] خۆیان ڕۆژێك زیاتر درێژە بسێنێ.

لە هەموو ڕوویەکەوە فەهمی سەعید کەسێکی لەبار بوو بۆ جێ بەجێ کردنی ئەو ڕاسپاردەیە. فەیسەڵی یەکەم لە ساڵی ١٩١٩ وە فەهمی سەعیدی دەناسی، ئەو ساکە کە ئەو پاشای شام بوو فەهمی سەعید ڕابەری کەرتی شێرهەڵگرانی یاساوڵی تایبەتی ی کۆشك بوو. دوای ڕوخانی ئەو ڕژێمە بە دەستی فەرەنسەیی یەکان و دانانی فەیسەڵ بە پاشای عیراق فەهمی سەعیدیش گەڕایەوە عیراق و بووە ئەفسەری لەشکری تازە دامەزراوی وڵات. فەیسەڵی یەکەم بەشی زۆری ئەفسەرانی ئەو لەشکرەی دەناسی چونکە کاتی خۆی بەشداری شۆڕشەکەی شەریف حسەینی باوکی بوون و گەلێکیان هەر لە ژێر فەرماندەی خۆی و کەمێکیان لە ژێر فەرماندەی میر عەبدوڵلای برایدا بوون. فەیسەڵ بۆ خۆی چاودێری ئەو ئەفسەرانەی دەکردو بایەخی دەدایە کاروباری تایبەتی و هەڵس وکەوتیان. لەبەر ئەوەش کە ژمارەیان کەم بوو ئەو کارە ئاسان مەیسەر دەبوو.

ویرای ئەوە فەهمی سەعید هەر زوو سەرنجی جەعفەر عەسکەری ی یەکەم وەزیری بەرگری ی لە مێژ ووی عیراقی هاوچەرخدا ڕاکێشا، جەعفەر هێند خوشی دەوی بێ سێ و دوو خزمێکی خۆی لێ مارەو لە ماڵی خۆی شایی ژن هێنانی بۆ ئەکات. لە ڕێگەی جەعفەر عەسکەریشەوە فەیسەڵی یەکەم زیاتر شارەزای فەهمی سەعید دەبێ. کەم کەس وەك جەعفەر عەسکەری جێگەی بڕواو متمانەی فەیسەڵ بوو.[١٨]

وێرای هەموو ئەمانە فەهمی سەعید کوردی دەزانی،[١٩] خزم و ناسیاوی لە ناوچەی سلێمانی زۆر بوو، شارەزای کون و کەلەبەری بوو، بۆیەکا دەیتوانی خۆی بە تەنها ئەوەی فەیسەڵی یەکەم دەیویست بەجێ بگەیێنێ. بۆ خۆشی بڕوای بە سیاسەتی فەیسەڵ بوو، هێند خۆشی دەویست دوا کوڕی خۆی بە ناوی ئەوەوە ناو نا کە ئێستە جێگری شایانی باوکی و دڵسۆزو وەفاداری خاڵوانێتی.[٢٠]

بۆ ئەوەی ئەو کارە تا سەر بە نهێنی بچێتە سەر فەهمی سەعید کانوونی دووەمی ساڵی ١٩٢٨ دوو مانگ لەسەر یەك ئیجازە وەردەگرێ، نە بەر لەو جارەو نە دوای ئەو جارە فەهمی سەعید ئیجازەی وای وەرنەگرتووە.[٢١] لەو ماوەیەدا دوو جار بە جلی سیویلەوە دەچێتە خزمەت شێخ مەحمود، گفتوگۆی بە ناوی فەیسەڵەوە لەگەڵ ئەکات. لە کورد شێخ حەمە غەریب و ماجید مستەفاو مەحمود عەتتاری ژ ن برای شێخ ئاگاداری ئەو دیدەنی و گفتوگۆیە بوون. جاری دووەم لەسەر داوای شێخ مەحمود وێنەگری تایبەتی دەبەن، جا یا بۆ یادگار، یا بۆ بەڵگە وێنەیەك دەگرن. هەرچۆن بێ ئێمە وێنەیەکی دەگمەنمان دەستکەوتووە کە شێخ مەحمودو فەهمی سەعیدی تێدایە وا لەگەڵ ئەم وتارەدا بڵاوی دەکەینەوە. لە پشتی وێنەکە بە کوردی و بە قەڵەمی رەش نووسراوە: «رسمی جنابی شیخ محمود. هیأتی عمومی. یا الله هر خوشبێ. ١٩٢٨».[٢٢]

وا پێ دەچێ ئەم دیدەنی یە بێ ئەنجام بووبێ، چونکە فەیسەڵی یەکەم داواکانی شێخ مەحمودی پێ زۆر بووە. هەر لەبەر ئەوەش کێشەی کورد بێ چارەسەر مایەوەو زۆری نەخایاند دیسان لە شێوەی تەقینەوەیەکی گەورەدا خۆی نواندەوە.

هەرچۆن بێ ئەم سەرەتا گرنگە پێوەندی یەکی نزیکی لە نێوان شێخ مەحمودو فەهمی سەعیدا دروست کرد کە لە سی یەکان و سەرەتای چلەکان و رۆژانی راپەرینی مایسدا رەنگی خۆی دایەوەو زیاتر ئەوە دەسەلمێنێ کە دەبێ جۆرە رێك کەوتنێك لە نێوانی شێخ و فەهمی سەعیدا هەبووبێ، هەرچەندە بێ رێك کەوتنیکی وەهاش هیچ رێی تێ ناچێ گەڕانەوەی شێخ مەحمود بۆ کوردستان بە فیتی ئینگلیز بووبێ، ئەگەر وابوایە هیچ رێی تێ نە ئەچو کوردستان وا بە گەرمی بۆ پشتگیری ی راپەرینی مایس بێتە کایەوە، چونکە ئەو رۆژگارە، واتە سەرەتای چلەکان، بزوتنەوەی نەتەوەیی کوردو لایەنگرانی «شێخی بەردە قارەمان» هێندیان لە باردا بوو بتوانن، گەر بیانویستایە، بەر بەستی ئەو هەڵچونە گشتی یەی کوردستان بۆ پشتگیری ی راپەرینی مایس بکەن، یا هیچ نەبێ لە مەودای فراوانی کەم بکەنەوە. بوونی ژمارەیەکی زۆر لە کاربەدەستی ناحەزی راپەرینی مایس لە ناوچە کوردەواری یەکان جێبەجێ کردنی ئەو کارەی ئاسانتر دەکرد.

شایانی باسە کاتێك دەنگو باوی گەڕانەوەی شێخ مەحمود کەوتۆتە دەم خەڵکی هەموان، بە رەش و رووتی کوردستانەوە، کەوتوونە باسی ئەوەی چۆن شێخ دیسان بۆ شەڕی ئینگلیز هاتۆتەوە. برای چیرۆکنووس مستەفا ساڵح کەریم لە نامەیەکی تایبەتی ی خۆیدا، کە چەند سەرنجێکی وردو بەکەڵکی لەسەر وتاری بڵاوکراوەی «لاپەڕەیەکی ون لە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود»ی تێدا تۆمار کردووە، لەم بارەیەوە بۆی نووسیوم دەڵێ:

«لە بیرمە پۆلی سێیەمی سەرەتایی بووم، تاقی کردنەوەی سەری



(٤) ماجید مستەفا سەرەتای بیستەکان، ئەو کاتەی ئەفسەری لەشکری کوردستان بوو

ساڵمان نەکرا، وتیان حەربی رەشید عالی یە. باوکم بۆ دیدەنی ماڵی باپیرەم بردمی بۆ وێڵەدەر... کە چووینە وێڵەدەر سەرەتای حوزەیران بوو،... ئەو رۆژەی ئێمە گەیشتینە وێڵەدەر گەلێ چەکدارم دەبینی بە رانك و چۆغەی جوان و شەرواڵ و مرادخانی و قەدە فیشەك و دەمانچەی لاقەدیانەوە دەهاتن و دەچوون... سەیر ئەوە بوو هەندێکیان (خەتی سەربازی) یەکەیان بە دەرزی سنجاق لە چۆغەکانیان دابوو. منالانی هاو تەمەنم دەیانگوت ئەوانە چەتەی شێخ مەحمودن. دوای دوو رۆژ کە چووینە خزمەت باپیرەم چونکە باوکم خوێندەوار بوو، لە شت دەگەیشت باپیرەم لێی پرسی: دەنگو باسی ئەو پیاوانە چی یە دەڵێن هاتوونەتە ئاوایی. باوکم پێی وت: قوربان شێخ لە بەغداوە رای کردووەو هاتۆتە داری کەلی، وا لە هەموو لایەکەوە پیاوان بە خۆیان و بە چەکیانەوە لە دەوری گرد دەبنەوە، بە قسەی قادر ئاغای سپیارە (رەنگە زۆر لەو ناوەش دڵنیا نەبم چونکە تەمەنم بە هیچ حاڵ لە نۆ ساڵ تێپەڕ نەبوبو، بەڵام زیتەڵە بووم، زوو شتم وەردەگرت) شێخ نیازی هەرایەکی تری هەیە دژی ئینگلیزەکان، باپیرەم کە لە کۆنەوە تێکەڵاوی ماڵی شێخان بوو هەناسەیەکی هەڵکێشاو گوتی: خوا دەست بە باڵی بگرێ و کاك ئەحمەدی شێخ پشتیوانی بێ و نوشوستی نەهێنێ».[٢٣]

وا دیـاره کوردی کفـری و دەوروبەری، تایبەت دەلۆییەکان کە هەمیشە شوێنیـان لە بزوتنـەوەی ڕزگاریخوای کوردا دیارو پێوەندی‌یان لەگەڵ شێخ مەحمـودا نزیـك بووە، بە هەمـان دەستوور بیریان کردۆتەوە. دانیشتوانی کفـریش بە گەرمی، چ بە خۆنیشـاندان و چ بە بروسکەو کاری‌تر، پشتی ڕاپـەڕینی مایسیـان گرتووە. ئەو سـەردەمە ڕووناکبیرانی کفری زۆر داخ لە دڵ بوون، جارو بار نارەزایی و سکـالای دڵی خۆیـان لەسـەر لاپـەڕەی ڕۆژنامەکانی بەغدای پایتەخت دەردەبری.[٢٤]

ژمـارەیـەك ڕاستی نوێ دیسـان ئەوە دەسـەلمێنن کە وروژانی هەولێرو دەوروبەری لە ڕۆژانی ڕاپەڕینی مایسدا، چ لە ناوخودی کوردستان و چ لە سـەرانسـەری عیـراق، کەم هاوتـا بوو. وەك جاری پێشـوو باسمان کرد ژمـارەی گیـراوانی هەولێـر لەسـەر ڕاپـەڕینی مایس لە ژمارەی هەر کام لە شارەکانی تری عیراق، بەغدای پایتەختی لێ دەرکەی، زیاتر بوو. بەلام ئەوەی بایـەخی مێـژوویی تایبـەتی خۆی هەیـە لەم ڕووەوە ئەوەیـە کە بەشێکی زۆر لەو گیراوانە یا ئەندامی «هیوا»، یا لایەنگری بوون. بە وێنە ڕوستـەم جەبیـارو فەتـاح جەبیـارو نازمی سەعید ئاغا لە «هیوا»دا بوون، دواییش بوونەتە ئەندامی «ڕزگاری».[٢٥]

یەکێـك لەو ڕوونـاکبیـرانـەی هەولێـر کە دەوری دیـاری لە هانـدان و وروژاندنی جەماوەری ئەو شارەدا هەبووە بەڕێوەبەری قوتابخانەی دووەمی سەرەتـایی شێـخ حەسـەن نیعمـەتولـلا بووە، کە بە حەسـەن ئەفـەندی شۆرەتی دەرکردووە. وەك دەگێرنەوە ئەم پیاوە دەوری زۆر بووە بۆ هاندانی دانیشتـوانی هەولێـر کە ئوتـومبێلی سالـح زەکی بەگی صاحێبقـران بسـووتێنن. کە ڕۆژی چواردەی مایسی ١٩٤١ فڕۆکـەکـانی ئینگلیـز بۆ یەکـەم جار هاتنـە سەر شاری هەولێـر[٢٦] خەلکی پێیـان وابـوو فڕۆکـەی ئەلـمـانیـان. بۆیـەش زۆر بە گەرمی، بە دەم چەپلەڕێزانەوە پێشوازی‌یان کردن. بەلام کاتێـك ئەو فڕۆکـانـە کەوتنـە بۆمبـابارانی بارەگای لەشکری عیـراقی لە قەراغ شارو زانـرا فڕۆکەی ئینگلیزن نەك ئەلەمان، عەشاماتی شار بە جارێـك خرۆشـان و شێـخ حەسـەن ئەفـەنـدی هێنـدەی تر بزوانـدوونی. لەو وتـارەیـدا کە لەوێـدا بۆی هاتـووە داوای لە دانیشتوانی هەولێر کردووە «ئاگرێك بکەنەوە لە لەندەنەوە دیار بێ». شێخ حەسەنیش یەکێـك بووە لەوانـەی دوای دامـرکـانـدنـەوەی ڕاپەڕینەکە گیراون، پاش ماوەیەك لە هەولێر گوێزراوەتەوە.[٢٧]

خوالێخـۆشبـوو عیـززەدین فەیـزی لە یادداشتـەکەیدا وێنەیەکی وردی شێخ حەسەن نیعمەتوڵلای بۆ کێشاوین[٢٨] کە بایەخی زۆرە بۆ ئەم باسەی ئێمـە، چونکـە بەلگـەیـەکی تری سروشتی ڕزگاریخوای دژ بە ئینگلیزی هەڵچـوونی کوردەواری‌ی لای خۆمـانـە لە کاتی ڕاپـەڕینی مایسـدا. عیززەددین فەیزی دەڵێ:

«لـە سانی ١٩٣٩ ـ ١٩٤٠ لە قوتـابخانەی دووەمی هەولێر بە ماموستا دامـەزرام. بەڕێـوەبـەری قوتـابخانەکە ماموستا شێخ حەسـەن نیعمەتوڵلا بوو. پیـاوێکی دڵســۆزو چالاك بوو. زۆر ڕقی لە ئینگلیـز دەبـووەوە. کە شۆڕشی مایس لە سالی ١٩٤١ لە عیراقدا بەرپا بوو، عیراق دژ بە ئینگلیز وەستـاو دۆستـایـەتی لەگـەڵ ئەلەمان پەیدا کرد، شێخ حەسەن هەستێکی کوردایـەتی هەبـوو، دەیـزانی هەر کارەسـاتێـك کە بەسەر کورد هاتبێ لە ڕووی ئینگلیـزەوەیـە. لەبـەر ئەوە خۆی بە دۆستی ئەلەمان و دژ بە ئینگلیز دادەنـا. چەنـد خۆپیشـانـدانێکی قوتـابیـان لەم شارەدا کرا، زۆربەی بە سەرپەرشتی شێخ بوو...».[٢٩]

پڕۆپـاگـەنـدەی نازی کاری زۆری کردبـووە سەر گەلێك لەوانەی وەك شێخ حەسەن بیریان دەکردەوە. بەشێکی زۆری ئەو پڕۆپاگەندەیە لە دیوی ئێـرانـەوە دەهـات. ئەو ساکـە خاکی ئێـران، بە کوردستـانی‌یـەوە، ببووە گۆڕەپـانێکی بەرفـراوان و بەرکـراوەی چالاکی نازی. بەپێی ئەو ژمارانەی دوکتـۆر ڕەحیمی قازی لە نامـەی دوکتۆراکەیدا هێناونی‌یەوە سێ هەزار لەو چوار هەزار ئەلەمانەی بەر لە شەڕی دووەمی جیهان لە ئێران بوون لە ناوچە ئازەری و کوردەواری‌یـەکـان کاریـان دەکرد. ئەو ڕۆژانە فەردریك هۆمێتی نازی خۆی گەیـانـدبووە ناو ڕیزی ژمارەیەك هۆزی ناوداری کوردەوە.[٣٠] بەپێی بەلگـەیـەکی دیپلۆمـاسی‌ی نهێنی عیـراقی هەر ئەو دەوروبـەرە دانسـازی ئەلـەمـانی دوکتـۆر ئاین لوز لە کرمـانشاو دەوروبەری چالاکی خۆی دەنـوانـد.[٣١] ئەو ساکـە پزیشکی تایبەتی تانانەت ڕەزا شا خۆیشی دوکتۆرێکی ئەلمانی بوو.

ئاریچێتی ئەم جۆرە کەسانەو باسی بایەخ پێدانی بێ ئەندازەی هیتلەر بە «ڕزگارکردنی نەتەوە ئاری‌یەکان» هەموو سنوورێکی بڕیبو. بەڵێ دەبوو هیتـلەر بۆ ئەم باسـە گەلێـك بەپـەرۆش بێ (!!)، چونکـە بەپێی پڕۆپاگەندەی نازی‌یەکان خوێنی هیچ نەتەوەیەکی ئاری نەژادی جیهان بە ڕادەی خوێنی ئاری‌یەکانی ئێران خاوێن نەبوو، گوایە نیسبەتی ئەو خوێنە لە ناو ئەوانـدا سێ هێنـدی نیسبـەتی‌یـە لە ناو تەنـانـەت ئەلـەمانەکانیش خۆیاندا (!!).[٣٢] جا وەرە کوردی ساکاری لێ قەوماوی بێ مافی ژین و ژیـان قسـەی لەم بابـەتـە بەر پەردەی گوێی بکەوێ... نازی‌یەکانیش، وەك ئاشکرایە، زۆر وەستا بوون لە بزواندنی هەستی خەلکدا، دەیانزانی ئەوی مەبەستیانە چۆن دەیگەیێننە مێشکیان.[٣٣]

ئەوی ڕۆژانی ڕاپـەڕینی مایس لە کوردستـان ڕووی دابـوو هەمـووی گەیشتبـۆوە دەم ئینگلیـز. دوای دامرکاندنەوەی ئەو ڕاپەڕینە کاربەدەستانی ئینگلیـز بە دەم هەڕەشـەوە گلەیی خۆیـان گەیـاندۆتەوە شێخ عەلائەددینی نەقشەبەندی لە بیارە، ئەمیش بە ناچاری شێخ عوسمانی کوڕە گەورەی بۆ عوزرخـوایی ناردۆتـە لای ئینگلیزەکان لە کەرکوك. شێخ عوسمان پێکەوە لەگەڵ سەید ئەحمەدی خانەقا دەچنە لای گەورەیەکی ئینگلیز لەوێ.[٣٤] لە مەیانی ڕازو گلەییدا کابرای ئینگلیز دەڵێ:


٧ ـ فتوى العلامة الكبير السيد علاء الدين النقشبندي .

علاء الدين العثماني

رئيس الطريقتين النقشبندية والقادرية

بيارة ـ حلبجة ـ العراق

٧ی فتواکەی شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی بە خەتی خۆی

**«جێگەی شێخ ئێوە هەموو لایەک ئێستا ڕاست بووەتەوە.**
**دەروێشەکانت بە دەف لێدانەوە هەڵپەڕکێ دەکرد:**

**لا اله الا الله**

**ئینگلیز بشکێ ئینشەللا**

بەلام ئێوە دەبێ باش لەوە بگەن هەر کات شێخ عەلائەددین بیەوێ لە زەمینەوە بومان بێ ئێمە لە ئاسمانەوە بۆی دێین»، دیارە مەبەستی بووە بڵێ بە فڕۆکە بۆمبابارانتان دەکەین.[٣٥]

ڕابەرانی ڕاپەڕینی مایس لە هەموو ئەو فەتوایانەی پیاوە ئایینییەکانی کوردستان دژی ئینگلیز دابویان زیاتر بایەخیان دایە ئەو فەتوایەی ڕۆژی نوێی نیسانی ساڵی ١٩٤١ شێخ عەلائەددینی نەقشبەندی دەری کرد. ئەوان بە نیازی زیاتر وروژاندنی هەستی جەماوەر لەو صەدان فەتوایەی لەو ڕۆژانەدا دەرچوون[٣٦] تەنها سیازدە فەتوایان هەڵبژاردو دەستوبرد لە نامیلکەیەکی سەربەخۆی بیست و هەشت لاپەرەیدا بە دەستوخەتی خاوەنەکانیان بڵاویان کردنەوە.[٣٧] حەوتەمین فەتوایان فەتواکەی شێخ عەلائەددینە کە لە لاپەڕە نۆزدەی نامیلکەکەدا بەم جۆرە پێشکەش کراوە:

«٧ ـ فتـوى العـلامـة الكبـير السيد علاءالـدين النقشبنـدي. علاءالـدين العثـماني رئيس الطريقتين النقشبندية والقادرية. بيارة. حلبجة. العراق. في ١٣٦٠/٤/٩» (بڕوانە وێنەکەی).

پێوەندیی نزیکی ڕەشید عالی گەیلانی لەگەڵ ژمارەیەکی زۆر لە ناسراوانی کوردستان کاری کردە سەر هەڵوێستیان بەرامبەر ڕاپەڕینی مایس. بەر لە ساڵی ١٩٤١ بە ماوەیەك ڕەشـید عالیو هاوبـیرانـی پێوەندییان بە ژمارەیەك سەرەك هۆزی کوردو عەرەبەوە کرد بە نیازی نانەوەی ئاژاوەیەکی فراوان بۆ خستنی یەکەم وەزارەتی عەلی جەودەت ئەییوبی کە ناحەزی بوون و بێ ڕەزامەندیی ئەوان ڕ ۆژی بیستو حەوتی ئابی ساڵی ١٩٣٤ دامەزرابوو.[٣٨]

کار بەوەوە نەوەستا. هەمووی حەفتەیەکی نەبرد دوای ئەوەی یاسین هاشمیی هاوڕێو هاو بیری نزیکی ڕەشید عالی گەیلانی ڕۆژی حەڤدەی مارتی ساڵی ١٩٣٥ دووەم کابینەی خۆی دامەزراند کاتێك وەفدێکی یەکجار گەورەی هۆزە کوردەکان بە ٦٠ ئوتومبیل بۆ دەربڕینی پشتگیریی کابینەی نوێ، کە ڕەشید عالی وەزیری کاروباری ناوخۆ بوو تیدا، هاتە بەغدا. لەو وتارەیدا کە فایق تاڵەبانی بە ناوی ئەندامانی وەفدەکەوە لە بەردەم سەرەك وەزیراندا خوێندیەوە گوتی:

«ئەم دەستەیەی وان لە بەردەم ئێوەی شکۆداراو نوێنەری ڕاستەقینەی هۆزەکانی کەرکوك و هەولێرو سلێمانیو موسڵ و دیالەن بە هاندانی دەزگا ناوچەییەکان، وەك باوە، نەهاتوون، لە خۆیانەوە بۆ پیرۆزبایتان هاتوون، بۆ ئەوە هاتوون بروای کورگەلی باکوور بە وەزارەتی پایە بڵندتان ڕابگەیێنن...».[٣٩]

لەو کتێبەیدا کە بە ناوی «مێژوو سبەی دەستی پێ نەکردووە»وە ساڵی ١٩٨٨ بڵاوی کردۆتەوە دوکتۆر نەجمەددین سەهرەوەردیی سکرتێری تایبەتیو زاوای ڕەشید عالی گەیلانیو بەشداری ڕاپەڕینی مایس و یەکێك لە دەربەدەرەکانی دوای دامرکاندنەوەی باسی پێوەندیی خەزووری بە کوردەوە بەم جۆرە کردووە:

«... لەبەر دوو هۆی سەرەکی کوردەکان بە چاوی ڕێزەوە سەیری ڕەشید عالی گەیلانییان دەکرد. یەکەمیان لەبەر پایەی ئایینی وەك نەوەی شێخ عەبدو لقادری گەیلانی کە کورد وەك ئیمام باوەڕیان پێیەو دەیپەرستن. دووەمیان ئەوەیە کە ڕەشید عالی لەگەڵیان ڕاستگۆ بوو، لە کاروباری کارگێڕیدا پشتی پێ دەبەستن و لە ڕۆژگاری فەرمانڕەوایی ئەو دا زۆربەی متصرەفەکان کورد بوون. هەروەها ژمارەیەکی زۆریان ئەفسەری لەشکرو پۆلیس بوون. لە ناوچەکانی باشوور دا ڕەشید عالی بە تایبەتی ئیعتیمادی دەکردە سەر متصریفە کوردەکان».[٤٠]



(٦) وێنەی شێخ عەلائەددین لە تەمەنی ٦٥ ساڵیدا، ساڵی ١٩٣٥ گیراوە

ئەم قسانەی سەهرەوەردی پێوەندی‌ی کۆنی ڕەشید عالی گەیلانی بە کوردەوە نیشان دەدەن، ئەو پێوەندی‌یەی، وەك وتمان، ڕۆژانی ڕاپەڕینی مایس ڕەنگی خۆی دایەوە. بەلاّم لەگەڵ ئەوەشدا پێویستە ئەوە بڵێین کە دانانی کورد بە متصرف لە شارەکانی باشوور بەر لەهەر شتێکی تر بەشێك بوو لە یاری‌یە زیرەکەکانی فەیسەڵی یەکەم.

بەو کارەی فەیسەڵ بە تیرێك دوو نیشانی دەشکاند. بەشی زۆری ئەو متصرفانە، وەك ماجید مستەفاو ساڵح زەکی بەگی صاحێبقران، لەوانە بوون کە لە بزوتنەوەی کوردایەتیدا بەشداری‌یان کردبوو، کوردایەتی لە مێشکیانا کنەی ئەکرد. فەیسەڵی یەکەم دەیویست بەو جۆرە، وەك «دیلی بەڕێز» لە کوردستانیان دووربخاتەوە. هەمان کات ئەوانە خوێندەواری چاك و کۆنە ئەفسەری شارەزاو لێهاتوو بوون، دەیانتوانی لە کاوباری کارگێریدا خزمەتی چاك بە دەوڵەت بگەیێنن، ئەوساکەش عیراقی تازە دامەزراو پێویستی بەو جۆرە پیاوە لێهاتووانە زۆر بوو.

سەهرەوەردی ڕاستی‌یەکی زۆر لەوەیش گرنگتری بۆ تۆمار کردووین. لە هەمان شوێنی کتێبە گەورەکەیدا[٤١] کە دێتە سەر باسی ئەو هۆیانەی پاڵیان ناوە بە سەرکردایەتی ڕاپەڕینی مایسەوە بیر لەوە بکەنەوە بنکەی بەرگری لە بەغداوە بگوێزرێتەوە ناوچەکانی باکوور نووسیوی‌یە دەڵێ:

«لەو هۆ یاریدەرانەی دەبوو ببنە ماکی بەردەوام بوونی بەرگری ئەوە بوو کە دانیشتوانی کوردی باکوور لە شەڕو بەرهەڵستی‌ی ئینگلیز دا لە هەرە ئازاو دڵسۆزەکان بوون، هەڵوەستیان یەکجار شەرفمەند بوو، هەرچەندە بزووتنەوەی جیاخوازی کورد[٤٢] لە عیراق بە سەرکردایەتی شێخ مەحمود لە ساڵی ١٩٣٢وە دەستی پێ کردبوو».[٤٣]

سەهرەوەردی، وەك وتمان، بە وێژدانانە لێرەدا دانی بە ڕاستی‌یەکی بایەخداردا ناوە ، بەلاّم لەگەڵ ئەوەش دیسان کەوتۆتە چەند هەڵەیەکەوە کە نابێ هەر وا بەسەریاندا تێپەڕین. یەکەمیان ئەوەیە کە مێژووی خەباتی شێخ مەحمود زۆر لە ساڵی ١٩٣٢ کۆنترە. شێخ مەحمود بەر لە شەڕی یەکەمی جیهان و ڕوخانی دەوڵەتی عوسمانی، واتە بەر لە دامەزراندنی دەوڵەتی عیراق بە گەلێك ساڵ هاتۆتە کۆڕی خەباتەوە. ئەو ساڵی ١٩١٩ دروشمی سەربەخۆیی دژی ئینگلیز هەڵگرت، واتە دوو ساڵ و چەند مانگێك بەر لەوەی ڕژێمی پاشایی لە وڵاتدا دامەزرێ.[٤٤] ئەو سەردەمەش هەموو گەلانی ناو دەوڵەتی ڕوخاوی عوسمانی عەودالی سەربەخۆیی بوون. بەلاّم دوای ئەوەبە ماوەیەك هەموو کۆششی شێخ مەحمود بۆ مسۆگەر کردنی خودموختاری‌یەکی ڕێك و پێك بوو. بۆ جێبەجێ کردنی ئەو مەبەستە شێخ ئامادە بوو لەگەڵ ئینگلیزدا ڕێك کەوێ، تەواو پێچەوانەی ئەو ڕا هەڵەیەی لە ناو زۆر کەسدا باوە کە گوایە شێخ لە کورت بینی‌یەوە هەمیشە ڕقەبەری ئینگلیزی کردووە. ئەوەتا ئینگلیزەکان لەو ڕاپۆرتە تایبەتی‌یەیاندا کە داویانەتە «کۆمەڵەی نەتەوەکان» کاتێك باسی ئەوە دەکەن چۆن شێخ مەحمود سەرەتای ساڵی ١٩٢٣ شێخ قادری برای ناردە کەرکوك و داوای کردووە کۆنگرەیەکی تایبەتی لە نوێنەرانی ئینگلیزو کوردو کاربەدەستانی بەغدا ببەسترێ بۆ دیارکردنی خودموختاری بۆ کورد، بەلاّم ئەوان ئەو پێشنیارەیان ڕەت کردۆتەوە گوایە لەبەر ئەوەی «هێشتا دوا ڕۆژی ویلایەتی مووسڵ ئاشکرا نی‌یە».[٤٥]

وا دیارە سەهرەوەردیش، وەك گەلێك نووسەری تر، دروست لە سروشتی بزوتنەوەی جیا خوازی نەگەیشتووە.[٤٦] لە ڕووی زانستەوە دوو جۆر بزوتنەوەی جیا خوازی هەیە، یەکێکیان ڕەوایەو لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا دەگونجێ، ئەوی تریان نا ڕەوایەو لەگەڵ ڕەوتی مێژوودا ناگونجێ. بە وێنە عەرەبی ناو دەوڵەتی عوسمانی تا ساڵی ١٩١٦ جیا خواز نەبوون، جیابوونەوەیان لە ئەستەموول نە ئەویست، ئەو پەڕەکەی



(٧) شێخی بەردە قارەمان

داوای (لامرکزی)و خود موختاری‌یان دەکرد. بەلام سیاسەتی کورتبینی ئیتیحادی‌یەکان و فشاری نەتەوەیی بێ ئەندازەیان ناچاری کردن خەبات بۆ جیابوونەوەو تەنانەت هاریکاریی ئینگلیزیش بۆ ئەو مەبەستە بکەن بێ ئەوەی مێژوو بتوانێ هیچ حوکمێکی خراپیان بە سەردا بدا.

کەچی گەر لە سویسرە هەمان کات بزوتنەوەیەکی لەو بابەتە لە ناو ئیتالی‌یەکاندا، کە لە صەدا شازدەی دانیشتوانی ئەو ولاتە پێك دێنن، دروست بوایە بە هەنگاوێکی کۆنەپەرست دادەنرا. چونکە ئیتالی‌یەکان وەك هەموو گەلانی ناو سویسرە تەواوی مافی کۆمەلایەتی و ئابووری‌و رۆوناکبیری‌و سیاسی‌ی خۆیان هەیەو لە هیچیان کەم نی‌یەو سەربەخۆیی ولاتەکەیان بە راستی هی هەموویانە، بۆیەکا جیابوونەوەیان زیانی هەیە نەك قازانج. هەر لەبەر ئەوەش ئیتالیایی‌یەك، یا ئەلەمانی‌یەکی ناو سویسرە هەرگیز بیر لە جیابوونەوە ناکات.

بە هەمان دەستوورو لەبەر هەمان هۆ زۆربەی هەرە زۆری ئەو چەند ملیۆن ئیتالیایی‌یەی لە ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا دەژین بە دڵ و بە گیان دژی مۆسۆلینی‌و ئیتالیای فاشی وەستان چونکە بیروباوەری فاشیزم زیانی دەبەخشی بە سەربەخۆیی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکاو ئەوانیش لە هەموو رووێکی نەتەوەیی‌یەوە لە ژێر سایەی ئەو سەربەخۆییەدا حەواونەتەوە.

نموونەیەکی لەوەیش سەیرتر. لەبەر فشاری نارەوای ئینگلیز بزوتنەوەی جیاخوازی ئەو یەك دوو ملیۆن کەسەی ئایرلەندەی باکوور رەوایە، کەچی کەسێك گوێی لە دەنگی ئەو پازدە شازدە ملیۆن ئایرلەندی‌یەی ولاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا نی‌یە چونکە لە هیچ بێ‌بەری نین. هەلبەت ئەوی تینووی نەبێ داوای ئاو ناکات!!

لەو سالانەدا کە سەهرەوەردی باسیان دەکات بزوتنەوەی جیاخوازی لە ناو کوردی عیراقدا لە هەموو پارچەکانی تری کوردستان لاوازتر بوو، ئەویش تەنها لەبەر ئەوەی بارو دۆخی ولات و خەباتی کورد کارێکی ئەوتۆیان کردبوو ئەوان، بە پێچەوانەی کوردی ئیران و تورکیاوە، بە بەشێك لە مافە رەواکانی خۆیان بگەن.

بێ‌گومان گەر سەرکرد یەتی راپەرینی مایس بە وردی لەم لایەنە گرنگە بگەیشتایە دەیتوانی هێندەی تر پاڵ بە کوردەوە بنێ بۆ کۆری خەبات، چونکە هەموو ناسراوو رووناکبیرانی کوردی ئەو رۆژگارە باوەریان بە سەرکردایەتی راپەرینی مایس نەبوو. هەبوون پێیان وابوو دەبێ کورد کەلك لەو هەل و مەرجە وەربگرێ کە بەهۆی راپەرینی مایسەوە هاتبووە گۆری‌و بە دڵ دەیانویست رابەرانی کورد لەگەل ئینگلیز رێك بکەون بەلکە لەو رێگەوە شتێك بۆ گەلەکەیان مسۆگەر بکەن. هی وایان هەبوو بۆ ئەو مەبەستە بە تایبەتی پێوەندی‌ی بە شێخ مەحمودەوە کردبوو. لە سلێمانی جم وجۆلێکی هەست پێ‌کراو کەوتبووە ناو ئەو جۆرە کەسانەوە.

لەگەل ئەوەش ئینجا کورد لە کاتی راپەرینی مایسدا هیچ درێغی‌یەکی نەکردو وەك سەهرەوەردی دەلێ بە شەرەفەوە ئەرکی سەر شانی خۆی راگەیاند. ئەوەش بۆ خۆی یەکێکە لە دەرسە بایەخدارەکانی مێژووی هاو چەرخی عیراق. ئەوانەش کە دەیانەوێ

ـە ڕۆژی زۆرداره‌کی کورد له‌که‌دار بکه‌ن له‌ ناماقوڵی به‌ولاوه‌ هیچی تری بۆ نامێنێته‌وه‌.

تێبینی:

---

به‌ نیازی ئه‌وه‌ی لایه‌نه‌کانی باسه‌که‌مان زیاتر بۆ ڕوون ببێته‌وه‌ ڕۆژی پێنجی مایسی ١٩٨٩ پێوه‌ندیمان له‌گه‌ڵ ئه‌حمه‌د خواجا کرد که‌، وه‌ك ئاشکرایه‌، یه‌کێك بوو له‌ نزیکه‌کانی شێخ مه‌حمودو دوای ڕێك که‌وتنه‌که‌ی ساڵی ١٩٢٧ ئه‌ویش له‌گه‌ڵ بابه‌ عه‌لی هاته‌ به‌غدا. به‌پێی گێڕانه‌وه‌ی خاوه‌نی «چیم دی» شێخ مه‌حمود ساڵی ١٩٢٨ هاتۆته‌ به‌غداو دیده‌نی فه‌یسه‌ڵی یه‌که‌می کردووه‌. که‌وا بێ ده‌بێ چوونه‌کانی فه‌همی سه‌عید ڕێگه‌یان بۆ ئه‌و زیاره‌ته‌ی شێخ مه‌حمود خۆش کردبێ. دوور نی‌یه‌ ئه‌و وێنه‌یه‌ش که‌ بلاومان کردۆته‌وه‌ هه‌ر ئه‌و سه‌رده‌مه‌ گیرابێت، چونکه‌ ئه‌حمه‌د عوسمان که‌ ئه‌و کاته‌ متصرفی سلیمانی بووه‌ له‌گه‌ڵ شێخدا هاتۆته‌ به‌غدا.

دیسان به‌ پێی گێڕانه‌وه‌ی خاوه‌نی «چیم دی» ڕه‌شید عالی گه‌یلانی ڕێزی تایبه‌تی‌ی بۆ شێخ مه‌حمود هه‌بووه‌و وه‌ك ده‌ڵێ به‌ ئاگاداری خۆی له‌ کاتی ڕاپه‌ڕینی مایسدا پێوه‌ندی‌ی پێوه‌ کردووه‌. ئه‌مه‌ش به‌ڵگه‌یه‌کی تره‌ بۆ به‌ درۆخستنه‌وه‌ی ئه‌و تۆمه‌ته‌ی دراوه‌ته‌ پاڵ شێخ.

به‌ داخه‌وه‌ به‌ ته‌واوی بۆمان ساغ نه‌بۆوه‌ فه‌همی سه‌عید ئه‌و دوو جاره‌ له‌ کوێ شێخ مه‌حمودی بینیوه‌. جاری یه‌که‌میان وا دیاره‌ له‌ شاخ بووه‌، به‌ڵام جاری دووه‌م دوور نی‌یه‌ له‌ سلێمانی خۆی یه‌کتریان دیبی. تا ئێسته‌ش به‌ ته‌واوه‌تی بۆمان ساغ نه‌بۆته‌وه‌ ئه‌و وێنه‌یه‌ی له‌گه‌ڵ ئه‌م وتاره‌ دا بلاومان کردۆته‌وه‌ له‌ کوێ گیراوه‌و هه‌موو ئه‌وانه‌ی تێیدا ده‌رچوون کێن. دانیشتووه‌کان له‌ ده‌سته‌ چه‌په‌وه‌ شێخ حه‌مه‌ غه‌ریب و شێخ مه‌حمودو ئه‌حمه‌د عوسمانن، ڕیزی پێشه‌وه‌ی ڕاوه‌ستاوه‌کانیش ئه‌مان له‌ ده‌سته‌ چه‌په‌وه‌ فه‌همی سه‌عیدو دوکتور حه‌مدی ناوچی ماجید مسته‌فان، چواره‌میان له‌وانه‌یه‌ ڕه‌شه‌ی شێخه‌ڵی یا شێخ قادری سه‌ید ئه‌حمه‌دی خانه‌قا بێ. نازانین ئه‌وه‌ی لای ده‌ستی ڕاست کێ‌یه‌. دوانه‌که‌ی پشته‌وه‌ له‌وه‌ ده‌کات له‌ چه‌کدارانی شێخ بن.

## په‌راوێز:

(١) دار الكتب والوثائق (د. ك. و.)، الوحدة الوثائقية: البلاط الملكي، رقم الملف ١٦٣، عنوان الملف «الحرب العراقية البريطانية»، الوثيقة رقم ٤٠.

(2) W.S. Churchill, The Second World War, Vol. 3, London, 1950, p.225.

(٣) بۆ درێژه‌ی ئه‌م باسانه‌ بڕوانه‌:

عبدالرزاق الحسني، الاسرار الخفية في حركة السنة ١٩٤١ التحررية، الطبعة الثانية، صيدا ـ لبنان، ١٩٦٤، ص١٧٢، ١٧٤، ١٨٤، ١٩٧ ـ ١٩٨، ٢٠١...

(٤) ده‌رباره‌یان بڕوانه‌:

عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الخامس، الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص٢٨٨ ـ ٢٨٩.

(٥) ته‌نها ده‌ستکاری ڕێنووسه‌که‌یمان کردووه‌ بۆ ئه‌وه‌ی به‌ ئاسانی بخوێنرێته‌وه‌.

(٦) ڕاسته‌که‌ی (لێڤی)یه‌، له‌ (Levy) ی ئینگلیزی‌یه‌وه‌ وه‌رگیراوه‌ که‌ به‌ مانای سه‌ربازی‌و سه‌ربازگرتن و کۆکردنه‌وه‌ی سه‌ربازو ئه‌و جۆرانه‌ دێ. کاتێك ئینگلیزه‌کان عیراقیان داگیرکرد هێزی لێڤی‌یان دامه‌زراند که‌ کوردو عه‌ره‌بیش تێیدا به‌شدار بوون، به‌ڵام زۆربه‌یان ئاشووری بوون. لێڤی دارده‌ستێکی خراپ بوو بۆ لێدانی نیشتمانپه‌روه‌ران. دوای وه‌رگرتنی سه‌ربه‌خۆیی به‌ ماوه‌یه‌ك ئینگلیزه‌کان پاشماوه‌ی ئه‌و هێزه‌یان برده‌ بنکه‌کانیان له‌ حه‌بانی‌یه‌و شوعه‌یبه‌.

(٧) محمود الدرة، الحرب العرقية البريطانية ١٩٤١، بيروت، ١٩٦٩، ص٢٩١.

(٨) هه‌مان سه‌رچاوه‌، ل١٢٦.

(٩) «مذكرات الشهيد العقيد الركن صلاح الدين الصباغ. فرسان العروبة في العراق»، بلا، ص٢٢.

(١٠) ڕوپی ئه‌و پاره‌ هندی‌یه‌یه‌ که‌ ئینگلیز له‌گه‌ڵ داگیرکردنی عیراقدا له‌ بریتی پاره‌ی عوسمانی خستیانه‌ بازاره‌وه‌و تا ده‌رچوونی دیناروورده‌ی عیراقی له‌ ساڵی ١٩٣٢ دا مایه‌وه‌. به‌پێی نرخی بانق هه‌ر صه‌د هه‌زار ڕوپی ده‌یکرده‌ ٧٤٤٨ پاوه‌نی ئیسته‌رلینی، واته‌ ڕوپی یه‌ك نزیکه‌ی ٧٥ فلس بوو. تا په‌نجاکانیش له‌ناو کورده‌واریدا ڕوپی وه‌ك ناوی پاره‌ به‌کار ده‌هێنرا، ده‌گوترا نرخی ئه‌و شته‌ دوو یا سێ یاچوار ڕوپی‌یه‌.

(١١) بڕوانه‌: «Zaria Vostoka», 28.V, 1931

(12) C.J. Edmonds, Kurds, Turks and Arabs. Politics travel and research in North - Eastern Iraq, London, 1957, p.350.

(١٣) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث، الطبعة السابعة، بغداد ١٩٨٨، ص١٣٢.

(١٤) وا دیاره‌ ئه‌و ناسیاوه‌ی شێخ مه‌حمود حه‌زی نه‌کردووه‌ ناوی بهێنرێ، بۆیه‌ حه‌سه‌نی تا چاپی حه‌وته‌می «تأريخ الوزارات»ه‌ به‌ ناوبانگه‌که‌ی ئه‌و ناوه‌ی هه‌ر وا به‌ نهێنی هێشته‌وه‌، هه‌رچه‌نده‌ به‌ جۆرێکی زیره‌کانه‌، له‌ ناو دووتوێی قسه‌کانیدا، په‌نجه‌ی بۆ ڕاکێشاوه‌، چونکه‌ ده‌ڵێ: «فنصحه هذا المعروف...». که‌ لێمان پرسی وتی مه‌به‌ستم مارف جیاوکه‌. حه‌سه‌نی له‌ نزیکه‌وه‌ پێوه‌ندی‌ی له‌گه‌ڵ مارف جیاوکدا هه‌بوو.

(١٥) عبدالرزاق الحسني، تأريخ الوزارات العراقية، الجزء الثالث،

الطبعة السابعة، بغداد، ١٩٨٨، ص ١٣٢ .

(١٦) عصبة الامم .

(١٧) الأنتداب .

(١٨) لەو عیـراقی یـانـەی کە لە زووەوە کاریـان لەگـەڵ کردبـوو جەعفـەر عەسکـەری یەکـەم کەس بوو فەیسـەڵی یەکـەم تەشـرینی دووەمی سـاڵی ١٩٢٣ کردی بە سەرەك وەزیران . جەعفەر بەر لە نوری سەعید بە شەش ساڵ و چوار مانگ و رۆژێك کابینەی خۆی دامەزراند .

(١٩) رۆژنامەی «الثورة» لە ژمارەی رۆژی دووی مایسی ١٩٨٨دا باسی کوردی زانینی فەهمی سەعیدی کردووە .

(٢٠) فەیسـەڵ فەهمی سەعیـد لە زۆر شوێن بە شانـازی یـەوە باسی خاڵـوانی باوکی ئەکـات، لەو کۆرە تایبـەتی یـەشـدا کە مایسی ١٩٨٩ زانکـۆی مستنصـریة رێکی خست فەیسەڵ دیـان ئەو باسەی کردبوو. لە رۆژنامەکانیشدا پەنجەی بۆ راکێشاوە (بروانە: «الثورة»، ٢ مایس ١٩٨٩).

(٢١) «دفتر خدمة العقيد فهمي سعيد»، السجل ٢١ خيالة س/ح/١٤٢ .

(٢٢) وەك خۆی نووسیـومـەتـەوە، تەنهـا چوکلەکـانی سەروشـەی «خۆشبی»م دانا تا بە دروستی بخوێنرێتەوە .

(٢٣) نامەکە رۆژی حەڤدەی نیسـانی ١٩٨٩ نووسراوە .

(٢٤) بە وێنە بروانە :

«العالم العربي»، ٢٦كانون الثاني ١٩٣٨ .

(٢٥) دیدەنی لەگەڵ ساڵح حەیدەری رۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٨٩ .

(٢٦) فرۆکەکانی ئینگلیز دوو جار بارەگای لەشکریان لە هەولێر بۆمبابارانکرد، جاری یەکـەمیـان رۆژی چواردەو جاری دووەمیـان رۆژی پازدەی مایس بوو. کەس نەوبومبـارانـەدا نە کوژرا، بەلام رۆژی یەکـەم دوو فرۆکـەی عیـراقی پێـوە بوون . ئەوکاتـە ئەمین رەوانـدوزی فەرمـانـدەی بارەگای لەشکر بوو لە هەولێر .

(٢٧) دیدەنی لەگەڵ ساڵح حەیدەری رۆژی ٢٠ی نیسانی ١٩٨٩

(٢٨) برای چیرۆکنووس مستەفا ساڵح کەریم سەرنجی بۆ ئەم راستییە راکێشام .

(٢٩) «یـادی عیزەددین فەیزی»، ئامادەکردنی سۆران عیزەددین فەیزی، هەولێر، ١٩٨٨، ل٨٩ .

(30) R.G. Gazi, Kurdistanskaya Democraticheskaya Partia - organizator i rukovaditel Natsionalno - osvoboditelnovo dvijenia v Iranskom Kurdistane (1945 - 1946 gg.), Baku, 1954, pp. 134 - 136.

(٣١) د. ك. و. ، الـوحـدة الوثائقية : البلاط الملكي، ٤٩٨٧/ ٣١١، الـوثيقـة رقم ١٠٣، ص١٥٨، الـموضـوع : تقرير القنصلية العراقية في تبـريز الى وزارة الخارجية العراقية، المرقم ٢٩٢ ،٢ ،٢ ،٩٦، والمؤرخ ١١/أيلول /١٩٣٩

(32) D.N. Wilber, Contemporary Iran, New York, 1963, p.76

(٣٣) بۆ درێژەی ئەم باسە بروانە :

نصيف جاسم عبـاس الأحبـابي ، العـلاقـات بين إيـران وانمـانيا النازية (١٩٣٣ ـ ١٩٤٥)، رسـالـة ماجستير غير منشورة، كلية الاداب ـ جامعة بغداد، ١٩٨٩ .

(٣٤) هەوڵمان دا لەرێگەی بەرێز شێخ ئەمینی نەقشـبەندی‌یەوە ناوی ئەو ئینگلیزە بزانین، بەلام وا دیارە شێخ عوسمانی کاکی ناوەکەی لە یاد کردووە .

(٣٥) دیـدەنی لەگـەڵ شێـخ ئەمینی شێـخ عەلائـەددینی نەقشەبەندی، رۆژی چواردەی مایسی ١٩٨٩ .

(٣٦) لە ورۆژانەدا تەنانەت مەلای گوندەکانیش فەتوایان دەردەکرد .

(٣٧) ئەو نامیلکـەیـە لە کتێبخـانـە گشتی یـەکـانـدا دەست ناکەوێ . ئەو دانـەیـەی لای شێـخ ئەمینی نەقشـەبـەنـدی‌یـە بێ بەرگـە . لەسەر یەکەم لاپـەرەی نووسـراوە «الاهـداء الـى الـعـرب والـمسلمين في أنحـاء المعمـورة» . دەبێ مانگی مایسی ١٩٤١ لە بەغـدا چاپ کرابێ ، دیـارە دوای دامرکاندنەوەی راپەرینەکە ژمارەکانی کۆکراونەتەوەو فەوتێنراون .

(٣٨) عبـدالـرزاق الحسني ، تأريـخ الـوزارات العراقية ، الجزء الرابع ، الطبعة السابعة ، بغداد ، ١٩٨٨ ، ص٢٨ ، ٥٠ .

(٣٩) هەمان سەرچاوە، ل٨٠، ٨٦ ـ ٨٧ .

(٤٠) نجم الدين السهروردي ، التأريخ لم يبدأ غدا . حقائق وأسرار عن ثورتي رشيـد عالي الگيـلاني ١٤و٨٥ في العـراق ، الـدوحـة ـ قطـر ، ١٩٨٨، ص١٢٥ .

(٤١) کتێبـەکـەی دوکتـۆر نەجمـەددین سەهـرەوەردی ١٢٥ لاپـەرەیـەو هەرچـەنـدە لە کەم و کورتی وهەڵـەی گەورە بێ بـەش نی یـە، بەلام بۆ لێکـدانـەوەی گەلێـك لایەنی مێژووی هاوچەرخی عیراق سەرچاوەیەکی رەسـەن و بەکـەڵکـە ، تایبـەت لەبـەر ئەوەی گەلێـك شوێنی بریتین لە یادداشتەکانی رەشید عالی گەیلانی .

(٤٢) دەقی قسەکەی سەهرەوەردی وایە : «حركة الاكراد الانفصالية» .

(٤٣) نجم الدين السهروردي، المصدر السابق، ص١٢٥ .

(٤٤) ٢٣ی ئابی سـاڵی ١٩٢١ فەیسـەڵی یەکەم کرایە پاشای عیراق .

(45) «Iraq. Report on Irag Administration, April 1922 - Marsh 1923», London, 1924, p.40.

(٤٦) زۆر کەس نارەواو بێ ئەوەی بە وردی لە ناوەرۆکـی باسـەکـەو سروشتی بزوتنەوەی جیاخوازی بگەن لە خۆرا ئەو تۆمەتە دەدەنە پاڵ هەموو بزوتنەوەیەکی کوردایەتی .

# حقائق جديدة عن موقع الكرد في إنتفاضة مايس ١٩٤١

د. كمال مظهر احمد

كلية الاداب - جامعة بغداد

بعد نشر بحثنا المعنون «صفحة مجهولة من تأريخ نضال الشيخ محمود. حول دور الكرد في انتفاضة مايس ١٩٤١» في العدد ١٢١ من مجلة «روشنبيرى نوى» (ص ١٦٢ - ١٨٨) عثرنا على مجموعة من الحقائق، والمعلومات الجديدة التي تعززما ورد من استنتاجات فيه. فان بداية العلاقات بين الشيخ محمود والعقيد الركن فهمي سعيد تعود الى مطلع العام ١٩٢٨، حين كلف الملك فيصل الأول الأخير للاتصال بالشيخ محمود بصورة سرية لايجاد لغة للتفاهم معه بعد ان نمت الى سمعه خطط الشيخ محمود للدخول ثانية الى الأراضي العراقية من مقره في قرية پيران الايرانية بهدف تحرك جديد، في وقت كان فيصل حريصاً أشد الحرص على ان يبدو العراق مستقراً، الأمر الذي كان يعد شرطاً مهماً يؤهله للدخول في «عصبة الامم».

وعلى العكس من ذلك أدى تاريخ علاقات رشيد عالي الگيلاني، رئيس الحكومة تلك، دوره في دفع العديد من متنفذي كردستان الى الوقوف الى جانب الانتفاضة. فقبل العام ١٩٤١ صبح الگيلاني على أوثق العلاقات بعدد كبير من اولئك المتنفذين الذين اعتمد عليهم كثيراً في لعبة الصراع من اجل السلطة، التي غدت تؤلف واحدة من السمات الأساسية لتأريخ العراق السياسي في المرحلة التي اتبعت وفاة الملك فيصل الأول عام ١٩٣٣، والتي استمرت على مدى سنوات عديدة. وباعتراف سكرتير رشيد عالي الخاص، وزوج ابنته، وأحد مشاركي انتفاضة مايس نجم الدين السهروردي في الصفحة ١٢٥ من كتابه المعنون «التأريخ لم يبدأ غداً» (الدوحة، ١٩٨٨) ان احد الاسباب التي كانت تدفع قيادة الانتفاضة الى التفكير في نقل مركز مقاومة الغزاة من العاصمة بغداد الى المنطقة الشمالية ارتبط

دشن هذا اللقاء الأول بين القطبين بداية مهمة في علاقاتهما التي تطورت بسرعة في السنوات اللاحقة بصورة هيأت الطريق لتعاونهما أيام انتفاضة مايس ١٩٤١.

وتبين مجموعة من الحقائق الجديدة ان أربيل كانت من اكثر المدن العراقية تحمساً للانتفاضة فعلاً. واغلب الظن انها تحتل الموقع الثاني بعد العاصمة بغداد في هذا المضمار. بحيث لم يتمكن الانگليز وأنصارهم من ان يجدوا سنداً فاعلاً لهم بين أهلها، شأنهم في ذلك شأن أهل المناطق الكردية الاخرى. وتبدو عزلة هؤلاء عن الأوساط الكردية في تلك الايام من اسلوب صياغة البيان الذي نشره الوصي باللغة الكردية، والقته الطائرات البريطانية على مدن كردستان قبيل سقوط «حكومة الدفاع الوطني» بايام قليلة.

بحقيقة «ان سكان الشمال من الأكراد كانوا اكثر الناس شجاعة وولاء في المعارك ضد الانگليز، حيث كان موقفهم مشرفاً جداً. . ».

تؤكد الحقائق الجديدة، مع غيرها، ان ابناء الشعب الكردي أدوا واجبهم الوطني بحماس كبير أيام انتفاضة مايس ١٩٤١، مما يؤلف صفحة مهمة في تأريخ العراق المعاصر. وفي رأينا ان الذين يحاولون تشويه دور الكرد في الانتفاضة، وموقفه منها يقفون في خندق واحد مع اولئك الذين لم يبخلوا في كيل التهم للعقداء الاربعة الذين، وان كانوا ساسة غير بعيدي النظر، الا انهم كانوا ابطالا في وطنيتهم.

# شارەزوور لە ڕوانگەی سێ بابەتی مێژوویی دا

هاشم کاکەیی

لەم لێکۆڵینەوەیەدا هەوڵی ئەوەم داوە، چەند بابەتێك ڕوون بکەمەوە لەو بابەتە مێژوویی یانەی کە پەیوەندی‌یان بە ڕۆژگاری شارەزوورەوە هەیە. باسەکە بریتی‌یە لە پوختەیەکی مێژووی (شارەزوور - نیم ئەز ڕا)ی‌و لایەنی سەرهەڵدانی فەلسەفەی سۆفی‌گەری‌و ناودارانی ئەم ناوچەیە، هەروەها شی‌کردنەوەی پەیوەندی شارەزوور لە ڕوانگەی نوسراوەکانی هەندێ نووسەرو مێژووناسی کوردو دەرخستنی پەیوەندی نوسراوەکانیان بە هۆزی کوردی (کاکەیی)یەوەو، دیاری کردنی بیروڕاو بۆچوونەکانیان لەم بارەیەوە. شایانی باسیشە ئەم لێکۆڵینەوەیە لە ساڵی (١٩٨٦) هاتووەتە نووسین و تا ئێستا بڵاو نەکراوەتەوە.

أ - شارەزوور:

---

ئەگەر ئاوڕێك لە مێژووی ڕۆژگاری دێرینی ئەم ناوچەیەی شارەزوور، بە گوێرەی ئەم نوسراوانەی کە بە درێژایی مێژوو پێمان گەیشتووە بدەین، بۆمان دەردەکەوێ شارەزوور ناوی پایتەختی ناوچەیەکی فراوانی کوردستان بووەو، لە زۆربەی سەردەمی جۆراو جۆرەکانی مێژوودا ناوی براوە. وا بە پێی توانا دەست بۆ بڕێ سەرچاوە درێژ دەکەین کە باسی مێژووی (شارەزوور)مان بۆ دەگێڕنەوە. پاشان ڕاو بۆچوونەکانی خۆمان و بڕێکیان دەست نیشان دەکەین. بەوەی کە شوێنەواری دێرینی (خورماڵ - گوڵ عومەر) بریتی‌بووە لەو شارەی لە مێژوودا پێی وتراوە (نیم ئەز ڕا)ی، واتە (شارەزوور). ئاشکرایە لە ئەنجامی پێك هاتنی جۆرەها (دەرتەنگ)و (دەربەند)ی وەك (دەربەندی بازیان)و (دەربەندی باسەرە)و (دەربەندی سەگرمە)و (دەربەندی‌خان)و دەرتەنگی (چرچەقەڵا)و (پەیکوڵی)، لە زنجیرە چیاکانی زاگرۆس دا، هەر لە بەرەبەیانی مێژووەوە، گەلی (لۆلۆیی)یەکان لە «سلێمانی - زاموا Zamua واتە وڵاتی لۆلۆیی‌یەکان»[1] بوون و لەم دەربەندو دەرتەنگانەدا دەژیان و قەڵاو شوورەی پتەویان دروست دەکردو هەندێ جاریش ڕێگەیان لە کاروانی (ئەکەدی)و (ئاشور)ی دەگرت و پەلاماریان دەدان.[2] مێژووی (شارەزوور)یش هەر ئەم ناوچەیەی گەلانی لۆلۆیی‌و گۆتی‌یەکان دەگرێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ سەردەمی ئاشوری‌یەکان و ناوەندی (زاموا)ی وڵاتی لۆلۆیی‌و لە ڕۆژگاری دەسەڵاتی (ئاشور ناسرپاڵی دووەم - سەدەی دەیەمی پ ز)دا، گەلی لۆلۆیی‌یەکانی تێدا ژیاوە.[3] لە کاتی هێرشەکەی (نارام سینی ئەکەدی / ٢٢٦٠ - ٢٢٢٣ پ ز) بۆ سەر وڵاتی لۆلۆ، لۆلۆیی‌یەکان پەنایان بردە بەر چیاکانی (قەرەداخ)، بۆ ناو شورەو قەڵاکانی (پەیکوڵی)و (چرچەقەڵا)و لەوانەشە لۆلۆیی‌یەکان کاتێ لە پێش سوپای (نارام سین) کشانەوە ڕوویان کردبێتە ناو (قۆیی)، بۆیە نارام سین فرمان دەداتە سوپاکەی بە خستنە خوارەوەی بەدیل گیراوەکانی لۆلۆیی‌یەکان لە سەروی (قۆیی)یەوە، وەکو لە پەیکەرە تاشراوەکەی (دەربەندی گاور)دا دەبینرێت.[4]

بە هۆی ئەو کنەو پشکنینانەی لە تەپۆڵکەکانی ناوچەی شارەزووردا کراون، بۆ شوێنەوارناسان دەرکەوتووە، کە (شیوی شارەزوور) لە سەردەمێکی زۆر کۆنەوە ئاوەدان کراوەتەوەو مرۆڤی تێدا ژیاوەو، پاشماوەی شوێنەواری نیشتەجێ بوونی مرۆڤی ئەو سەردەمانەی لێ دۆزراوەتەوە کە دەگەڕێنەوە بۆ سەردەمەکانی پێش مێژوو، لەگەڵ سەردەمە مێژوویی‌یەکانی (ئەکەدی، ئاشوری، ساسانی، دەسەڵاتی موسڵمانانی عەرەب)، واش دەرکەوتووە هەموو کاتێ ئەم شیوەی شارەزوور شوێنێکی پەسەندی نیشتەجێ‌بوون بووە، بە هۆی

ـیت وفەری زەوی‌و سەرچاوەی ئاوو بەرهەمی هەمەجۆری. . .[5]

وشـەی شارەزوور لە سـەرچـاوەكـانی (سـریـان)دا لە نیوان سالآنی ::: ـ ٦٠٥ز)، بە شێـوەی (سیــرزڤــر ـ سیــارزور) هاتــووە، كە ـریـی‌یەكانی ئەم دەمەش بەم جۆرەیان وەرگێڕاوەتەوە (شـەهر زڤر).[6] ـە كرنمەی (ئەردەشێری پاپكان)یش، بە شێوەی (سیاهـ لژڤل)، یان ـیـرژور) هاتـووە.[7] جگـە لەمـانـەش (هیراكلیوس)یش بە شێوەی ـب زۆرون)، یان (سیار سۆرون)ی نوسیوەتەوە. . .[8] دكتۆر (جمال ـتیـە) دەڵێ: ئەم هەموو ناولێ‌نانەش لە ڕاستی‌دا واتای (ڕەزی تریێ ـی ـ چر ـ) دەگەیێنێت، ئەمەش بە هۆی ئەو گۆڕانكاری‌یەی بەسەر ـتی یەكـەمی ناوەكـەدا هاتـووە، واتـا (سپیتا ـ Spita) ی (میدی) كە ـەرتەی (سپی) دێت، كە پاشان گۆڕاوە بۆ (سیتا) ـ Seta) و پاشان بۆ ـیـە Sea) و لە دوایی‌دا بۆ (سیە) كە چووەتە سەر ناو لێنانەكەی ـارەزوور)[9]

ـەڵام مامـۆسـتـا (تـۆفـیـق وەهبی) دەڵێ: «شـارەزوور ناوێكی ـكـراوەیـە لەسـەر شێوەی (گردەبۆر)و واتای نزمەشار، هەرێمی نزم» ـیت و ئەم ناو لێ‌نانەش بە تەواوی لەگەڵ شێوەی تۆبۆگرافی (شیوی ـارەزوور)دا دەگونجێت. .»[10]

دەتوانین بڵێین ئەو شارو وڵاتەی بە (شارەزوور) ناسراو بووە، لە مێـژوودا، ئەم حكـومـەتانەی وەكو (شاشوری)و (میدی)و (پشدادی)و (ئەخمینی)و پاشان (ئەسكەندەر ـ لە سەدەی چوارەمی پ ز)و ئەوجا حكومەتی (پرثی ـ ئەشكانی)یەكانی ئێرانی لە سەدەی دووەمی پ ز)و پاشان حكومەتی (ساسانی)و تا هاتنی دەسەڵاتی موسڵمانانی عەرەب ـە (٢١ك/ ٦٤٣ز)و،[11] تاكـو كۆتـایی خەلافـەتی عەبـاسـی‌یـەكـان و كەوتنی شاری (بـەغـداد)و هەتـاكو هاتنی حكومەتی عوسمانی‌یەكان، هەر جارەی یەكێ لەم حكـومـەتـانـە جڵەوی شارەزووریـان دەكـەوێتە دەست و ئەگەر چی كوردەكان خۆشیان فەرمانڕەوایی شارەزوور بوونە ـە نێوان ماوەی فەرمانڕەوایی ئەو حكومەتانەدا.

(شارەزوور)و ڕووداوەكانی:

---

**لە مێژە شارەزوور ئاوەدان كراوەتەوەو بە شوێنێكی گرنگ ناسراوە، لەبەرئەوەی خاوەن دەشت و زەوی‌یەیكی پان وبەرینی ڕەنگ سووری بەپیت وفەڕ بووەو، پڕ چەم و ڕووبارو كانی‌و تەپۆلكەو شاخ و دەربەندو دەرتەنگ و ئاتەشگەدەو، مزگەوت و تەكیەو خانەقاو زاناو دانای زیرەك و ڕێگـا ڕوونـاك كەرەوە، قەڵاو لادێی دڵگیـرو ئاو هەوای سازگـارو پڕ لە بەرو بووم و هەرزانی بووە. . ناوچـەكـە بە درێـژایی مێـژووی گەلێ شین و زاری‌و تالآن و كوشتنی‌و كاول بوونی بە خۆیەوە بینیوە، هەموو جۆرە داگیــركـەرێـك چاوی لێ بڕی بووە بۆ خۆژیـانـدنی بە دارایی‌و داهاتی ئەم وڵاتە دێرینە، داگیركەرانی مەغۆلی‌و عوسمانی‌و پاشایانی ئێـرانــی لە هەمــوو داگــیـركــەرو تالآنــكــەرێــك پتــر**

زیانیان پێ‌گـەیانـدووەو هەمیـشە هەوڵی ئەوەیان داوە ناوچەكە بكەنە جێگەو شانۆی شەڕو شۆڕیان و بتوانن دەستی بە سەردا بگرن، بەڵام خەلكی ناوچـەكـەو سەرۆكـەكـانیان ملیان بۆ بیگـانـەو داگـیركەران دانـەنواندووە، هەموو كاتێ ویـستوویانە سەر بەرز بن چەشنی سەر بەرزی چیا پیرۆزەكانی (شەعران ـ هەورامان)و (شندروێ)و (بالامو)و (پیرە مەگروون)و (داڵەهۆ). ئەگەر لایەك لە شیوو دۆڵ و ئەشكەوت و تەپۆلكەو تەلای ناوچەو شوێنەكانی وەك (قەلای نارین ـ خورمان)و (یاسـین تەپە)و (بەكراوا) بدرێتەوەو بپشكێندرێت و لاپەڕە كۆنەكانی هەڵبـدرێتـەوە، لەوانـەیە هەر پارچـە گۆزەو كوپـەلـەیێك و بەردێكی پیرزێ. . بیرەوەری‌و بەسـەرهـاتی ڕۆژگارو سەردەمێكی ناوچەكەی بەخۆیەوە هەڵگرتبێت و یادگاری‌یەكی لەسەر تۆمار كرابێت!.

لە ساڵی (٦٢٧ز)، (شـــارەزوور) تووشی بەڵاو وێرانكـاری‌یەكی خراپ دێت، بەهۆی ئەو جەنگەی كە لە نیوانی سوپای (هەرقل)و (خوسرەوی پەروێز) ڕووی‌دا، لە نزیكی شاری (نەینەوا)ی دێرین. لەبــەر ئەوەی (هــەرقـل) مینـەی (خـوسـرەوی) دەكـرد لە ڕێگـەی (شـارەزوور)ەوە، بۆیە مانگی شوبـاتی ساڵی (٦٢٨ز) لە شارەزوور بەسەربردو بەربووە تالآن و وێرانكاری‌و سووتاندنی‌و تا ساڵی (١٨ك/ ٦٣٩ز) شارەزوور لەژێر دەسەڵاتی (ڕۆمەكان)دا دەبێت.[12]

لە ساڵی (٢١ك/ ٦٤٢ز) لە سەردەمی خەلیفە (عمر)دا، (عزرە بن قیس) كە بە سەر شاری (حـلوان)دا ڕادەگـەیشـت، نێردرایە سەر (شـارەزوور) لەبـەر ئەوەی (شـارەزووری‌یەكـان) باج و خەراجیان بە دەوڵەتی ئیسلام نەدەدا،[13] ئەو كارەی بۆ ئەنجام نەدرا. بۆیە (عتبة بن فرقد)یان، بە سوپایەكی گەورە نارده سەر (شارەزوور)و لە پاش كوژرانـی خەڵكێكی زۆر لە هەردوو لاو مردنی پیاوانی موسڵمان بە هۆی دوپشك پێوەدانیانەوە ـ دوپشكی بەناوبانگی عەربەتی شارەزوور ـ توانی‌یان داگـیری بكـەن و لەم مێژووەوە شارەزوور چووەتـە ژێر دەسەڵاتی موسڵمانانی عەرەب و خۆی‌و دێهاتەكانی سەر بە (موسڵ) بوونـە، تا لە كۆتـایی خەلافـەتی (هـارون الـرشید)دا، لێی جودا كراوەتەوە.[14] لە ساڵەكانی (٣٨ك/ ٦٥٨ز) بەم لاوە، كۆمەڵێك لە یاخی‌بـووان (الخـوارج). دژی ئیمامی عەلی (خ.ر)، لە بزووتنەوە بەرپاكردن و جەنگ دا بوون، هەندێ جار كە دەشكان، گرو گرو لەم یاخی‌بـوانـە پەنـایان دەهێنایە بەر ناوچە سەخت و شاخاوی‌یەكانی كوردستان، بە تایبەتی شاری (شـارەزوور). دەبینین هەر لەم ساڵەدا (٣٨ك)، (أبو مریم الـسعدي التیمي) ناوێك و گرۆیەك لە یارانی پەنا دەبەنە (شارەزوور)و،[15] لە ساڵی (٤١ك/ ٦٦١ ـ ٦٦٢ز)دا، (فروة

بن نوفل الأشجعي) لەگەڵ پێنج صەد سواردا، کە دەستیان لە کوشتار کردنی ئیمامی عەلی‌و یارانی هەڵ گرتبوون، ڕوویان کردوەتە (شارەزوور)و،[16] هەر لەم ساڵەش دا، وا ڕێك دەکەوێ کە (فروة بن نوفل الاشجعي)، لە (مغیرة بن شعبة) هەڵ گەڕێتەوەو بە دەستی (شبث بن ربعي) یاخود (معقل بن قیس) ناوێك، لە (شارەزوور)دا لە نێو ببرێت.[17]

لە ساڵی (٧٦ك/ ٦٩٣ز) لە سەردەمی (الحجاج بن یوسف الثقفي)دا، سەرۆکی یاخی‌بووان (شبیب الخارجي)، بزووتنەوەی دژی حەجاج دەست پێ‌کردو حەجاجیش سوپایەکی بە فەرماندەی (عبدالرحمن بن محمد بن الأشعث) بۆ سەرکوت کردنی ناردو سوپاکە بە شوێنی‌یەوە بوو، ئەمیش خۆی گەیاندە شارەکانی (دقوقاء - تاوغ)و (شارەزوور).[18]

لە ساڵی (١٢٧ك/ ٧٤٠ز) لە پاش مردنی (سعید بن بهدل الشیباني) کە دەستی کردە بزووتنەوە لە سەردەمی (یزید بن الولید بن عبدالملك) ئەمەوی‌و دووصەد کەسی خەڵکی (جزیرە)و (ضحاك بن قیس الشیباني) لەگەڵ دابو، لەپاش مردنی (سعید بهدل) ئەو خەڵکە (ضحاك الشیباني)یان، هەڵ بژارد بەدەم ڕاستی‌یان و ڕوویان کردە (موسڵ)و پاشان (شارەزوور)و خەڵکێکی زۆریان دواکەوت و خۆیان لە چوار هەزار کەس دەدا. ئەوجا هەڵیان کوتایە سەر (یزید بن الولید)و کاربەدەستی (عێراق)و شڕبانیان کرد...»[19]

لە ساڵی (١٢٩ك/ ٧٤٦ - ٧٤٧ز) لە سەردەمی (مروان بن محمد بن مروان)ی دوا خەلیفەی بنەماڵەی (ئەمەوي)، گرۆێك لە یاخی‌بووان بە سەرۆکایەتی (شیبان بن عبدالعزیز الیشکری) پەیدابوون و. (مەروان) پتر لە نۆ مانگ لە گەڵیان دا جەنگی. ئەمانە هەر جارەی کە دەشکان ڕوویان دەکردە شارو شوێنێك، لە جەنگێك دا کە خۆیان لەپێش سوپای مەروان پێ ڕاناگیرێ، لە ناچاری‌و لە برساو لەبەر گرانی، پەنا دەبەنە بەر (شارەزوور) بەهۆی هەرزانی شت ومەکی‌و زۆری بەروبوومی.[20]

لە ساڵی (١٣١ك/ ٧٤٩ز)، (قحطبة بن شبیب)ی سەر بە (عەباسی)یەکان، لە (ابو المسلم الخراساني)یەوە، فەرمانی پێ دەکرێ سی‌هەزار سوار بخاتە ژێر فەرماندەی (أبا عون بن علي)یەوەو ڕەوانەی سەر (شارەزوور)ی بکات کە ئەو کاتە (عثمان بن سفیان)ی سەر لەشکری (عبدالله بن مروان بن محمد) تێی‌دا بوو (أباعون)و (مالك بن طریف الخراساني) کە یەکێ بوو لە سەرکردەی سوپاکانی دین و لە نزیکی (شارەزوور) بە دوو فرسەنگ هەوار دەگرن و لە پاش شەوو ڕۆژێك حەسانەوە، ئەمجا هێرش دەبەنە سەر (عثمان سفیان)و لە بیستی مانگی (ذي الحجة) ساڵی (١٣١ك) سەردەکەون و عثمان دەکوژن. ئەم دەنگوباسی سەرکەوتنەی (أباعون) کاتێك دەگاتە (مروان بن محمد)ی ئەمەوی، ئەوکاتە ئەم لە شاری (حەڕان)دا دەبێ‌و خەڵکی سەربازی شارانی (شام و جزیرەو موسڵ)ی لە گەڵ دا دەبێ‌و (حەڕان) بە جێ دەهێڵێ‌و دەست دەکاتە سەنگەرو کەندەك لێدان هەتا خۆی دەگەیێنێتە (زێی گەورە). (أباعون)یش پاشماوەی مانگی (ذي الحجة ومحرّم)ی ساڵی (١٣٢ك) لە (شارەزوور)دا بەسەر دەبات»[21] لە ڕووداوەکانی ساڵی (١٣٧ك/ ٧٥٥ز) لەپاش ئەوەی عەباسی‌یەکان توانی‌یان بە هۆی (أبو المسلم الخراساني) بەسەر مەروانی‌یەکان دا زاڵ ببن و بێنە سەر تەخت و (شارەزوور)یان دەست کەوێ، لەم ساڵەدا لە دوای چەند ڕوداوێك لە نێوانی (أبو المسلم)و (عەباسی‌یەکان)، (أبو جعفر المنصور)ی خەلیفە هەستا بە کوشتنی ئەبو مسلم لە بەغداو، نوسراوێکی بە دەمی (أبو المسلم) نوسی‌و بە مۆری ئەو مۆری کردو ناردی بۆ (أبو نصر مالك بن الهیثم)و لە نوسراوەکەدا فەرمانی پێ دەکات خۆی کۆکاتەوەو هەرچیشی لەماڵ لا داناوە بیهێنێ‌و بێت بۆ بەغدا. کە نوسراوەکە دەگاتە دەستی (أبو نصر)، بە مۆرەکەی دەزانێ کە (أبو مسلم) ئەمەی نەنووسیوە، لەبەرخۆیەوە دەڵێ: ئەمەشتان کرد! ئەوجا بەرەو (هەمەدان) تێ‌دەقورتێنێ کە ئەویست بچێ بۆ (خۆراسان). لەم لاشەوە (ابو جعفر) نووسراوێکی دی بە دەمی خۆیەوە هەر بۆ ئەم (أبو نصر)ە، دەنێرێ‌و بەڵێنی دەداتێ کە بێکاتە خاوەنی (شارەزوور) - بۆ ئەوەی هەڵ نەیێت - لەهەمان کات دا نامەیەکیش بۆ (زهیر بن الترکي) کاربەدەستی (هەمەدان) دەنێرێ‌و تێی‌دا ڕادەگەیێنێ‌و دەڵێ: ئەگەر (ابو نصر) بەم دەوروبەرەدا تێپەڕی، بیگرەو بەندی بکە. وا ڕێکەوت گرتی‌و بەندی کرد، بەڵام لەم کاتەدا نوسراوەکەی (أبو جعفر) دەگات و بەڵێن نامەی . کردنە خاوەنی (شارەزوور)ی پێ ڕادەگەیێنن. لەبەرئەمە (زهیر الترکي) بەرەڵای دەکات ئەگەرچی خۆشیشی دەویست. کەچی دوای ڕۆژێك بە ئازادکردنی خاوەنی شارەزوور، نامەیێك لە (أبو جعفر) دەگاتە (زهیر)و تێی‌دا دەڵێ: ئەبێ (أبو نصر) بکوژی، ئەویش لە وەڵام دا دەڵێ من ئازادم کرد لەبەرئەوەی کردوتانە بە خاوەنی (شارەزوور)... لەپاش ماوەیێك (ابو جعفر) لێی خۆش دەبێ‌و لەسەر (موسڵ) دادەمەزرێ»[22]

لە ساڵی (١٨٤ك/ ٨٠٠ز) لە زەمانی خەلیفە (هارون الرشید)ی عەباسی‌دا، دیسان (شارەزوور) دەبێتە جێگای گرۆیانی یاخی‌بوون (الخوارج)و لەم ساڵەدا (أبو عمرو الشاري) پەنای پێ دەبات و (زهیر القصاب) دەنێرنە سەری‌و لە (شارەزوور)دا دەیکوژێ.[23]

لە ڕووداوەکانی ساڵی (٢٦٧ك/ ٨٨٠ - ٨٨١ز)ی یاخی‌بووان، لە شاری (موسڵ) ناکۆکی دەکەوێتە نێوانی (هارون الخارجي)و (محمد

ـ خرزاد)ی خارجي، لەپاش کوشتارێکی توند (هارون) هەڵدێو لە تەجلە) دەپەڕێتەوە بەرەو بنەماڵەی عەرەبی (بني تغلب)و ئەوانیش نیە دەنگیەوە، (ابن خرزاد)یش دەکشێتەوە. پاشان هارون دەگەڕێتەوە ـو (حـدیثـة ـ شارێکی نزیك بە موسـڵ)و خەڵکێکی زۆری لێ کۆدەبێتـەوە. دوای ماوەیێك نامـە بۆ یارانی خرزاد دەنـێرێ چونکـە نەیزانی یارانی خرزاد، لە (خـرزاد) بێزار بوونـە بە هۆی ناخۆشی گوزەرانیان لە (شارەزوور) ـ ئەو شارەی دوژمنی خرزاد بوون لە کوردو نەوانی دیو . دەیان هێنێتە ڕیزی خۆیەوە تەنیا هۆزی (الشمردلیة) ـەی ناچن کە دانیشتـووی شارەزوور بوون و لەگـەڵ (خـرزاد) تەمێننەوە. لەو لاشەوە (هارون) هەڵ دەستێ لە شاری موسڵ دا باری ژیـنی خۆیو یارانی چاك دەکات (ئەمەش هۆیێك بووە کە یارانی حرزاد پەنایان پێ بردووە)، کەچی (ابن خرزاد) لە قینی ئەم کارەی (هـارون)و یارانی هەستا کەوتە گیانی کوردە جەلالی)یەکان و ئەوانی تێ لە ناوچەی (شارەزوور)و لە ئەنجامیش دا خۆی کوژراو هارون ـوەوە سـەرۆکی یاخیبووان»[24]

لە ساڵی (٢٩٠ك/ ٩٠٣ز)، لە مانـگی (جـمادی الأول)ی ئەم ساڵەدا، سوپا سالار (أبو سعید الخوارزمي) کە پەنای هێنابووە لای خەلیفەی عەباسی (المکتفي بالله) هەڵ دێو ڕێگای (موسڵ) دەگرێتە بەرو نامەیێك بۆ (عبدالله ـ ناسراو بە (غلام نون) دەنێرێت کە بەسەر (تکریت)و ناوچەکانی دەوروبەری‌دا ڕادەگەیشـت. داوای لێ دەکات کە لە (خەلیفە المکتفي) پێکەوە یاخی ببن، بەڵام (عبدالله) ڕازی نابێو لەگەڵی کۆدەبێتەوە بۆ ئەوەی بەم کارە هەڵ نەستێ، کەچی (أبو سعید) لە خشتەی دەبات و دەیکوژێو ڕووەو (شارەزوور) دەبێت و لەوێدا لەگـەڵ (ابن الربیع الکردي)دا پێك دێن بەوەی لە خەلیفە یاخی ببن»[25]

لە ساڵی (٣٠٧ك/ ٩١٩ز)، خەلیفە (المقتدر بالله)ی عەباسی، هەرێمی (دیار ربیعە) دەداتە (ابراهیم ابن حمدان)و (شارەزوور)یش دەدا بە بنـەمـاڵـەی (بني بن نفیس)، بەڵام خەڵکەکەی شارەزوور خۆشیان لێ نایەو ڕازی نابن. خەلیفە (المقتدر) ناچاردەبێ سوپایێك بنێێو (شارەزوور) گەمارۆ بدات و لە ئەنجامیش دا بۆیداگیرناکرێو کوشتارەکە بە (موسڵ) دەسپێرێو خۆی دەگەڕێتەوە. . .»[26]

لە ساڵی (٣١٤ك/ ٩٢٦ز)، لە سەردەمـی (المقـتـدر بالـلە)ی عەبـاسی‌دا، جەنگێك لە نێوانی (عبـدالله بن حمـدان)و (کـوردو عەرەب)ەکان، ڕوودەدات بەهۆی ئەو هێرشانەی کە کوردو عەرەبەکان دەیان کردە سەر ناوچەکانی (موسڵ)و ڕێگای (خراسان ـ خرێسان)و ئەمیش لە (بـەغـدا)وە بەسـەر ئەم شوێنـانەدا ڕادەگەیشت و (ناصر الدولە)ی کوڕیشی لە (موسڵ)ەوە، جا (عبدالله) فرمان بە کوڕەکەی دەکات بۆ لەشکر پێکەوەنان و شۆڕبوونەوە بەرەو (تکریت)، ئەمیش بەم کارە هەڵ دەستێو دەچێتـە (تکریت)و چاوی بە باوکی دەکەوێو پاشان عەرەبەکان کۆ دەکاتەوەو بەرپرسیاریان دەکات بەرامبەر بەو کارانەی کردبوونیان، لەپاش شێوە سزادانـێکـی ئەو خەڵـکــە بە کوشتن و برین، بەرەو (شـــارەزوور) مل دەنێو بەردەبێتە گیانی (جەلالی)یە کوردەکان و لە گەڵیان دا دەجەنگێ. .»[27]

لە ساڵی (٣٤٣ك/ ٩٥٤ز)، لە مانگی (رجب)ی ئەم ساڵـەدا، (معـزالـدولـە سبکتکین، سوپـایێك دەنـێرێتـە سەر (شارەزوور) بە (مـنجنیق)ەکـانــەوە ـ (ئـاڵــەتێکی بەردهــاوێژ بوون لە چەشنی تۆپ هاوێژی ئێستـا) بۆ داگـیرکردنیو تاکو مانگی (محرّم)ی ساڵی (٣٤٤ك) خەریکی بوون. کەچی نەیان توانی داگــیریبکـەن و بە هەناسەساردی گەڕانەوە بەغدا»[28]

لە ساڵی (٣٤٨ك/ ٩٩٥ز)، بەم لاوە، (شارەزوور) دێتە باوەشی میرنشینە کوردەکان و یەك لەدوای یەك دەیگرنە باوەشیان کە یەکەمیان بنـەمـاڵـەی (حـەسنـەوێ)کـانـە، کە پاش کزبـوونی دەسـەڵاتی عەباسی‌یەکان، ئەم میرنشینە کوردی‌یە بە سەرۆکایەتی (حەسنەوێ کوڕی حوسـێن)ی بەرزیکانی پەیدا بوو، ناوچەی میر نشینی‌یەکەی بریتی‌بـوو لە شاری (دینەوەر). ئەم میرە زیرەکە توانی لە سەردەمی (رکن الـدولة البویهی)دا، قەڵەم ڕەوی زەوی میر نشینەکەی فراوان بکـات بە خستنــەسـەری شارەکـانی (شـارەزوور)و (هـەمـەدان)و (نـەهـاوەند)،[29] لەبەر ئەمە (بوەیهی)یەکان ترسیان لێ پەیدا کردو (معــزالــدولــە)ی بوەیهی، هەستــا بە ناردنی سوپـایێك بۆ سەر (شــارەزوور) بە فەرمــانـدەی سەرلـەشـکـر (ینـال گوش)،[30] بەڵام (حـەسنەوێ) توانی ئەم سوپایە تێك بشکێنێت و وای لێ‌دێ پەیمانی ئاشتی لەگـەڵ دا ببـەستن،[31] لە دوای ئەمەش ئەم هەر خەریکی فراوان کردنەوەی میرنشینەکەی بوو تا لە ساڵی (٣٦٩ك) کۆچی دوایی ئەکات و پاش خۆی (بەدر ـ ناصرالدولە)ی کوڕی دەبێتە جێ‌نشینی، بەدر چەنـد کوڕێکی بووە بەڵام ناوی دووانی پێمان گەیشتـووە کە (هلال و أبی‌عیسێ)ن. یەکێك لەمانەی زیاتر ڕۆڵی خۆی گێڕابێت لەم ئیمارەتـە، ئەویش (هـلال)ی کوڕی بووە، کە لە سەردەمی بەدری باوکـی‌دا بەرەنـگـاری حاکـمی شارەزوور (ابن المـاضي) دەبێت و گەمارۆی شارەزوور دەدات و پاشان دەسـت بەسـەر دارایی ناوچەکە دەگرێت و (ابن الماضی)یش دەکوژێت.[32] دیارە ئەمەش دەبێتە هۆی هەڵ گیرسـانـدنی شەڕێك لە نیوانی باوك و کورداو لەئـەنجامیش دا (هلال) سەردەکەوێو (بەدر)یش بە دیل دێتە گرتن. بەڵام (بەدر) بە سازاندنی پیلانێك توانی کۆمەڵێك لە یارانی (أبا الفتح بن عناز ـ

دامەزرێنەری ئیمارەتی عەنازی کوردیو سەرۆکی هۆزی شازنجانی)و (ب عیسی شاذي بن محمد) ڕووبەڕووی (هلال)، بکات و هەروەها خۆشی هانا بەرێتە بەر (بهاء الدوله البویهي)و ئەمانیش سوپایەکی دەدەنی لە ژێر فەرمـاندەی (فخرالملك ابي غالب - یەکێك بووە لە وەزیرەکـانی بهـاء الـدولـه)، لەپاش شەڕێکی سەخت سوپای (فخـرالملك)و (بـەدر) سەرکـەوتن بەدەست دەهێنن و (شـارەزوور) دەکەوێتەوە چنگی (بەدر)،[33] کەچی (بەدر) هەڵ دەستی شارەزوور دەدەنە دەستی (عمید الجیوش) - ابو علي بن ابو جعفر)ی، وزیری (بهـاء الدولة)، ئەمانیش ئیتر خۆیان حوکمی (شارەزوور) دەکەن و حکمی بۆ دابین دەکەن، کاتێ (سلطان الدوله) لە (عێراق)دا دێتە سەر تەخت، (شـارەزوور) لەژێر دەسەلاتی (عمید الجیوش) دەردەچێ و پاشان دێتەوە بۆ باوەشی (طاهر بن هلال)[34]

لە سالێ (٣٦٩ك/ ٩٧٩ - ٩٨٠ز)دا، جەنگێك لە نێوانی (بني شیبان - گرۆیەك بوون لە یاخی بـووان (الخـوارج)و سوپـای (عضد الدولة)ی بویهی. لە مانگی (رجب)ی ئەم سالـەدا دەست پێ دەکـات. (عضد الدولة) سوپایێك ڕەوانەی سەر (بني شیبان) دەکات کە لە (شارەزوور)دا مەوایان گرتبوو. لەبەرئەوەی هێرشیان دەکردە سەر ولاتەکەیو پەیمانیشیان لەگـەڵ کوردەکـانی شارەزووردا بەستبـوو، زۆر لە (شـاهـەکان)یش، بێزاربـوون لە بەشوێن کەوتنیان و (شارەزوور)یشیان بۆ داگیر نەدەکرا، لەبـەرئەمە (عضد الولة) فرمانی بە سوپاکەی کرد بچنە شارەزوورەوە بۆ بڕینی دەسـتـی تەمـاعـی (بـنـي شیبـان)و خۆقـایم نەکـردنیان لە (شارەزوور)دا، لە ئەنجامیش دا سوپاکە سەرکەوتن بە دەست دێنێ.»[35]

لە سالێ (٤٣٤ك/ ١٠٤٣ز)دا، (أبو الشوك - کوڕی محمدی عەنازی شازنـجـانـی کورد)، ڕوو لە (شـارەزوور) دەنـێو ئابـلوقـەی دەداو دەست دەکاتە تالان و سووتاندنی گوندەکانیو تێکدانی، پاشان (قەلای تیرانشـا)ش گەمارۆ دەدات و (أبو القاسم بن عیاض) پێشی لێ دەگرێو بەڵێنی دەداتێ کە (أبو الفتح)ی کوڕی لە (مهلهل - أبو ماجدي کوڕی محمـدی عەنـازی) برای، ڕزگـار بکـات و نێوانیشیان چاك کاتـەوە، (مهلهـل)یش کاتێ بیستی کەوا (أبـو الشـوك)ی برای نیازی هاتنـە شارەزووری هەبـوو، شارەزوور بەجێ دەهێڵێو ڕوو دەکـاتـە (سندە)و شارەکـانی دی سەر بە (أبـو الشـوك)و دەست دەکـاتـە تالان کردن و سووتاندنیو، ژێردەستەکانیش لە هەردوو لا سەرگەردان دەبن. پاشان (أبـو الشوك) نامەیێك بۆ (أبو القاسم عیاض) دەنێرێو تێیدا بە یادی دەخـاتەوە کەوا کاتێ خۆی بەڵێنی دابوو کوڕەکەی بۆ ڕزگار بکات بەو مەرجـانـەی لەسـەری پێك هاتبـوون. ئەمیش وەڵامی دەداتـەوە کەوا (مهلهـل) پێك نایەت و، بۆیە (أبـو الشـوك) لە (حەلوان)ەوە، دەچێتە (صامغان)و تالانی دەکاو ئەو ناوچەو شارانەش تالان دەکات کە سەر بە (مـهلهـل) دەبن»[36] لە سالێ (٤٣٩ك/ ١٠٤٧ - ١٠٤٨ز)، خاوەنی (قەلای سەرماج) کە یەکێك بووە لە کوڕانی (بەدری کوڕی حەسنەوێ)، کۆچـی دوایی دەکـات و پاش ئەم قەلای سەرمـاج دەدرێتـە دەستی (ابـراهیم ینـال)و ئەمیش (أحمـد بن طاهـر)ی وەزیری دەنـێرێتـە (شـارەزوور)و دەستی بەسـەرا دەگرێت و (مهلهل - کوڕی ئەبو فەتح محەمەد کوڕی عەنازی)یش، هەڵ دێت و جێی دێڵێ. (أحمد بن طاهر) دەچێتـە سەر قەلای (تـیرانشـاهـ)و گەمـاروی دەدا. ئەنجا (مهلهل) دەست دەکاتە نامە ناردن بۆ خەڵکی (شارەزوور)و بەڵێنیان دەداتێ کەوا بە خەڵکێکی زۆرەوە بۆ لایان دێت و داواشیان لێ دەکات کە ڕوو بەڕووی بێگـانـەکانی (الغز)ببنەوە. خەڵکی (شارەزوور)یش دەکەونە گیانی ئەو بێگانە (الغز) انەو، گەلێکیان لێ دەکوژن. کاتێ (أحمد بن طاهر) ئەم هەواڵە دەبیسێ، دەگەڕێتەوە سەر (شارەزوور)یەکان و خەڵکێکی زۆریان لێ دەکوژێت و تالانیان دەکات»[37]

لە سالێ (٤٤٣ك/ ١٠٥١ز) جڵەوی ناوچەی (شارەزوور) دەکەوێتە دەستی (أبي الماجـد المهلهل - کوڕی محەمەدی عەنازی)، بەوەی لەم سالەدا (مهلهل) دەچێتە لای (سلطان طغرل بك)ی سەلجووقیو ڕێزی لێ دەنێت و دەسەلاتیشی لەسەر ئەم ناوچانەی ژێر دەستی دەچەسپێنێت، لەوانـە (سـیروان، دقـوقـاء، شارەزوور، صامغان)و سورخابی کوڕی محەمەدی کوڕی عەییار - عەنازی براشی ئازاد دەکاو قەلای (ماهەکی) بۆ دابـین دەکـاو، ناوچەی (الراوندین)یش دەبەخشێ بە (سعد بن أبي الشوك - سەعدی کوڕی ئەبو شەوك).[38]

لە سالێ (٥٣٤ك/ ١١٣٩ز)، (شارەزوور)و ناوچەو گوندەکانی دەورو بەرێو قەلاکـانی، دەبنە سەر بە (اتابك زنكي - عیمادەدین کوڕی ئاق سەنقەرەی دامەزرێنەری دەوڵەتی ئەتابیکەی زەنگی لە موسڵ)، کە پێشی ئەم لە ژێر دەستی (قیجـاقی کوڕی ئەرسـەلان تاش)ی تورکـمان دا بووە.[39]

لە سالێ (٥٦٣ك/ ١١٦٧ - ١١٦٨ز)، (شـارەزوور)و قەلاکـانی دەکـەوێتـە ژێر دەستی (زین الـدین علي بن بكتكـین)ی جێگـری (قطب الدين مودود بن زنكي)ی خاوەنی موصل، کاتێ دەچێتە (اربل - هەولێر)و دەبێتە حاکمی دەوڵەت و زۆربەی ناوچەکانی ولاتی دەکەوێتە دەست»[40]

لە سالێ (٥٧٢ك/ ١١٧٦ز)دا، (شـارەزوور) لەژێر دەسـتـی (سـیف الـدین غازی)ی خاوەنـی (مـوسـل) دەبێو لەم سالـەدا، فەرمان ڕەوای (شارەزوور) کە ناوی (شهاب الدین محمد بن یزان) دەبێ لە (سـیف الـدین غازي) یاخـی دەبـێ، هۆکـەشـی ئەوە بووە کە

سیف الدین) هەڵ دەستێ (مجاهدالین قایماز ـ کوری عبدالله زەینی) ئەکاتە جێگری خۆی لە (موسڵ)، (ابن یزان) پێی ناخۆش دەبێت لەبەر ئەوەی کاتێ کە (مجاهدالدین قایماز) کرابوو بە حاکمی (اربل ـ هەولێر) لە نێوانی هەردووکیان دا ناکۆکی یەکی توند پەیدا دەبێ. جا لەم کاتەدا ترسی ئێ دەنیشێت نەوەك ئازارێکی لێوە پێ بگات، یاخی بوونی خۆی ئەر دەبڕێ‌و مل کەچی بۆ ناکات. بەڵام (جلال الدین)ی وزیری سیف الـدین) نوسراوێکی بۆ دەنـێرێ کە مل کەچی فرمـانـەکـانی سیف الـدین) بێت و سەرزەنشتی پاشـەڕۆژی یاخی بـوونـەکەشی پێ ڕادەگـەیێنێ. کە نامەکەی پێ دەگات دەست بەجێ دەچێتە (موسڵ)و ملی کەچی خۆی دەنـوێنێ‌و ئەو ناکـۆکی یەش لادەچێت»[41] لە ساڵی ٥٧٩ك/ ١١٨٣ز)، (شارەزوور)و دەوروبەری لەژێر جڵەوی (اتابك عزالدین مسعود)ی خاوەن (موسڵ)دا بووەو، ئەمەش لەدوای ئەوەی کە (صـلاح الدین الأیوبي) زۆربەی ناوچەکانی (جزیرە)ی لەژێر چنگ دا دەربێنێ‌و تەنهـا (شـارەزوور)و (العقـر)ی بۆ دەمێنێتـەوە.[42] لە ساڵی ٥٨١ك/ ١١٨٥ز)، (سلاح الدین الأیوبي) زۆربەی ناوچەکانی سەر بە موسڵ) لە (عزالدین مـسعود). دادەبڕێ‌و داوای (شارەزوور)و (ولایة القرابلی)و هەموو شارەکانی ئەو دیوی (زێی)ی سەر بە (وان) دەکات و لە ئەنجـامیش دا بەهـۆی بەستنی پەیمانی ئاشتی لە نێوانیان ئەو ناوچـانە دەکەونە ژێر دەستی بنەماڵەی ئەیوبی یەکان.[43]

لە ساڵی (٦٢٣ك/ ١٢٢٦ز)، لە ڕۆژی چوارشەممەی بیست و پێنجی مانگی (ذي العقـدة)ی ئەم ساڵـە، لە کاتی چێشتەنگـاو، لە شاری (موسڵ)و زۆربەی وڵاتانی عەرەب و عەجەم بوومەلەزرە دەبێت. بەڵام زیاتـر لە شاری (شارەزوور)دا ڕوو دەدات و دەبێتە هۆی وێران کردنی شـارەکـەو قەڵاکانی. بوومەلەرزەکە بۆ ماوەی زیاتر لە مانگێك بەرۆکی شارەزووری بەرنەداوە»[44]

لە ساڵی (٦٤٥ك/ ١٢٤٧ز)، لەگـەڵ پەیدابـوونی (مەغۆلی)یەکان، (شارەزوور)یش وێرانکاری‌و گەورەترین بەڵاو ناخۆشترین ڕۆژی ڕەشی بە خۆیەوە بینیوە. پاش ئەوەی (هـولاکـۆ) توانی شاری (بـەغدا) داگیر بکـات و دەسـەڵاتی خەلیفەکانی بنەماڵەی عەباسی یەکان، کزکاتەوە، دانیشتـوانی شارو دێهـاتـەکانی ناوچەی (شارەزوور) ناچار دەبن شـارو گوندەکانیان بەجێ بهێڵن و ڕوو بکەنە وڵاتانی (میـسر) و (شام).[45]

دیارە لەم مێژ ووە بەم لاوە، (شـارەزوور) دەکـەوێتـە دەستی کوردە گۆرانەکانی بنەماڵەی (ئەردەڵان)ی، کە (بابا ـ باوە ئەردەڵان)ی سەرەك هۆزیان بە دامەزرێنەری ئەم ئیمارەتە دەژمێردرێ‌و لە پاشی خۆی، چەند پشتێك لە نەوەکـانی فەرمان ڕەوایی تێدا دەکەن و هەر یەکەیان دەوری خۆی دەگـێرێ لە ئاوەدان کردنـەوە و فراوان کردنـەوەی سـنووری ئەم ئیمارەتـە، لە (شـەرفنـامـە)ی شەرەفخانی بەدلیسی‌دا بە درێژی باسی نەوەکـانی (بـابـا) کراوە تاکـو سەردەمی شـەرەفخـان خۆی واتـە سـاڵی (١٠٠٥ك/ ١٥٩٧ز) بەڵام لێرەدا ناوی (بیگـەبـەگ)، دێنینـە ناو ئەم باسـەوەو ئەڵێین لە نوسراوێکی (مەئمون بەگی)ی کوڕی‌دا هاتووە دەڵێ: «ڕشتەی بەندە (بیگە بەگ) دەگەڕێتەوە بۆ (أبی عبیدة الجراح) لە دە کەسە مژدەپێ دراوەکانی بەهەشت و (أمیر المؤمنین العباس)و یەکێك لە باپیرانی بە ناوی (عـادل ـ عادلانی)یەوە، لە سەرەتـای ڕۆژانی کوشتـارەکـانی (جـەنگیزی)یەکـان دا، لەسـەر «شارەزوور» واڵی بووە». ئەم بیگە بەگەی شارەزوور گوێی نەداوە بە (شا ئیسماعیلی سەفەوی)و لای بە لادا نەدەکـردەوە، بۆیە شا ئیسـماعیل هەست (چـپـان سـلطان)ی قزلباشی یاریدەری بە لەشکـرێکی گەورەوە نارده سەر وڵاتی بیگـەبـەگ، کاتێ هێرشیان هێنایە سەر زەوی‌یەکانی (شارەزوور)، هەستان بە تێکدانی ئەو گوندانەی کەوتبوونە ناو شیوی شارەزوورەوەو سێ قەڵاشیان تێك دا بەڵام نەیان توانی شوورە پتەوەکانی شوێنە بەرزەکەی ـ شارەزوور ـ تێك بدەن و ماوەی ساڵێك ئابلوقەیان داو بە نائومێدی گەڕانەوە.[46]

لە کۆتایی سەدەی نۆیەمی کۆچی‌دا، کە (بابان)ەکان، پەیدابوون و توانیان (ئیمارەتی بابـان) دروست بکـەن. (شارەزوور) بووە بەشێك لە ئیمارەتی بابـان و ئەم ئیمارەتە بە شێوەیەکی نیمچە سەربەخۆ مایەوە تاکو عوسمانی یەکان لەساڵی (١٢٦٧ك/ ١٨٥١ز) زاڵ بوون بەسەریاو کردیانە (متصرفیە).[47] بەڵام لەپاش ئەو ئاڵ وگۆڕە ئیداری‌یەی ساڵی (١٨٦٧ز) ڕوویداو (ئـەیالەتی موسـڵ) پێك هات، بە (سنجەقی کەرکوك)یان، دەوت (شارەزوور)و کە بەشێك بوو لە ئەیالەتی موسڵ، (شارەزوور)یش بوو بە ناوچەیەك لە (سنجەقی سلێمانی)دا.[49]

ئەمـە بریتـی بوو لە گێڕانـەوەی بڕی لەو ڕوداوانـەی مێژ ووی (شارەزوور)و ناوچەکانی کە بە گوێرەی توانامان لێی دواین و پیشانمان دان.

پێناسی جوگرافی (شارەزوور) لە چەند سەرچاوەیێك دا:

---

١ ـ گەڕۆك و شارناسـانی عەرەب لەوانـەی پێنـاسی (شـارەزوور)یان کردووە، یەکێکیان (الاصطخري ـ ٣٤٠ك) مردووە، لە کتێبی (المسالك و الممالك)دا دەڵێ: «شـارەزوور، شارێکی بچووکەو لەژێر دەسەڵاتی کوردەکـانـەو، لەگـەڵ ئەوەش لە عێراقـەوە نزیکە، کەچی هیچ ئەمیرو کاربەدەستێکی تێ‌دا نی‌یە، چونکە لەژێر دەستیان دایە». هەروەها هاتووە ماوەکانی لە نێوانی (شارەزوور)و شارەکانی دەورو بەری بەم جۆرە دابین کردووەو دەڵێ «لـە (دینـەوەر)وە بۆ (شارەزوور) چوار قۆناغەو، لە (حەلوان)یشەوە بۆ (شارەزوور) دیسان چوار قۆناغە».[50]

٢ ـ (ابن حوقل ـ ٣٦٧ك) مردووەو، یەکێکە لە جوگرافی ناسەکانی عەرەب

لە کتێبی (صورة الأرض)دا دەڵێ: «شارەزوور، شارێکی بچووکەو لەژێر دەستی کوردەکان دایەو لەگەڵ دەورو بەری، کە نزیکیش بووە لە عێراقەوە، هیچ ئەمیرو فەرمان بەرێکی سوڵتانی تێدا نی‌یە دەست بگرێ بەسەر دارایی‌یەوە، ژیانێکی خۆشی هەیەو هەرزانی‌یەو شوێنێکی چاك و پان و بەرینەو بەپیت وفەرەو دیمەنێکی جوانی هەیە..»[54] بۆ ماوەکانیش دەڵێ «ماوەی نێوانی شاری (دینەوەر)و (شارەزوور)، چوار قوناغە»[55] هەروەها باسی چیاو دۆڵەکانی ناوچە شاخاوی‌یەکانی کردووە لەگەڵ ناو بردنی هوزە کوردەکانی (حمیدی)و (لاریە)و (هەزبانی) لە کوردەکانی شارەزوور..»[56]

٣ - جوگرافی‌زانی عەرەب و گەڕۆك (مسعر بن المهلهل - ٣٧٧ك) مردووە، وەکو لە نووسینەکانی‌دا دەردەکەوێ پێش ساڵی (٣٤٠ك)[57] ناوچەی شارەزووری دیتووە، بەم جۆرە پێناسەی شارەزوور دەکاتن: «شارەزوور چەند شارۆچکەو دێهاتێکە، شارێکی گەورەی تێ‌دایەو مەڵبەندیەتی لەم سەردەمەمان و پێی دەڵێن (نیم ئەز را)ی، خەلکی ئەم شارە لە سوڵتان یاخین... ئەم شارە لە دەشتایی‌یەو خەڵکەکەی گەلێ ئازاو جەربەزەن، پارێزگاری لە خۆیان و ناوچەکەیان دەکەن. ئەستووری شوورەی شارەکە هەشت گەز پانەو زۆربەی فەرمان ڕەواکانیان لە خۆیانن و، دوویشکی کوشندەی تێ‌دایە کوشندەتر لە دوویشکی (نوصەیبین)... لە نزیکی ئەم شارەوە [نیم ئەز را]، دوو چیا بە ناوەکانی (شەعران)و (زەلم)وە هەن... لەم شارەوە بۆ (دەیلەمستان) حەوت فرسەخە... لەشارەزووردا شارێکی دی هەیە لە یاخی بوون و سەرکەشی کردن دا بە (بیر - [یاقوت الحموی نووسیویە شیز] دەناسرێ‌و خەڵکەکەی شیعەی زەیدی صالحین و لە سەردەستی (زەیدی کوری عەلی)دا بوونە موسڵمان. ئەم شارەی (بیر) دیوەتە پەناگەی هەڵاتوان‌و سەرکەشان، جارێکیان دانیشتوانی (نیم ئەز را)ی هێرشیان بردە سەریان و کوشتنیان... ئەمەش لە ساڵی (٣٤١ك)دا بوو. لە نێوانی ئەم دوو شارەدا، شارێکی بچووك هەیەو پێی دەوترێ (دزدان). شێوەی بنیات نانی خانووبەرەی وەکو شاری (شیز) وایە، دەریچەیەکی تێدایە لە شارەکەوە دەترازێ بۆ دەرەوەی، سوار غارغارۆکێ بەسەر شوورە بەرزەکانی‌یەوە دەکاتن لەبەر پان و بەرینی‌و... مزگەوتێکی گەورەی تێدایەو... ئەم شارەش [دزدان]، (دارای کوری دارا) دروستی کردووە (ئەسکەندەر) نەی توانیوە داگیری بکات...»[58]

٤ - شێنی بەسە جوگرافی‌زانی عەرەب ناوبانگ بە (المسعودی - ٣٤٥ك) مردووە، لە کتێبی (التنبیه والاشراف)دا، ناوی هوزە کوردەکانی بردووە، وەك و ] بازنجان، شوهجان، شاذنجان، نشاورة، بوذیکان، لور، جورقان، جاوان، بارسیان، جەلالی، مستکان، جابارقی، جروغان، کیکان، لەوانەی لەژێر ڕکێفی فارس و کرمان و سجەستان و خوراسان و (شارەزوور)دا بوونە...»[59]

٥ - پاشان (یاقوت الحموی - ٦٢٦ك) مردووە، لە (معجم البلدان)دا، دەڵێ: «شارەزوور کەوتووەتە هەرێمی چوارەم و، درێژی‌یەکەی حەفتا پلەك و سێ‌یەکپلەکێکەو، پانایشی سی‌و حەوت پلەك و نیوو چوار یەکێکەو مەڵبەندێکی گەورەیەو لە نێوان کێوەکانی (اربل - هەولێر)و (هەمەدان)دایەو، (زوری کوری زوحاك) نوێی کردەوە... خەڵکەکەی ئەم ناوچانە تێکرا کوردن.»[60]

٦ - بەڵام (شەرەف خان)ی بەدلیسی، لە (شەرەفنامە)کەی‌دا، بە دەمی (حمدالله المستوفي)یەوە دەدوێ‌و دەڵێ: «بە گفتی (حمداللەی مستەوفی)، شارەزوور واتا شاری هێزو زۆرو هەمیشە فەرمان ڕەواکانیان کورد بوون و هەر کەس کە خاوەن زۆر بووبێ، بێ زۆری پێش خۆی ڕەپیچەك داوەو ڕاوی ناوەو لە جێگاکەی دامەزراوە ئەویش هەر ئەوەندەی توانیوە بمێنێ تا بە توانایی ماوەو هەرگا داویەتە باری کزی‌و زەبوونی‌و بەرەو نەبوونی خزیوەیەکی زۆرداری بۆ ڕەخسیوەو پرزەی لێ بریوەو میرایەتی‌یەکەی گۆڕیوە. بابا ئەردەڵان لەو خاوەن زۆرانە بووە کە زۆریان نەبردووەو بە سەربەستی فەرمان ڕەوایی مەڵبەندی شارەزووری کردووە...»[61]

٧ - مامۆستا (تۆفیق وەهبی) یەکەمین کەسێکە توانیویەتی لێدوانێکی زانستی‌یانە سەبارەت بە ناولێنانی شارەزوور بکات و پاشان شارەزووری بەم جۆرە دیاریی کردووەو دەڵێ: «ناوی شارەزوور لەم سەردەمەدا بە سەر نشێوو نزمایی‌یەکی زەوی دەردەبڕێت، کە بەشی ڕۆژهەڵاتی خواروی دۆڵی (تانجەرۆ)ی شاری (سلێمانی) پێك دێنێت کە بەشە نزمایی‌یەکەیەتی، ئەم نشێوو نزمایی‌یەش لە باشووری شاری (عەرەبەت)وە، درێژ بووەتەوە بۆ دەوروبەری شاری (هەڵەبجە). چەند زنجیرە شاخێك دەروانێتە سەری، بە تایبەتی لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاواوە. هەندێ چاڵ و چۆڵی تێدایەو دەورو بەری بە نزیکەی (٦٠٠م) بەرز دەبێتەوە لەسەر ڕووی دەریاوە، بەڵام بڵندیی ناوەراستی لە (٤٥٠م) بەرزتر نی‌یە. لەوانەشە ئەم شیوە بە (حەوزێك) دابنرێ کە قوڵایی‌یەکەی نزیکەی (١٥٠م) بێت، ڕووبەری شیوی شارەزوور نزیکەی بە (٥٦٦ کم ٢) دەپێورێت»[62]

رای چەند کەسانێك لە دیاری کردنی شوێنی (شارەزوور)

١ - گەڕیدەی ئینگلیز (ریچ) لە یاداشتەکانی‌دا باسی شوێن و تەپۆڵکەو پاشماوەی شوێنەوارەکانی شارەزووری کردووە، لە شوێنێك دا، دەربارەی شوێنەواری شاری (شارەزوور)ی کۆن دەڵێ: «کنەو پشکنینم بۆ دۆزینەوەی شاری (شارەزوور)، وای لە زۆربەی کوردەکان کرد بیر لەم کارە بکەنەوە، پاشا [وەسمان پاشا] ئەمرۆ پێی وتم، خۆی لەو باوەڕەدایە کە شارە کۆنەکە دەکەوێتە لای (قیز قەلعەسی)ی نزیکی (بیستان سوور) لە ناوچەی شارەزوور)[63]

٢ ـ مامۆستا (ئەمین زەکی بەگ، لە کتێبەکەی‌دا دەڵێ: «مستەشرق (چەریکۆف)و (هەرزفەلد) دەڵێن: ئەم شاری (نیم را)یە، (گوڵعەنبەر)ە، واقعەن تەعریفی (ابنْ المهلهل)و (یاقوت)یش، لەگەڵ ئەم تەفسیرەدا یەك ئەگرێ، چونکە ئەم دوو موئەرخە دەڵێن شاری (نیم را)، لە نزیکی شاخی (شاران ـ هەورامان)و (زەڵم) بووە»[64]

٣ ـ (د. حسام الدین نەقشبەندی) لە بارەی شارەزوورەوە دەدوێ‌و دەڵێ: «لەگەڵ بوونی جیاوازی لە نێوان بۆچوونە جیا جیاکانی لێ کۆڵەرەوان دا بۆ دیاری کردنی شوێنی شارە کۆنەکە (شارەزوور)... بۆمان دەرکەوت کە پاشماوەی (خورماڵ)ی ئێستا لە ڕاستی‌دا پاشماوەی شوێنەواری شاری (شارەزوور)ی کۆنە..»[65]

٤ ـ مامۆستا (ئەمین نەقشبەندی) دەڵێ: «دروست کردنی پایتەختێکی بەکاری وەکو (نیم ئەز را)ی کە لام وایە لە ئەسلا ناوی (شارەزوور)یان (شارەسوور) بووبێت و مەڵبەندەکە بە ئەووەوە ناونرابێت و پاشان چونکی لە نیوەی ڕێگای تیسفون (مدائن)و (شیز) واتە تەختی سولەیمانی نزیکی سەقزا بووە ناوی نراوە (نیم ئەز را)ی‌و پاشان بووەتە گوڵ عەنبەر، یان گوڵ عەمەرو پاشان خورماڵ.»[66]

٥ ـ مامۆستا (کمال نوری معروف) دەڵێ: «لەوانەیە ئەو شارەی ئاشوری کە ناوی (دور ـ ئاشور) بووە، هەمان شاری (شارەزوور) بێت، کە پادشای ئاشوری (ئاشور ناسرپال ـ ٨٨٣/ ٨٥٩ پ ز) لەسەر کەلاوەکانی شاری (لوو)، ناسراو بە (ئەتلیلا) دروست کردووەو گۆرانکاری بە سەردا هاتبێت... بەم جۆرە (دور ـ ئاشور) بووە بە (ئاشور ـ دور)، پاشان (شار ـ دور) بووە بە (شار ـ زور)..»[67]

ئێمە خۆشمان لەو باوەڕەداین کە (خورماڵ) بریتی بووە لەو شارەی پێی وتراوە شارەزوور، یاخو (نیم ئەز را)ێ بە گوێرەی ئەو سەرچاوانەی کە پێشتر دەست نیشانمان کردن و، هەروەها بە گوێرەی ئەم (بەڵگە نامە)یەی[68] لەساڵی (٥٣٠ك)دا نوۆسراوەتەوە، بە ڕوونی دیارە کە (گوڵعەنبەر ـ خورماڵ) پێی وتراوە شارەزوور، بەوەی نووسەری بەڵگەنامەکە کە ناوی (سەیید ئیبراهیم)ە، دەڵێ «نعم اني بعد قطع المسافات غير القليلة وصلت قرية (جبراباد ـ جەوراوە) شرقي شهرزور»،[69] لێرەدا دیارە دێی (جەوراوە) دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی (خورماڵ)ەوە، قسەکانیش مەبەست هەر لە (خورماڵ)ە، نەك هەموو ناوچەی شارەزوور، لەبەرئەوەی ئەم (سەیید ئیبراهیم)ە، باسێکی (خورماڵ ـ خورماد) نووسیوەتەوەو دەڵێ: «ان المدينة المسماة بـ (خورماد) تسمية الكل بأسم الجزء حيث كان ملك اسمه (ماد) قد بنى قلعة حصينة وسماها باسم ابنته الوحيدة (خور) فباضافة الأبن الى ابيه صارت الكلمة (خورماد) أي شمس الماد وشمس صارت (روز ـ ڕۆژ) وبكثرة الاستعمال أصبحت (تعرف) بـ (شهرزور بن مد)»

دیارە ئەمەش ئەوە ناگەیێنێت کە (خورماڵ) لە مێژوودا ناوی پێشی (شارەزوور) بکەوێت، چونکە ئەوە ئەزانین کە ناوی (شارەزوور) دەگەڕێتەوە بۆ مێژوویەکی گەلێ کۆنتر. هەروەها بە هۆی ئەو کنەو پشکنینەی لە شوێنە دێرینەکانی ناحیەی خورماڵ کراوە، شوێنەوارناسان توانیویانە شوورەیەکی گەورەی بە بەردو گەچ دروست کراو بدۆزنەوە کە ئەویش چەند بورجێکی بازنەیی‌و چەند لایی‌یە کە بە چوار دەوری شارێکی کۆن لە باکورو باشورەوە بە دوو قەڵای پتەو کۆتایی دێت... جگە لەوەی چەند جۆگائاو ڕێکخەرێك و پردێك لەسەر ڕوباری (زەڵم)دا دۆزراوەتەوە کە ئەم پاشماوە شوێنەوارانەی خورماڵ پاشماوەی شاری شارەزووری کۆنە، کە گەڕیدەو شارناسانی عەرەب لەوانە جوگرافی‌زان (ابن حوقل) کە لە سەدەی چواری کۆچی‌دا پێناسەی کردوە، ئەو پێناسەش لەسەر پاشماوەکانی (خورماڵ) دەگونجێت»[70]

ئەوەی شایانی وتن بێ لێرەدا، بەشێکی زۆری شارو گوندەکانی ناوچەی شارەزوور لە کەشکۆڵە پیرۆزەکانی (ئەهلی‌هەق) کاکەیی‌یەکان دا، یاد کراون و، مێژووی ئەو نووسراوە ئایینی‌و ڕێبازی‌یانەش دەگەڕێنەوە بۆ سەدەی هەشتەمی کۆچی‌و، وشەی (شارەزوور) پتر لە پەنجا شوێن دا دووپات کراوەتەوەو بەرچاو دەکەوێ، هەندێ جاریش بە شێوەی گۆ کردنی (شارەزویل ـ شارەزول)[71] بە واتای شاری (زەل و زلکاو) هاتووە. بە داخەوە ڕوون نی‌یە مەبەست لە (شارەزوور) لەم سەرچاوە ئایینی‌یەدا، (خورماڵ)و (عەربەت)ە، یاخود شارە پیرۆزەکەی (پردیوەر)ی سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی‌یە.

* * *

ب ـ شارەزوورو سۆفی‌گەری:

---

**وەکو لامان دیارە ئەو شوێن و ناوچەو مەڵبەندەی بە (شارەزوور) ناوی دەرکردووە لە مێژوودا، مەڵبەندی پیاوانی سوارچاك و دلێرو قارەمانان بووە، جێگای زانست و زانیاری هەمە جۆرو پیرو شێخانی خاوەن کەرامەت و خوا ناسانی سۆفی‌و مەلاو دەروێشان و گەورە پیاوانی تەریقەت و داهێنەری ڕێگاو ڕێبازی بیریی ئایینی بووە. ناوی پیاوانی لە ئەستێرەناس و پزیشك و فەلسەفەی سۆفی‌یەتی‌و بوێژو زاناودانای چەشنی ئەستێرەیەکی گەش وان بە ئاسمانی پان و بەرینی دەشتی (شارەزوور)ەوە، هەر یەکە لەو شۆڕەسوارانە لە مەیدان و بوارێکی تایبەتی‌دا گەیشتوونەتە لوتکەی مەبەست. ناوچەکە لە کات و سەردەمە کۆنەکان دا، بازارێکی گەورەی ئاڵ وگۆڕکردنی بیری زانست و زانیاری هەمە جۆرو وێژەو بیرەکانی فەلسەفەکاری سۆفی‌گەری بووە، جگە**

لەوەی کە بازاڕێکی گەورەی ئاڵ و گۆڕ کردنی شتو مەکی بازرگانیش بوو بێت. پاش ئەوەی بیرو باوەڕی سۆفی گەری لە کوردستان دا بڵاوبووەوە، هەموو ناوچەکانی داپۆشی، کورد بە باشی ئەم ڕێگە خواناسی یەی ناسی و تێکەڵاوی بوو. هەر لە (شارەزوور)دا بە سەدان سۆفی و مورشیدی بلیمەت هەڵکەوتن و، ڕێگای زانین و زانستی یان گرتبووە بەر. ئەمانە سۆفی یەکی ڕاستەقینەی (صراط المستقیم) بوونە. هەرچەندە وتراوە سۆفی یەکان حەز لە زانست و زانیاری یە ڕووکەشەکان ناکەن، بەڵام ئەمانەی لێ یان دەدوێین ئاشناو شەیدای هەموو جۆرە زانیاری یەك بوونەو بیریان لە پاشە ڕۆژی دنیاو مرۆڤ کردووەتەوە، چاویان بڕیبووە ڕۆژگاری دوورو پێشکەوتنی کۆمەڵانی مرۆڤ و مێشکیان تەرخان کردبوو بۆ بابەتەکانی ئایینی و زانستی فەلسەفەی سۆفی گەری. لەوانەشە برێ لەو زاناو فەیلەسوفانەی کوردی شارەزوور مێشکی خۆیان بە تیۆری فەلسەفەکانی هیندی و ئەفلاتون و ئەرەستۆی یۆنانی زاخاو دابێت، «تەریقەتی نەقشبەندی خۆی لە خۆی دا دەمارێکی تیژی بیرکردنەوەو فەلسەفەکاری تیایە، لەوانەیە بەشێکیشی لە هیندەوە هێنابێ [مەولانا خالیدی شارەزووری]و لە کەلەپووری سامانە فەلسەفی یە دەوڵەمەندەکەی ئەو وڵاتە بێ»[٧٣]

لەسەدەی حەوتەمی کۆچی، (شێخ کاکۆ زەکەریا) دەورێکی گەورەی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی (تەریقەتی قادری)[٧٤] لەناو کۆمەڵگای کوردەواری داو، لە سەدەی یانزەی کۆچیش شێخ (شهاب الدین شێخ رضی الدین)ی شاذلی، توانی لە ئیمارەتی (ئەردەڵان)و (بابان)دا تەریقەتی نەقشبەندی بڵاوبکاتەوە،[٧٥] ئەمەش ئەوە دەسەلمێنێت کە ئەم تەریقەتە بۆ ماوەیەکی زۆر لە پێش مەولانا خالیدی شارەزووری (١٧٧٩ ـ ١٨٢٧) لەناو کوردەواری دا بڵاوبوو، خەڵکێکی زۆریش دەستگیری ببوون..)[٧٦]

لە مەیدانی فەلسەفەی سۆفی گەری دا، ئەمانەی وەك (بابا تاهیری لوڕی، بابا خۆشین، پیر شاریاری هەورامان، نەوەدو نۆ پیرەکەی هەورامان، شێخ عیسیٰ و موسیٰ، مەولانا خالیدی نەقشبەندی شارەزووری، سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی، شێخ مارفی نۆدێی، شێخ حەسەنی گڵەزەردە، بابا ناوزی سەرگەتی، پیر میکائیل داودانی، پیر سلێمان ئەردەڵانی، مەلا عابەدینی سازانی، عێل بەگی جاف... هتد) پێشەنگی ئەو کاروانەن کە هەر یەکەیان لە سەردەمێك دا ژیاون، خزمەتی ئایین و مرۆڤ و فەلسەفەی سۆفی گەری یان کردووە. ئێستا بۆ نموونە لایەنی بیرو دەروونی چەند کەسانێك لەم زاتانە ڕوون دەکەینەوە کە بە دەگمەن زانیاری مان دەربارەیان پێ گەیشتووە ئەگەر چی هەندێ بیری فەلسەفەی ڕووت تێکەڵاوی بیرو باوەڕیان بووەو لەژێر کاریگەری ئەو جۆرە تیۆری یە فەلسەفی یانە ڕزگاریان نەبووە.

**بابا خۆشین (٤٠٠ك):**

---

لەو سەردەمەی ئەم زاتە لە (شارەزوور)دا پەیدا بوو (وەکو لە زانیاری یەکانی سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی یەوە پێمان گەیشتووە) هەڵگرتووی هەگبەیەکی پڕ لە زانست و بیرو باوەڕی فەلسەفەی سۆفی گەری بوو، بیرو بۆچوونەکانی پڕ بوون لە لایەنی وا کە ئەندێشەی بیری مرۆڤیان دەوروژاند، وایان لە مرۆڤی ناوچەکە دەکرد سەرنج بدەن و بیربکەنەوە.. فەلسەفەکانی ئەم زاتە بریتی بوون لە بیرو بیرۆکەی ڕۆحی و زانیاری و هۆشیاری باباو خەونەکانی. دەڵێن ڕێبازەکەی لەوە دەدوا کەوا مرۆڤ لە ژیان دا ڕۆحی بەردەوام دەبێت و گۆڕینی ڕەوان (دۆنای دۆن) دەکات و ڕۆحی ئەو مرۆڤە هەر بە نەمری دەمێنێتەوە، خاوەن ڕۆح لە کاتێك دا کۆچی دوایی کرد، ئەوا ڕۆحەکەی دەچێتە بەر (قاڵب ـ لاشە)یەکی نوێ و، سەرلەنوێ لە دایك و پەیدادەبێتەوە.. بەڵام ڕۆژێك دێت ئەو ڕۆحە لەو گۆڕانکاری یەی خۆی دەکەوێت، ئەویش بە هاتنی (ڕۆژی دوایی)یە.

بابا خۆشین هەر وەك مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی (١٢٠٧ز)، ڕەنگی ئەم فەلسەفەیە لەناو چوارچێوەی بیرەکانی دا خۆی دەنوێنێ. «ڕێبازی مەولەوی پشت بە قورئان و حەدیسەکانی پێغەمبەر (د.خ) دەبەستێت و سوودیشی لە زانستی گەردوون ناسی ئەو سەردەمە وەرگرتووە. لەڕاستیش دا هەندێ بیرو تیوری دوور لە بیری موسڵمانێتیشی تێکەڵ بووە، بۆ نموونە جاروبار تیوری دۆنای دۆن (الحلول والتناسخ Inearnation) لە شیعرەکانی مەولانادا بەرچاو دەکەوێت...».[٧٧] بابا خۆشین و دەستەو دایەرەی لەو باوەڕەدا بوونە، کە ئاڵەتی موسیقا بەتایبەتی (ساز)ی کوردەواری، دەورێکی کاریگەری هەیە بۆ خاوێن کردنەوەی دڵ و دەروون لە تەم ومژ و تاریکی، بۆ ئەم مەبەستەش لە کاتی ئاهەنگی ئایینی دا، گوایە (نۆسەد)[٧٨] کەس لە سۆفی یانی هاوڕێی ئەو جۆرە سازەیان ژەنیوەو جۆرە جوولەو سەمایەکی هێمنانەیان لەگەڵ ئاوازەی دەنگی تەلەکانی سازەکان دا نواندووە. ئەم دەستەیە سازیان هەڵبژاردووە وەکو لای کۆمەڵە ڕێبازە سۆفی گەری یەکانی تر کە ئاڵەتی زیکرو کۆڕ بەستنیان بریتی بووە لە دەف و تەپڵ و ئاوازی دەنگی جۆراوجۆر بۆ بەتین کردنی گڕو بڵێسەی گەرمی هەناوی سۆفی یان. کەچی مەولانای ڕۆمی لە جیاتی ئەوجۆرە ئامێرانە هاتووە (نای)ی بەکار هێناوە لەگەڵ سەمایەکی گەلێ بێ دەنگ دا.

سەرچاوەی هەوێنی بوون لای زانایانی فەلسەفەکاری ئەم ڕێبازەی بابا خۆشین بریتی بووە لە چوار ماددەی (ئاو، هەوا، ئاگر، گڵ). سزادانی (ڕۆح ـ گیان)بەوە خاوێن دەبێتەوە، کە چەند جارێك گۆڕانکاری لاشەی

مرۆڤ دەکــات و لەم لەشــەوە دەچێتــە بەر لەشێکی دیو بە سزای خۆی دەگات لەو ماوەیەی کە گیرۆدەی ئەو لەشە دەبێت. جا وتراوە زۆر کەس لە پەیــڕەوانی ئەم ڕێبــازە سۆفیــزمی یــە کوردەی شارەزوور گوایــە بە ئاگـا هاتوونەتەوە لە قاڵبە پێشووەکانی خۆیان! واتە زانیویانە چەند جار ڕۆحیان نە لەشیـان جودا بووەتـەوە! هەروەکـو فیثـاگـۆرسی یۆنـانی (٥٧٢ پ ز) کۆچی دوایی کردووە کە ڕابـەرو داهێنەری ڕێبازێکی ئاینی و سۆفی گەری و کۆمـەڵاتی بووەو ڕێبـازەکـەشی بە ناوی خۆیەوە بە (فیثاگۆریزم) ناسراوە، دەربـارەی ئەم دیـاردەیـەو نەفسی ئادەمیزاد بەم جۆرەی بۆچووە: «نەفسی ئادەمیزادیش بە پێی ژمارەو ئاواز ئافەریدە کراوەو بۆ سزادان خراوەتە لاشەی ئادەمیـزادەوە، دەربـاز بوونی نەفس تەنیـا بە مردنی ئەو کەسە دەبێت و ئەوسا کە لە لاشەی جیا دەبێتەوەو دەگەڕێتەوە بۆ بەر لاشەی گیـان لەبــەرێکی تر...»[79] لەم بارەیــەوە وتــراوە کە فیثـاگـۆراس وتوویەتی: «من لە یادمە کە پێنج جار نەفسم [ڕۆح]م، لە لەشم جیا بۆتەوەو لە دۆزەخ دا پاك بۆتەوە...».[80]

لێرەدا دەڵێین ئەم جۆرە بابەتە فەلسەفی یە تێکەڵ بووەی فەلسـەفەی سۆفیزم لە کاتی خۆی‌دا لە ناوچەکانی شارەزوورو هەورامان دا باوی بووە، بە تایبــەتی لە سەردەمی ئیمــارەتی ئەردەڵان دا زۆر لە ڕێبـازو ڕێـرەوە ئاینی‌یـە نهێنی‌یـەکان[81] دەرکەوتن و هەڵگری چەند لایەنێکی ئاینی و داب و نەریتی کۆمــەڵایــەتی ڕابـوردووی خۆیـان بوون و ئەم جۆرە بیـرو باوەڕانـەی گەورە پیـاوانی فەلســەفـە کاری تێ کردوون و لە گەڵ بیــرو باوەڕەکــانی خۆیــان دا تێ هەڵکێشیــان کردن. نەك هەر ناوچــەکــانی شارەزوورو کۆمـەڵێـك لە کوردەواری تێکـەڵ بەم جۆرە بیــرۆکـانــەی فەلســەفـە بوون، بەڵکـو لە ڕێگـای فەلسـەفـەکـاری سۆفیـزمی یـەوە ئەم بابـەتـە دێـرینانە هاتوونەتە ئاراوەو زۆربەی گەلانی جیهان بڕوایان پێ بووە.

**بابا ناوز (٥٠٠ك):**

---

ئەم سۆفی‌یە پایەبەرزە بە نێوی (بابا ناوز)ی سەرگەتی شارەزوور ناسراوە (سەرگەت دێ‌یەکە دەکەوێتە ڕۆژهەڵاتی خورماڵ)، هەروەها بە چەنـد ناوێـك بە ناوبـانگ بووە وەك (بـابـائـوەیس، بابـانـەوس، ناووس، ناوون)و[82] یەکێکــە لەوانــەی پێش پەیـدابـوونی (سـوڵتـان ئیسحاقی بەرزنجی ـ ٧١٦ك)، ویستوویەتی ڕێبازی سۆفی گەری لە شارەزووردا دامـەزرێنێ، بەڵام بۆی نەچـووەتـە سەر. بابـانـاوز ناوی ڕاستــەقینــەی (ئیبـراهیم)و لەنـاو خەڵکی سەرگـەت دا بە (بلە شێتە)و (نـاوزە شێتـە) ناسـراوبووە، هەر لەم گونـدەش هاتـووەتە دنیاوەو ناوی باوکی (ئەحمەد)و ناوی دایکیشی (خاتوو گوڵێ)یە. ئەم زاتە خاوەنی زۆر لە زانیاری‌یە ئاینی و بیری‌یەکانی ئەو دەمە بووە پێش ئەوەی لە لایەن خەڵکی‌یەوە بە شێت لە قەڵەم بدرێت، ئاشنای بارەگای یەزدان بووەو، دەڵێن زۆر لە دونیـا دوور کەوتبـووەوە قســەی سەرسـوڕهێنەری فەلسەفی وای کردووە بۆ دانیشتوانی خورماڵ و هەردوو دێی سەرگەت و گوڵپەت (گوڵـپ). کە بە لای ئەو خەڵکەوە نیشانەو بۆنی نامۆیی و بێ ئاگایی لەو قسانەی‌دا بەدی‌کراوەو ناوچەی شارەزووری وروژاندبوو، بە تایبەتی لە کاتی جەزبە ـ حاڵ لێهاتنی‌دا قسەی وای کردووە کە لەگەڵ بیرو باوەڕی مرۆڤی ئاسایی‌دا نەگونجێ، دیارە لە فەلسەفەی سۆفیان دا بەم جۆرە مرۆڤـانـەیـان وتـووە (فنـاء في الله) یانێ لە خودا تواونـەتەوە ئەوەندەیان بیر لێ کردووەتەوە.

لەبەر ئەوەی لە باباناوز دەدوێین، با بزانین نوسەران چی‌یان دەربارە وتووە:

أ ـ مامـۆستـا عبـدالکـریم مدرس لە کتێبی (بنەماڵەی زانیاران)دا، لە بارەی سەیـدەکـانی (سـەرگـەت) نووسیـویـەو دەڵێ: «ئـەم بنـەماڵەیە دەڵێن: لە نەوەی سەیـدێکی پیـاوچـاك و بەڕێـزو لە خودا ترسن، کە ناوی سەید ئیبراهیم و بە (بابانەوس) ناسراوە، بابانەوس لە مێژووی پێنج صەدی کۆچی‌دا لە ژیان دا بووەو هاوچەرخی سەید مصطەفای (عریضی) ناسراو بە پیر شەهریاری مورشیدی هەورامی بووە».[83]

دیسان مامۆستا عبدالکریم دەڵێ «بابانەوس برادەرو دۆستی (قازی بەنێ‌و)،[84] (شێخ عەلی‌خان) بووە. قازی بەنێ لە دێی شیوی قازی لە ناحیەی قەرەداخ دا نیشتەجێ بووەو، شێخ عەلی خان لەو دێ‌یەدا کە بە ناوی خۆیەوە بە (شیلەخان)ە کە سوککراوی شێخ عەلی‌خانە ـ لە ناحیەی سوورداش پارێزگای سلێمانی‌دا بووە»[85]

ب ـ مامۆستا محمود أحمد محمد لە (گۆڤاری کاروان)دا[86] بەڵگە نامەیێکی مێژوویی نایابی بڵاوکردووەتەوەو، بریتی‌یە لەوەی یەکێك بە نێوی (سەید ئیبراهیم)و لە ساڵی (٥٣٠ك)دا، لە کۆتایی قورئانێکی پیــرۆزی دەسنـووس دا کە خۆی ڕەنـووسی کردووە، بڕێ یادگـاری و نوسینی تۆمار کردووە لە دەنگ و باسی ناوچەی شارەزوورو بەسەرهاتی باو باپیرانی بنەماڵەکەیان بۆ نەوەکانی... جا ئەوەی مەبەستی ئێمەیە لێرەدا، باسی باباناوزە کە لەم بەڵگە نامەیەدا ناوی هاتووەو ئێمەیش دەقی ئەو شوێنانە دەنوسینەوە، ئەمەش دەقی شوێنەکانی ناو بەڵگە نامەکەیە کە (سەید ئیبراهیم) دەڵێ: «نعم اني بعد قطع المسافات غير القليلة وصلت قرية (جبراباد ـ جەوراوە) شرقي شهرزور وكان في القريـة رجـل شريـف وقـائم باداء امـامـة القرية اسمه خواجه آصف وكنيته (باباناواز) وبقيت ضيفاً على القرية وكان لي حب السؤال عن اسماء الامكنة المحيطة بالقرية... حيث يشرح لي (بابا ـ باباناوز) ما كنت اسأله من هذا القبيل... بعد هذا اشار لي بابا بأن ابن عمي موجود في قرية (آورامان ـ هەورامان)...»[87]

## پیر میکائیل داودانی:

ئەم زاتەش یەکێکە لە پیاوچاکانی ڕێگای سۆفی‌گەری‌و، ماوەیەکی درێژی تەمەنی لە شارەزوور بەسەر بردووە، باپیرانی پیر میکائیل لە کاتی خۆی‌دا لە ناحیـەی جوانـرۆ لە دێی داودان گیـرسـابـوونـەوە، زەوی‌وزارێکـی زۆری ئەو ناوچـانـەش موڵکی ئەمـان بووە. بەڵام نەتەوەی پیرمیکائیل بۆ ماوەیەکی زۆر لە دێی (دەودان ـ داودان) ماون و پاشـان بە بۆنـەی هەنـدێ کارەسـاتی جیهـانی‌یـەوە ڕوو دەکەنە (کۆی سنجـەق)و جێگیـر دەبن و مەولانـا خالیـدی نەقشـبەنـدی یەکێکە لە ناودارەکانی بنەماڵەی ئەم پیر میکائیلە. .[٨٨] ئەم زاتە خاوەن کەشف و کەرامات بووەو دەنگ و باسی پیاو چاکی‌و خواناسی دەنگی دابووەوەو گەلـێ کاری پڕ لە کەرامـات بە دەمـیـەوە گێـردراوەتـەوە لە ناو کەشکـۆڵـەکـانی ڕێبازی سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی‌دا. خۆ ئەوە هیچ کاتێك ئینکار ناکرێ کەوا لەنێوانی خۆی‌و سوڵتان ئیسحاق دا گفتوگۆو کەرامەت نواندن بە یەکتر ڕووی داوە، بە داخەوە باسی کەرامەت و گەورەیی‌یـان بە هۆی گێـڕانـەوەی دەمـاو دەم خراوەتـە ناو چوار چێوەی ئەفسـانە لە لایەن خەڵکی‌یەوە، بۆ نموونە بڕوانە ئەو باسەی کە مامۆستا (پیرەمێردی نەمر) کە لەسەرزاری کۆمەڵانی خەڵکی‌یەوە گێڕاویەتی‌یەوەو مامۆستا (غفور میرزا کەزیم) لە گۆڤاری (ڕۆشنبیری نوێ)دا[٨٩] بڵاوی کردووەتەوە. ئەو بابەتە هەرچەندە جل وبەرگی ئەفسانەی لەبەر کراوە، بەڵام لە حەقیقـەت دا باسـەکـە پەیـوەنـدی هەیـە بە (پیـر میکـائیـل داودانـی)و (سـوڵتـان ئیسحـاقی بەرزنجی)یـەوە، لە کاتی چوونی ئیسحاق بۆ ئەو ناوچەیەو دروست کردنی (شاری پردیوەر)ی کاکەیی‌یەکان.

## عێل بەگی جاف:

لایـەنێ فیکـری‌و دەروونی ئەم زاتـەش دەریایەکی پان و بەرینە. . لەو کات و سەردەمەی لە شارەزووردا دەژیا، مێشکی خۆی تەرخان کردبـوو بۆ عالـەمی مەعنـاویـات و ئەو نهێنی‌یـانـەی مرۆڤی سادە نایـان گاتێ‌و بیـری بۆ ناچێ‌و هیچی لێ ناگـات، بێ‌گـومـان ئەم بیـرکـردنـەوەیـەش کەم کەس دەیگاتێ «جێگای بەربەرەکانێ نی‌یە کە ئادەمیزاد خۆی لە خۆی‌یا لە ماددیاتە، چونکە ئەم لەشەی کە هەیەتی گۆشت و خوێن و ئیسقـانـە، ئەمـانـە هەمـوو لە ماددەن، هەر لەم ئادەمیـزادەدا ئەنـدێشـەو بیرو باوەڕ هەیە، ئەمانە هەموو لە مەعنەوین. کاتێ ئەو ئەندێشەیە ڕوو بەڕووی جەوهەرێکی واقعی بووەوە، وردە وردە لەو جەوهـەرە ڕوونـاکی وەردەگـرێ تا وای‌لێ‌دێ خۆی دەبێ بە کۆگایەکی نوور. ، کە گەیشتە ئەم پلەیە، ئەو بەرەیە زاڵ دەبێ بەسەر بەرەی ماددیاتەکەی‌یاو ئەو ماددیاتە نموودێکی نامێنێ»[٩٠]

جا کاتێ عێـل بەگیش گەیشتـووەتـە ئەم پلەیـە، لەو نهێنیانەوەو کە پێی گەیی‌وە، زانیویە مرۆڤ پاش ماوەیێك لە ژیان. . گۆڕانکاری بە سەردا دێ‌و هەستـەکـانی مێشکی توانیـویـانـە ئەو قۆنـاغـانەی کات و سەردەم ببڕن و ئاگاداری بکەنەوە بەوەی فلیمی ئەم چەرخەو ڕۆژگارەی بهێننە پێش چاوانی‌و وێنەی بگرن و ئەویش بتوانێ بەو جۆرە بڵێ کە چۆن مرۆڤ لە دوای ماوەیێك گوزەران کردن لە ژیان، گۆڕانکاری بەسـەر داب و دەسـتـوورو نەرێتـە کۆمـەڵایـەتی‌یـەکـانی‌دا دێ‌و پێـداویسـتـەکـانی خۆی لە شتی نوێ‌و پێشکەوتوودا. دەدۆزێتەوە، کە ئەمـەش لای خەڵکی بە (پێش بین) ناسـراوە. ئاشکـرایـە لە نێـوانی سۆفیزم و فەلسەفەدا جیاوازی هەیەو لە چەند خاڵێکی کەم دا یەکانگیر دەبن. فەلسەفە پەنا بردنە بەر بیر کردنەوەو سەرنج دان و لێکۆڵینەوەیە، بەڵام سۆفی‌گەری جۆرە تاقی‌کردنەوەیەکی (ڕۆحی ـ گیانی)یەو، سەر بە بەرەی فەلسـەفەی میتافیزیکایە، کە بە فەلسەفەی ئەودیوسروشت نێو دەبـرێت و پەنـا بردنـە بەر چاوو دڵ و ناخی ناوەوەیـە، سەرچـاوەی لە عالـەمێکی گیـانی‌یـەوە دێتـە ئاراوەو پەیدا دەبێت، «سەرچاوەی ژیانی مرۆڤ دڵ و دەروونیـیـەتـی، دڵ و دەروون کە پاك کرایـەوە، کردەوەو ڕەفتاریش پاك و جوان دەبێ، تەسەوف هەوڵ دەدا دەروون پاك کاتەوە لە هەمـوو خەوشێ، لە هەمـوو باوەڕێکی ناشیـرین و ناپـەسـەنـد، بە ڕادەیێك تا وای لێ‌دێت شایستەی ئەوە بێت کە نوری خودای تێدا دابەزێت»[٩١]

بەدی‌کـردن و تێـروانینی‌و بوونی بۆچـوونی جیـاواز لە نێـوانی ڕێبازە فەلسـەفیەکانی سۆفی گەری‌دا، دەگەڕێتەوە بۆ بڕینی هەنگاوی درێژی ئەم ڕێگـایـەو گەیشتن بە پلەو مەقـامـەکانی. تەسەوف لای بەشێکیان و لەگـەڵ فێـربـوونی زانستە ڕووکەشەکانی دنیایی کە ئادەمیزاد پێویستی پێی هەیـە بۆ شیتـەڵ کردنی بیـرەکـانی. دەربـارەی بوونی بیـروڕای پێچەوانەی یەکتر لە ڕێبازەکانی گەورە پیاوانی تەسەوف دا بە گشتی‌و فەلسـەفەی سۆفیزمی ناوچەکانی شارەزوور بە تایبەتی، دەگەڕێتەوە بۆ چەند هۆیەك؛ بەشێ لەو ڕابەرە گەورانەی تەسەوف هەڵگری زانست و بیـرو باوەڕی کۆمـەڵایـەتی خۆیـان و بیگـانـە کاری تێ‌کـردوون لە شی‌کـردنـەوەی بابـەتـە جۆر بە جۆرەکانی ئایینی‌و سۆفی گەری‌دا، بە تایبـەتی بۆنی بیـری فەلسـەفـەی یونـانی وەکـو ئەفـلاتـون و ئەرەستۆ. نەیان توانیوە هیچ کاتێك خۆیانی لێ ڕزگار بکەن. دەڵێن مەنصوری هەلاج (٣٠٩ك) ویستـوویـەتی ڕێبـازی سۆفی‌گـەری تێکـەڵاوی فەلسەفەی یۆنانی بکات و لە دوای ئەویش گوایە ئیمامی غەزالی ئەو ڕێگـەیـەی گرتـووەتەبەر. .[٩٢] مەولانا جەلالەدینی ڕۆمی (٦٠٤ك)،

ـە یەکێک لە زاناو پێشەوایانی فەلسەفەی سۆفی‌گەری ناسراوە، ـەربارەی مردن و زیندووبوونەوەو ڕۆژی دوایی دەڵێ: «لەبەر چی‌یە ـەرسان لە مردن؟ بۆچی ئەم ڕاکردنە لە مردن؟ تۆ بەردەوام لە حوڵان دای لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێکی‌تر، لە نەبوونەوە بۆ بوون، وە لە ـوونەوە بۆ نەبوون، هەروەها تۆ بەردەوامی لە بەرگ داکەندن و ـەرکردنی بەرگێکی‌تر، هەتا وەکو لەو چوار توخمەوە گەیشتیتە قاڵبی مرۆڤایەتی...»[93]

ـێرەدا دیارە کە مەولانای ڕۆمی خۆی لە فەلسەفەی (تناسخ الارواح) واتە (دۆنای دۆن) دەدات و ڕەنگە هەڵگری بیروباوەڕی کۆمەلایەتی کاری تێ‌کردبێت. نەتەوەی کوردیش لە شارەزوورو هەورامان دا، کاتێک ئایینی ئیسلام ڕووی تێ‌کردن.. ئەو دەمە ئەمان ـەر ڕێبازو ئایینی (ماریفەت و پیرشالیار)ی بوون، بیروباوەڕی ـیەتی‌و ئایینی خۆیان هەبووە سەبارەت بوون و دروست بوونی مرۆڤ و زەوی‌و ئاسمان و مردن و زیندووبوونەوە... کاتێکیش موسڵمان بوون، ناتوانین بڵێین کارتێ‌کردنی ئەو بیرو باوەڕەیان لە مێشک دا نەمابووەوە، ئەوەتا بە گوێرەی یاداشتەکانی کابرایێک بە ناوی (سەید ئیبراهیم)و لە مێژووی (٥٣٠ك) لەژیان دا بووە لە گوندی (هەورامان)و دەڵێ: لەم گوندەدا پیاوێکی خاوەن پایە هەبووە بە ناوی (شالیارە سیاو) کە هێشتا لەسەر ڕێ‌و شوێنی کۆنی[94] یانە ـ [زەردەشت]. ناوچەکانی هەورامان تا ساڵی (٨٤٢ك) بەهۆی سەختی شوێنەکەیانەوە، هەر بەسەرزار موسڵمان بوونەو لە ژێرەوەش لە سەر ڕەوشتی ماریفەتی پیر شالیار ڕۆیشتوون.[95]

جا ئەو سۆفی‌یە گەورانەی کورد شار بە شار گەڕاون بە دوای زانست و زانیاری‌و فەلسەفەو بیرەکانی فەلسەفەی ڕێبازە سۆفی گەری‌یەکان، لە شارەزوورەوە بۆ هەمەدان و تەورێزو لەوێشەوە بۆ سەمەرقەندو بوخارا، پاشان حەلەب و بەغدا... ئەم شارانەیان پشکنیوە، لە هەر شارێک بیرێک و لە هەر مورشدێک، مەقامێک و فەلسەفەیەکی سۆفی‌گەری‌یان بە دەست هێناوەو فێر بوونە. ئەو سۆفی‌یانەی گەیشتوونەتە چلە پۆپە لە تەسەوف و فەلسەفەکاری‌دا، ڕوویان کردووەتە مەڵبەندی دایک زادەی خۆیان، بە هەگبەیەکی پڕ لە زانیاری‌و خورەوشتی بابەتی نوێ کە لە ناوچەکەی خۆی‌دا بەدی نەدەکرا، ئەمانە کاتێ ئەو جۆرە زانیاری‌یە تازە بابەتانەیان لە فەلسەفەی سۆفی‌گەری پێشانی خەڵکەکەدا، هەندێ بابەتی ناو هەگبەکانیان لای ئەو خەڵکە پەسەند کراو لەوانەشە بڕێکی پەسەند نەکرابێ. جا کاتێ هەندێ لەو جۆرە بیرۆکانەی کە پەڕیوەتە ناو فەلسەفەی سۆفی گەری‌یەوە، کاری لە هەندێ کەسانی سۆفی کردبوو لە ناو کۆمەڵگای کوردەواری‌و سەر گەرمی لێکدانەوەی ئەو چەشنە بیر کردنەوانەیە

بوون...»[96] کە سەرنجی ئەم چەند دێرە هۆنراوەیەی شاعیری کوردستان (خانای قوبادی) بدەین، لە داستانی (شیرین و خوسرەو)دا، ئەم دیاردەیەی فەلسەفەی (دۆنای دۆن)ی ئەو سەردەمەی کوردستان پیشان دەدات، کە لەوانەیە (خانا) هەڵگری بیرو باوەڕە کۆمەلایەتی‌یەکەی بێت، ئەوەتا بە دەمی شیرینی خۆشەویستی خوسرەووەوە، بۆمانی دەگێڕێتەوە کاتێ (خوسرەو) بە دەستی (شیرۆ)ی کوڕی دەکوژرێ، (شیرین)یش، دەست دەکاتە شین کردن بۆ خوسرەوو، (خانا)ی مەزنیش بە دەمی شیرینەوە دەڵێ:

«چەند کەردش فەریاد فوغان و بێ‌داد
ئەووەڵ پەی خوسرەو، ئاخر پەی فەرهاد.
بێ‌دادم جە دەس چەرخ (دوونا دوون)
زەمانەی سفڵەی بێ شەرط و بێ شۆن»[97]

وشەی (دوونا دوون) لەم شیعرەدا، دەبێ بەم جۆرە گۆ بکرێ (دۆنا دۆن)، لەبەرئەوەی لەسەر کێشی وشەی (شۆن) هاتووە. (دۆن = شێوە، بەرگ، جامە، قاڵب)و زاراوەیەکی کوردیی گۆرانی ڕەسەنە. خانای قوبادی درێژە دەدات بە هۆنراوەکەی‌و دەڵێ:

کەس تا سەر نە سای چەرخ چەپی‌واز
جە دام دەوران نەبی سەر فراز
دەور (دوونا دوون) مایەی مەکرو فەند
چەرخت چەپەر بۆ تا (هەزارو ئەند»[98]

واتە کەس تا کۆتایی ژیانی لە ژێر سێبەری چەرخی چەپگەردا، لە داوی (دەوران ـ سوڕان) سەر فراز نەبوو، بە شادی نەسرەوت. (دەور ـ مرحلە، سوڕ)ی (دۆنای دۆن)، کە مایەت مەکرو فێڵە، چەرخت هەر شین و زاری‌و واوەیلا بێ.. تا ئەو ڕۆژەی کە (ڕۆژی دوایی دێت و تۆیش لە دەوران و سووڕی خۆت دەکەویت.

★ ★ ★

**جـ ـ (شارەزوور)و ئەردەلانی‌یەکان:**

دێینە سەر پەیوەندی شارەزوورو بنەماڵەی ئەردەلانی‌یەکان، بە هۆزی (کاکەیی)یەوە لە ژێر تیشکی بۆچوونەکانی نووسەران دا.

بابا ئەردەلان بە بناغە دانەری دەوڵەتی ئەردەلان دەژمێردرێت، کە یەکێک بووە لەوانەی توانیویەتی هۆزەکانی (گۆرانی)ی ناوچەی شارەزوور یەک بخات لە کوردستان دا. بابا توانیویە بە هۆی کەس و کارو هۆزەکەیەوە سوود لە هەڵوەشاندنەوەی دەسەڵاتی خەلیفەکانی عەباسی وەرگرێ، واتە لە کۆتایی عەباسی‌یەکان دا دەوڵەتی ئەردەلانی کوردی دامەزراوەو توانیویەتی بۆ ماوەیەک دەست بەسەر شارەزووردا

بگـرێت و له ساڵی (١٢٨٤ك) لەنێـو براوه. مامـۆستـای مێـژووزان جەمیـل ڕۆژبـەیـانی دەڵێ «. . . ئەم دەوڵـەته به سەربەخۆیی مایەوەو درێـژەی کێشـا له سەردەمـەکـانی جەنگیـزیو تەتـەریو ئیلخـانیو تەیمـووریو قەرەقـۆینلوو ئاق قۆینلوو، چەنـد ساڵێکیش له سـەردەمی دەوڵەتی سـەفەویدا، هەوڵ و کۆششی دەکرد بۆ مانەوەی ئەم بەشەی کوردستان به سەر بەخۆیی بۆ ماوەی چوار سەدە، بەڵام (خان ئەحمەد خان)ی ئەم بنەماڵەیەی ئەردەڵان. . پەیوەندیی له گەڵ شاهـ عەباسی سەفەوی پەیدا کردو (کڵاو زەڕ = کڵاو زێڕین)ی خوشکی ماره کردو خۆی دایـه پاڵ شاهـ عەبـاس له پێش داو، پاشـانـیش لێیـان هەڵ گەڕایەوەو، له گەڵیان دا جەنگی. به مردنی خان ئەحمەد خان له ساڵی (٦ط١٠٤ك/ ١٦٣٦ز)، دەوڵـەتی ئەردەڵان بۆ سەفـەویـیـەکان سەری دا نـوانـدو بووه وڵایـەتێکی سەربـەوان و به شێـوەیـەکی نیمچـه سەربـەخـۆ مایـەوه له سەردەمـەکـانی ئەفشـاریو زەنـدیدا. بەڵام له سەردەمی قاجارییەکان دا. . شـاهـ ناصری قاجاری ئەم دەوڵەتەی به یەکجاری له ساڵی (١٢٨٤ك) له نێو برد»[٩٩]

سەبارەت به ڕگەزو بنەچەی بنەماڵەی (بابا ئەردەڵان) چەند بیرو ڕاو بۆچوونێك هەیه، وا لێرەدا دەیان خەینه پێش چاو:

١ ـ شەرەفنامه دەڵێ: «به ئاگایان له کەونه ڕۆژگاری فەرمانڕەوایانی کوردستـان و شوێن هەڵگـرانی شوێنـەواری ئەتـابیکـانی لوڕسـتـان، بنچینـەی فەرمـانـڕەوایی ئەردەڵانی دەگێڕنەوه سەر ڕەسـەنی خونکارانی دیـاربکـر. که ئەوانیش له نەتـەوەی ئەحمـەدی کوڕی مەڕوانن. بابـا ئەردەڵان ناوه بۆ پیاوێك که چەند سەردەم و تاوێك له ناو هۆزەکانی گۆران دا ژیانی ڕابواردووه، له بەرەو دوای جەنگیزی یەکان دا دەستی به سەر شارەزووردا گرتووەو ئەمیرایەتی لێ دامەزراندو، ئەوسا ناوی بابا ئەردەڵانی گۆڕیوەو کردوویه به قوبادی کوڕی فەیروزی ساسـانی!!»[١٠٠]

٢ ـ مامـۆسـتـای خوالێ خۆش بوو ئەمین زەکی بەگ وتـوویـەتی: «ڕیـوایـەتی (چـوار عەصـری دوایی عێـراق)یش، له ئەسـاس دا وەکو ڕیوایەتی شەرەفنامه وایه بەڵام دەڵێ: (بابا ئەردەڵان) له خانەدانێکی قەدیم و نەجیبی دیـاربـەکـر بووەو هیجـرەتی کردبـووه ناو عەشیـرەتی گۆران، وه ئەوەنـدەی پێ نەچـوو نفـوذی پەیـا کرد وه عەشـائـری شارەزوورو خێڵانی دۆڵانی شەرقی هەورامانی کرد به تابعی خۆی، وه که جەنگیزخان هاته ئەو ناوه، حکومەتی (بابا ئەردەڵان)ی تەصدیق کردووه»[١٠١]

٣ ـ ڕۆژهـەڵات ناس و گەڕیـدەی ئینگلیـز (مستـەر ڕیـچ) وتوویەتی: «خـانـەدانی بنـەمـاڵـەی ئەردەڵان، له ڕەگەزو بنەچەك دا (گۆران)و له تیرەی (مامۆیی) ین»[١٠٢]

٤ ـ ئیسمـاعیلی کوری مەلا محمـەدی حوسێن، نوسـەری تاریخی ئەردەڵان وتـوویـەتی: «بـابـا ئەردەڵان له جێی خۆی پەڕیـوه بووەو له مەڵبـەنـدی پاڵنگـان دابـەزیوەو له دوارۆژدا له سۆنگەی مەئمون بەگی کوڕی مونزری نەوەیەوه ناوی (مامۆیی)یان به سەردا براوه»[١٠٣]

٥ ـ مامۆستا ڕۆژبەیانی لەم بارەیەوه دەڵێ: «. . . له دوای وەرگێڕانی شەرەفنـامـەو ورد بوونـەو قووڵ بوونـەوەم لەو ناوچـانـەی ئەم دەوڵـەتی ئەردەڵانەی تێدا پەیدا بوو، گەیشتمه بیرو باوەڕێك که هیچ کام له مێژوونووسانی کورد بیریان بۆ نەچووه، کەوا (بابا ئەردەڵان) یەکێك بووه له پیرەکانی (گۆران)ی کاکەیی یەکان و (بابا) واتا وشەی (پیر ـ شێخ)ی ڕێباز دەگەیێنێ، وشەی (ئەردەڵان)یش گۆڕانکاری به سەردا هاتووه (هەردەڵان ـ شاخەکان، تەپۆڵکایی یەکان) دێت و ئەو ناوچانەی (هـاوار، داودان، نەوسـود، شێـخـان، زەڵـم) له کاتـی خۆیدا دانیشتوانی کاکەیی بوون، شەرەف خانیش ئاماژەیێکی کەمی بۆ ئەم باسه کردووه بەوەی وتوویەتی: وا دیاره دەسـەڵاتی ئەم دەوڵەته کۆتایی پێ هات بۆ فەرمـانـڕەوا (پیـر بۆداق بەبـەیی ـ بابـایی) که واتـای ناز ناوەکـەی گۆ کردنی (بـابـان) دەگـەیێنێت. ئەمانەی ناویان دەبەین وەکو (بـاوه محـەمـەد، باوه پڵاوی، باوه شاسـوار، باوه یادگار. .[١٠٤] پیره مەگـرون و پیـر مەسـویـرو پیر شالیار، ئەمانه هەموو له سەرۆکه پیرۆزه ئایینییەکانی کورد بوون»[١٠٥]

مامۆستا ئەمین زەکی، بەرامبەر به بۆچوونەکەی (مستـەر ڕیچ) که وتوویەتی خانەوادەی بنەماڵەی ئەردەڵان له ڕەگەزو بنەچەدا گۆرانن و له تیرەی مامۆین، وتوویەتی: «تەدقیقاتی ئەم موئەرخه له عەقڵ زۆر نزیکـەو دەبێ به قوەتی عەشیـرەتـەکـەیـەوه بەسەر عەشائری ئەو ناوەدا زاڵ بوویێو حکومەتی دامەزراندبێ. .»[١٠٦]

منیش لەم بارەیەوه زانیارێیك دەخەمه سەر ئەو بۆچوونانەی ڕیچ و ئەمین زەکی بەگ و دەڵێم لەنـاو کوردا له هۆزەکـانی گۆران تیـرەیێـك هەیـه که به (مـام ـ مامـۆیی) ناسـراون و له ڕەچـەڵـەك دا کاکـەیین و خۆیان به گۆرانی شارەزوور دەزانن، ئەمانه له کۆن دا هۆزێکی گەوره بوونـه، به تایبـەت لەو کات و دەمـەی پێشـەوای کاکەیی یەکان سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی که خۆی خەڵکی (بەرزنجە)ی ناوچەی کرمانجی شارباژێر بوو، ڕووی کرده ناویان و ڕێبازه سۆفیزمییەکەی له ناویان دا بڕیـار داو، زمـانـەکـەی ئەوان که (ماچۆ ماچۆ)ی گۆران بوو، وەك زمانێکی ڕەسمیو پیرۆز بۆ ڕێبازەکەی هەڵبـژارد. جا ئەو تیـرانـەی به (تفـەنگچی) به ناویـانگن سەر بەم تیرەیەن و گۆران یان پێ دەڵێن. دەشێ بابا ئەردەڵان هەر وەکو (ڕیچ) وتوویەتی له بنەچەك دا (گۆران) بێو سەر به تیرەی (مامۆیی) بێ، که ئەمین زەکی بەگ پاڵپشتی بۆچوونەکەی دەکات.

ئەگەر سەرنج لە نووسینەوەکانی (مەئمون بەگی بێگە بەگ)ی ئەردەلانی بدەین، کە بریتی‌یە لە نووسینی بیرە وەری‌یەکانی خۆی بۆ (سولتان موراد‌ی سێیەم)ی عوسمانلی بە هۆی دانیشتنیەوە لە سەر تەختی پادشایی، دەبینین باسی بەسەرهات و فەرمان ڕەوایی دەسەلاتی خۆی‌و باوکی‌و بارو دۆخی ناوچەی شارەزوور دەکات، هەروەها لە پێشەکی نوسراوەکەی‌دا باس و پێناسەی ڕشتەی مەسەلەکەیان بۆ سولتان موراد دەردەخات و خۆی دەباتەوە سەر مەسەلەی (عادلانی)، ڕای کردووە لەو ڕاستی‌یەی کە بزاندرێت ئەم فەرمانرەوایەی ئەردەلان، یەکێکە لە بنەماڵەی بابا ئەردەلان. لێرەدا پەنا ئەمەینە کتێبی (مذكرات مأمون بك بن بيگه بك)، کە وەرگێرانی کتێبەکە لە پەراوێزدا لەم بارەیەوە بەم جۆرە دەدوێن: «لە پەندو قسە موتەفەقەکانەوە هاتووە کە خەڵکی بڕوایان بە ڕەچەڵەکی خۆیان هەیە. لەگەڵ ئەمەش دا ئێمە لەو بڕوایە داین کە (مەئمون بەگ) نازناوی (عادلانی) بۆ خۆی هەڵبژاردووە کە دەگەڕێتەوە بۆ ناوی دروست کراوی باپیرە گەورەی! ڕای کردووە لەوەی کە بزاندرێ لە بنەماڵەی بابا ئەردەلان و لە سەرۆکەکانی (گۆران)و لە پیاوە پیرۆزەکانی (کاکەیی)یە، کە بە نازناوی (باوە = بابا)وە ناسراون. لەبەرئەوەی سوڵتانی عوسمانلی دەزانێ ئەم خێزانە کاکەیی‌یانە دەگەڕێنەوە بۆ سەر ئایینێکی...، هەر لەو بڕوایەوە (بابا ئەردەلان)یش، ڕەچەڵەکێکی بۆ خۆی دۆزیوەتەوە، خۆی بردووەتەوە سەر بنەماڵەی (مەروان)ی‌یەکان و... ئەمیشیان هەر لەبەر هەمان بوختان لە ڕاستی ڕای کردووە. مامۆستا جەمیل ڕۆژ بەیانی‌یش لە پاش وەرگێرانی (شەرەفنامە)، کۆبوونەوەیەکی لەگەڵ مامۆستا (تۆفیق وەهبی)دا بەستووە دەربارەی چاوگی وشەی (بەبە)، کە گۆڕانکاری بە سەرداهاتووەو بووەتە (بابان)و ڕازیشی کردووە بەوەی وشەی (بەبە) لە (باوە)ی کاکەیی‌یەوە پەیدا بووەو هاتووەتە ئاراوە. جا مامۆستا تۆفیق وەهبی وتارێکی نووسیوەو تیای‌دا دیاری کردووە کە وشەی (بەبە) دەگەڕێتەوە بۆ وشەی (باوە)، کە فەرمان ڕەوایانی بنەماڵەی (بابان) لە ڕەچەڵەك دا، لە پیاوە پیرۆزەکانی کاکەیی‌یەکان بوونە»[107]

ئەگەر بێت و ئەم بۆچوونانە مەبەست بێکن کەوا بابا ئەردەلان و مەئمون بەگی نەوەی. . لە ڕەچەڵەك دا لە (کاکەیی)یەکانی (گۆران) بن، ئەوا ئێمەیش دەڵێین: دیارە هۆی ڕاکردنی باوە ئەردەلان و مەئمون بەگی نەوەی لە ناوو نازناوی ڕاستەقینەی بنەماڵەکانیان ر پەنا بردنیان بۆ چەند ناوو نازناوێکی بێگانەو خۆحەشاردانیان لە پەنای ئەو ناوانەدا، ئەوە دەگەینێ هەر کۆنەکان دا زۆرجار هێرش براوەتە سەر هۆزو تیرەکانی کاکەیی‌یەکان و شارو دێهاتیان تێك دراوە لە لایەن کۆنەپەرستانی هەردوو دەوڵەتی عوسمانلی‌و ئێرانی‌یەوە، بەوەی هەر جارەی هانی لایەك لە دانیشتوانی کوردستانی سەر بەم دوو دەوڵەتە داگیرکەرو تاڵان کەرانە دراوە بۆ دەر پەڕاندنی هۆزی کوردی کاکەیی لە ناوچەو شارو دێهاتەکانی (هاوار، نەوسود، شێخان، داودان، زەڵم، سەرگەت، گوڵپەت، سازان، مۆردین، پردیوەر، سەراو، عەربەت ... هتد) بە ناوی ئەوەی ئەمانە بیرو باوەڕی ئایینی‌یان جیاواز بووە لەگەڵ خەڵکی ناوچەکانی دەوروبەریان! هەر لەبەر ئەم جۆرە کێشانە، گەلێ تیرەو هۆزی کاکەیی‌یەکان لەو ناوچەو شوێنانەدا بڵاوەیان لێ کردووەو خۆیان لە دەشتی پان و بەری شارەزوور بێ بەری کردووە. شاعیری کورد (مەحوی) لە کاتی خۆی‌دا ئەو جۆرە هێرشانەی براوەتە سەر هۆزی کاکەیی لە شارەزووردا بیستووەو تێکەڵاوی شیعرەکانی کردووە، بەڵام ڕوداوەکەی بە شێوەیەکی نەبوو نەکراو وەرگرتووە وەك دەڵێ:

«دنیا بە حیلە مەیلی بە ئەبنای ئەگەر ببێ
ئەم (دایە ڕێزبارە)، بە فرزەندی شو دەکا»[108]

لێکۆڵەرانی (دیوانی مەحوی) دەڵێن: «... لەناو موسڵمانانی ئەو ناوچانەدا کە کاکەیی‌یەکانیان تێ‌دا دەژین وا مەشهورە وەختی خۆی خێڵی کاکەیی تەفرو تونا کراون و کەسیان لێ دەر نەچووە ئافرەتێکی دووگیان نەبێ...»[109]

**سەرەنجام:**

---

ئەم نوسینەی ئێمە کە بە ناو جەرگەی دەشتێکی پان و بەرینی (شارەزوور)دا خولایەوە.. دوا وشەمان ئەمەیە دەڵێین: شارمزوور جێگاو شوێن و زەوی‌و شاخ و تەپۆڵکەو دۆڵی، کانیاوو چەمی پاك و پیرۆزە لە لای هەموو (کاکە)یێك و لای (کاکەیی)یەکان بە شێوەیەکی تایبەتی. هۆی پیرۆزی ناوچەکە لای کاکەیی، دەگەڕێتەوە بۆ ئەو ماوە دوورو درێژەی کە باپیرە گەورەکانیان تێیدا ژیاون و فەرمان ڕەواو خاوەن دەسەلات بوون، بە سەدان گوندیان تێ‌دا ئاوەدان کردەوە.. بە هەزاران دارە گوێزیان تێ‌دا ناشت، لێرەوە لەسەر ئەم خاکە پاکە بڕیاری ڕێبازە سۆفی گەری‌یەکەی سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی درا، بە چەندان شوێن و جێگاو نەزرگەی پیرۆزیان لە باوەشی ناوچەکەدایە، لانك و بێشکەی هەمیشەیی پیرو شێخەکانیانە.. لەبەر ئەمەیە وشەی (شارەزویل ـ شارەزوور) وشەیێکی پیرۆزی تێکەڵاو بە وێردو هۆنراوەو سروودی سۆفی‌و دەروێشانی کاکەی‌یانە، بەتایبەتی پیرانی ڕێبازو زانایانی زانیاری ناوەکی‌و زایەری بە هۆنراوەی سۆفیزمی‌و بە زمانی زگماکی (ماچۆ ماچۆ)ی گۆرانی کوردی‌یەوە.. لە کێوو دەشت و شارو دێی ناوچەکەوە کەوتونەتە خۆش خوانی‌و نەواخوانی..»

## پەراوێزەکان

١ ـ بروانە جمال بابان، السليمانية من نواحيها المختلفة، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد الثامن، س١٩٨١، ص٣٢٩ هەروەها سوودم لە دەس نووسێکی مامۆستا (توفيق وهبي) خوالێ خۆش بوو، بینیوە بە ناو نیشانی «شهرزور» سفرة من (دربند بازيان) الى (دربند تاسلوجه)، لە لایەن مامۆستای بەڕێز (مصطفى نەریمان)وە پێم گەیشت زۆری سوپاس دەکەم.

٢ ـ توفيق وهبي، «شهرزور» سفرة من دربند بازيان الى دربند تاسلوجه، دەسنوس،

٣ ـ بروانە ئەمین نەقشبەندی، شارەزوورو شارەزوورییەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق دەستەی کورد، ژمارە (١٠) س١٩٨٣، ل٤٥ کە ئەویش لە (دائرة المعارف الاسلامية) وەری گرتووە.

٤ ـ لە وتارە دەسنووسەکەی (توفيق وهبي)، (شهرزور) سفرة من دربند بازيان الى دربند تاسلوجه) وەرگیراوە.

٥ ـ بروانە (تنقيبات مديرية الآثار العامة في سهل شهرزور)، مجلة سومر، العدد ١٦، س١٩٦٠، ص١٣٦. بروانە جمال بابان، السليمانية من نواحيها المختلفة، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٨)، س١٩٨١، ص٢٢٩.

(٨،٧،٦) بروانە د. جمال رشيد، دراسات كردية في بلاد سوبارتو، مطبعة دار آفاق عربية، بغدا، س١٩٨٤، ص٦١

٩ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل٦١

١٠ ـ بروانە توفيق وهبي (أصل تسمية شهرزور)، مجلة سومر، العدد السابع عشر، س١٩٦١، ص١٣٦

١١ ـ بروانە جمال بابان، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد (٨)، ص٣٣١ ـ ٣٣٢

١٢ ـ محمد امين زكي، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور، الطبعة الثانية، ترجمة محمد علي عوني، مطبعة صلاح الدين، بغداد، س١٩٦١، ص١٢٠

١٣ ـ بروانە ابن خلدون، كتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر، الجزء الثاني، مكتبة النهضة، مصر، ١٣٥٥هـ/ ١٩٣٦م، ص٣٥٤ ـ ٣٥٥

١٤ ـ بروانە البلاذري، فتوح البلدان، الطبعة الاولى، مطبعة الموسوعات، مصر، ١٣١٩هـ/ ١٩٠١م، ص٣٤١ ـ ٣٤٢ هەروەها ابن الاثير، الكامل في التاريخ جـ٣، ادارة المطبعة المنيرية، مصر، ١٣٥٦هـ، ص١٩ هەروەها ابن خلدون، الجزء الثاني، مكتبة النهضة، ص٣٥٤ ـ ٣٥٥ هەروەها خلاصة تاريخ الكرد وكردستان، الطبعة الثانية ١٩٦١م، ص١٢٥.

١٥ ـ بروانە ابن الاثير، الكامل في التاريخ، ادارة المنيرية للطباعة، س١٣٥٦هـ، جـ١٨٨/٣

١٦ ـ ابن الاثير، سەرچاوەی دیاریکراو، ل٢٠٥

١٧ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو جـ٢٠٦/٣

١٨ ـ بروانە الكامل في التاريخ، طبعة ادارة المنيرية، س ١٣٥٧هـ، جـ٤/ ٥١ ـ ٥٢

١٩ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ٢٨٩/٤

٢٠ ـ بروانە الطبري، تاريخ الأمم والملوك، الجزء السادس، مطبعة الاستقامة، القاهرة، ١٣٥٨هـ /١٩٣١، ص٢٠ ـ ٢٢

٢١ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ٦/ ٦٨ ـ ٦٩ هەروەها الكامل في التاريخ، طبعة ادارة الطباعة المنيرية، س ١٣٥٧هـ، مصر، جـ٣١٩/٤ ـ ٣٢٠

٢٢ ـ الكامل في التاريخ، جـ٣٥٥/٤

٢٣ ـ الطبري، تاريخ الأمم والملوك جـ٦/ ٤٧٢

٢٤ ـ الكامل في التاريخ، طبعة ادارة الطباعة المنيرية ١٣٥٣، جـ٦/ ٣٥ ـ ٣٦

٢٥ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ٦/ ١٠٧

٢٦ ـ هەمان سەرچاوە، جـ١٦٥/٦

٢٧ ـ هەمان سەرچاوە، جـ١٨٣/٦

٢٨ ـ هەمان سەرچاوە، جـ٣٤٧/٦

٢٩ ـ بروانە د. جليلة ناجي الهاشمي، الامارة الحسنوية في الدينور والشهرزور، مجلة المجمع العلمي الكردي، العدد الاول من المجلد الثالث س ١٩٧٥، ص٧٣٠ هەروەها بروانە محمد جميل الروژبياني، دينورو مشاهيرها، مجلة المجمع العلمي الكردي، المجلد السادس، س١٩٧٨، ص٥٦٥

٣٠ ـ بروانە الامارة الحسنوية في الدينور والشهرزور، ص٧٣٤، ومحمد جميل الروژبياني، دينور ومشاهيرها، ص٥٦٥

٣١ ـ بروانە الكامل في التاريخ، ادارة الطباعة المنيرية، س١٣٥٣هـ، جـ٢٣٤/٧

٣٢ ـ هەمان سەرچاوە، جـ٦/ ٢٤٧ ـ ٢٤٨ هەروەها الامارة الحسنوية في الدينور والشهرزور، ص٧٤٥

٣٣ ـ بروانە الامارة الحسنوية في الدينور والشهرزور، ص٧٤٦

٣٤ ـ الكامل في التاريخ، ادارة الطباعة المنيرية، س ١٣٥٣هـ، جـ٦/ ٢٧١ هەروەها بروانە الأمارة الحسنوية في الدينور والشهرزور،

ص٧٤٦ ـ ٧٤٧

٣٥ ـ الكامل في التاريخ، ادارة الطباعة المنيرية، س ١٣٥٣هـ، جـ٩٩/٧

٣٦ ـ الكامل في التاريخ، مطبعة (الاستقامة)، القاهرة، راجعه نخبة من العلماء، جـ٣٦/٨ [سەرنج، لەبەر ناتەوای جۆری چاپەکان، ناچار بووم ئەم دوو بەشەیە(الكامل في التاريخ)ی چاپی (الاستقامة) نەمست نیشان بکەم کە ساڵی چاپی لەسەر نەبوو]

٣٧ ـ الكامل في التاريخ، مطبعة الاستقامة، القاهرة، جـ٣٦/٨

٣٨ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ٥٧/٨

٣٩ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ٣٦٨/٨

٤٠ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ٩٧/٩

٤١ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ١٤٠/٩

٤٢ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ١٦٣/٩

٤٣ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ١٧٠/٩

٤٤ ـ سەرچاوەی پێشوو، جـ٣٧٣/٩

٤٥ ـ بروانە خلاصة تاريخ الكر وكردستان، الطبعة الثانية، مطبعة صلاح الدين بغداد، س١٩٦١، ص١٥٣ ـ ١٥٥

٤٦ ـ بروانە مذكرات مأمون بك بن بيگەبك، ترجمة محمد جميل الروژ بيانى وشكور مصطفى، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، س١٩٨٠، ص١٨ ـ ١٩

٤٧ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٩ ـ ٢٠

٤٨ ـ بروانە محمد جميل الروژ بياني، داقوق (دقوقاء) في التاريخ، مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، س١٩٨٣، ل٤٢٥، پەراوێزی ژمارە (٢٦٥).

٤٩ ـ بروانە ئەمین نەقشبەندی، شارەزوورو شارەزووریەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق ژمارە (١٠)، س١٩٨٣، ل٥٢

٥٠ ـ بروانە الأصطخري، المسالك والممالك، تحقيق الدكتور محمد جابر عبدالعال، مطبعة دار القلم، القاهرة، س١٣٨١هـ /١٩٦١م، ل١٨

٥١ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٦

٥٢ ـ بروانە ابن حوقل، صورة الارض، طبعة بيروت، س١٩٧٩، ل٣١٤

٥٣ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٦

٥٤ ـ هەمان سەرچاوە، ل٣١٥

٥٥ ـ بروانە الرسالة الثانية، ابي دلف مسعر بن المهلهل، نشرها مينورسكي، مطبعة جامعة القاهرة، س١٩٥٥م، ل١٤ وەکو لە گەشتەکەیدا دیارە لە ساڵی (٣٤٠) لە شاری (قرميسين ـ كرماشان)دا بووە.

٥٦ ـ بروانە معجم البلدان، ياقوت الحموي، الطبعة الأولى، المجلد الخامس، مطبعة السعادة، مصر، س١٣٢٤هـ/ ١٩٠٦م، ص٣١٢

٥٧ ـ بروانە الرسالة الثانية، مسعر بن المهلهل، ل١٠ ـ ١٢

٥٨ ـ ئەم هۆزەی بە (کیکان) ناو براون، مامۆستا ئەمین زەکی بەگ سەبارەتیان وتوویەتی: ئەمانە لە نزیکی (مەرعەش)دا، جێگیر بوونە، بروانە خلاصة تاريخ الكرد وكردستان، ترجمة محمد علي عوني، الطبعة الثانية، مطبعة صلاح الدين، بغداد، س١٩٦١، ص٣٥٦. کەچی مامۆستا جەمیل ڕۆژبەیانی ڕای وایە مەبەست لەم هۆزەی (کیکان)، بریتییە لە ناو هێنانی هۆزی (کاکەیی)، بەڵام ئەوەی من بیزانم هۆزی کاکەیی لەم مێژ ووەدا دروست نەبووە! بروانە گۆڤاری کاروان، جاوان، کتابة جميل الروژبياني، ترجمة عبدالحميد عبداللطيف، العدد (٥٤)س ١٩٨٧، ص١٣٥.

٥٩ ـ بروانە المسعودي، التنبيه والاشراف، الطبعة الاولى، دار الصاوي للطبع، القاهرة، سنة ١٣٥٧هـ/ ١٩٣٨م، ص٧٨

٦٠ ـ بروانە معجم البلدان، ياقوت الحموي، جـ٥/ ٣١٢

٦١ ـ بروانە شەرەف خانی بەدلیسی، شەرەفنامە، وەرگێرانی بەکوردی...، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، س١٩٧٣، ل١٩٤

٦٢ ـ بروانە توفيق وهبي، أصل تسمية شهرزور، مجلة سومر، العدد ١٧، س١٩٦١، ل١٢٩

٦٣ ـ بروانە رحلة ريج الى العراق، ترجمة بهاءالدين نوري، الجزء الاول، مطبعة السكك الحديدية، بغداد، س١٩٥١، ل١٩١

٦٤ ـ امين زەکی بەگ، تاریخ سلیمانی و ولاتی، چاپخانەی النجاح، بەغدا، س١٩٣٩، ل١٩.

٦٥ ـ بروانە د. حسام الدين النقشبندي، المدن المندرسة في محافظة السليمانية، گۆڤاری کاروان، ژ (٣٤)، س١٩٨٥، ل١٥٢

٦٦ ـ ئەمین نەقشبەندی، شارەزوورو شارەزووریەکان، گۆڤاری کۆڕی زانیاری ژمارە (١٠)ی، س١٩٨٣، ل٦٠

٦٧ ـ بروانە كمال نوري معروف، گۆڤاری کاروان، ژمارە (٣٩)، س١٩٨٥، ل٢٤

٦٨ ـ گۆڤاری کاروان، ژمارە (٣٦)، س١٩٨٥، ل١٣٦ (حلقة مفقودة من تاريخ شهرزور) نوسەر محمود أحمد محمد.

٦٩ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠

٧٠ ـ هەمان سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٢

٧١ ـ بروانە (تنقيبات مديرية الآثار العامة في سهل شهرزور) مجلة

سومر، العدد (١٦)، س١٩٦٠، ص١٣٧

٧٢ ـ (شارەزویل ـ شارەزول)؛ جاران کوردەواری بەم جۆرەیان گۆ کردووە، بە تایبەتی کوردە کاکەیی‌یەکانی ناوچەی (شارەزوور). دەتوانی تەماشای (مذکرات مأمون بك بن بیگە بك)، وەرگیرانی مامۆستایان جەمیل رۆژبەیانی و شکور مصطفی، ل١٩ بکە، هەروەها بروانە شەرەفنامەی شەرەف خانی بەدلیسی، کە ئەویش بە شێوەی (شارەزول)ی دەربریوە.

٧٣ ـ بروانە دیوانی مەحوی، چاپی دووەم، عبدالکریم مدرس و محمدی مەلا کەریم، چاپخانەی ئۆفسێتی حسام، بەغدا س١٩٨٤، پێشەکی دیوانەکە، ل١١

٧٤ ـ گۆڤاری بەیان، سۆفی‌یەتی لە شیعری کوردیی‌دا، خورشید رشید، ژمارە (٦٥)، س١٩٨٠، ل٦

٧٥ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل٦

٧٦ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل٦. هەروەها چەکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان، محمدی مەلا کریم، چاپخانەی سلمان الاعظمي، بەغدا، س. ١٩٧٠، ل٦، ٢٦

٧٧ ـ بروانە جەلالەدینی رۆمی و سروودی نەی، أحمد تاقانە، چاپخانەی علاء، بغداد، س١٩٧٩، ل١١ ـ ١٢

٧٨ ـ نۆسەد؛ بە واتا (٩٠٠) کەس و ئەمانە دەستەو دایەرەی بابا خۆشین بوونەو هەمووشیان لە ئاهەنگی زیکرو کۆڕ بەستن دا سازلێدەر بوونە.

٧٩ ـ بروانە حمید عزیز، سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، س١٩٧٩، ل١٤٢

٨٠ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٢

٨١ ـ بروانە د. مارف خەزنەدار، لەبابەت مێژووی ئەدەبی کوردی‌یەوە، چاپخانەی المؤسسة العراقية للدعاية والطباعة، بەغدا، س١٩٨٤، ل٩٠

٨٢ ـ باباناوز؛ یەکێکە لە خوانامە مەزنەکانی شارەزوورو، سوڵتان ئیسحاقی بەرزنجی لە ناو کەشکۆڵە پیرۆزەکانی ڕێبازەکەی‌دا ناوی بردووە، بە مرۆڤێکی فەیلەسوفی سۆفی‌یانی لە قەڵەم داوەو بڕێ لە کەشف و کەراماتی بۆ درکاندووین و زۆربەی بیرو باوەڕەکانی بۆ دەر بڕیوین، قسەکانی بابا ناوزیش ئەمڕۆ نرخێکی پیرۆزو بە چاوێکی ڕێزەوە تەماشا دەکرێ. مامۆستا عبدالکریمی مدرس دەڵێ: یەکێ لە برادەرانی وڵاتی خۆمان لە (ئەڵمانیا) بوو، چەند نامەو چەند غەزەلێکی نێوان بابا ناوزو قازی بەنێ و شێخ عەلی [شێرۆ]ی بۆ ناردم کە بە شێوەی هەورامی نوسراون و بۆ مێژووی ٤٧٥ك دەگەڕێنەوە. بروانە لاپەرە (٣٨٩)ی بنەماڵەی زانیاران.

٨٣ ـ بنەماڵەی زانیاران، عبدالکریمی مدرس، چاپی یەکەم، چاپخانەی شفیق بەغدا، س١٩٨٤، ل٣٨٨

٨٤ ـ قازی بەنێ؛ ئەمیش یەکێك بووە لە یارانی بابا ناوزی شارەزووری و لە (سەرگەت) لە دایك بووەو لە ناوچەکانی شارەزوور کۆچی دوایی کردووە، قازی بەنێ ماوەیێك لە دێی شیوی قازی لە ناحیەی قەرەداغ دا نیشتەجێ بووە. ئەم پایە بەرزەی هەوڵی داوە بیرو باوەڕەکانی ڕێبازی سۆفیگەریی باباناوز بە خەڵکی شارەزوور تێ بگەیێنێ و بڵاوی کاتەوە، کاتێ کە خەڵکی لە باباناوز نەدەگەیشتن و نەیان دەزانی لە چ دەدوێ. ئەمیش هاتووە دوعاو سەر زەنشتی ئەو جۆرە کەسانەی کردووە کە نەچوونەتە ریزی ڕێبازی باباوە.

٨٥ ـ بروانە بنەماڵەی زانیاران، ل٣٨٨

٨٦ ـ گۆڤاری کاروان، ژ(٣٦)، س١٩٨٥، حلقة مفقودة من تاريخ شهرزور... ، محمود أحمد محمد، ل١٣٦

٨٧ ـ سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠ ـ ١٤١

٨٨ ـ بنەماڵەی زانیاران، ل ٦٠٦ ـ ٦٠٧

٨٩ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ ژ (١٠٢) تەمووزی ساڵی ١٩٨٤، شاری بەرزنجەی پیرۆزو بنەماڵەی ناودارانی لە مێژوودا، ل٩٩ هەروەها بروانە کتێبی کاکەیی، محمد أمین هورامانی، سروودی ژمارە (٣)، گفت و گۆی سوڵتان و پیرە میکائیل، ل٢٠٦ ـ ٢٠٧

٩٠ ـ بروانە علاءالدين سجادی، سۆفیەتی لە هۆنراوەی کوردی‌دا، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد، بەرگی شەشەم، س ١٩٧٨، ل٣٨

٩١ ـ ئەمین شێخ علاءالدین نەقشبەندی، زنجیرەی (٢٠)ی بابەتی تەسەوف، رۆژنامەی (العراق)، ژمارە (٢٦٦٤)ی، س١٩٨٥.

٩٢ ـ بروانە خورشید رشید، سۆفیەتی لە شیعری کوردی‌دا، گۆڤاری بەیان، ژ(٦٥)، س١٩٨٥. ل٥

٩٣ ـ بروانە ئازاد رەئووف، زنجیرەی ناودارانی ئیسلام (مەولانای رۆمی)، چاپخانەی الحوادث، بەغدا، س١٩٨٥، ل٤٩

٩٤ ـ گۆڤاری کاروان، حلقة مفقودة من تاريخ شهرزور... ، ژمارە (٣٦)، ١٩٨٥، ل١٤١.

٩٥ ـ بروانە محمد بهاءالدين ملا صاحب، پیر شالیاری زەردەشتی و هەندێ لە بویژو پیاوە بە ناوبانگەکانی هەورامان، چاپخانەی شەفیق، بەغدا، س١٩٦٨، ل٩ ـ ١٠

٩٦ ـ بۆ نمونە هەروەکو ئەو جۆرە بیر کردنەوەو لێکدانەوە ئایینی‌یانەی کە (حەقەکان) سەر گەرمی بوون. دەتوانی تەماشای نوسراوێکی د. عیزەدین مستەفا رەسول، لە پاشبەندی دووەمی کتێبی ئاوردانەوەیەك لە بزووتنەوەی هەقە بکەی کە لە بارەی کوردە حەقەکانی سەرگەڵووەوە گێراویەتی‌یەوە، ل٦٧.

٩٨ - سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠٨

٩٩ - محمد جميل الروژبياني، داقوق (دقوقاء) في التأريخ، مطبعة مجمع العلمي العراقي، بغداد، س١٩٨٣، . پەراوێزی ژمارە (٢٠٣)، ل٤٢٤

١٠٠ - شەرەف خانی بەدلیسی، شەرەفنامە، بەکوردی، چاپی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٣، ل١٩٤.

١٠١ - بڕوانە محمد امين زكي، کوردو کوردستان، چاپخانەی دار السلام، بەغدا، س١٩٣١، چاپی ئەو دیو، ل٣٢٦، بەشی (٢ - ٣) شیکە (حکومەتی بنی اردەلان).

١٠٢ - سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢٦ هەروەها شەرەفنامە بە کوردی، پەراوێزی ژمارە (٢)، ل١٩٥.

١٠٣ - شەرەفنامە، بە کوردی، پەراوێزی ژمارە (٢)، ل١٩٥

١٠٤ - توفیق وهبي نوسیویە زۆر شوێن و جێگای شارەکانی کەرکووك و سلێمانیو هەولێر) هەن بە ناوی (بابا - باوە)کانی، ئەمی هەقەوە ناو نراون، جارێ ئەمە ناوی چەند گوندو نەزرگەیێکی دەوروبەری شاری سلێمانی یە، لەوانە گوندەکانی (باوە مەردە، باوە گیمەی، باوە خۆشین، باوە چیچەك)و مەزارەکانی وەك (پیر مەسویر، پیرە مەگرون - یەکێکە لە پیرەکانی سەدەی دەیەمی کۆچی کاکەییەکان، پیر میکائیل، پیر بابا. . .) ئەمانە لە دەستنوسێکی توفیق وەهبي وەرگیراون و مامۆستا نەریمان پێی دام.

١٠٥ - بڕوانە داقوق (دقوقاء) في التاريخ، پەراوێزی ژمارە (٢٨٨)، ل٤١٥

١٠٦ - کوردو کوردستانی محمد امين زكي، بەشی ٢-٣)ی، ل٣٢٦

١٠٧ - بڕوانە مذكرات مأمون بك بن بگیەبك، ترجمة محمد جميل وشکور مصطفى پەراوێزی ژمارە (١٥)ی، ل١٦

١٠٨ - دیوانی مەحوی، عبدالکریمی مدرس و محمدی ملا کریم، چاپی دووەم، هۆنراوەی ژمارە (٩)، ل ٢٥ - ٢٦

١٠٩ - هەمان سەرچاوە، ل٢٦ - ٢٧

سەرچاوەکان

---

أ - سەرچاوەی کۆن بە کوردیو عەرەبی:

---


١ - ابن الأثير، ابو الحسن عزالدين علي بن ابي الكرم محمد بن عبدالكريم الجزري (ت٦٣٠هـ/ ١٢٣٣م)، الكامل في التاريخ، الطبعة الاولى، طبعة ادارة الطباعة المنيرية سنة ١٣٥٦هـ، مصر، الاجزاء (٣، ٤، ٥، ٦).

٢ - المؤلف نفسه: الكامل في التاريخ، طبعة (الاستقامة) القاهرة، راجعه نخبة من العلماء مصر، بدون سنة الطبع، الأجزاء (٨، ٩).

٣ - ابن حوقل، ابو القاسم محمد بن علي بن حوقل النصيبي (ت٣٦٧هـ/ ٣٩٧٧) صورة الارض، طبعة بيروت سنة ١٩٧٩م.

٤ - ابن خلدون، لاالامام عبدالرحمن ابن خلدون، (ت٨٠٨هـ/ ١٤٠٦م)، تاريخ ابن خلدون المسمى بكتاب العبر وديوان المبتدأ والخبر، تحقيق محمد المهدي الجنابي، الجزء الثاني، مكتبة النهضة، مصر، س١٣٥٥هـ/ ١٩٣٦م.

٥ - ابن المهلهل، أبي دلف مسعر بن المهلهل الخزرجي، (ت بعد سنة ٣٧٧هـ/ ١٩٨٧م) الرسالة الثانية، نشر وتحقيق مينورسكي، مطبعة جامعة القاهرة، س١٩٥٥.

٦ - الاصطخري، ابن اسحاق ابراهيم بن محمد الفارسي الاصطخري، المتوفى في النصف الأول من القرن الرابع الهجري، المسالك والممالك، تحقيق د. محمد جابر عبدالعال الحسني، مطبعة دار القلم. القاهرة، ١٩٦١م.

٧ - البلاذري، أحمد بن يحيى بن جابر البغدادي الشهير بالبلاذري، فتوح البدان، شركة طبع الكتب العربية، الطبعة الاولى، مطبعة الموسوعات، مصر. س١٩٠١م

٨ - الحموي، ابو عبدالله شهاب الدين ياقوت بن عبدالله الرومي (ت٦٢٦هـ/ ١٢٢٨م) معجم البلدان، جـ٥: مطبعة السعادة، الطبعة الاولى، مصر، ١٣٢٤هـ/ ١٩٠٦م

٩ - الطبري، أبي جعفر محمد بن جزير الطبري، تاريخ الأمم والملوك، راجعه نخبة من العلماء، مطبعة الاستقامة، القاهرة، ١٣٥٨هـ/ ١٩٣٩م

١٠ - المسعودي، أبي الحسن علي بن الحسين المسعودي، (ت سنة ٣٤٥هـ)، التنبيه والأشراف، نشر عبدالله اسماعيل الساوي، دار الصاوي للطبع، القاهرة، الطبعة الاولى، ١٣٥٧هـ/ ١٩٣٨م.

١١ - شەرەف خانی بەدلیسی، (کۆتایی ساڵی (١٠٠٥ك /١٥٩٧ز)، شەرەفنامە، وەرگێڕانی بە کوردی. . ، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، س١٩٧٣.


ب - سەرچاوەی نوێی کوردیو عەرەبی:

---


١ - ریچ، کلۆدیوس جیمس، رحلة ريج الى العراق عام ١٨٢٠، ترجمة بهاءالدين نوري، الجزء الاول، مطبعة السكك، بغداد، س١٩٥١.

٢ - مأمون بك بن بيگەبك، مذكرات مأمون بك بن بيگەبك، نقلها الى العربية وعلق عليها محمد جميل الروژبياني وشكور مصطفى.

مطبعة المجمع العلمي العراقي، بغداد، س١٩٨٠.

٣ ـ محمد أمين زكي بك، خلاصة تاريخ الكرد وكردستان من أقدم العصور الى الآن، ترجمة محمد علي عوني، الطبعة الثانية، مطبعة صلاح الدين، بغداد، ١٩٦١م.

٤ ـ المؤلف نفسه، تاريخ سلێمانی و ولاتی، چاپخانەی النجاح، بغداد، ١٩٣٩م.

٥ ـ المؤلف نفسه، کوردو کوردستان، چاپخانەی دار السلام، بەغدا، س١٩٣١م، چاپی کوردەکانی ئەو دیو.

٦ ـ محمد جميل الروژبياني، داقوق (قوقاء) في التاريخ، مطبعة المجمع العلمي العراقي بغداد، س١٩٨٣.

٧ ـ محەمەدی ملا کریم، دیوانی شیرین و خوسرەو خانای قوبادی، چاپخانەی کۆڕی زانیاری، بەغدا، س١٩٧٥.

٨ ـ هەمان دانەر، چەمکێکی مێژووی هەورامان و مەریوان، چاپی سلمان الاعظمي بەغدا، س١٩٧٠.

٩ ـ محمد بهاءالدين ملا صاحب، پیر شالیاری زەردەشتی و هەندێ لە بوێژو پیاوە بە ناوبانگەکانی هەورامان، چاپی شفیق، بەغدا، س١٩٦٨.

١٠ ـ عبدالکریم مدرس، بنەماڵەی زانیاران، چاپی یەکەم، چاپخانەی شفیق، بەغدا، ١٩٨٤.

١١ ـ عبدالکریم مدرس و محەمەدی ملا کریم، دیوانی مەحوی، چاپی دووەم، ئۆفسێتی حسام، بەغدا، س١٩٨٤.

١٢ ـ دکتور مارف خەزنەدار، لە بابەت مێژووی ئەدەبی کوردی‌یەوە، چاپی المؤسسة العراقية للدعاية والطبع، بەغدا، س١٩٨٤.

١٣ ـ حمید عزیز، سەرەتایەك لە فەلسەفەی کلاسیکی یۆنان، چاپی زانکۆی سلێمانی، س١٩٧٩.

١٤ ـ دکتور جمال رشید، دراسات كردية في بلاد سوبارتو، چاپی دار آفاق عربية، بغداد، ١٩٨٤.

١٥ ـ ازاد رؤوف، زنجیرەی ناودارانی ئیسلام (مەولانای رۆمی) چاپی الحوادث، بەغدا، ١٩٨٥.

١٦ ـ أحمد تاقانە، جەلالەدینی رۆمی و سروودی نەی، چاپی علاء، بغداد، ١٩٧٩.

جـ ـ گۆڤارو رۆژنامە:

---

١ ـ مجلة سومر، الجزء الاول والثاني، المجلد السابع عشر، سنة ١٩٦١م.

٢ ـ مجلة سومر، الجزء الاول والثاني، المجلد السادس عشر، سنة ١٩٦٠م

٣ ـ گۆڤاری رۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٢)، س١٩٨٤

٤ ـ گۆڤاری بەیان، ژ (٦٥)، س١٩٨٠

٥ ـ گۆڤاری کاروان، ژ (٣٤)، س١٩٨٥

٦ ـ گۆڤاری کاروان، ژ (٣٦)، س١٩٨٥

٧ ـ گۆڤاری کاروان، ژ (٣٩)، س١٩٨٥

٨ ـ گۆڤاری کاروان، ژ (٥٤)، س١٩٨٧

٩ ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد ژ (١) بەرگی (٣)، چاپی کۆڕ، س١٩٧٥

١٠ ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری کورد، بەرگی (٦)، چاپی کۆڕ، س١٩٧٨

١١ ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی‌کورد، (٨)، س١٩٨١

١٢ ـ گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، دەستەی کورد، ژ (١٠)، س١٩٨٣

١٣ ـ رۆژنامەی (العراق)، ژ (٢٦٦٤)، س١٩٨٥.

**ملخص البحث :**

هاشم عاصي كاكەیی

# شهرزور من نافذة ثلاثة مواضيع تاريخية


ندى تدقيق الوثائق التاريخية القديمة يتبين لنا ان (شهرزور) سم عاصمة لمنطقة واسعة من كردستان ورد اسمها في مختلف حقب التاريخية وان الموقع الاثري القديم (خورمال) اوگول عەمەر (گلعنبر) هو موقع المدينة التاريخية التي كان يطلق عليها سم (نيم أزرا) . وشهدت منطقة شهرزور أحداثا هامة في زمن نصراع بين الأمبراطوريات القديمة وتم فتحها سنة ٢١ هجرية توافق ٦٤٢ ميلادية على يد عزرة بن قيس أمير حلوان في خلافة عمر بن الخطاب وسار إليها من بعده عتبة بن فرقد . وفيما بعد سنة ٢٤٨ هجرية ـ ٩٩٥ ميلادية تأسست فيها امارات كردية كالحسنوية والعنازية والأردلانية والبابانية وقد تحدث عن شهرزور كل من الاصطخري وابن حوقل ومسعر بن المهلهل والمسعودي وياقوت الحموي وشرفخان البدليسي وغيرهم كثير.

ويذكر الباحث بانه ورد في الكتب الدينية لجماعة (اهل الحق) الكاكائية التي يعود تاريخ كتابتها الى السنة الثامنة الهجرية، ورد اسم شهرزور مرارا وتكرارا، وعلى هيئة (شارەزويل) و (شارەزول) والتي تعني مدينة المستنقعات، ولم تعين هذه المصادر الدينية المقصود من موقع شهرزور هل انه (خورمال) و (عربت) أم بلدة (پردیوەر) المقدسة ببلدة السلطان اسحق البرزنجي؟

وقد اشتهر في شهرزور علماء وقضاة وكتبة انتشروا في بعض بلدان العالم الاسلامي كما اشتهر فيها متصوفة كبار. فكان للشيخ كاكو زكريا في القرن السابع الهجري دورا مهما في نشر الطريقة القادرية بين الكورد وقاه الشيخ شهاب الدين شيخ رضي الدين الشاذلي في القرن الحادي عشر الهجري بنشر الطريقة النقشبندية في انحاء امارتي أردلان وبابان . ونجد اسماء شيوخ مزجوا التصوف بالفلسفة خدمة للدين الاسلامي الحنيف . ويرجع الكاتب نسب اكثر شيوخ المنطقة في التصوف الى الاسرة البرزنجية الكريمة . فيذكر اسماءهم ويخصص صفحات من هذا البحث للشيوخ بابا خوشين وبابا ناوز وپیر میكائيل الداودانی ويذكر إنهم مزجوا مبدأ الحلول والتناسخ بالتصوف كما كان يفعل مولانا جلال الدين الرومي وغيره من المتصوفة .

ويحاول أن يجد رابطة تاريخية بين شهرزور وجماعة الكاكائية باعتبار انهم كانوا ساكني المنطقة، وان لهجتهم الگورانية كتب بها أدب ديني قديم .

# ئورزانا، کۆنە پادشادیەکی ناوچەی رەواندوز

فاضل قەرەداغی

لە سەدەی نۆیەمی پێش زاین تا نزیك کۆتایی دەولەتی ئاشور (سەدەی حەوتەم پ ز) پادشایانی ئورارتو بەردەوام لە جەنگ دا بوون دژ ی پادشا ئاشوری‌یەکان بۆ گرتنی ولاتانی نزیك و دووریان.

گەورەترین شکانی ئورارتو لە سەردەمی سارگۆنی دووەمی ئاشوردا (سالی ٧١٤ پ. ز) بوو کاتێك بەسەر هاوپەیمانەکانی ئورارتودا سەرکەوت و بەشێکی گەورەی ولاتی ئورارتوی گرت.

ئورزانا یەکێك بوو لە هاوپەیمانەکانی پادشای ئورارتو، بەلام بەردەوام سەر بەو نەبوو چونکە هەندێك جار دەسەلاتی سارگۆن ئەوەندە گەورە دەبوو کە ئورزانا ناچار بێ ژێردەستەی بێ.

لەگەڵ ئەوەش دا دەبینین کە ئورزانا زۆر بەخۆی‌دا دەنازێ کەوا لە نامەیەکی دا دەڵێ «ئەوەی کردوومە هەر دەیکەم» و قایل نابێ بە قەدەغەکردنەکانی سارگۆن، ئەمەش رەفتارێکی زووی بوو، وا دیاریشە دوای یاخی بوونی دواهەمینی ((سالی ٧١٤) لە دەست دانی شارەکەی دەگەڕێتەوە موساسیر و ئەچێتەوە ژێر فەرمانی سارگۆن.

جگە لە نامەی ئورزانا تەنها مۆرێکی لولەکی ئەومان لا هەیە کە نووسراوەی ئەوی لەسەردا بێ، لەبەر ئەوەی جێماوێکی بەنرخە لێرەدا باسمان کردووە، هەروەها باسی شوێنەواری (مجێسر)مان کردووە کە لەوە دەچێ جێی شاری کۆنی موساسیر، پایتەختی ئورزانا، بێ،

لە سالی (٧١٥)ی پێش زاین، پادشای ئورارتو؛ روسا (یان ئورسا)ی دووەم دابەزی‌یە ناوچەی دەریاچەی ورمێ و دەسەلاتی ئاشوری‌یەکانی لەوێ‌دا شکاند. روسا پەیمانی بەست لەگەڵ پادشاکانی ناوچەکەو لەگەڵیان دا پادشای [مانا]ی کوشت کە پیاوی ئاشوری‌یەکان بوو، لەوێشەوە رووی‌کردە ناوچەی (رەواندوز) لە دەستی ئاشوری دەرکرد.

ئورزانا ursana پادشای موصاصیر Musasir [یان ئاردینی لە نووسراوەی خالدیی پادشای ئورارتو] کە لە دەورویەری رەواندوز بوو داوای یارمەتی روسای کردبوو، پێش ئەوەش سەر بە ئاشوری‌یەکان بوو. روساش توانی (حامیە) ئاشوری‌یەکان لەو ناوچانە دەربکات، ئورزاناشی هێشتەوە لەسەر تەختی موصاصیر بەبۆنەی سەرکەوتنەکانیشی‌یەوە میلێکی دانا لە (تۆپزاوا)ی نزیك ئەوێ.

سارگۆنی دووەم (٧٢١ ـ ٧٠٥ پ. ز)؛ پادشای ئاشور، لە سالی (٧١٤)دا و لە لەشکرکەشی‌یە بەناوبانگەکەی‌دا دژ ی [ماد] و [مانا] و ئورارتو. . . هتد، لە دەشتی (رانیە)وە پەلاماری هاوپەیمانەکانی روسای داو بەسەریان دا سەرکەوت، لەوێشەوە رێی رۆژهەلاتی دەریاچەی ورمێ گرت، دواییش لە باکووری دەریاچەکە رووی کردە ولاتی نائیری کە دەکەوتە ناوچەکانی رۆژهەلاتی ژووروروی پارێزگای (دهۆك).

[یانزو]، پادشای نائیری، کەوتەسەرڕێی سارگۆن و چووە ژێر فەرمانی. سارگۆن لە نائیری‌یەوە دەرچوو، ئورزاناش «کوێستان نشینی بەدکار کە سوێندەکەی شکاند» دیاریی بۆ نەهێناو نەهات بۆ پێشوازی لێ‌کردنی، کە سارگۆنیش ئەمەی لێ‌بینی تووڕەیی‌یەکی سەخت گرتی، وەك خۆی باسی دەکات و بڕیاری دا شاری موصاصیر بگرێت

پادشای ئاشور لەشکرەکەی ناردەوە ولاتەکەو خۆی و تەنیا یەك عارەبانەی جەنگ و بە هەزار کەسەوە بۆ گرتنی موصاصیر ڕویشت. [1]

رەنگە لەشکرەکە توانای شەڕی نەمابووبێ دوای ئەو ڕێگا دوورودرێژ و ئەو شەڕە زۆرانەی و لەبەر ئەوە ناردی‌یەوە ولاتی ئاشور بەلام ئەوەی گومانی تێ‌دا نی‌یە ئەوەیە کە ئەم کارە هەروا لەبەر هۆیەکی تر بوو ئەویش لە ناکاوبردنی موصاصیر، چونکە ئورزانا بەم جۆرە وای دەزانی کە سارگۆن گەڕاوەتەوە ولاتی ئاشورو تا سالێکی تر هیچ کارێکی دوژمنانە دژ ی ناکات.

هەر بۆمەبەستی لەناکاوبردن، سارگۆن بە ڕێگایەکی سەخت و لەوانەیە بەکارنەهێنراودا ڕۆیشتبێت. لە کێوی بەرزی ئاریسو Arisu ئاوابوو دوایی لە زێی بادینان پەڕی‌یەوە، ئەویش ـ وەك سارگۆن دەڵێت ـ خەڵکی ناوچەکانی نائیری و کیرخی (یان خانجی) ئیلامونیا Elamunia یان پێ دەگوت. پاشان تووڵە ڕێگایەکی بڕی (واتا) خۆش کرد) لە کێوەکانی ئەو ناوچانە. سارگۆن ناوی ئەم کێوانە دەهێنێت: شیاك (شێ‌یاك) Shiak, (sheiak) ئاردیکشی Ardikshi ، ئولایاو (ئولایەو) Ulaiau, ئەللوریا Alluria کە زۆر لێژ و سەختن و بە هەموو جۆرە درەختێك داپۆشراون. [2]

دوای بڕینی ئەمانەش لەشکرە بچووکەکە پەلاماری شاری موصاصیری‌دا. ئورزاناش کە بە هاتنی لەشکرەکەی بیست ڕای‌کردو

ـســر کێـوێکی سەخت سەرکـەوت . سارگـۆنیش شارەکەی وێران کردو ـ و کوڕو کچەکانی ئورزاناو هەزارەها کەس، لەگەڵ ژمارەیەکی زۆری ـیـرو زیـوو برۆنـزو ژمـارەیـەکی زۆر ولاخی برد، بەپاڵ ئەمانەش خالدیا Haldia و باگبارتوم Bagbartum ، دوو بتەکەی ئورارتو،[3] هەروەها چەندین ـیکـەری پادشـاو میـرانی ئورارتـو،[4] لەو ساڵـەشـەوە موصـاصیـر بووە ـیلایەتێکی ئاشوری.[5]

نازانین بۆچی بتی خالـدیـا لە موصـاصیر بووە، ئەم بتەش پەرستراوی ـەکـمی ئورارتـو بووەو خەڵکی ئورارتـو واتـا خالـدی‌یەکان بەناوی ئەوەوە ـســراون بزانـە کە نەك تەنهـا پادشای ئورارتو، بەڵکو هەتا فەرمانڕەوایانی ـوچـەکـانی تریش دەچـوون بۆ موصـاصیـر بۆ لای خالـدیـا . «گەورەی کۆشـکی» ئاشوری نامەیەك دەنێرێت بۆ ئورزانا (دیارە پێش شەڕی ساڵی ٧١٤)و هەواڵـی روســای لێ دەپـرسـێـت ئەویش لەولام دا دەڵـێـت کە فەرمـانـڕەوای ئوئاسی (Uasi) و فەرمانڕەوای ناوچەی ئوکی‌یەکان (خەڵکی ئوکا uka ) هاتن بۆ موصاصیرو لە پەرستگاکەی‌دا پەرستنی خۆیانیان کرد. ـوتیـان روسـا دێت، فەرمانڕەواکانی تریش دواکەوتن، ئەوانیش دێن.[6] سـارگـۆنیش دەزانێت کە ناتـوانێت لەچوونی روساو فەرمانڕەوایانی دوژمنی ـو موصاصیر ڕێبگرێت لەبەر ئەوەش گەورەی کۆشکی ئاشوری (کە دیارە ـە گۆڕینەوە لەگەڵ ئورزانا سەر بەو بوو) پێی گوتبوو کە بەبێ ڕەزامەندیی سارگـۆن نابێ کەس بۆ ئەو ئەرکـە ئاینیـانـە سەربـازەکانێ لەگەڵ خۆی‌دا بهێنێت، ئورزانـاش بە جۆرە قسـەکـردنێکی «بەفیز» دەڵێت ئایا ئەم شتەم قەدەغە کردبوو لە پادشای ئاشور؟ (واتا هێنانی لەشکر لەگەڵ خۆی‌دا)و کە «ئەوەی کردوومە هەر دەیکەم» . . . . هتد.[7]

لێرەدا دێینە سەر هەندێك لە نامەکانی ئورزاناو ئەو نامانەی سەر بەون.

کیمیـری‌یـەکـان لە ژووروی ولاتی ئورارتووە دێنەخوارەوە، پادشای ئورارتـوش بە لەشکـرێـك دەچێتـە دژ یـان بەلام دەیبـەزێنن و دەگەڕێتەوە شارێکی ولاتـەکـەی. ئورزانـا خۆی‌و براکـەی‌و کوڕەکـەی دەچن بۆ لای پادشـای ئورارتـو، ئەمـەش لە نامـەیـەك دەزانین کە بۆ سارگـۆن نێردرابوو (لـەوانـەیـە لە [سـەنحاریب]ی کوڕی). لە نامەکەدا باسی ئەوە کراوە کە خەڵکی موصاصیر (واتا ئورزانا)و خوبوشکیا (پایتەختی نائیری) چوون بو پەیمان

بـەستن لەگـەڵ پادشـای ئورارتـو،[8] ڕەنگـە ئورزانا ئەو کاتە بە شکاتی پادشـاکـەی نەزانیبێ ئەگینا لەگەڵ پادشایەکی دۆڕاودا ڕێك نەئەکەوت[9] بەلام لەوانـەشـە بەوەی زانیبێ بەلام ئارەزووی لەگـەڵ روسا زیاتر بووە لە سارگۆن هەر لەبەر ئەوەش لەسەر دڵسۆزییەکەی بۆ روسا مابوو هەتا دوای ئەوەی روسـا لە شەڕەکـانی (٧١٤)دا شکـاو بە ولاتی سەر بە ئاشور چوار دەوری گیرا.

ئەوە دەمێنێتـەوە کە کەی روسـا بەرامبـەر کیمیـری‌یـەکـان شکـاو کەی

ئورزانـا چووبۆلای ئەم. بەڕای (دانجـان) لەوانـەیـە یەکـسـەر دوای شەڕەکـانی (٧١٤) بوویێ بەڵگـەی لەسـەر ئەمـە هێنـاوەو دەڵێت : ئەوە دەچێت ئورزانـا دوای تێـك دانی موصـاصیر گەڕابێتەوە ئەوی وەك چۆن هیـچ ڕووی نەدابێت».[10] بەم جۆرەش پێـویستـە قسـەکەی سارگۆن کە دەڵێت روسـا لە خەفـەتی گرتنی موصـاصیرو خالدیا خۆی کوشت ڕاست نەبێت و روسا بە نەخۆشی مردبێ لە هەمان ساڵ دا وەك (دانجان) ئەڵێت.[11]

لەوانـەیـە گەڕانـەوەی ئورزانـا بۆ موصاصیر دوای وێران کردنی ڕاست بێت چونکـە نامـەیـەك هەیە (ڕەنگە هەر لە گەورەی کۆشکی ئاشوری‌یەوە نێردرابێت) کە تێی وتراوە :

«[بـەلام لەوانـەیە] بلێ‌ی : با [پادشای ئاغام خوداوەندەکانم] بداتەوە . . . . . ، (کـەواتـا) زوو هەواڵ [کـۆبـکـەرەوەو بنـێـرە بۆم] زۆرێش خوداوەنـدەکـانت ئەدەمـەوە. . . . ، شاری موصـا [صیـر] : ئەوی‌ە بمێنەرەوە! . . . . هتد»[12]

هەرچـەنـدە نامـەکـەش شکاوە بەلام تا ڕادەیەك ڕوونە کە قسە لەگەڵ ئورزانـا کراوەو ئەو داوای خالـدیـاو باگپـارتـوم . . . ی کردبوو، جا یان ئەم نامـەیـە بە دوو دەستـنـووس نووسرابووەوە یان بە یەك دەستنووس کە ئەوەی سەرەوەیە بەلام نەنێردرابوو بۆ ئورزانا.

دەربـارەی ئەو گەشتـەی دوو فەرمـانـڕەوای سەر بە روسا کردبوویان بۆ موصـاصیـر، هەواڵـەکـانیـان زوو گەیشتـە پادشـای ئاشور. دەشبینین کە (استخبـارات) لەو کاتـەدا ڕۆڵێکی دەرکـەوتـوویان دەبینی‌و زۆر جار فەرمـانـڕەواو سوپاسالارەکان بەم کارە هەڵئەسان، ئەو نامەیەی گەیشتبووە سارگۆن ژمارەی سەربازەکانی سێتینی Setini (واتا فەرمانڕەوای ئوئاسی)ی دیـاری‌کـردبـوو ئەویش سێ هەزار کەس بوون و ئەمـانـە لە (تـووەرەش) پەڕینەوە[13] دیاریشە کە ئاوەڕەش ناوی ڕووبارێکی ئەو ناوچانە بوو، ڕەنگە لقێکی زێی بادینان بێ!

پێـویستـە ئەم ڕووداوانـە هەمـوو بخـەینە ماوەی پێش لەشکرکێشی ی ساڵی (٧١٤)ی سارگـۆن، بەم جۆرەش دەتـوانین بڵێین کە لەسـەرەتاوە لەبـەر هۆیـەکی نەزانـراو (ڕەنگـە لەژێـر ترسی دەسەلاتی ئاشور) ئورزانا چوویێتـە ژێـر فەرمانی سارگۆن دوای ئەوەی کە پەیوەندی‌یەکەی باش بوو لەگـەڵ ئورارتـو، دوای ئەوەو پێش شەڕەکـانی (٧١٤) ئورزانا لە سارگۆن هەڵگەڕایەوەو داوای یارمەتیی لە روسا کرد بۆ ئازادبوون لە پادشای ئاشور. پاشـان شەڕەکـانی ئەو ساڵـە (واتـا ٧١٤) قەومـان و موصـاصیر تێك دراو ئەرزانا لە دوایی‌دا ناچاربووەوە بچێتە ژێر دەستی سارگۆن

لە کاتێکی دیـاری‌نـەکـراویش دا ولاتی موصـاصیـر تووشی هێـرشی [مـانـنـایی‌یـەکـان] بوو ئەوانیش لە ڕۆژهـەلاتی موصـاصیـر دەژیـان، لە خوارووو ڕۆژهـەلاتی دەریـاچـەی (ورمێ) بەلام لێـرەدا ناوی ئالاکونو

Analaqunu دەبیستین کە فەرمانـرەوای موصـاصیـرە، (دانجـان)یش وای داناوە کە ئەم کابرایە فەرمانڕەوای تەواوی موصاصیر نەبووە بەڵکو سەرۆکی لەشکـری «پێش» سنـوورەکـانی موصـاصیر بووە چونکە نامەیەك هەیە کە «فـــەرمـــانـــڕەوای بەردەم موصـــاصیــر»ی تێدا هاتـوەو کە لە شەڕی دژ بە کیمیرییەکان کوژرار بوو.[١٤]

نامـەکـە، کە بۆ پادشای ئاشور نێردرا بوو، دەڵێت کە ئەومانناییانەی کە لە «شـارەکـانی ئورارتـویی یـەکانن»و کە لە ناوچەی قەراغی دەریاکەن (واتـــا دەریـــاچـــەی ورمێ) تالانییـان کردو دبـار نەمـانـەوە، ئانـالاکـونـو فەرمـانـڕەوای موصاصیر و تونئائون Tunnaun فەرمانڕەوای کارسی [ . . . ] - یان کارسیتو [ . . . ] [١٥] - بۆ پاسەوانی چوونە سنووری ماننییەکان . . .

لەبەر ئەوەشی باسی ئەومانناییانە کراوە سەر بە وڵاتی ئورارتون و لەبەر ئەوەی روسـا لە ڕۆژهـەڵاتی دەریـاچـەی ورمێ (نـاوچـەی ئوئیشـدیش و Uishdish زیکیـــرتـــو Zikrtu) گەیشتبـووە وڵاتی ماننییـەکـان، یان با بڵێین جەرگەی وڵاتەکەیان، (دانجان) وای داناوە کە ئەومانناییە پەلامارده‌رانە هەر لەوێوە هاتبوون،[١٦] بەمەش دەتوانین بڵێین کە ئانالاکونو ئەفسەرێکی سەربـە ئاشـوریـیـەکـان بووەو لەبـەر هەبـوونی ئەوو لەشکرەکەی ئورزانا داوای یارمـــەتی ی لەرووســـا کردووە ئەویش دوایی هاتـــوتـــە ناوچـەکـەر ئاشـــوریـــیـــەکـــانی لێ دەرکـــردووە، بەم پێیـەش ئانـالاکـونـو هەر ئەو «فـەرمـانـڕەوای بەردەم موصاصیر»ە نەبوو کە دژی کیمیرییەکان کوژراوە چونکە ئەمیان سەر بە روسا بووە.

## مۆری ئورزانا:

لەبەر ئەوەشی باسەکەمان دەربارەی ئورزانایە، لێرەدا باسی مۆرەکەی دەکەین.

مۆرەکە بریتییە لە وێنەی کابرایەکی خاوەن چوار باڵ وەك هی باڵندەو بە هەر دەستێکی ملی حوشتـــرمـەڵ یان باڵنـدەیـەك لەوجۆرەی گرتـووە، لەگـەڵ نووسینی مێخی ی حەوت دێـری، ئەوســـاش وا زانـــرا بوو کە نووسینەکە بە زمانی خالدییە، واتا ئورارتویی، دوو دێری یەکەمی نەبێت بۆیە وەرنەگێردرابوو بەڵام نووسینەکە هەموو بە شێوەی ئاشوریی نوێی زمانی ئەکەدییەو بەم جۆرەیە:

١ ـ مۆری ئورزانا
٢ ـ پادشای موصاصیر
٣ ـ شاری س س س
٤ ـ کە وەك مارێك
٥ ـ لە کێوە بەدەکان دا
٦ ـ دەمی کراوەتەوە[١٩]

تێبینی:

١ ـ دێـری چوارهـەم کە لە سەرچـاوەکەمان دا نە خوێندراوە بەم شێوەیە (ZA(d)ALAD) و ئەگەر ئەم وشە سومەرییانە بە ئەکەدی بخوێنرێنەوە دەبنە aban shedu و هەردووکیـان واتـای بەردی [شێـدو] کە بەرانبەر (خوداوەند) ئالادەو کە خێـــوێـــکـــی پارێـــزەرە،[٢٠] ئەم شێـــدووەش لە دوایـــی دا لە (تەورات)دا بە واتای (بت)و لە کڵیسەی یۆنانیدا بە واتای (جنۆکە) بەکاردەهات،[٢١] هێماکانی سەرەوەش هەروا بە (ZA (d) LAMA (z)) ، واتا بەردی [لامـاســـو]ش دەخـوێندرێتەوە وەك (دانجان) وەری گێرابوو،[٢٢] لامـاســـو وەکـو شیـدو خێـوێکی پارێـزەرە[٢٣] (هـەنـدێك جارنەبێت)، بەردەکەش کە مۆرەکـەی لێ دروست کرابوو بەپێ ی (مونان) بەردێکی پەمەیی ی بەنرخە (بە عەرەبی «یەشب» کە وەکو یاقووتە . . .)[٢٤]

٢ ـ [س س س]: چەند وەرگێرانێك هەیە بۆ ئەم سێ هێمایە. زووتر بە (al) u - ab (?) - ti واتـا شاری ئوئـابتی (؟) وەرگێـردرابـوو (لای: سایس، ڤنکلەر، شترێـك) بەمـەش دێـری دووهـەم و سێهـەم دەبنـە: «پادشای موصـاصیـر و ئوئابتی»،[٢٥] پێش ئەوانیش (یانسن) بەتەنیا دێری سێهەمی بە (ئال) [خو ـ ئاب ـ تی]ی خوێندبووو بە «شاری حوشترمەڵ»ی وەرگێـرابـوو،[٢٦] دواییش (دانجان) هێماکان بە بەرامبەرە ئەکەدییەکانی خوێنـدبوو، واتا: شاری [ئاریبو] واتاقەلەڕەش و ئەمی بە جنۆکەی شاری موصاصیری زانیوە،[٢٨] نەك هی قەلەڕەش، واتا لەکاتێك کە دێری سێهەم بەناوی شارێکی دیاریکراو زانراوە لای (سایس)و (ڤنکلەر)و (شترێك)، لای ئەوانەی تردێرەکە بە پێناسەی شاری موصاصیر دانراوە.

(گـوتـزە) بەهـۆی ناوی موصـاصیـرەوە گەیشتە ڕاکەی خۆی، ئەوەش گوایـە ئەم ناوە پەیـوەنـدی هەیـە بەچـەنـد وشـەیـەك کە واتـاکەی (واتای موصاصیر) ئەکەنە «سیسرك»یان «کوللە»، وتبووشمان کە ئاردینی لەدەقی خالـدیی روسـا (لـەسـەرمیلی تۆپـزاوا) بەرامبـەری موصـاصیری دەقی ئاشوریی هەمان میلە.

دەربـارەی ناوی ئورزانـا، دیارە کە ناوەکەی سەر بە زمانی ناوچەکەیەو ناوێکی ئاشـوری نییـە، پەیـوەنـدیکیش دانراوە لەلایەن (هیوزنگ) نێوان ناوی ئورزانـاو ناوی ئوئـارزان uarzan کە ئەمیـان میـری شوێنێکە بەناوی ئوقوتتی uqutti[٢٩] (ناوچەی ماد؟)، بەڵام (شترێك) ئورزانای بە ناوێکی نزیـك هینـدو ـ ئەوروپایی نەزانیوە. بەڵکو گەراندبوویە کومەڵە زمانەکەی نزیك زمانی [خالدی].[٣٠]

پەیـدا بوونی میـرنشینێکی سەربـەخـۆ لەکـاتی هەبـوونی دەوڵـەتێکی گەورەداو لەیـــەك ناوچـەو لە دوو سەردەمی جیـاوازدا سەرنـج ڕاکێشـەرە، وێنـەی موصـاصیـر و ئورزاناش دوای (٢٥)سەدە لەوانەوە دەبینین ئەویش

ـەکـاتی (محمـد پاشـا)ی رەوانـدوز، رەنگـە ئەمـەش بگەڕێتەوە بۆ باری جوگرافی‌ی ناوچەکە چونکە ئەو کێوانەی لە ناوچەکانی رۆژهەڵاتی جیای ـەکاتەوە بوونەتە شوورەیەکی سروشتی بۆی لەبەر ئەو بەرگری کردن لێ‌ی ـسـان ئەبوو.

ـە کۆتاییدا بەباشی دەزانین ئەگەر بەکورتی باسی مجێسر بکەین. ئەم شـوێنەی نزیك تۆپزاوایە لە ناوە کۆنەکەی موصاصیر دەچێت وەك باسکراوە ـەلایـەن زیـا لەیـەك کەس هەرچـەنـدە نازانین چۆن ناوە ئاشـوری‌یـەکە ـمێنێتـەوەو ئەو ناوە ئەفـەوتێ کە خەڵکی ناوچـەکـە بەکاریان ئەهێناو وەك ـەرنەکەوێت کەس زۆری لێ نەئەکردن بەکاری نەهێنن.

ـە ساڵی (١٩٦١)ی زایینیدا دووپەیکـەری مرۆڤ و هەنـدێك پەیکەر کە شێـوەکـەیـان دیـار نییـە هی ئاژەلـە یان هی مرۆڤە، هەروەها باڵندەی ـەردین و گڵێنە (فخاريات).... لەوێدا دۆزرابوونەوە بە رێکەوت.[٣١]

دوو پەیکـەری مرۆڤـە زۆر ساکـار دروسـت کراون لەچـاو پەیکـەرە ئاشـوری‌یـەکـان، یەکێکیـان سەرێکی قووچی هەیـە، لەوانـەیـە ئەوەی ـریشیـان هەمـان شێـوەی سەری هەبـووبێت بەڵام شکابێت، رەنگە دوو پەیکەرەکە هی دووپادشا یان میری ئورارتوبن و دەست سارگۆن نەکەوتبن زانیبوشمان کە سارگۆن پەیکەری پادشاومیرانی ئورارتوی لە موصاصیرەوە ـردبوو ولاتەکەی، دووریش نییە بت بن، لەو بتانەی داوای گەڕاندنەوەیان ـە پادشای ئاشور کرابن.

کەواتا:

١ ـ ئورزانا پیاوێکی پادشای ئورارتو بووو لەبەر نەگونجانی باری رامیاری و سـەربـازی ناچـاربـوو بچێتـە پاڵ پادشـای ئاشـور، جارێـك پێش ـەشکرکەشی‌ی ساڵی (٧١٤) پ.ز و جارەکەی تر یەکسەر دوای ئەو.

٢ ـ بەبـڕوای ئێمـە هێـرشی مانایی‌یەکان بۆ سـەر ناوچەکەو خەریك بوونی «فـەرمـانـرەوای موصاصیر» واتا پیاوەکە سەر بە ئاشور بە شەر کردن دژ یان هەن بوو بۆ داواکردنی یارمەتی‌ی ئورسـاو هاتنی ئەم بۆ ناوچەکەی ئەمەش ئەگـەر هێـرشی مانـایی‌یـەکان دەستی ئورسای تێدا نەبێ (چونکە نامەی ـەرمانرەواکە باسی ئەو مانایی‌یانە دەکات «کە لە شارەکانی ئورارتویی‌یەکان».

٣ ـ ئەوە ئەچێ موصـاصیـر لەشـوێنـەواری ئیسـتـای (مجێسـر) بێ لەبـەر ـزیکی‌ی لەمیلی تۆپزاوەو لەبەر لەیەك چوونی دووناوەکە.


پەراوێزو سەرچاوە:

1,2,3 - D.D. Luckenbill, Ancient Records of Assgria and Babylonia (ARAB). 2, 1927, S 171.

4 - F. Thureau - Dangin, Une Relation de huitieme Campagne de Sargon (huit. Camp) .Paris, 1912 ,P.XVIII

5 - ibid. P. XIV,n.2.

6,7 - Ibid ,P.XIII

8 - R.G. Thomson, ini American Journal of Semtic Languages, (AJSL), 17, 1901, p.166 - S. ParapoLa, State Archivs of Assyria, 1, 1987, no.3 P.32

9 - AJSL, 17, P.65.

10 - huit. Camp ,P.XIV.

11 - huit. Camp. P.XIX.

12 - State Avch. ,no.7 ,P.g.

13 - Beitrage Zur Assyriologie (BA), 4, 1902, no. 380, s.522.

14 - hiit Camp. ,P.XVI ,n.I

15 - Ibod

16 - Ibid - BA, y, no.381 ,S.523

17 - huit. Camp. .P.XVI ,n.I

18 - M.J. Menant, Catalogue des Culindres Orientaux dn Cabinet Royal des Medailles de La Haye, 1878, P.55

دوو وێنەی مۆرەکەمان لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە.

19 - A.Goetze, Musas(s)ir, in, Revue d Assyriologie (RA), 46, 1952, P.158

٢٠ ـ بۆ [شێدو] بڕوانە:

R. Labat, Manuel d Epigraphie Akkadienne, 5ieme Ed., 1976, P.147 no. 322.

٢١ ـ بڕوانـە: لیـــواوپنهـــايم، بلاد مابين النهـرين، و. سعـدي فيفي عبدالرزاق، ١٩٨١، ل٢٥٣.

22 - huit. Camp ,P.XII ,n.3

23 - R. Labat, Ibid.

24 - huit. Camp, ,P.XIII ,n.3 (Menant, Catalogue.... ctc)

25 - huit. Camp. .P.XIII ,n.3

26 - M. Streck, in, Zeitschrift fur Assyriologie (ZA), 14, 1899, S.131.

27 - huit. Camp. .P.XII.

28 - RA, 46, P.159.

29 - ARAB, 2, S192.

30 - M. Streok ,in ,ZA, 15 ,1900 ,S. 357, Anm.1.

٣١ ـ ئەم زانیـــاریـیـــانـــە لە بەڕێـــز (کـاك معتصم ڕەشیـد) بەڕێـوبـەری مۆزەخانەی سلێمانی وەرگیراوە.

ملخص البحث

# اورزانا، احد ملوك منطقة راوندوز القدماء

فاضل قەرەداغى



ان اكثر معلوماتنا عن اورزانا هي من كتابات الملك الاشوري سرجون الثاني (٧٢١ - ٧٠٥) ق.م ومن رسائل ذلك العهد بالاضافة الى ختم اسطواني خاص باورزانا نفسه. والظاهر ان اورزانا كان تابعاً مرة الى ملك اشور واخرى الى ملك اورارتو وان كان ميله للاخير اكثر.

وقد استطاع اورسا الثاني، ملك اورارتو عام (٧١٥) ان يطرد الاشوريين من منطقة (راوندوز) الا ان انتصاره كان موقتاً حيث استطاع سرجون نهاية حملة سنة (٧١٤) المشهورة (الحملة الثامنة) احتلال [مصاصير]، مدينة اورزانا، بمناورة عسكرية بارعة واجبر اورزانا على ترك مدينته وفيها اهله وآلهته - بما في ذلك [خالديا]، الآله القومي لاورارتو - وسقوطهم غنيمة الملك الاشوري.

وحسب (دانجان) فان اورزانا قد عاد الى مدينته «كأن شيئاً لم يحدث» وتظهر رسالة مهشمة وجدت في الوثائق الاشورية وليس في مصاصير مساومة اشورية لارجاع الآلهه الى مصاصير مقابل تقديم معلومات باستمرار، وربما لم ترسل الرسالة ابداً الا انها مع ذلك تؤيد رأي (دانجان).

وحسب اعتقادنا فان اورزانا كان في البداية تابعاً لاورارتو او ربما حليفاً ثم خضع للاشوريين ثم تمرد على سرجون قبل الحملة الثامنة تبع ذلك سقوط مصاصير بيد الملك الاشوري - وهذه المعلومة مؤكدة من اقوال سرجون نفسه - ويظهر ان اورزانا عاد الى المدينة واضطر الى العودة الى حظيرة الدولة الاشورية.

وقد تعرضت المنطقة الى هجوم للمانائيين - سكنة جنوب وشرق بحيرة (اورمية) - الذين كانوا «في مدن الاورارتيين» وكان هناك «حاكم» المصاصير» باسم (انالاقونو) وعلى مانعتقد انه كان اشورياً وانه ليس ذلك الشخص صاحب نفس الاسم والذي قتل في حرب اورسا ضد الكميريين.

ولعل ابتلاء هذا الـ (انالاقونو) بالهجمة المانائية كانت فرصة لاورزانا لطلب مساعدة اورسا تبعها مجيء الاخير الى المنطقة هذا اذا لم تكن الهجمة المانائية مدبرة اصلاً من قبل اورسا.

من ثم يتناول البحث ختم اورزانا والكتابة عليه حيث يناقشها بالاعتماد على مصادر المحدثين.

ويعقد البحث مقارنة خاطفة بين اسم اورزانا واسم (اوارزان) - في منطقة ميديا؟ ثم اخرى بين اورزاناو (محمد باشا) امير منطقة راوندوز (بعد ٢٥ قرن) ذو الصيت المرعب انذاك.

ويتناول البحث في نهايته موقع (مجيسر) القريب من (طوبزاوه) اي قرب مسلة اورسا التي أقامها عام (٧١٥) بمناسبة انتصاره حيث وجدت عدة تماثيل من بينها تمثالان لشخصين، وربما صنمان أو اميران للمنطقة او لاورارتو حيث كان سرجون قد اخذ هذه التماثيل الى بلده بعد احتلال مصاصير.



# لاپەرەیەکی پرشنگداری سەردەمی شێخ مەحمود

رەوف عوسمان

- ١ -

لە مێــژووی نەتـەوەی کورددا گەلێ لاپـەڕەی پڕ شکـۆو درەوشـاوە هەن، تائێستـا یان پشت گوێ خراون یان تەپ و تۆزی ڕۆژگـاری هـەمـوار نیشتـوتـە ملیان و لەبیرچوونەتەوە، دیارە ئەرکی ون نەبوون و دەرهەلهێنانیان لە گۆڤارو ڕۆژنامەکان دا دەکەوێتە ئەستۆو بەرپرسیارێتی ڕۆشنبیرانی نەتـەوەکـەمـان، ئینجـا بۆئـەوەی ئەم لاپـەڕە مێـژوویی یە ئەمشەمان ڕووی چاپ ببینێ و ئەم ئەلقەیەش ببەسرێتەوە بەو زنجیرە بە پێشت و گرنگـەی تێکـۆشـانی شێـخ مەحمـودی نەمـرەوە، ئەم چەوپێکەوتنەم لەگەڵ [مام حامی عەبدوللا] کە لە ئاوایی (کانی کەوەی شەمیران) دادەنیشێ و لە ساڵی ١٩١٤دا هاتۆتە دنیاوە سازکرد، مام حامی بیـرەوەرییـەکی تیـژی هەیـەو گەلێ لاپەڕەی گەش و ڕووناکی ڕۆژانی سەردەمی شێخ مەحمودو شەڕەکانی لەیادە، هەر ئەمەش بوو بەی پێوەنام کە پتر بیجوەڵێنم و گەلێ زانیاریی مێژوویی گرنگی ئەو سەردەمەی بە دەنگی خۆی پێ تۆماربکەم، یەکێ لەو لاپەڕە گەشانەی کە مام حامی لە دەفتـەری بیـرەوەرییـەکـانی دا بۆی هەڵ دامـەوە سەرپێچی کردنی ناوچەی شەمیرانە لە ئینگلیزو، هاوپەیمانێتی حەمەی سان ئەحمەدە لەگەڵ شێخ مەحمودی نەمردا، وەك (ئی. بی. سون) دەڵێت: (شەمیران دەکەوێتە باکووری ڕۆژاوای هەڵەبجەوەو لەسەرەوە ڕێی سیروان، لە ڕۆژاواو باشوورەوە شاخی بەمۆ، لە ڕۆژهەڵاتیشەوە سنووری عیراقە بە ئێرانەوە، هێزە شەڕکەرەکانی شەمیران ـ وەك سوون دەڵێت ـ بریتی بوون لە (١٥٠) سوارو (٤٠٠) پیادەو (٧٥٠) خێزان، ئەمانە پێیان دەوترێت یەزدان بەخشیی و بەشێکن لە عەشیرەتی گەورەی جاف. ئەم تیرەیە وازیان لە ژیانی کۆچەرێتی و دەوارنیشینی هێناوەو لە ناوچەی شەمیـران و گڵعنبـر «واتـە خورمـاڵ» نیشتـەجێ بوون)، مام حامی دەڵێت: بەر لە شەڕی ئاویـاریـك حەمـەی سان ئەحمـەد کە گەورەی تیـرەی یەزدان بەخشی بوو، لە ناوچـەی شەمیـران پەیـوەندی کرد بە شێخ مەحمودەوەو پەیمانی دایە کە بە هەموو شێوەیەك یارمەتی بدات، ئەوە بوو لە سەر فەرمـان و داوای شێـخ مەحمـود، محمـدی سان ئەحمەد، مەحمودی کوڕی و مەحمودی ئەحمەدی وەسمانی ناردە داری کەلی و ماوەی ساڵێك لەوێ لە خزمەت شێخ دا مانەوە، لە ماوەی ئەم ساڵـەدا ئەم دوانـە چەنـد جارێـك نامەیان لەنێوان شێخ مەحمودو محمـدی سان ئەحمـەدا هات وچۆ پێ کـردووە، لەدوای ئەم ساڵـە، لەسـەر داوای شێـخ مەحمـود حەمـەی سان ئەحمـەدو برازاکـەی کە (محمـدی قادرە) سەریـان لە شێخ مەحمـود داوەو هەردەم ئامـادەیی خۆیانیان بۆ پشتگیری و یارمەتی جوولانەوەکەی دەربڕیوە.

ئەوە بوو لەسەر داوای شێخ مەحمود، بۆ ماوەی چوار ساڵ ئەم تیرە گەورەو نازایـە پشتیـان کردە میـری و ئینگلیـزو بۆ هیـچ شتێـك نەك بە دەمیانەوە نەدەچوون بەڵکوو پشتیان تێ دەکردن، زۆر جار لە ئیدارەی میـریی لە قەزای هەڵـەبجـەوە، دەکـرایـە سەریـان کە باج و زەویـانەو جووتـانـەو. . . هتـد بدەن، بەڵام ئەمـان گوێیـان نەدەدایـەو، ئەو پەیمانەی کە دابوویان بە شێخ مەحمود هێنایانەدی و سووربوون لەسەر سەرپێچی و مل نەدانەکەیان.

بە فەرمـانی کاپتـان (لیس) هێـزێـك پێـك هێـنرا لە مودیر ناحیەی (فـەقێ جنـە) کە حسین حسن بگە و (٣٠) پۆلیـس و خاوەن موڵکی ناوچەکە حەسەن بەگ، لەگەڵ هەندێ لە دەسەو دایەرەوکاسەلیس دا، کە ڕووەو شەمیران برۆن و بارەکە ئاسایی بکەنەوە، هەر کە گەیشتنە دێ (کـانی کـەوە) داوایـان کرد کە کوێخـای هەر چواردە دێکـەی شەمیران کۆبنەوەو هەر یەکەی پارەیەکی زۆر جووتانەو زەویانەی ئەو چوار ساڵی سەرپێچی یـە بدەن کە نەیـان داوەو بە حیسـابی ئەمـان قەرزارن! ئەمـەش ناوی کوێخـاو ئاوایی یـەکانە، (ئەحمەدی حسین ـ توولـەیی)، (عـەبـدولـلای رەسـوڵ ـ چەمەڕەش) (حەمەی ڕۆستەم ـ کۆکۆیی)، (بارامی حەمەی شاوەیس ـ وەرمن) (حەمە شەریفی قادر ـ

دەنگەوەرە)، (نادری بارام ـ زمناکۆ)، (ئەحمەدی سان ئەحمەد ـ ولۆەر)، (حەمەی ئەوەرەحمانی یونس بەگ ـ بەشی ئەحمەد بەگ)، (توفیقی فەرەج ـ دلف)، (حەمەی مەحمودی هەواس ـ بەشی هاجە). (حەمەتوفیقی میران ـ بەشی پیرك)، (قادری هاجك ـ مام شەوی)، (مەحمودی محمدی چراخ ـ شەك مەیدان)، با ئەوەش لەیادنەکەین کە حەمەی سان ئەحمەد لە سەرەتادا هەندێ تفەنگچی لەم لاو لای ئاوایی‌و ڕێگاو بانەکان دا دامەزراندبوو، وە فەرمانی تایبەتی دابوونێ کە لە کاتی پێویست دا دەست لە هێزەکەی میری بوەشێنن، ئامیر مەفرەزەی هێزەکەی ئینگلیز (عەبە بەراز) ناوێکی درو تاوانبارو ئەلقەلەگوێ بوو، کاربەدەست و پۆلیسەکان کەوتنە هەڕەشەو گوڕەشەو تۆقاندنی خەڵکەکە، کوێخاکانیان هەڵ پێچا بۆ پارەی زەویانە، لە سەرەتادا دوو کوێخایان واتە (عەولای ڕەسوڵ و ئەحمەدی حەسەینیان) بە پاڵ برد، لە هەمان کات دا حەمەی سان ئەحمەد لە دیوەخانەکەی هاتەدەرێ‌و بە چەکەوە هەڵمەتی بردو هاواریکردە خەڵکەکە کە پەلامار بدەن و بیان گرن و دەست بەستیان کەن، چونکە ئەمانە هاتوون شەرەفیان بشکێنن، ئیتر پۆلیس و دەسەودایەرەی ئینگلیز درانە بەر پایلم و هەر یەکی بەلایەك دا ڕایان کردو پرژ و بڵاوبوونەوە. دیارە ئەم ڕووداوە هێندەی تر پەیوەندی نێوان حەمەی سان ئەحمەدو شێخ مەحمودی بەتین کرد دوای تێپەڕبوونی دوو مانگ بەسەر ئەم ڕووداوەدا تەیارەیەك بەیاننامەی بەسەر ئاوایی (کانی‌کەوەی شەمێران)دا بڵاوکردەوەو داوای لە دانیشتوان کرد، یان ئەوەتە مل دەدەن بە ئینگلیز، یان ئەوەتە ناوچەکەیان بۆمباباران دەکرێت. ئەوە بوو حەمەی سان ئەحمەدیش، فرمانی مل نەدان و چۆڵ کردنی ئاوایی‌داو بە خەڵکەکەی ڕاگەیان کە ڕوویکەنە ئەشکەوت و کەورگەکان ئەوەی بە گوللەی ئینگلیز بکوژرێت شەهیدە، پاش چەند ڕۆژێك پێنج فڕۆکە هاتنە سەر ئاوایی کانی‌کەوەی شەمێران و بە خەستی بۆمبا بارانیان کرد، ئەوەی شایانی باسە حەمەی سان ئەحمەد ئاوایی چۆڵ نەکردو لە پەنای گاشەبەردێك دا، کە دەکەوێتە کەوانەی ئاوایی‌یەوە، بە تفەنگێکی تەیارە شکێنی برنەو خۆر توانی یەکێ لە فڕۆکەکانی بپێکی‌و لە دەشتی چەمە ڕەش دا فڕێ‌داتە خوارێ، هەر لەو کاتەدا سێ فڕۆکەوان کە لە تەیارەکە خۆیان هەوادایە خوارێ‌و لە بێشەو قامیشەڵانەکانی چەمەڕەش دا خۆیان حەشارداو پێش ئەوەش بە بەیداخێکەوە ئیشارەتیان بۆ یەکێ لە فڕۆکەکان کرد کە بە دەمیانەوە بچێ، فڕۆکەیەك بە خێرایی نیشتەوەو هەر سێ ئەفسەرەکەی قوتارکرد، ئەوەی شایانی وتنە (مامۆستا ئەحمەد خواجە لەم هەموو ڕووداوانە بە تەنیا باسی خستنی فڕۆکەکە دەکات)!

لە هەمان شەودا نامەیەك لەکاپتان (لیس)ەوە، گەیشتە دەست حەمەی سان ئەحمەد، کە تیایدا داوای کردبوو، ئەگەر فڕۆکەکە نەسووتێنن ئێمە لێیان خۆش دەبین و هیچ لە نێوانمان دا نامێنێ، لە وەڵام دا حەمەی سان ئەحمەد وتی، مادامەکی ئینگلیز خاوەنی فڕۆکەکەیەو بۆمبابارانی کردووین، گەرەکە بسووتێنرێ ئەوە بوو پێشی سووتاندنی فڕۆکەکە، چەند پارچەیەکیان بە دیاری نارد بۆ شێخ صدیقی شێخ مارفی نیرگسەجار، دوای سووتانی ئەو فڕۆکەیە ئینگلیز هێندەی تر ڕقیان هەڵساو کەڵبەیان تیژتر کرد، دوای چەند ڕۆژێ جارێکی دی چوار فڕۆکەیان ناردەوە سەر ناوچەکەو بە خەستی بۆمبابارانیان کرد، ئیتر ئەوە بوو حەمەی سان ئەحمەد هەمیشە تفەنگچی دەنارده ڕێگاوبان و ملەی (تەمرەژەنان) بۆ چاودێری‌و وریایی لە هێزی دوژمن، نەك لەناکاو بە سەریان دا بدەن، پاش ساڵێك بەسەر ئەم ڕووداوانەدا ئینگلیزەکان جارێکی تر داوایان لێ‌کرد کە دەیانەوێت پەیوەندی نێوانیان باش کەن و لە هەموو شتێك بیان بەخشن، وە ئەگەر بۆ خۆی بڕوا ناکات، با کوڕەکەی، کە (مەحمودی حەمەی سان ـ ئەحمەدە) مان بۆ بنێرێ بۆ ڕاوێژ و ئاشت بوونەوە، ئەویش لەسەر داواو پێ‌داگرتنی کوێخاکانی ناوچەکە، مەحمودی کوڕی‌و ئەحمەدی حوسەینی ناردە هەڵەبجە، بەڵام ئینگلیزو کاربەدەستانی ئەو سەردەمە، دەست بەجێ هەردووکیان گرتن و لە بەندیخانە توندیان کردن و وتیان هەتا حەمەی سان ئەحمەد خۆیمان تەسلیم نەکات ئەم دووانە بەر نابن، دیارە ئەویش زانیویتی مەسەلەکە پیلانەو پەیوەندی بە خودی خۆیەوەیەتی، لە بەرامبەر ئەم بارە نوێ‌یەدا حەمەی سان ئەحمەدیش نامەی یارمەتی‌و بەدەنگەوە هاتنی بۆ حەمە آغای سەرۆکی تیرەی گەلاڵی‌و عەبدوڵلای حەمەی خواکەرەم سەرۆکی تیرەی نەورۆڵی‌و تایەفەی تاوگۆزی نارد، ئەوانیش لەشکرێکی گەورەیان پێکەوەناو ڕووەو دەست بەسەرداگرتنی دەزگاکانی ئینگلیز لە هەڵەبجە ڕۆیشتن و بوو بە جەنگی مەغلوویە، هەر کە ئینگلیزو کاربەدەستان بەمەیان زانی بە پەلە مەحمودو ئەحمەدی حسێنیان ڕەهاکرد.

کار بەم شێوەیە مایەوە هەتا شێخ مەحمود بەرەو کزی ڕۆیشت و ئەمیش ئەو گوڕو تینەی نەما، ئەوە بوو بۆ ماوەی (٤٠) ڕۆژ بە دەس بەسەری برا بۆ خانەقین و لە ئەنجامی ئەم بەرەوبەری تۆمەتی سەرپێچی‌کردن و نەدانی زەویانە موحاکەمەکران و وازیان لێ‌هێنان.

سەرچاوەکان

---

١ ـ العشائر الكردية ـ ترجمه وعلق عليه فؤاد حەمە خورشيد ـ مطبعة الحوادث ـ بغداد ـ ١٩٧٩ ـ المؤلف ـ ئی ـ بی ـ سون.

٢ چیم دی ـ ئەحمەد خواجە.

# ملخص البحث

# صفحة من ذكريات عن أيام الشيخ محمود

رؤوف عثمان

في تاريخنـا القـريب صفحـات مشـرقـة لكنهـا مهملة يعلوهـا تراب النسيـان ومن واجب المثقفين الكشف عنهـا. وقـد قام كاتب المقال في هذا السبيـل باجـراء مقـابلة مع أحد سكان قرية (كانى گەوه) في شميران يدعو (حامى عبدالله ـ ١٩١٤ م) والذي يحتفظ بذكريات ثرة عن أيام الشيخ محمود ومعاركه.

ويسـرد هنـا صفحـة من دفتر ذكرياته تخص تمردّ منطقة شميران على الانكليز وإتفاق حمه ابن سـان أحمد رئيـس المنطقة مع الشيخ محمود. ومنطقـة شميـران كمـا يقول ئى. بى. سون تقع في الشمال الغربي من حلبجـة يحـدهـا من الأعلى نهـر سيروان ومن الغرب والجنوب جبل بمو ومن الشـرق الحـدود العـراقيـة الايـرانيـة. وحسب ما كتبه سون فآن في شميـران ١٥٠ خيـالاً و (٤٠٠) راجـلاً و ٧٥٠ عائلة ينتمـون الى (يزدان بخشى) وهو فخد من عشيرة جاف الكبيرة وقد تركوا الترحال واستقروا في منطقة شميران وخورمال).

ويـذكـر هذا الشخص بآن حمـه ابن سان أحمـد إتصـل اثنـاء معركة (آوربـاريـك) بالشيـخ محمـود وتعهد بمناصرته وبناء على طلب الشيخ محمـود قاطـع حمـه وجمـاعته الحكومة في حلبجة مقاطعة تامة وامتنعوا عن دفـع الضـرائب و استقبال موظفي الحكومة وشرطتها. فجرّد الكابتن (ليس) في حلبجة حملة على شميران وفي قرية كانى گەوه جمع مختارى (١٤) قريـة وطلب منهم دفـع ضريبة الأرض والفلاحة المتراكمة بذمتهم لمدة (٤) سنوات، وفي حالة إمتناعهم يجري آخذهم عنوة الى المدينة.

لكن حمـه ابن سان أحمـد تحيّن الفـرصة وهاجم القوات على حين غرة واستطـاع طردهم من القـريـة ومـلاحقتهم. ممـا حدا بالانكليز الى مهـاجمـة القـريـة بخمس طائـرات حربية استطاع المقاتلون من إسقاط إحـداها. واستمر هذا الصراع حتى انسحاب الشيخ محمود من الساحة فاضطـر الى تسليم نفسـه فأرسـل مخفـوراً الى (خـانقين) وحوكم بتهمة التمرد والامتناع عن دفع الضرائب. ومن ثمّ أعفي.

- بەشی دووەم -

# ریالیزمی سۆشیالیستی و ئەدەبیاتی کوردی

د. عزالدین مصطفی رسول
کۆلیجی ئاداب ـ زانکۆی صلاح الدین

## ئەدەبیاتی نەتەوەیی

پلەی جێگیر بوونی ریالیزمی سۆشیالیستی دیاردەیەکی تریشی دی کە بووە شەقلێکی تری ئەدەبیاتی تازە. بەتایبەتی پەیدابوونی رژێمی سۆشیالیستیو پەرەسەندنی ئەدەبیاتی نەتەوەیی دی. ئەم ئەدەبیاتە لەرووی سروشتی ناوەرۆکەوە کەوتنە لەیەك نزیك بوونەوەو یەکگرتن و لە روخسارو دیاردەی نەتەوەیی‌دا کەوتنە جیاوازی. ئەمەش لە نەتەوەیەکەوە تا نەتەوەیەك وبە پێی پلەی بەرەو پێش چوونی پێشوویان جیاوازبوو، نەتەوەی وا هەبوو سامانێکی کۆنی هەبوو، گەلی واش هەبوو ئەلف و بێی نەبوو، لەگەڵ ئەوەش دا شتێکی هاوبەش هەر مابووە.

قارەمانی تازەی سۆشیالیستی یەکخەرو نموونەی شۆرشگێرو وێنە تێکۆشەرو دەربری کێشەی نێوان کۆن و تازەبوو بە هەموو سووچەکانی‌یەوە.

ئەم ئەدەبیاتە تا ماوەیەکی درێژ جیاوازیی لە نێوان گەلان و ئوسلوو- بیان دا هێشتبووەوە هەروەك نووسەرانی پێش شۆرش بەرەبەرە دەهاتنەریزی ئەدەبیاتی تازەوەو هەندێك جار بەزەحمەت دەهاتن، (نموونە: رێگەی ئازاری ئەلیکسی تولستۆی‌یە).

لەم بەرەو پێش چوونەوە دەبێ ریالیزمی سۆشیالیستی وەك شتێکی مێژوویی تێبگەین. دەبێ لە چۆنیەتی گۆرینی مێژوویی ئەو رووداوانە بگەین کە بەسەر یەکێتی ناوخۆی ئەو ئەدەبیاتەدا رادەبووری. ئەگەر ریالیزمی سۆشیالیستی لە سەرەتایداو لە کات و شوێنی پاش جەنگی ناوخۆیی‌دا یەکسەری‌و پیلان بۆ کێشانی تێدابێت، ئەوا ریالیزمی سۆشیالیستی دیاردەیەکی واقیعی بە هەموو ئاڵوزی‌یەکی‌یەوە دۆزی‌یەوە.

روخساری جیاوازیی شانۆی سۆڤیتی‌و بریخت لەراستی‌دا دوو جۆری ناوەرۆکی یە کگرتووی ریالیزمی سۆشیالیستن، هەروەك تڤاردۆڤسکی‌و ئیساکوڤسکی (بۆنموونە) لە شیعرەکانیان دا پشتیان بە سامانی کلاسیکی سەدەی نۆزدەهەم و گۆرانیی میللی‌یەوە بەستووە، بەلام مایە ـ کۆڤسکی تەواو لەوە لایداوە. رەسوول هەمزاتۆڤ و قەیسوون قولیێف و میزیلایتیش لیتنا سامانی نەتەوەی خۆیان پیشان داوە. سامانی دەوڵەمەندی ئەدەبیاتی ریالیزمی سۆشیالیستی جیهانی پێش هەمووشت لە جیاوازیی رێبازی نەتەوەیی‌و بە پێك هاتنی کۆمەلایەتی‌و ئیستاتیکی‌و هونەریی‌و بە گەشەسەندنی ئوسلووبی تازە دەست ـ نیشان دەکرێت.

لای نووسەرانی هەندێك لە نەتەوەکانی یەکێتیی سۆڤیت، لە کاتی دەست نیشان کردنی دەوری پێوەندیی کۆمەلایەتیی سۆشیالیستی‌و رۆلی سەرەنجامی کۆمەلایەتیی مێژوویی ئەم نەتەوەیەدا.

چیرۆك نووسە میللی‌یەکان جێگای هونەریی دیاری‌کراویان بە باس و نامەو شێوەی داستانی کۆنیان هەیە. تەنانەت دەنگی دانەوەی شیعری میلليی کۆن لەو ئەدەبیاتەشی‌دا کە بە پلەی ریالیزمی رەخنەگریی‌دا رابووردوون و رەنگی کێشەی کرێکاریی تێدا لێوە دەبینرێت (تینۆ ـ شڤیللی لە گورجستان، ئاگۆبیان لە ئەرمەنستان، سابیر لە ئازربایجان. . . هتد). ئەو ئەدەبیاتانە بوون کە رێبازە بورژوازی‌یە

ست شکاوەکانی پێش شۆڕشی خۆیان گەیاندبوونێ (ڕەمزیەت لە گ رجستان و ئەرمەنستان). ئەمەش شتێکی گران نی‌یە، چونکە ڕێ‌و شوێنی ڕوخساری کۆن لە ئوسلووب دا چەند کز بێ، لە فۆلکلۆرداو لە وکردنە زیندووکردنەوەی سەرگوزەشتەی‌پێشنیازا هەر دەردەکەوێت. یزمی وەسفی‌و ئەم ئوسلووبەی ڕوخساری ڕۆژهەلاتی، کە گیکی‌زۆر کۆنی هەیە، شوێنەواری بە ئاشکرا لە ئەدەبیاتی ناوەڕاستانی د (تاژیك و ئۆزبەك)و تەنانەت پاش ئوکتۆبەریش لە کازاخستان و کومانستان و قرگیزیش دا دیارە. ڕۆمانەکانی عەرەبی شەمۆی رنیش بەشێکە لەم چەشنە.

گومانیش لەوەدا نی‌یە کە ئەمە کۆسپێك بوو لە ڕێگەی ئەدەبیاتی مد. دەنگی گۆرانی بێژەکانی کۆن و تێکردنی تێکستی کۆن لە ەڕستی ئاسیادا شوێن دەستی تەواو دیاربوو.

کی لەو مەسەلانەی لە ڕووی تیۆری یەوە گرنگن ئەوەیە کە ئەو نەبیاتەی‌لە ڕێ‌یەوە لای هەندێك نەتەوە پەیدابوون، هەر لە سەرەتاوە چنە خانەی ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌یەوە. ئەمە لای ئەوانەی نووسینیان بوو لە ڕووی ناوەڕۆکەوە، بەلام لە ڕووی ڕوخسارەوە ئەدەبیاتی سۆڤیتی بە چەند تێکەلاوبوون (تفاعل) یکی هەمەڕەنگی جیاوازدا بوورد. هێشتا لە بەرهەمی هەندێك نووسەری ئەرمەنستان و گورجستان و ئازربایجان دا ئوسلوویی ڕووداوی جیا (مفارقە)و ڕووکردنە خوتبەدان دیارن، ئەمانەش خاسیەتی شیعری میللین. هونەری میللی هەر نەتەوەیە کاردەکاتە سەر گەشەسەندنی لەمەودوای، وەك لەناوەڕاستی ئاسیادا دەبینین.

ئەدەبیاتی سۆڤیتی چەند نەتەوەیی بەپێی بیر و باوەڕی ڕیالیزمی سۆشیالیستی بەرەو پێشەوەدەڕوات.

نووسەرە باشەکان لە ئەفراندنی خۆیان دا تەنیا ڕێبازی تایبەتی‌یان فێر نەدەکرد، بەلکو بەو ئەفراندنە واقیعی سۆشیالیستی‌یان پیشان دا. سەرهەلدانی ئەم شەقلەدیارە لە ئەدەبیاتی سۆڤیتی تازەدا ڕاستیی پێش بینی‌یەکەی بیلینسکیی دەرخستت، کە وتبووی ئەدەبیاتی نەتەوەیی لەو وێنە جیهانی‌یە تایبەتی‌یەی ئەدەبیات دا دەردەکەوێ کە لە وێنەی سروشتی‌ی تازەی خۆیەوە بەرەو ڕوخساری هونەری دەچێت و دەکەوێتە بەردەستی هەموو چەرخێك و هەموو ولاتێك بەلام سروشتی نەتەوەیی خۆی ون ناکات.

ئەدەبیاتێکی تازە گەشەی سەندووەو دیمەنەکانی جێگەی خۆیان گرتووەو بە یەك هاتنی دیالێکتیکیی خۆی تێکەلاوبوونی تەواویان لە نێوان مانای «نەتەوەیی‌و نێو نەتەوەیی» و مانای کەلابوونی «نەتەوەیی» و تێکەل بوون لە یەکێتی‌ی سۆشیالیستی‌دا هێنایەدی. ڕەنگە ڕەنگیترین دەربڕینی ئەم ڕاستی‌یە لەو وشانەی شاعیری ئەڤار ڕەسوول هەمزا-تۆڤ دا بێت کە وتوویەتی: «هەندێ‌کەس لێم دەپرسن: دەنگی نووسەری ڕووس بەسەر دەنگی شاعیرانەی من دا زال نابێت؟ من بە دلنیایی‌یەوە دەلێم هەموو کەلچەرێکی نەتەوەیی کە بە بیر و باوەڕی پێشکەو تنخوازی چەرخی خۆی پاراو بێت دەبێ ئاوازێکی نێونەتەوەیی هەبێت، من بەزمانی گەلێکی قەفقاسیی بچووك دەدوێم و دەنووسم، کاتێك کە دەنووسم سوورم لەسەر ئەوەی خەلکی بزانن ئەمە نووسینی ئەڤارێکی داگستانی‌یە. بەلام یەك تاو ئەوەم لەبیر ناچێت کە من شاعیرێکی سۆڤێتیم، وەك ئەو هەلۆیە وام کە لە فڕین دا نازانی کام بالی گرنگترە؟».

**ئایا ئەم ڕێبازە هەر ڕێبازی ئەدەبیاتی سۆڤیتی‌یە؟....**

لە زۆر زووەوە، واتە لە بیست سالەکانەوە ڕیالیزمی سۆشیالیستی بووە بە ڕێبازی سەرەکیی هونەر لە یەکێتی سۆڤیتی‌دا. ئەم ڕێبازە لە ژیان خۆیەوە لە بەرەو پێش چوونی هونەرەوە پەیدابوو، بەم جۆرە وەك ئەو بورژوازیانەی بوونە پسپۆر لە ئەدەبیاتی سۆڤیتی‌دا دەلێن تاقە وتەیەکی تیۆری نی‌یە کە بۆ لێ‌وردبوونەوە دەست بدات.

ڕیالیزمی سۆشیالیستی هەول دانێکی هونەریی هەمیشە بەرەو پێش چووەو بەردەوام و بێ دوو دلی بەو بەرهەمە ئەدەبی‌و هونەری‌یانەی ئیلهام لە بیر و باوەڕی سۆشیالیزمەوە وەردەگرن و بە ژیان و ڕاپەڕینی شۆڕشگێڕی‌یە مەزنەکان و گۆڕینە مەزنەکانی سەدەی بیستەمەوە بەستراون دەولەمەند دەکرێن.

هەقی ئەوەمان هەیە کە دلنیا بلێین ئوکتۆبەر و ئەو ئەدەبیاتە سۆڤیتیەی زادەی ئەون کارێکی فراوانیان کردە سەر ئەدەبیاتی جیهانی. گۆڕینی قوول و بەردار لە بەرهەمی نوێنەرە گەورەکانی ڕیالیزمی ڕەخنەگرانەی ڕۆژئاواو ڕۆژهەلات دا خۆی نواند. ئەو قوللە بەرزەی لای جوانی پەرستانی سەدەی بیستەم بووبووە دالدەدەرێکی خەیالی بۆ دووركەوتنەوە لە گەردەلوولی ژیان ڕووخاو چەند شوێنەوارێکی مێژوویی وەهمی نەبێت هیچی تری لەناو کەلچەری ئێستادا نەمایەوە. لە کۆمەلی بورژوازی خۆی‌دا خەباتی ئازادی خوازانەی چینی کرێکار و خەباتی هەموو کارگەران بەگشتی بەرامبەر بە دەسەلاتی سەرمایە کارێکی گەورەی کردە سەر هەموو کەلچەری گیانی یا ئەدەبیات و هونەر. پەیدابوونی ڕیالیزمی سۆشیالیستی بەستراوە بەوەوە. ڕیالیزمی سۆشیالیستی نە دیاردەیەکی ڕووسی‌یەو نە تەنیا سۆڤیتیش، بەلکو دیاردەیەکی نێونەتەوەیی‌یە لە هەموو بستە زەوی‌یەك دا کە چینی کرێکاری تێدا ڕاپەڕی‌بێ بۆ خەبات بەرامبەر بە سەرمایەداری، یا لە هەر خاکێك دا کە بیر و باوەڕی گۆڕینی ژیان بەرەو سۆشیالیزم بەسەر هۆش و گۆشی خەلك دا زال بووبێ پەیدا دەبێت.

بیــر وبــاوەڕی سۆشیــالیــزم زۆر پێش ئەوەی تەجــر وبــەی ڕژێمی سۆشیــالیــستی خۆیداچەسپێنێت پەیدا بووە . خۆگێل کردن لەم ڕاستی‌یە وامــان لێ دەکــات کە بە هیــچ جۆرێــك لە گۆڕین و جمــوجــوڵی ناو ئەدەبیــاتی ئاسیــاو ئەفــریقاو ئەمریکای لاتینی نەگەین یا ڕاستتر ئەوەیە کە دەسەلاتی تێگەیشتن زۆر ڕاستی‌و زروفی گرنگی سەر بە پەیــدابوون و گەشــەســەنــدنی هونــەرمــان نەبێت . مەســەلەی ڕیالیزمی سۆشیــالیــستی ئەدەبیــاتی ڕووسی بە ڕەگێکی بەتین بە ڕێ‌وشــوێنی کۆن و شکــۆداری ڕیــالیــزمی کلاسیکی پوشکین و گۆگــۆل و تۆلستــۆی‌و چیخــۆف و گۆرکی‌یەوە بەستراوە . چارەسەرکردن لێرەدا بۆ نموونە لەوە جیاوازە کە لە ڕیالیزمی‌ی سۆشیالیستی ئەدەبیاتی ئەمەریکای لاتینی‌دا دەبینین ، لێرەدا ڕەگی دەچێتــە سەر هونــەری ڕۆمــانتیــزمی‌و لە ئەفســانە زیندووکردنەوەدا ڕێگــەی ئەو دەگــرێت . لە ڕۆژئاوای ئەوروپادا دەتوانین ئەفراندنی (خ . لاکسین) لە ئایسلەندە لەگەڵ هەندێ لەو دیمەنانەدا جووت کەین کە لای هەنــدێ گەلــی ڕۆژهــەلاتی سۆڤێت دا دیمــان . وەك چوونــەوە سەر ئوسلووبی داستانی مێژوویی کۆن ، کە ئەمەش لە زۆر زووەوە بەستراوە بە ڕیــالیــزمی سۆشیــالیــستی‌یــەوە هەر لەو کاتــەش دا لە ڕووی ئیبداعەوە چەند تاڵ بە ئوسلووبە کۆنەکەی «ساگە»یەوە دەبەستێت .

ڕیــالیــزمی سۆشیالیستی لە ولاتانی ئەفریقاو ئەمەریکای لاتینی‌دا هەر لەژێــر سایــەی خاسیەتی کات و شوێنی کۆمەلایەتیی خۆی‌دا پەیدابووە . لەوێ‌دا تەئسیــری بیــروبــاوەڕی ئیستــاتیکی پێشــڕەوی (ئەڤانگاردیزم) ئەکــەوێ بەســەر تەئسیری ئەو لێکدانەوە ئەفسانەیی‌یەدا کە هێشتا لە بیر و کەلچــەری گەل دا ماون . شوێن پەنجــەی لێکــدانــەوەی ئەفســانــەیی لە بەرهــەمــی نووســەری پێش کەوتــنــخــوازی وەك جۆرج ئەمــادۆو ئەلیکــیش دا لە باری سەرنجی مێژووەوە ڕیالیزمی سۆشیالیــستی بە تاقە بزووتنــەوەی هونــەرەکــە دەبینــرێ کە هەمــوو دیمــەنــە دیــارەکانی پلەی دامــەزرانــدنــەوەی سۆشیــالیستانەی جیهان بخاتە چوارچێوەی خۆیەوە . بەلام ئەم ڕوخســارە گشتی‌یــە ناچێتــە ناو تاقە وێنەیەکەوە . جۆرج ئەمادۆ لێکــدانــەوەی خۆی بەرامبــەر ڕیــالیــزمی سۆشیــالیــستی وا دەردەبــڕێت کەدەڵێت : [ تا کتێب و ڕۆمــان و شیعــرمــان خزمەتی مەسەلەی شۆڕشی هەبێت ، دەبێ پێش هەموو شتێك بەرازیلی بێت ، توانای نێو نەتەوەیشی هەر لەمەدایە . . ]

لەتوانادایە کە نوێنەری هەموو ئەدەبیاتە نەتەوەیی‌یەکان ئەمە دەربارەی گەشــەســەنــدنی ئەم ئوسلووبــە تازەیــە بڵێن کە لەگــەڵ کات و شوێن دا ڕاســتی ئەوە دیــارتــر دەبێت کە دیمــەنی بنــەڕەتیی ئەو ئوسلووبــە لە ڕوخساری هونەری نەتەوەیی هەمەڕەنگەی‌دایە .

ڕیــالیــزمی سۆشیــالیــستی لە جەوهــەردا خاسیــەتی نێــو نەتــەوەیی هەیە . سەرەتــای نێــونــەتــەوەیی‌یــە ، بەلام دیمــەنەکانی دیارە جیان . ئەمەش لە ڕووی مێــژوویی‌و ئایــدیــۆلــۆژی‌یەوە ڕەنگ دەدەنەوەو یەکێتیی ناوخۆیی بزوتنــەوەی مێــژوویی کۆمــەلایــەتی نەتــەوەی جیاوازجیاواز دەردەخەن . هێنــانــە پێش چاوی ڕیــالیــزمی سۆشیــالیــستی بەهۆی ئەم ڕاستی‌یەوە بێ پشــوو لەگەڵ یەکگرتنی ڕەگەزی دیموکراتی‌و سۆشیالیستی لە کەلچەری ئەم ولات یا ئەو ولات دا فراوان دەبێت .

## ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌و جیهانی سێ‌یەم

بوونی ئەدەبیــاتی ڕیــالیــزمی سۆشیالیــستی لە جیهانی سێهەم دا جێی موناقەشە نی‌یە . کە گەیشتینە ڕاستی پەیدابوونی ئەدەبیاتی کرێکاران لە جیهــانی سەرمــایــەداری خۆی‌دا ، یا بڵێین لەو ولاتــانەدا کە هێشتا لەژێر دەســەلاتی سەرمــایــەداری‌دان (فــەرەنســاو بەریتــانیــا) یا گەیشتینە سەر پەیدابوونی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لە ڕووسیای پێش ئۆکتۆبەردا ، ئەمانە هەمــوو ڕێ نیشــانــدەرن بۆ بوونی ڕیــالیــزمی سۆشیــالیــستی لە هەمــوو ولاتێکی سەرمــایــەداری وادا کە خاسیــەتی هاوتایی شتی نەتەوەیی‌و شتی نێونەتەوەیی لە ئەدەبیاتا تێدا پێك بێت . یا ئەدەبیاتەکەی سروشتی خەباتی بەرامبــەر بە سەرمــایــە تێــدابێت و لەگــەل هەمــوو تەوژمــە ئەدەبی‌یــە بۆرژوازی‌یەکانی ئەم سەردەمەدا بکەوێتە کێشەوە .

لە کاتێك دا کە دەمێکە لە ولاتە سەرمایەداری‌یەکانی ئەوروپادا مونا - قەشە بەلای چاکەی ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌دا کۆتایی پێ هێنراوە ، کەچی تازە موناقەشە دەربارەی بوون و نەبوونی ئەم ئەدەبیاتە لە ولاتانی جیهانی سێهەم دا دەکرێت .

ئەمــە باسی دوا کۆنفــرانــسی عیلمی بوو کە لە دەستگــای ڕۆژهــەلا - تنایی سەر بە ئەکادیمیای زانستی سۆڤێتی لە مۆسکۆ لە دوو ڕۆژی ٢٥ - ٢٦ری حوزەیرانی ١٩٧٧ دا گیرا . کۆنفرانس کاری خۆی بۆ تەئسیری ئەدەبیاتی سۆشیالیستی بەسەر ولاتانی ڕۆژهەلات دا تەرخان کردبوو (١٦)

کۆنفــرانس لەڕێی چەنــدین ڕاپــۆرتی عیلمی‌یــەوە ڕۆڵی نووســەرانی ڕۆژهەلاتی سۆڤێتی لە بەرەو پێش بردنی ڕیالیزمی سۆشیالیستیی ولاتانی ڕۆژهــەلاتــی دوورو ناوەڕاســت و نزیــك دا سەلــمــانــد . وەك ئەکــادیــمیــك براگیــنــسکی‌وتی : ئەدەبیــاتی ڕۆژهــەلاتی سۆڤێتی تەجروبەیەکی تازە لێك دانی بناغەی ڕۆژهەلاتی بە تەجروبەی ڕیالیزمی ڕووسی‌و سۆڤێتی بەخشی‌و ئەمــەش لە تەجــروبــەی ئەدەبیــاتی گەلانی ڕۆژهــەلات و (جیهــانی سێ‌یــەم دا ڕەنگی دایــەوە ، هەرچــەنــدە گەلێك ناونــانی وەك «ئــەدەبیــاتی میللی»و «ئــەدەبیــاتی دیمــوکراتی»و «ئەدەبیاتی دیمــوکــراتیی میللی» هەیــە بەلام ڕووکــردنــە ڕیالیزمی سۆشیالیستی لەم ئەدەبیــاتــەدا دیــارو ڕۆشنــە . دەتــوانین ئەو بیــر و ڕایانەی لەو کۆنفراسەدا موناقەشە کران لەم دێڕانەدا کورت بکەینەوە :

ـیـزمی سۆشیـالیستی لە سی سالانەوە لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەلات دا ـبـوە . هەرچەندە لە چل سالان و پەنجا سالان دا گەشەی سەند ، ـ ـکـوکـی ئابـووری لە سالانی شەست و حەفتـادا لە هەندێ ولاتی ـهـەلات دا بووە هۆی هەنـدێ کشـانـەوە لە ڕووکـردنـە ڕیالیزم ، لە ـنـدنی ڕۆژهـەلات دا ، ئیبداعێکی پڕ لە بیری سۆشیالیستی هەیە ، ـ ـادەی هونەریی لای زۆر نەتەوە هێشتا دواکەوتووە ، لەکاتێك دا لە ـ ـنی جیهـانی سێیەم دا لەژێر دروشمی سەربەستی ئیبداعی خۆیی و ـ ـی هونەرمەندا هێرش دەبرێتە سەر ڕیالیزمی سۆشیالیستی ، هەر لەو ـتـەدا دیـاردەی مۆدێرنیزمی لە ڕۆژئاواوە هاتووی خۆی دەردەخات و لە ـسی ولات دا ئەدەبیاتی ئاینی پەیدا دەبێت (وەك ئەندەنووسیا) .

مودیـرنیـزم پاش ئەوەی لە ڕۆژئـاوا گەیشتـە دوا پلەی ڕووی کردە ـهـەلات . ڕۆژهـەلاتی سەر بەو ڕێبـازە چوون بەپیر هەموو سووچە ـتـوایی‌یـەکـانی‌یـەوە . ئەگـەر ڕیالیزمی سۆشیالیستی وەك پرۆفیسۆر ـگینی چێلۆشـوف وتی : (هـارمـۆنیـای مەوزووعیتی خۆیـەتی بێت و ـوی یەکخستنی ئادەمیـزادو جیهـان بێت و بە ئاشکـرا مەسـەلەی . . ـکردنەسەریی‌یەکی هونەرمەندو واقیع بێت ، ئەوا پێوەندیی مۆدێرنیزم بە ـقیعـەوە ( بەتـایبـەتی بە واقیعی ڕۆژهـەلاتـەوە) زۆر کزو لاوازە . لە ـعیـاتی ڕۆژهـەلات دا باسی بێگیانیی ڕۆژئاوا ناکرێت ، بەلکو باسی ـگیـانی ئیمپـریـالیزمی ڕۆژئاوا دەکرێت . لە ئەدەبیاتی ڕۆژهەلات دا ـ ـرچـەنـدە لە هەنـدێ ولات دا ڕووکـردنـە ڕیـالیـزمی سۆشیالیستی لە ـست سالان و حەفـتـا سالان دا کز بوو ، بەلام هەر ئەدەبیـاتـێـکی ـرچـاوگـەشـە . ئەم ئەدەبیاتە لە زۆر ولات دا (بۆ نموونە هیندستان) لە ـبیاتی دروشم و هەست دەربرین دا نەماوە ، بەلکو ژیان لە ڕوانگەی ـلیـزمی سۆشیالیستی‌یـەوە نەخشە دەکێشێ . هەندێ لە زانایان باسی ـویـان کرد کە تەوژمـە ڕیڤیتـرۆنیستی یا چەپ ڕەوەکـانی ناو سیاسەت ـریـان کردوتـە سەر ئەدەبیـاتی ڕیـالیستی جیهـانی سێیـەم و بەرەو ـش چوونی . هەروەك لە مەسـەلـەی سۆشیـالیستی‌یە نامارکسی‌یەکان و ـوشیالیستی‌یە درۆزنەکان و کارکردنە سەر ئەدەبیی‌یان دوان و ئەم چەشنە ـوشیالیزمە بە سۆشیالیزم دانیان بە کارێکی ترسناك و ئالۆز دانا .

هەروەك هەنـدێـك زانا نرخیان بە ڕووکردنە سۆشیالیزمی زۆر هێزی سیاسیی تازەداو بە بایەخەوە تەماشای ئەوەیان کرد کە ئەم هێزانە چوونەتە سەر ڕێبـازی بیـری سۆشیـالیستی و بەهـۆی پەیـدابـوون و پەرەسەندنی ڕیـالیزمی سۆشیـالیستی‌یـان دانـا لە ئەدەبیـات داو داوای تێبینی‌کردنی دیـاردە تازەکـانی ئەدەبیـاتی ڕۆژهەلاتیان کرد . ئەم دیاردانە جارێکی‌تر بوونەوە هۆی موناقەشەکردنەوەی ناونانەکەوە . ئایا دەتوانین ئەم ئەدەبیاتە تازەیـەی ولاتـانی ڕۆژهەلات کە لە ناوەڕۆکی گشتی‌دا دەچێتە سەر بیری سۆشیالیستی بە ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی دابنێین؟ . .

ئەگـەر لەوەدا یەك بین کە بیـری سۆشیالیستی لە چوارچێوەیەکی زۆر فراوانتـر لە چوارچێـوەی مارکسیـزم دا ببینین ، ئەوا دەتـوانین لەگـەل پێشنیـارەکـەی پرۆفیسـۆر یەڤگینی چێلۆشـۆف دا بین کە ئەم ئەدەبیـاتـە ڕۆژهەلاتی‌یە تازەیەی بە ئەدەبیاتی (جوغزی سۆشیالیستی) ناو نا .

ئایـا دەربـارەی چوارچێـوە تازەکـەو وتـەکەی ماياکۆڤـسکی دێتەدی کە دەربارەی ئەدەبیاتی شۆڕشگێری تازە وتوویەتی :

«هـەرچەندە باس یا ڕووداو گەورەبێت ، دەبێت باوەڕی تەماشاکردن گەورەتـر بێت ، پیـاوی بێ توانـا دەجـوولێت ، بەلام لەجێی خۆی‌دا چاوەڕێ دەکـات تا ڕووداو بێـت و بڕوات و نەخشــەی بکێشێ . بەلام پیـاوی بە توانـا پێش ڕووداو دەکـەوێ بۆئـەوەی ئەوی دەیزانێ بە دووی خۆی‌دا ڕابکێشێت» .

## چەند موناقەشەی تازە

ڕیالیزمی سۆشیالیستی لە زەوی‌یەکی پتەودا سەری هەلداوە . ئەمەش واناگەیێنێ کە تەنیا میراتگری هەموو لایەنی باشی ناوەڕۆك و ڕوخسـاری قوتـابخـانـەکـانی پێش خۆیـەتی ، بەلکو ئەم چەشنە پێوەندی‌یەی لەگەل هەموو قوتابخانە ئەدەبی‌یەکانی تردا هەیە .

ڕیـالیـزمی سۆشیـالیستی بۆ تێگـەیشتنی هاوچـەرخـەکـانی خۆیان . یارمـەتی هونـەرمـەنـدانی ڕیـالیـزمی ڕەخنـەگرانەی ئەمرۆ دەدات . ئەو هاوچەرخانەیان وەك کەسانێك پیشـان دەدات کە دەوروپشتی خۆیان پێی گەیـانـدبن و تاقـەکـەسی نەبن ، وەك تێکـۆشـەری ڕێگـەی گۆڕینی ئەم دەوروپشتە پیشانیان دەدات .

ڕیـالیـزمی سۆشیـالیستی کاری کردە سەر نوێنـەرانی ڕیـالیـزمی ڕەخنـەگـرانەی وەك هەنریس مان و ڕۆمان ڕۆلان و نووسەرانی ولاتانی دیموکراتی میللیی درۆست کرد . فیشـەر دەلێت :

ڕۆژدوای ڕۆژ نووسـەرە لاوەکـانمان زیاتر دەسەلات بەسەر هونەری هەمـەڕەنگـەی ژیـان نەخشـەکێشـان دا پەیـدا دەکـەن ، هەرچـەندە لەو چاوەڕوانی‌یـەدا لایـەنی سیـاسیی ژیان دەخەنە پێشـەوەو باشیش دەکەن . چونکـە بێ تێگـەیشتنی سیـاسـەت ئادەمیزاد لە تەواوی‌و پڕ و چڕیی ژیان ناگـات . کەواتـە ڕیـالیـزمی سۆشیـالیستی لە ڕۆلی بنەڕەتی‌ی ناوەڕۆك دا زۆر نەڕۆیشتووەو ڕۆلی ڕوخساریشی نەخستۆتە لاوە ، بەلکو کردوویەتی بە پاشکـۆ (تـابیـع)ی ناوەڕۆك . ڕیـالیـزمی سۆشیـالیستی بە سروشتی بیروباوەڕی گشتی دەربارەی زانیاری‌و دەربڕینی ژیان بنەڕەتی ڕێڕەو و شەقلی تایبـەتیی هەولی خولقێنـەری خۆی دەست نیشـان کردووە . لەم بارەشـەوە ڕیـالیـزمی سۆشیـالیستی پێچـەوانـەو بەرامبـەری ڕیـالیـزمی بێسنـوورە . لەزۆر ولات دا گەلێـك موناقـەشە دەربارەی مەسەلەکانی ڕیـالیـزمی سۆشیالیستی دەکرێت ، ئەم موناقەشانە بە هەندێك مەسەلەی

تیۆریو پراکتیکی بۆ پێش خستنی ئەدەبیاتی هاوچەرخ ئامادە دەکەن. وێنەی ئەم مەسەلانە پێوەندیی پێرەوکەرییە بە ڕیالیزمەوەو سەرەتای ڕەخنەگریو داچەسپاندنی ڕیالیزمی سۆشیالیستییە، پێرەوو ئوسلووبە باسی ڕۆڵی سەربەخۆی هونەرمەندە. هەروەك موناقەشەیەکی گەورە دەربارەی پێوەندیی نێوان ڕۆمانتیزم و ڕیالیزم لە ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستیدا هەیە. ژمارەیەك لەڕەخنەگران دان بەوەدا دەنێن کە ڕێبازێکی ڕۆمانتیکی تایبەتی لە سنووری ڕیالیزم دا یا لە سنووری ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستیدا هەیە. هەندێکیش باسی ئەوە دەکەن کە هەر ڕەنگە باسی بوونی دیمەنی ئوسلوبی ڕۆمانتیکی لە بەرهەمی هەندیك شاعیردا بگونجێت. هەندێك باسیش هێشتا هەر چاوەڕێی موناقەشەیە وەك پێوەندی نێوان پێرەوو ئوسلووب.

تڤاردۆڤسکی دەڵێت:

کە بووکە بە بارانەیەکم بۆ دێنن و لە بارێك دا کە پێیبوتری (فریشتەیی) گیانی دەکرێت بە بەردا، من لە داخانا چاوم دەنوقێنم، دەڵێن ئەوەی دەبێبخوێنرێتەوە چییە؟ دەڵێن: ڕۆمانتیزمە ئەوساش دەڵێم نا. کە شتێکی کلۆڵی لاوازبێ بۆ فڕێی دەدەن وەك بڵێن لە دەفتەری نفووس، پەردەی سینەما دەچێت و تا ڕادەیەکی کەم وزۆر بە کزی ڕۆشنی دەبەخشیت بە بیرێکی کلۆڵی وا کە ژیان دووبارە بنووسێتەوەو دووبارەی بکاتەوەو پێم دەڵێن: ئەمەیە ڕیالیزم؟ من دەکەومە پەروەردەکردن و ڕاهێنانی.

ئۆکتۆبەر دەورانێکی تازەی هێنایەکایەوە، دەورانی (کلپەی جیهانی)، بارێکی مێژوویی تازەی هێنایە کایەوە کە لە ڕووی ئەدەبیاتەوە بەردەوامیی ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە نییە، با ڕیالیزمی سۆشیالیستی ڕەنگدانەوەی ڕابووردووشی تێدابێ بەڵام هەر لە دووربینی دوارۆژەوە تماشای دەکات و گەڕانەوە نییە بەرەو ڕابووردوو. ئۆکتۆبەر کاری کردە سەر زۆر نووسەری دەرەوەی یەکێتی سۆڤێت. ئەمەش لە «مالڤاوایی» یوهان ـ بێهێر و «من لە دەرگا دەدەم»ی شوون ئولکسیو شیعری سمیر ـ نینسکیو نایمان دا دیارە، هەروەك کاریشی کردووەتە سەر شیعری مایکۆڤسکیو یارو سلاڤ گاشیك. هەروەك ئیبداعی ڕیالیزمی ـ سۆشیالیستی شتێکی تازە بوو لە ئەدەبیاتی جیهاندا، هەروەها بە شێوەی ئاسایی هەندێك دیاردەی هەمەڕەنگ لە ئەدەبیات دا پەیدا بوو و ڕژایە ناو ڕۆخانەی ئەم ئوسلووبە تازەیەوەو چووە شەپۆلی گەشەسەندنی ئەو پلە پڕ لە ئاڵۆزیو ناکۆکییەی زۆر وڵات و ڕێبازی بزووتنەوەی جیهانییەوە. ئەم مەسەلەیەی زۆر لقی هەیە تا ئێستا بە جۆرێکی کۆنکرێتیی ئاشکرا لە لێکۆڵینەوەکانی ڕەخنەدا باسی لێ نەکراوە.

جۆرج لۆکاچ نووسیوییە.. ئەدەبیاتی سەدەی نۆزدەهەم لوتکەی ئەدەبیاتی وڵاتانی سەرمایەدارییە، لۆکاچ بەم قسەیە تیۆریی تەنگوچەڵەـ مەی سەرمایەداری لە پلەی ئیمپریالیزم دا بە جۆرێکی میکانیکی دەهێنێنە کۆڕی ئەدەبیات و ڕەخنەوە. هەر لەسەر ئەم بناغەیەش لە ئەدەبیاتی سەدەی بیستەمی ئەورووپا بە سەرەتای ڕیالیزمی سۆشیالیستی دەزانێت. برێخت لە وتاری بڵاوی هەمەڕەنگیی ئوسلووبەکانی ڕیالیزم (١٩٣٨)ی خۆی دا موناقەشەی ئەمەو بیرەکانی تری لۆکاچ دەکات و هەمەڕەنگیی ئوسلووب بە ڕێگری ئەوە دەزانێت کە هەموو ئەدەبیاتی ناڕیالیستیی بە شتێکی بێنرخ بزانرێت. برێخت نووسیوییە: «مەترسی لەوەدایە کە تێگەیشتنی شکۆداری ڕیالیزم بەستین بە دوو ناو یا سێ ناوی گەورەوە، یا دوو ڕێباز یا سێ ڕێباز، با چەند سوودمەندیش ین دەست نیشان بکەین، تاقە ڕێبازی ڕاست ئەوەیە کە دووبارە نابێتەوە»

لەمەوە دیارە کە لۆکاچ ڕیالیزم بە ئوسلووبێکی بورژوازی دەزانێت، ئەم بیرەی ئەویش لای پێترۆڤ دیاری دەدا کە ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە بە بناغەی ڕیالیزمی سۆشیالیستی دەزانێت، کە لێرەدا سۆچکۆڤ و میاسنیکۆڤ و هەندێکیتر لەگەڵی نین و لە باری سەرنجی خۆیانەوە نابێ زۆر لەسەر ئەوە برۆین کە ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە ڕۆڵی گەورەی لە پێکهاتنی ڕیالیزمی سۆشیالیستیدا هەیە. چونکە ئەمە جەوهەری تازەـ گەریو تازەهێنانی ڕێبازی تازە ون دەکات. لێرەدا گرنگ ئەوەیە کە تایبەتێتی نەتەوەیی ڕیالیزمی کلاسیکیی ڕووسی دەربخەین، چونکە ئەو بارە شۆڕشگێرییەی لە ڕووسیادا پەیدابوو، ڕیالیزمی کلاسیکیی لە سنووری ڕەخنە لە شت گرتن دا ڕانەگرت. بنەڕەتی ئەو بیرانەی لەو وتارانەدا کە دەربارەی تۆلستۆی نووسراوە ئەوەیە کە «هەنگاو بەرەو پێشەوەنان لە بەرەو پێش چوونی هەموو هونەری مرۆڤایەتیدا یەکسەر بەستراوە بە دەست نیشان کردن و هێنانە بەردەمی کۆششی گەل لە بەرامبەریی مێژوودا، ئەم مەسەلەیەش سروشتێکی شۆڕشگێریی داوە بە هوشیاریی هونەری لە ڕووسیادا. لەکاتێك دا کە لە بزووتنەوەی ئەدەبیی ئەورووپادا بە پێچەوانەوە زۆر لە نووسەران وەزعییەت و ئایدیالیستییان کردووە بە فەلسەفەی خۆیان و ناتورالیزم و نشێویو فۆرمالیزمیان پاش ڕووخانی ڕیالیزمی ڕەخنەگرانە کردووە بە ئوسلووبی هونەریی خۆیان ئەمەش سەرەتای هەموو کارەساتەکانی بیروڕاو ڕێبازی تاقە کەسییە».

هەندێجار بە زۆر بیانووەوە لێرەو لەوێ دەنگ بەرز دەبێتەوەو هاواری کۆتاییهێنانی ڕیالیزمی سۆشیالیستی دەکرێت.

ئەو شۆڕشی زانست و تەکنەلۆژیایەی کاری تەواوی کردە سەر بەرەو پێش چوونی هەموو کەڵچەر بنەڕەتی بیروباوەڕەکانی ڕیالیزمی سۆشیالیستی نەگۆڕیوە، تەنانەت لە وڵاتە سۆشیالیستەکان دا لە ڕەگەوە بەستراوە بە قەوارەی سۆشیالیستیی کۆمەڵەوەو خزمەتی چاکەی دەکات،

...ی جێگەی ناگرێتەوە. ئەو بیری مرۆڤی خولقێنەرەی باوەڕی ...تی هێنایە کایەوەو گۆرکی بەرەو پێشی برد، هەمیشە هەر بەردی ... سووچی کەڵچەری سۆشیالیستی‌یە.

...یالیزمی سۆشیالیستی لەم پلەیەی ئێستای دا لە بنەڕەتەوە، یەکگرتوەو ... تەواوکردنی نێوان جیهان و بوونی مرۆڤی لەسەر بناغەی یاسا ...تی و کۆمەڵایەتی‌یەکان دەردەخات. ڕیالیزمی سۆشیالیستی هونەری ...ی کۆمەڵایەتی مەزنە، ڕژێمێکی ڕەوشت و ئیستاتیکی هەمیشە ...ەو پێش چووی ئەوتۆیە کە توانای دۆزینەوەی کتوپڕی‌و دووبارە ...خاندنەوەی تەواوی ئادەمیزادو جیهانی هەبێت و مەسەلەی ڕەوشت و ...یولۆژی‌یە هەرەگرنگەکانی لە سنووری جیهان و هەموو مەسەلە ...نگەکانی جیهان دێنێتە ناوەوە. بایەخ دان بە ئەدەبیاتی تۆمارکردن و ...گەیی (وثائقی) لە ڕۆژهەڵات دا بە گەڕانەوە سەر ڕیالیزم دەژمێرری ...ڵام بەرەو پێش چوونی هەڵس وکەوتی ئەدەبیاتی جیهانیی هاوچەرخ بەڵگەی ئەوەیە کە ڕیالیزم تا ئێستا گەورەترین تەوژمی ئەدەبیاتە. ئەم ڕیالیزمە وەك ئەوانەی ئەدەبیاتی تازە بە مەزندەی کۆن دەپێون لایان وایە، ئەوی سەدەی پێشوو نی‌یە، بەڵکو ڕیالیزمی ئەم چەرخەیەو هەموو دەسکەوتە مەزنەکانی سەدەکانی پێشووی وەرگرتوە و دیمەنی جەوهەریی تازەی ئەوتۆی لێ‌زیاد کردووەو ئاراستەی بەرداری بەوە جێگەی گرتووەو بناغەی گۆڕینی ژیانی گرتوتە خۆی‌و نووسەری تازەی زۆر وڵاتی بۆ ئەوە ڕاکێشاوە کە ئیبداعی خۆیان بڕێژنە ڕۆخانەی ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌یەوە.

چەند ساڵێك لەمەوبەر ژمارەیەك لەوانەی لە ئەدەبیاتی ئینگلیزی دەکۆڵنەوە لە (ستراتفور ئۆف ئافون)ی جێگەی لەدایك بوونی شکسپیردا کۆبوونەوەو کۆڕێکیان بۆ باسی (ڕیالیزم و واقیع و ڕۆمان گرت. لەو ڕاپۆرتەدا کە لە پاشکۆی ئەدەبی تایمسی‌دا بڵاوکرایەوە بەشدارانی ئەو کۆڕە لە موناقەشەدا لەو قسەیە کۆڵینەوە کە گوایە باوەڕە خولقێنەرەکانی ڕیالیزم ئەرکی خۆی تەواو کردو پێویستی بە تازەکردنەوە هەیەو گوایە ئاڵۆزیی نوێ بووە بە پێویستی یەکی مێژوویی، هەروەك هەموو لەسەر ئەوە یەك بوون کە توانای ڕاستەقینەی بەرەو پێش چوونی ئەدەبیاتی دوارۆژ بە تەواوی بە هۆی ئاڵۆدە بوونی زۆری ڕەخنەگران لە ڕێگەی باسەوە داینێ، هەر لەو کاتەدا گۆرکی لەمەوە دوور کەوتەوەو پەیسی تازەی داینێ‌و نەخشەی نوێنەری هەموو دەستەو تاقمێکی نەخشە کێشاو لە پەیسەکانی‌دا نوێنەری دوو چین دەبینین (کەچی لای چیخۆف نوێنەری یەك دەستە دیارە). بەرەو پێش چوونی قارەمان (لە ڕۆخسارو جەوهەردا) لەو داستان و ڕۆمانە تازانەدا (لە بیست ساڵەکان و سی ساڵەکان دا) دی‌و لە ڕۆمانی تۆمارکردنی واقیعی پاش جەنگی ناوخۆیی‌و جەنگی نیشتمانی‌دا دیاریی‌دا.

لە نیوەی دووەمی ساڵانی پەنجادا جۆرێکی تازە لە ئەدەبیاتی سۆڤیێتی‌دا دەرکەوت و تەوژمێکی دا بە ئەدەبیاتی جیهانی.

ئەویش پەیدا بوونی پەخشانی لیریکی بوو، کە دەتوانرێ بە جۆرێك لە پەخشان یا چیرۆکی بێ قارەمان دابنرێت، یا قارەمان هەر نووسەر خۆیەتی.

ڕەنگە سەرەتایەکی ئەمە لە ئەدەبیاتی ڕیالیستی کلاسیکی ڕووسی‌داو بەتایبەتی لای تۆرگێنێف ببینین. بەڵام ڕەسووڵ هەمزاتۆف کە لەسەر زەوی‌یەکی پتەوی وا وەستابوو کە هەموو بناغەکانی ڕیالیزمی سۆشیالستی کۆ کردەوە ئەم بابەتەی بەرەو پێش برد.

«داگستانی من» نموونەیەکی جۆر و چۆنیەتیی ئەدەبیاتی تازەو هەمە کەناری قووڵی دەربڕە.

ئۆلگا بیرگولتسا بە تابلۆی ڕەش بەرەو کڵێسەمان دەبات و تەپوو تۆز لە ئەیقوون لا دەدات. بە بۆچوونێکی تازە باسی کڵێسە دەکات و بە تیۆریی ڕەمزیەت و تەعریفی ئیفلاتوونیی ئەدەبیاتەوە بەرەو نەمانی برد. ئەمە زنجیرەیەکە لە درۆ. کۆڕەکە لەگەڵ تیۆریی پرۆفیسۆر شورێرو هاوپشتەکانی‌دا نەبوو کە ئەدەبیات بکرێت بە ڕەمز و ئیشارەت. بەکورتی لێکۆڵەرەوە گەورەکانی ئەدەبیاتی ئینگلیزی بە هەموو ئەو شتانە ڕازی نەبوون کە نوێنەرانی قوتابخانەی ڕەخنەی تازەی پووچەوە بوو یا ئیستاتیکی ئەدەبیاتی تازە هەوڵیان دا بیکەنە جێگری ڕیالیزم.

گرنگترین بەرهەمی ئەدەبیی وڵاتانی سۆشیالیستی باس لە مەسەلە ـ یەکی بنەڕەتی دەکات کە دامەزراندن و پاراستنی کۆمەڵی سۆشیالیستی لەم مەیدانەدا باس و وێنەی خۆیان دەدۆزنەوەو مەشخەڵ دادەگیرسێنن. ئەمە لەمەوبەریش هەر ڕاست بوو. چونکە لە سەرەتاوە ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی ئیلهام لە ڕووداوەوە وەردەگرێت و هەر تەنیا هەوڵی تۆمارکردنی نادات، بەڵکو دەستیش دەخاتە ناوی‌یەوە. ئێستاش کە دەچینە پلەیەکی مێژوویی تازەوە ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لە ڕادەی ئیبداعی ئەدەبی‌دا لێ زیادکردنی تازەو زۆر ئاڵۆزی دەوێت. بۆ نموونە ئەدەبیاتی سۆڤیێتی هەر لە ڕووی لێکۆڵینەوەوە بەرەو پێش نەچووە، کە دەبینین چیخۆف پەیسی کۆنی دەوری خۆیی ڕووخاندو هەڵوێستێکی ڕۆژانەی تازەی بەخشی‌و جیهانێکی تازەی پێ دۆزی‌یەوە و ئەمە لای چیخۆف کۆڵەکەو باس بوو و توانای بینینی ناوەڕۆکی سروشتی یادداشتی ڕۆژانە دەدات بە پەخشانی لیریکی. ڕیالیزمی سۆشیالیستی سنووری هونەریی خۆی فراوانتر دەکات و وردە وردە وەك ئوسلووبێکی هونەریی هاوچەرخ گرنگی پەیدا دەکات. ئەم فراوان بوونە بە وشکی تێ‌گەیشتن لە ڕیالیزمی سۆشیالیستی دوور دەخاتەوە.

ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لە سنوورێکی جیهانی‌دا دانی پێ‌دانرا. مێژووی ئەو تەنیا پشتێك لە نووسەران ناگرێتەوە. لە ڕێڕەوی

گەشە سەندنی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستیدا چەند پشتی وا هەبوون کە هەندێك کە بە بەرچاوتەنگییەوە تەماشای ئەو ڕوخسارە هونەرییەیان دەکرد کە لە سالأنی سیدا بەکار دەهێنران. هونەری ڕیالیزمی سۆشیالیستی لە پلەی ئێستایدا هەموو تەجروبەی هونەریی ولأتانی سۆشیالیستی زۆر نەتەوەیی و ولأتانی بۆرژوازیی ڕۆژئاواو کەلَچەری «جیهانی سێیەم» دەگرێتەوە. لە وێدا کێشەیەکی ئالۆز لەژێر گەلێك تەنسیردا بەرەو پێش دەچێت. لەبەرئەوە ناتوانین دان بە مەسەلەی «چوونە قاوغ» یا تەواوەتی ـ تکامل ـ «ی ڕیالیزمی سۆشیالیستیدا بنێین و بە ڕێبازی هونەریی بزانین. ئەم ڕێبازە هەمیشە لە بزووتنەوەدایەو هەرچی ڕێبازی پێشکەوتوو لە بەرەوپێش چوونی مێژوویی جیهانیدایەو ڕوخساری ڕەنگدانەوەی هونەری تێدایێ، هەمووی بەلای خۆیدا ڕادەکێشێت. لەبەرئەمە بیری ڕیالیزمی سۆشیالیستی بە جۆرێکی یەکگرتوو لەگەڵ بیری بەرەوپێش چوونی ئیستاتیکیدا یەك دەگرێ و بزووتنەوەی پێشکەوتنی کۆمەڵ بەرەو ژیانێکی گیانیی پڕ لە ڕوخساری بە نرخ و بایەخی جیاواز نەخشە دەکێشێ. پێشکەوتنی ئیستاتیکی لەزۆر پلەدا ناکۆکی تیژ لەناو نابات بەلأم بنەڕەتی ڕێبازی ڕەنگدانەوەی بەرەو پێش چوونی کۆمەڵ بەرەو سۆشیالیزم لە ڕێگەی هونەرەوە دەست نیشان دەکات.

## ڕیالیزمی سۆشیالیستیو ئەدەبیاتی کوردی

لێدوان و موناقەشەی بوونی قوتابخانە یا ڕێبازی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لە ئەدەبیاتی کوردیدا هێشتا نەچۆتە سەر کاغەزو کۆڕی نووسینەوە. تەنیا ئەوەندەیە کە لە هەندێك موناسەبەدا هەندێك دەنگ بەرز دەبێوەو ئینکاری بوونی ئەدەبیاتێکی ڕیالیزمی سۆشیالیستی کوردیی دەکرد. ئەمە بووە هۆی دووبارە پێداچوونەوەی سەرچاوە تیورییەکانی ڕیالیزمی سۆشیالیستی، وردبوونەوە لەو ڕێبازو قوتابخانەیەخۆیو لە سەرەتای پەیدابوونیو تێڕوانینی لە چوارچێوەی مێژوویی خۆیو بەرەو پێش چوونی بەردەوامیو خوێندنەوەی بەری ئەو موناقەشانەی دەربارەی دەکرێت و هوشیارانە بەراوردکردنی هەموو ئەمانە لەگەڵ ئەدەبیاتی کوردیداو بەناو نیگایەکی ڕووناکی چوارچێوە مێژووییەکەی گەیشتە چەکەرەو گزنگی ئەو ڕێبازە لە ئەدەبیاتی کوردیدا تا دەگاتە بینینی ئاسۆی بەرەو پێش چوونی.

لە کاتی خۆیدا سەرەتاو چەکەرەی ئەو ڕێبازە لەم چەند دێرەدا دەست نیشان کرابوو کە تێیدا نووسرابوو:

«ئەوەی سەرەوە دەمانگەیێنێتە ئەنجامێك، ئەویش ئەوەیە کە ئەدەبیاتی ڕیالیستیی کوردی لەپاش جەنگی دووەمی جیهان وەك قوتابخانەیەکی خاوەن نیشان و تایبەتێتی خۆیی ئەوتۆ جێگر بوو کە شادەمارەکانی بەسترا ـ بن بە ژیانی گەلی کوردو سامانی نەتەوەیی کوردو ڕەگەزە ڕیالیستییەکانییەوەو پشت بە تەجروبەی ئەدەبیاتی ڕیالیستی نەتەوەکانی ترەوە ببەستێت. ڕوخساری ڕەخنەگرانەی ئەم ئەدەبیاتە ڕەخنە لە دواکەوتوویی ژیانی گەلی کورد دەگرێت و گاڵتەی پێ دەکات و پاڵ بە گەلەوە دەنێت کە ئەو دواکەوتوویییە چارەسەر بکات» پیرەمێردو ئەحمەد موختار جاف و زێوەرو موفتیو بێکەس نوێنەری دیاری ئەم ڕێبازەن گەلێك لە نووسەرانی گەلاوێژو کامەران و عەلادین سوجادی بەرەو پێش بەری ئەون و هۆی نزیك کردنەوەی مەبەستی ئەو و مەبەستەکانی قوتابخانەی ڕیالیزمی سۆشیالیستین، سەلام و جگەرخوێن یش ئەڵقەی بەیەك گەیاندنی مەبەسی شیعری ڕیالیزمی ڕەخنەگرانەو ڕیالیزمی سۆشیالیستین.

ڕەگی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لەگەڵ بلاوبوونەوی بیروباوەڕی پێشکەوتنخوازانەی شۆڕشگێری، زانستیدا، بەتایبەتی لە کوردستانی عێراق دا لە سالأنی جەنگی دووەمی جیهان و دوای ئەو جەنگەدا کەوتە ڕواندن. نووسینەکانی عەبدولواحید نووری (ع. و. نوری)، (١٩٠٤ ـ ١٩٤٤ز) کە بەشێکن لە ئەدەبیاتی سیاسی باشترین سەرەتای ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستین. هەردی ـ لە پلەی یەکەمی شیعرەکانیداو (ع. ح. ب.)و کاکەی فەللاح و دلزار و دیلان و قەدریجان و مارف بەرزنجەیی و کەسانی تر، بەو ڕێبازەدا ڕۆیشتن، پاش ئەوە ناوەڕۆکی شیعر لەلای گۆران بەرەوپێشەوە چووو وردە وردە چووە ڕیزی ڕیالیزمیسۆشیالیستییەوە بە ناوەڕۆك و ڕوخساری تازەی خۆی بوو بە ڕابەری ئەم قوتابخانەیەو بەرزترین لوتکەی پێگەیشتن و بەرەو پێش چوونی خۆی (١٧)

گەلێك ڕووداو و گۆڕاندن و ژیانی گەلی کورد و گەلی عێراق و سەرەتای گۆڕاندنی واقیعی کومەلایەتیی پاش شۆڕشی تەمووزی ١٩٥٨و ڕۆلی بیری شۆڕشگێری لە دۆڕینی واقیع دا لە ئەدەبیاتی کوردیدا ڕەنگیدایەوە. سەرەتای گۆڕینێکی تازە لەو ئەدەبیاتەدا چاوەڕێ دەکرا، چوارچێوەی ئەو گۆڕینەش لەم چەند دێرەدا دەست نیشان کرا:

« ڕیالیزمی سۆشیالیستی کوردی پەیدا بووە و بۆ پێشەوە دەچێ و هەنگاوی باش بەرەو پێشەوە دەنێ و باشترین شاعیر و نووسەر و چیرۆك نووس لە دەوری کۆ دەبنەوەو گۆرانی شاعیر کە لە سەروو هەمووانەوەیە، پاش ئەوەی زەمانێك ڕابەری ڕۆمانتیکەکان بوو، بووە بە ڕابەری ئەم قوتابخانەیە. لەم قوتابخانەیەدا جێی ژوورو دراوە بە گۆران، چونکە بە ئیبداعی یەرکەوتووانەی خۆی توانیویتی شەقلی یەکەم و گەورەی ئەم ڕیالیزمە بەجێ بێنێ، کە ئەویش یەکێتی ناوەڕۆك و ڕوخسارە. گۆران توانی کە تێگەیشتن و بیروڕای تایبەتی

ریالیزمی سۆشیالیستی جیهانیو کوردی بە پتەوترین و جوانترین روخساری شیعر کە ئەدەبیاتی کوردی لە مێژووی خۆیدا دیبێ جێگیر بکو دەری بخات.

بەمە بوو بە میراتگری راستەقینەی هەموو روخسارە تایبەتییەکانی فۆلکلۆری کوردیو شیعری کلاسیکیی کوردیو سوودی لە بایەخ و تەجروبەی ئەدەبیاتی جیهانی بینی[18] ».

گۆران هەروەك لوتکەی سوودبینینی بێ بەزەییە لە سامانی نەتەوەیی کوردو جیهانا بۆ چاکەی ئەدەبیاتی کوردیی هاوچەرخ، هەروەها لوتکەی بەکارهێنانی وشەی کوردیو ئیبداعە لە هەڵبژاردن و دەرخستنی لایەنی جوانی ئەو وشەیەدا. بە هێزی زمان و گەیشتنە لوتکەی یەکێتیی روخسارو ناوەرۆك هونراوەکانی ئەفراندووەو باشترینی شاعیران و نووسەرانی لە دەوری خۆی کۆکردۆتەوە.

هەرچەندە هەندێك لە نووسەران[19] ناوەرۆکی ریالیزمی سۆشیالیستییان پێش ئەو دەربڕیوە بەڵام لە یەکخستنی جوانیو بەرزیی روخسارو ناوەرۆك دا دوای ئەو دەکەون.

روخساری هونەریو توانای هەڵبژاردنی بابەتی ئەدەبیو هێزی پتەویو رەسەنیی زمان لای گۆران لە هەویرێکی نەرم دەچێت بە دەستی هونەرمەندێکی خولقێنەرەوە، کە ناوەرۆکی لە روخساری شایان بەخۆیدا پێ دروست بکات و خولقێنەرانە خەیاڵی رۆمانتیکی پێ تێکەڵ بە دەربڕینی واقیعیی ژیان بکات و بەم کارە ئەوە بسەلمێنێتەوە کە خەیاڵی رۆمانتیکی ئەو گیانەیە کە ژیان دەکات بە بەری ریالیزمی سۆشیالیستیدا. ئەدەبیاتی ریالیزمی سۆشیالیستی کوردی، واقیعی گەلی کوردو ژیانی چینە زەحمەتکێشەکانی دەردەبڕێت و بایەخ دەدات بە مرۆڤ و هەستی هەمەرەنگ و جیاجیای ئەو واقیعە. لێرەدا بە جۆرێکی بەرنامە بۆ دانراو (یا بابەتی وشکی قوتابخانەگەری) نەخشە نەکێشراوە، بەڵکو تا رادەیەکی گەورە ئاوێنەی راستگۆی واقیعەو ئەو لەبەر رووناکیی بیروباوەری شۆرشگێریی پێشکەوتنخوازی زانستیدا ئەو واقیعە بۆ گۆرینی شۆرشگێریی تێکەڵ دەکات.

ئەم ئەدەبیاتە دوور لە هەموو ئەو نائومێدیانەی رەنگە تاڵیی واقیع و سەختی ژیان بیدەن بە هونەرمەند، رێگەی خۆی دەگرێت، تەنانەت دەبێت بە چەکێکی هیوا، رێگە بۆ نائومێدان دەکاتەوەو مێشك و دیدەیان رووناك دەکاتەوەو هیوای پتەویان بە سەرکەوتنی مەسەلەی مرۆڤ و سەرکەوتنی پێوەندیی کۆمەڵایەتیی عادیلانە لەسەر زەمین دا پیشان دەدات[20].

ئەم ئەنجامانەمان تا ئێستا لەلا هەر راستن. پێداچوونەوەیەکی باسەکە دەمانخاتە بەردەمی دابەش کردنێکی تازە یا چەند بەشێکی تازە کە ئەمانەن:

١ـ ناوەرۆك، یا بەرەو پێش چوونی بیری سۆشیالیستی.
٢ـ ئەو روخسارەی ئەدەبیاتی تازە دەردەبرێت.
٣ـ تەنگوچەڵەمەی بەرەو پێش چوونی ئەدەبیاتی تازە بەناو یەکگرتنی روخسارو ناوەرۆك و بەجێماویی یەکێکیان دا.
٤ـ ئاسۆی نوێ.

مەسەلەی روخسارو ناوەرۆك لە ئەدەبیات دا زۆر دەمێکە بووە بە بناغەیەکی زێرینی بیری زانستی ئیستاتیك. بیلینسکی بە وتەیەکی بەناوبانگی خۆی ئەم بناغەیەی دانا. رەخنەگری گەورە وتوویەتی: «کاتێك روخسار ناوەرۆك دەردەبرێت ئەوا زۆر بە پتەوی پێوەی بەندەو جیاکردنەوەی لە ناوەرۆك دەبێتە هۆی لەناوچوونی ناوەرۆکەکە خۆی، بە پێچەوانەشەوە، دابرینی ناوەرۆك لە روخسار لەناوچوونی روخسارەکەیە» هاوکێشەی روخسارو ناوەرۆك لێرەدا بەرامبەر بە هاوکێشەی دیاردەو جەوهەرە لە فەلسەفەدا، لەبەرئەمەشە گۆرینی ناوەرۆك دەبەسترێت بەو گۆرینە قووڵانەوە کە بەسەر بنەرەتی ئابووریو پێوەندی بەرهەم هێنانی کۆمەڵ دا دێت. لەکاتێك دا کە روخسار سەرخانێکە دەتوانین هەندێك قاڵبی لە رژێمەکانی پێشووەوە وەربگرین و وای بگونجێنین کە خزمەتی ناوەرۆکی تازە بکات. هەروەك چەسپینی سەرخان بەستراوە بە بنەرەتەوەو ماوەیەکیش لیی دوادەکەوێت.

کەواتە دەتوانین جیا لە روخسار تەماشای بەرەو پێش چوونی بیری سۆشیالیستی ناو ئەدەبیاتی کوردی بکەین.

دیارە مەبەستیشمان ئەوە نییە کە لە جەوهەردا لە یەکیان جیا بکەینەوە، بەڵکو مەبەس ئاسان کردنی لێکدانەوەی ئەم دیاردە تازەیە. هەندێك لەوانەی سووك و ئاسان کار لێك دەدەنەوە هەوڵی ئەوە دەدەن کە بوونی چینی کۆمەڵایەتیو تێکۆشانی نێو چینەکان ببەستن بە پەیدا بوونی مارکسیزمەوە. لەبەرئەمە دان بە بوونی هیچ بیرێکی چینایەتیدا نانێن، چ لە فۆلکلۆردا بێت، یا لە ئەدەبیاتی کلاسیکیدا بێت، ئەمانە خۆیان لەوە کەر دەکەن کە یەکەم بەڵگەی بیری مارکسی خۆی ئەو راستییەی دەربڕیوە کە وتویەتی:

(مێژووی مرۆڤایەتی ـ لە تێکچوونی کۆمەڵی خێڵەکیی سەرەتاییو موڵکایەتیی هاوبەشی زەوییەو مێژووی خەباتی نێو چینەکان بووە، نێو چینە چەوسێنەرەکان و چەوساوەکان، نێو چینە دەسەڵاتدارەکان و حوکم کراوان، مێژووی تێکۆشانی چینایەتی بریتییە لە زنجیرەیەك لە پلەی یەك لە دوای یەك کە ئەمرۆ گەیشتۆتە پلەیەك کە چینی چەوساوەی ئازاردراو ـ واتە پرۆلیتاریا ـ نەتوانێ بێ ئەوەی هەموو کۆمەڵ ئازاد بکات، خۆی لە ئازاری چینی چەوسێنەرەوەی دەسەڵاتدار واتە بۆرژوازی ـ رزگار بکات، رزگاریی هەتا هەتا لە هەموو چەوساندنەوەو ئازارێك و لە هەموو جیاوازیی چینایەتیو خەباتی چینایەتی.

وەك دەردەكەوێت مەبەس لەم خۆكەركردنە ئەوەیە كە خۆ لەو ئەنجامە ئاسایی‌یە لابدەن كە ئەم بینینە مێژوویی‌یە كە دەیگاتێ. ئەویش ئەوەیە كە.. لەو دەمەوە كە چینی كۆمەلایەتی دروست بووە هیچ كاتێك نەهاتووە كە كۆمەڵ پێویستی بە چینێك لە كرێكار نەبووبێ. ناو و شوێنی كۆمەلایەتیی ئەم چینەش گۆڕاوە. جوتیار جێی كۆیلەی گرتۆتەوە، ئەو ڕۆیشتووەو كرێكاری سەربەست جێی گرتوتەوە. سەربەست لە نۆكەریی دەرەبەگ، بەلام سەربەست لە هەموو مولكداری‌یەكیش، مولكداریی ئیش كردنی خۆی نەبێت. ئاشكراشە كە چ گۆڕینێك بەسەر دەستە بەرهەم ئەهێنەرەكانی ژووروری كۆمەڵ دا بێت، كۆمەڵ هەر پێویستیی بە چینێكی بەرهەم هێنەر هەیەو بێ ئەو نازی. كەواتە ئەم چینە لە هەمووكات و شوێنێك دا بۆ كۆمەڵ پێویستە، با كاتێكیش بێت كە هیچ چینێك نامێنێ‌و هەموو كۆمەڵ دەبێتە بەرهەم هێنەر ئەم ڕاستی‌یەی بەرچاومان بۆ بینینێكی تازەی هەموو سامانی ئەدەبیی‌و دۆزینەوەی هەستی قووڵی ئینسانی لەسەر بناغەی دان نان بە قووڵیی هەست و بە جیاوازی لە چینایەتی كردن ڕووناك دەكاتەوە، ئەو بینینە لە پەیدابوونی چینی كۆمەلایەتی‌یەوە لەناو كوردەواری‌دا دەست پێ‌دەكات، ئەوەش مێژووە كە بەو سامانە بێژراوو تێكستە ئەدەبیانەی نووسراونەتەوە، هەمووشیان بەرهەمی سەردەمی ئیسلامن و نامانگەینێتە دەست نیشانكردنی سەرەتاكەی، وەك دەزانین زۆر پێش فەتحی ئیسلامی چینی كۆمەلایەتیی، جیاواز دروست بوو بوو، بۆ تێكستی فۆلكلوریش، ئەوە زۆر زەحمەتە ڕەگەزی كۆمەڵی پێش چینایەتیی تیدا كەلا بخەین، كەچی دادو بێداد و هاوار لە دەست زوڵم و زۆری چینایەتی لەناو هەموو وشەو ئاوازێكی هەموو بابەتەكانی سامانی ئەدەبی فۆلكلورمانەوە، دەردەپەڕێت. ئەدەبیاتی كلاسیكیی كوردی پڕە لە گزنگی قووڵی ئینسانی، مەزهەبە شۆڕشگێرەكانی كۆن و ئەدەبیاتی سوفیانە زۆر لە شاعیرانیان بردوتە ڕیزی هەژارانەوەو بوونە دەروێشی ئاوارەی خوری لەسەر گوشتی ڕووت لەبەركەری بە دوای ڕاستی‌دا گەڕیدە، جاریش نەبووە، ئەو ڕاستی‌یە لای پادشای گومڕاو بیری لەخۆبایی‌و دەرەبەگی ورگ ئاوساو دۆزرابێتەوە

ئەم گزنگە چینایەتی‌یە قوولانەی هاواری بابەتایەرو فەقێ‌تەیران و ئەحمەدی‌خانی لێ پەیدا بووە، هەموو بێ ڕێ‌نیشاندەرێكی ئاشكراو بیری ڕابەرانەو ڕووناكی بینینی دوارۆژ لە كۆمەڵێكی پڕ دادی بێ زوڵم و زۆر گەڕاوە.

ئەم دیاردە ئینسانی‌یە یەكێكە لە شەقڵەكانی هەموو هونەری ئینسانی، لە كاتێك دا كە نابێ خۆمان بخەینە قاوغی دەرەی بەیەككردنی هونەرو ڕیالیزم و لەگەڵ یەك دا تێكەڵیان بكەین. هەروەها ناتوانین ئەو ڕەگانەی ڕیالیزمی هاوچەرخیش ببڕین كە بەزەویی بە پێتی مرۆڤایەتی‌و مێژووی هونەر خۆی‌دا چوتە خوارەوە.

ئەگەر ڕێبازی ڕیالیزمی لە ئەدەبیاتی كوردی‌دا زادەی تێكەلاویی واقیع و بیر یا ژیان و كاری ناوكوردەواری بێت، لەگەڵ هەموو ڕەگەزە كاریگەرەكانی بیر، لەبەرئەوە ناتوانین بە ڕێبازێكی لاوەكی دوور لە كوردەواریی دابنێین و بچینە سەر لێكدانەوەی هەندێك كۆنەپەرستی میتافیزیقی كە بەوجۆرە بیر دەكەنەوە.

ئەو ژیانەی كورد كە لە ئەدەبیاتی كوری‌دا ڕەنگی داوەتەوە، هیچ كاتێك لەو ڕووداوانە بەدوور نەبووە كە لەم ناوچە بەیەكەوە گرێ‌دراوەی ئەم جیهانە هەڵ چووەدا ڕوویداوە كە هەموو سووچێكی بە ڕووداوە مەزنەكانی مێژووی هاوچەرخی هاتوونەتە هەژاندن.

دەنگدانەوەی ئوكتۆبەر لەناو كوردەواریی‌دا لە دوو هێلی بەیەكەوە بەستراودا دەبینرێ.

كارتێ‌كردنی مێژوویی ـ لە تێكرای خەباتی گەلی كوردو دەنگدانەوەی ئەو كارتێكردنە لە هەموو ئەدەبیات و بیردا، خستنە ڕووو لێكۆڵینەوەی ئەمەش لە سنووری ئەم باسەی ئێستامان دەباتە دەرەوە.

ئەگەر بەشوێنداچوونی مێژوویی‌و وریایی ڕۆژنامەگەرانە هەندێك جار بەرەو یادداشت و یادگاری هەندێك لەوانەمان بەن كە هێشتا لەتەمەنی بیرەوەری‌دان و ئەو ڕووداوە مەزنەیان دێتەوە بیر، ئەوا شوێن كەوتنی كارتێ‌كردنی ئەدەبی لەگەڵ وردە دێری فۆلكلۆردا یەكمان دەخات. ئەو دێرانە شادی‌و خۆشیی زەحمەتكێشی كورد بە دروست بوونی یەكەم دەولەتی كرێكارو فەلاح دەردەخەن. مێژوونووسە هاوچەرخەكانمان گەلێك بەلگەیان بەدەستەوەیە كە هەر لە سەرەتایەوە نیشانەی كارتێ‌كردنی ئوكتۆبەرن لە بزووتنەوەی ئازادیخوازانەی كورد. بەلام ئەم كارتێ‌كردنە كتوپڕی‌یە لە مەیدانی بیر و ئەدەب دا كەمێك درەنگتر خۆی دەنوێنێت.

كۆنترین تێكست لە مەیدانی بیرو ئەدەبیات دا كە بچێتە جوغزی دان پێدانان و تۆماركردنی پەیدابوونی بیری سۆشیالیستی‌و ڕەنگدانەوەیە، لە ئەدەبیات دا نووسینەكانی (ع. و. نوری) ن، كە یەكەم نووسەرو سیاسی كوردی عێراقە، هوشیارانەو لەزانینەوە ڕێگەی دیموكراتیی چارەسەركردنی مەسەلەی گەلی خۆی‌و ڕێگەی سۆشیالیزمی بە سەرەنجامی هەموو مرۆڤایەتی دیوەو بەو نووسینانەو بەخەباتی خۆی بووە مامۆستای ئەوەیەك لە بیر ڕووناكە شۆڕشگێرەكانی كورد.

عەبدولواحید نووری، لە نیوەی دووەمی سی سالانی ئەم سەدەیەوە بەهۆی بە دوواگەرانی فراوانی زانینەوە گەیشتە بیری سۆشیالیستی‌و خۆی بۆ بلاوكردنەوەی لەناو خوێندەوارانی كوردو كۆمەلانی خەلك دا تەرخان كرد. عەبدولواحید نووری نووسەر بووە تێكۆشەر دژی ئەو فاشیزمەی بە هەموو جۆری ژەهری خۆی بلاودەكردەوە، هەروەها بووە بلندگۆ و فێركەر لە مەیدانی لەناوبردنی پڕوپووچ و زۆر چەشنی

ئیدیالیزمی لەناو نەوەی پێگەیشتوودا، بەهەموو جۆرێکش سۆشیالیزمی لا خۆشەویست دەکردن و باسی ئوکتۆبەرو شۆڕشی کرێکارو فەللاحی بۆ دەکردن. یەکێك لە قوتابی‌یەکانی، کە شاعیری بەدیمەن ئەحمەد هەردی‌یە پاش مردن ڕووی‌تێ‌دەکاو دەڵێت:

«تۆ هەتا لە ژیانا بوویت، ئەتویست ئەو خانووە شەقوشڕە، پەڕپووتە کۆنەی نەزانین و دەرەبەگی دایمەزراندووە، تێکۆمەکان بدرێ‌و لە جێی ئەو خانوویەکی تازەی جوانی ڕێك وپێك لەسەر بناغەیەکی قایم دروست بکرێ‌و زانستی‌و برایەتی‌و عەدالەت بیرازێنێتەوەو شەوی تاریکی بکا بە ڕۆژی ڕووناك[21]»

هەروەك هەردی لەوێ‌دا شوێن بیری عەبدولواحید لە کۆمەڵ دا دەست ـ نیشان دەکات و دەنووسێت:

«ئەو دڵە نەرمەی کە لەگەڵ دڵی هەموو جوتیارو کرێکارێکی کلۆلا، یی ئەداو بۆ هەموو هەناسەیەکی کروزاویان ڕائەچەنی[22]».

عەبدولواحید نووری لە نووسینەکانی‌دا تیشکی دەهاویشتە سەر ئیمپریالیزم و دەرەبەگی‌و شوێن جێگەکانیان؛ کەم وکووڕیی کۆمەلایەتی‌و هەژاری‌و نەبوونی کۆمەلانی خەڵك و نەزانی‌و نەخۆشی. داوای لە گەل دەکرد کە ڕاستی بزانی‌و وتەیەکی بەناوبانگی بیری سۆشیالیستی بە ئاسان کراوی پێشکەش دەکردن، کەوا لە کۆڕی تێکۆشان دا هەر کۆت و زنجیریان لەکیس دەچێت. کە هەزارەها ساڵە لە دەست و پێیان دایە. عەبدولواحید نووری لە نووسینەکانی‌دا بە شێوەیەکی ساکار هەوڵی دەرخستنی ڕووی ڕاستەقینەی سەرمایەداری‌و ئیمپریالیزمی ئەدا، پەنای دەبردە بەر ژیانی پیاوچاکانی کاروانی بیری مرۆڤایەتی لە سەردەمی زووەوە تا ڕابەرانی بیری سۆشیالیستی‌و سەرکەوتنی شۆڕشی سۆشیالیستی. ئەوەشی لەبیر نەدەچوو کە لە ڕابوردوو و ئەوسای نەتەوەکەی خۆی نموونەی چاك هەڵبژێری و بیخاتە ڕوو. هەروەك دەبینین دەربارەی پیاوچاکی ناودار کاك ئەحمەدی شێخ (١٧٩٣ ـ ١٨٨٩)ی نووسیووەو دڵی فراوانی هەموو کەس ویستی ئەوو هەوڵی یەکخستن و ئاشت کردنەوەی خەڵکی کردووە بە نموونە، عەبدولواحید ئەم کۆششە دەکات بە وێنەی هەوڵ دان بۆ ئاشتی‌و یەکێتی نیشتمانی.

نووسەر کتێبی «بەرەو ڕووناکی»ی خۆی پێشکەش بە ئەفسەری نیشتمان پەروەری کۆچ کردوو کامیل حەسەن دەکات و بە نموونەی شۆڕشگێڕی دەزانێ. هەروەك ئەوەشی دەربارەی بیر ڕووناکی کورد ئەمین فەیزی نووسیووە.

عەبدولواحید نووری هەوڵی زۆریشی داوە کە گەلەکەی خۆی ئاگاداری پێشکەوتنی زانست و ژیانی بلیمەتانی زاناو داهێنەر بکات، کە زمانی سروود نووسینیشی بەکار هێنا، لە چوارچێوە ئایدیۆلۆژی‌یەکەی خۆیەوە دەیووت:

راچڵەکین و وریا بووین
راپەڕین و هووشیار بووین
بەرگی جاهیلیمان دران
تا بە جاهیلی نەمرین
ئەژین، ئەژین، ئێمەش وەك عالەم
ئەژین.
ژیانێکی شێرانە، وەتەن ئەکەین بە لانە
ئەپارێزین لە میکرۆب
لە میکرۆبی بێگانە
ئەژین، ئەژین، ئێمەش وەك عالەم ئەژین.

ئەگەر عەبدولواحید نووری ڕق و کینەی خۆی دەربارەی پرووپووچ دەربڕیبی‌و بە شێوەیەك چووبێتە جەنگی‌یەوە کە هەندێك کەس بەزۆر ڕەوی‌و پێش کاتیی بزانن. ئەوا بانگی تازەگەری‌و شۆڕش ڕووبە ڕووی کۆن، لە بەرابەریی سامانی کەلچەری دا لە سنووری بیری سۆشیالیستی نەبردوتە دەرەوە. زۆر شانازی بە زمانی زگماکی خۆیەوە دەکرد و پاڵی بە لاوانەوە دەنا کە ئەو زمانە بپارێزن و بەرەو پێشەوەی بەرن و ئەدەبیاتەکەی بە شتێکی خۆشەویستی ئەوتۆ بزانن لە ژیان دا کە دەبێ بایەخی پێ بدرێت. نووسەری پێشکەوتن خواز مەحموود ئەحمەد (١٩١٧ ـ ١٩٦١) لە دڵەوە چەند وشەیەك دەردەبڕی کە قووڵیی شەخسیەتی عەبدولواحید نووریی نووسەرو مرۆڤ و تێکۆشەر پیشان دەدات، مەحموود ئەحمەد دەربارەی مامۆستای کۆچ کردووی نووسیوویەتی:

«بۆ ڕاستی قسەکەمان مامۆستای خوا لێ‌خۆشبوو عەبدولواحید نووری‌یە. ئەو پێشمەرگە ئازایەی کە ئەم دنیایەی جێ هێشت، لە دوای ئەوەی هەموو بیرو زانینێکی خۆی کرد بە شەربەتێکی شیرین و بەتام و دایە دەس گەل و دواکەوتووەکانی بۆ خواردنەوەی، دنیای ڕەنگینی بەجێ هێشت لە دوای ئەو ئێش و ئازارەی بەدەس نەخۆشی‌و نەبوونی‌یەوە چەشتی. بەلام کۆڵی نەداو بە هەموو ئازایی‌یەکی ئینسانی‌یەوە نووسی... کتێبی دانا... دەرسی وتەوە بە قەومەکەی خۆی ـ هەروەکو مامۆستای منالەکانی شەعب بوو، هەروەها مامۆستای باوك و دایکانی شەعب بوو، لە دێ‌دا، لە شاردا، لە ولات دا لە غوربەت دا، لە مەعاریف دا، لە بەلەدیەدا بەیەك ڕەنگ هەوڵی داو بەربەرەکانی کرد چونکە هەمیشە ئەی وت (هەموو دنیا وەتەنی ئینسانە لە هەر کوێ‌یەك بێ پێویستە لەسەری ئیش بکا) بۆ پێش کەوتن و سەرکەوتنی ئینسانیەت. بەڵێ ئەم دنیایەی بەجێ‌هێشت کە هیچ ڕەحم و چاکی نازانێ. بەسەد ئێش و دەردو ئازاری نەخۆشی ـ بە نەبوونی‌و هەزار ئاواتەوە، وەلێ ئەو

دڵەی و جۆشی تاکو ئەبەدی لێی ئەدا چونکە توانیویە گەلێ شاگردانی بەکار پێبگەیێنێ بۆ ئەوەی ئامێلکەی لینانیەت تەواو بکەن و چرای زانست هەڵکەن»[23].

ئەم وەرگرتنە درێژەی نووسینەکەی مەحموود ئەحمەد لەبەرئەوەبوو چونکە سەرچاوەی لێوەرگرتنەکەی بە دەگمەن دەست دەکەوێت و[24] خۆیشی لەخۆیدا شایەتی یەکێکە لەو هاوەڵانەی عەبدولواحید نووری کە هەر ئەو ڕێگەیەی ئەویان گرت و بەرهەمی پتەو و قوربانیی زۆری پێش کەش بەو ڕێبازە کرد.

مەحموود ئەحمەد بێ سێ و دوو بە یەکێك لەو نووسەرانە دادەنرێت کە لە چوارچێوەی بیری پێشکەوتنخوازی هۆشیاردا جێیان گرتووە. کۆمەڵەی «گوڵاڵە» کە خۆی سەرپەرشتیی چاپی کردووە و کەرەسەکەیی کۆکردوتەوەو پێشەکی و پەراوێزی بۆ کەرەسەکانی نووسیووە. نیشاندانی بێ پێچ و پەناو ئاشکرای بۆ بیری سۆشیالیستی تێدایەو ناوەرۆکەکەی دەچێتە ئەم چوارچێوەیەوە. هەروەها مەحموود ئەحمەد لەو سەردەمەوە چیی لە چیرۆك و وتار نوسیوە هەمووی بۆ بەربەرەکانیی دەرەبەگی و دواکەوتنە[25] و چارەسەرکردنی مەسەلەش هەر لە سنووری بیری سۆشیالیستیدایە. بیری سۆشیالیستی لەمەو-دوا، واتە پاش جەنگی دووەمی جیهان، کاری کردە سەر تێکرای ئەدەبیاتی کوردی، ئەمە چ لە بەرهەمی ئەوانەدا دیارەکە ئەوسا دەستیان دایە پێوەندی لەگەڵ بیری سۆشیالیستیداو پاشان بەیەکجاری پێوەی بەستران، یا لە بەرهەمی ئەوانەدا دیارە کە تا رادەیەك لەو بیر و رایە دوور بوون، بەڵام لە ڕوانگەی بیری پێشکەوتنخوازی‌یەوە چارەسەری کاری ڕۆژانەیان دەکرد، دانەپاڵ کۆمەڵانی زەحمەتکێشیان بەڕێگەی ڕزگاربوون لە دواکەوتن دەزانی.

ئەگەر بچینەوە سەر باسەکانی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی کوردی ماوەی جەنگی دووەمی جیهان و سەرەتای شەست ساڵەکان و جارێکی‌تر دابەشیان بکەینەوە بەسەر ئەم باسانەدا: تەنگوچەڵەمەی کۆمەڵایەتی، ژیانی فەللاح، ژیانی کرێکار، ژیانی تێکرای گەل و دەستە زەحمەتکێشەکان، خەباتی گەل، هاوکاری و برایی نێوکورد، برایی عەرەب و کورد، هاوکاریی تێکۆشانی جیهانی، مەسەلەی ئاشتی و جەنگ، نرخ پێدانی ئادەمیزاد، وێنەی ئافرەت و سروشت»، ئەوسا دەچینەوە سەر ئەنجامەکانی پێشوومان و بەم جۆرە کورت و خەستیان دەکەینەوە.

١- زۆر بەتەنگەوە ڕووکردنە ژیانی گەل و پیشاندانی ئازاری زەحمەتکێشان دەبینین، ئەمەش هەر نەخشەکێشانی ژیانی ڕۆژانەو ڕەنج و چەوساندنەوەیان نییە، بەڵکو وێنەی تێکۆشانیشیانی وا لەپاڵدا. نەخشەکێشانی گشتیی ژیانی گەل و ئازاری زەحمەتکێشان و ئەو چارەسەرکردنانەی بەهۆی دەربڕینی ئەدەبی‌یەوە لە تێکرای شیعری کوردی و چیرۆکی کوردیی‌دا لەو سەردەمەدا نەخشە کێشراون، بە هیچ جۆر ناچنە ڕیزی نەخشە کێشان و چارەسەرکردنی بۆرژوازیانەی مەسەلەکەوە.

بۆرژوازیی ڕادیکالیی ئەوروپا لە چارکردنی مەسەلەی کشتوکاڵ دا هۆو ڕێبازی خۆی هەیە. ئەم هۆو ڕێبازە، لە ڕەنگە دانەوەو چارەسەردا دەچێتە سنووری پیشەسازی لێکردن (تصنیع)ەوە، گواستنەوەی کۆمەڵ بەرەو پێوەندیی لە کشتوکاڵ داو پێکەوە گرێدانی بەتینی نێو شار و لە چوارچێوەی جموجۆڵی کشتوکاڵ دا بەڵام بەرهەمی ئەدەبی کوردیی ئەو سەردەمە، بەتایبەتی چیرۆك تێکڕا ناچێتە ناو ئەو لێکدانەوە بۆرژوازی‌یەوە، لەوێدا لایەنگرتنی تەواوی فەللاح دەبینین، بێ‌ئەوەی کەمە ئارەزوویەکی دامەزراندنی کۆمەڵێکی تازەی چەوسانەوەدار ببینین، تەنانەت بەردەوامی گوناهبارکردنی ئەو چەوسانەوەیە دەبینین کە دێهات بەشارەوە دەبەستێت. لەم دانەپاڵ ڕەنجبەرانەدا، هەموو ئەو شاعیر و نووسەرانە هاوتان کە لە پێوەندیی ڕۆژانەدا خۆیان بەستووە بە بیر و تێکۆشانی پێناو سۆشیالیزمەوە، یا لە ڕەفتاری ڕۆژانەدا لەم کۆرە دوور بوون. دەبێ چی هەست و ئەستی بلە و عەلادین سوجادی و حەسەن قزلجی و مارف بەرزنجەیی بەرامبەر بە فەلاحی کورد لەیەك جیا بکاتەوە. یا بە چ پێوانەیەك هەستی محەممەد مەولوود و کاوس قەفتان و کاکەمەم بۆتانی و مستەفا ساڵح کەریم و عەبدوڵڵا میدیا و حسین عارف و ئەبەز و محەرەم محەممەدئەمین و محەممەد ساڵح سەعید و جەمال بابان لە پلەی لەمەو دوادا لەیەك جیا بکەینەوە.

لە بەرهەمی هەموو ئەمانەدا نەخشەکێشانی کەرتی جیاجیای ڕەنج کێشانی ڕۆژانەو بە یەکجاری دانەپاڵ فەللاح و بەربەرەکانیی دەرەبەگی دەبینین. چارەسەرکردنیش هەندێك جیاوازیی تێدایە، هەندێك جار ئاواتی خێرخوازانەیەو هەندێك جار هاندانە بۆ تێکۆشان، بەڵام بەهیچ جۆر بیانوو بۆ هیچ بابەتە چەوسانەوەیەك یا دانە پاڵ: موڵکداری نابینین، ئەمەش وا دەکات کە گوناهبارکردنەکە بۆ پلەی دوای دەرەبەگیش درێژە بکێشێت.

گوناهبارکردنی موڵکداریی تایبەتی بیرێکی سۆشیالیستی‌یە، پاڵ پێوەنەر و جوولێنەری گوناهبارکەر هەرچی‌یەك بێت. شیعری ئەو پلەیەو چیرۆکەکانی پاش لەوێش پڕن لەم گوناهبارکردنە. ڕەنگە شاشی‌یەك لە نەخشەکێشان دا یا سەرنەکەوتنێك لە هەڵبژاردنی نموولە یا مەیدانی سەرەگیی کێشەدا ببینین، بەڵام ئەمە لە بنەڕەتەوە لە دەسەڵات نەبوون بەسەر هۆی تەکنیکی‌دا هاتووەو هەڵوێستی نی‌یە لە بیر و ڕاوە پەیدا بووبێت. هەندێك چیرۆك خۆش ویستنی فەللاحی چەوساوەی لێ دەتکێت، بەڵام ئەو خۆش ویستنە زیاتر لە بەزەیی دەچێت بە فەللاحی چەوساوەدا وەك لەوەی هەستی هاوکاریی چینایەتی بێت بەرامبەری،

ئەمەش لەوێنەدا دەچێتە خانەی بەزەیی ساختەگەرانەی بۆرژوازی‌یەوە، هەرچەندە خۆی لەوەوە هاتووە کە نووسەر بە تەواوی پەناو ژیانی راستەقینەی رۆژانەی فەلاح دا رۆنەچۆتە خوارەوەو ئەو نووسەرانەی ناتوانن وێنەیەکی زیندووی ئەو ژیانەمان پدەنێ لە نزیکەوە، لەگەڵ فەلاح دا نەژیاون، وێنەی ناوەوەو مەنە لوژی ناو دەروونیان پێ نەخشە ناکێشرێت. بەلام ئەمەش لە هەلوێستی ئایدیولوژیان ناگۆرێت. رابەرە بەراییەکانی چیرۆکی ریالیستی کوردی لە روانگەی ئەم جیهان بینی‌یەوە تەماشای مەسەلەی فەلاحیان کردووە، چیرۆکی کوردی لە سی ساڵەی دواییدا هەر لەسەر ئەو رێبازە رۆیشتووە.

وەك وتمان رەنگە چوونە ناو هەندێك وردە شتەوە هونەرمەندی لە دووبارە کردنەوەی واقیعەوە دوور خستبێتەوە، بەلام نەخشە ـ کێشانەوەی واقیعی بە ئاوات خواستراو هەر بە چەشنێك بووە کە مولکداریی تایبەتی تیدا کوژابێتەوەو واقیعی بە ئاوات خواستراو هەر مولکی زەوی‌چێنەر بووە یا لە وێنەی خەویش دا بووبێ. لەبەر هەندێك هۆجار وبار شەخسیەتی نموونەیی هەلنابژیررێ، یا شەخسیاتە هەلبژیراوەکان رووی تێکۆشەرانەیان نی‌یەو مەیدانی کێشەکە لا رێی‌یە بەلام راستەقینەیە، کامێرای هونەرمەند نوقتەی راستەقینەی رووناکی پی‌بەخشین باش دەست نیشان ناکات؛ بەلام رووی واقیعی تاوانباریش نرایش ناکات و سووراو سپیاو لە دەم چاوی چرچی دەرەبەگی و کۆنەپەرستی و دواکەوتوویی نادات [٢٦].

ئەدەبیاتی کوردی یەکجاری دەرەبەگی تاوانبار کردووەو لەپاڵ فەلاحی زەبوون دا وەستاوەو زۆر بەی زەویی ئەو واقیعەی روشن کردۆتەوە کە خەلك تێدا ژیاون و جارێکی‌تر واقیعی بە لێ زیادکردنی مەردانەی بیری هونەرمەندان خۆیانەوە نەخشەکێشاوەتەوە. بەلام ساکاری‌و سەرەتاییی کەرەسەو هۆی نەخشەکێشان و نەبوونی توانای بلیمەتانە، هەندێك سووك پیشان دان و سادەیی‌و گێرانەوەگەری و خوتبە خوێنەریی داوە بەگەلێك بەرهەم و بەرهەمی باش لە چەند چیرۆکی کورت و ناوەندی‌دا [٢٧] دەبینرێ‌و هێشتا رۆمان نووس خۆی نەگەیاندۆتە ئەو واقیعە [٢٨].

راستیی پێوەندیی مادەی بەرهەم هێنانی تا چەند ساڵ لەمەوبەری کوردستان و لەناونەچوونی تەواوی پێوەندیی دەرەبەگی تا ئێستا بە شێوەیەکی واقیعی لە ئەدەبیاتی کوردی‌دا رەنگی داوەتەوە، بەم جۆرە وێنەی فەلاح بەسەر وێنەی کارگەری راپەری ئەودا زاڵ بووە هەرچەندە چەکوشی کرێکار لە دەرگای شیعر و چیرۆکی کوردیشی داوەو هەر لە کۆتاییی جەنگی دووەمی جیهانەوە دەنگی کۆمۆنەیی لە شیعری کوردی‌دا بەرز بۆتەوەو بە سامەوەو بە شکۆوە رۆڵی چینی کرێکاری لە رابەریی کۆمەلانی خەلك و کۆری خەبات دا دەست نیشان کردووە [٢٩].

ئەو بڕیارانەی بەسەر پێوەندیی کارکردنی لادێ‌دا دراوە ئەنجامە گشتی‌یەکانیان بەرەو شاریش دەبەن. ئەو بەرهەمە کەمانەی بۆ نەخشەکێشانی ژیانی چینی کرێکاری تەونەمام تەرخان کراون، هەلوێستی هونەرمەندی سەر بە بیری کرێکاران و بەرژەوەندیی چینی کرێکار دەردەخەن. لەو بەرهەمانەدا شکۆدانی رێك و رەوان بەرەنج کێشان و تاوانبارکردنی نموونە خۆماڵی‌و جیهانی‌یەکانی گەرت و دەستە بۆرژوازی‌یەکان دیارن [٣٠]، هەرچەندە ئەدەبیاتێکی کرێکارانەی تەواومان نی‌یە [٣١]، بەلام بیری سۆشیالیستی لە هەموو ئەو بەرهەمانەدا کە بۆ رەنج کێشان و کارکردن تەرخان کراون دیارن.

لێرەدا دەتوانین دوو مەسەلە جیا بکەینەوە کە ئەوانیش هەلوێستی بیر و توانای تێگەیشتنی تەواوی واقیع و بیر و جیا کردنەوەیانە لە بەرهەمێکی ئەدەبی‌وادا کە لەگەل هەلوێستی خاوەن بیرەکە خۆیدا تەبابن. لە رێی بەرهەمی ئەدەبی‌یەوە سەر بە بیر و ئایدیولوژی بوون لە ئەدەبیاتی کوردی دا دەگمەن و ناجێگیرە، کە هونەرمەند لە بەرهەم دا دژی هەلوێست و بەرژەوەندیی چینی کرێکاربێت، شتێکی نەبینراوە. رێکو رەوان دانە پاڵ ئەو چینە رابەرە تەواو ئاشکرایەو دەیان پریشکی ئەدەبی‌و پارچە شیعر و چیرۆك بەلگەی ئەوەن، هەروەك گرێدانی خەباتی چینی کرێکار بە بیری سۆشیالیستی‌یەوە ئاشکرایە، تەنانەت رێك و رەوان دەربرینی دەگاتە رادەی پەیدابوونی جۆرێکی تر لە ئەدەبیاتی دروشم دەربرین، کە لە سەرەتای چل ساڵەکانەوە دەستی پی‌کردووەو تا ئێستاش شوێنەواری دیارە. روشنی لەم مەسەلەیەدا لەوەدایە کە خەباتی چینی کرێکار خراوەتە چوارچێوەی جیهانی خۆیەوەو بەستراوە بە خەباتی شۆرشگێرانەی جیهان و بنیادنانی سۆشیالیزمی جیهانەوە.

٢ـ ئەگەر بەرهەمە ئەدەبی‌یە کوردی‌یەکانی سەدەی بیستەم لاخەین و بە پێی باس و مەبەس خانەخانەیان کەین دەبینین مەسەلەی نەتەوەیی کورد لە رووی زۆری‌یەوە پێش هەمووان دەکەوێت، ئەگەر لە رووی چۆنێتیشەوە پێشیان نەکەوێت، ئەمەش رەنگدانەوەی ئاساییی راپەرینی بزووتنەوەی نەتەوەیی کوردە کە لە کۆتاییی سەدەی نۆزدەهەمەوە دەبینرێت. شاعیر و نووسەرانی کورد بە دەرەوکەلێنی ئەم بزوتنەوەیەدا دابەش بوون و هەریەکە کەرتێکی فراوانی پر لە کەرەسەی تەسەلی لێ گرتووە و وێنەی کێشاوە.

مێژووی کورد بە گشتی کە رەسە بووە بۆ شیعر و بۆ چیرۆکی تازە بابەتیش. هەر لە قارەمانیتی کۆنەوە تا گیانی هاوچەرخی بەخشین بەهەندێك رەگەزی میتولوژی لە فولکلۆری کوردی‌دا تا رووداوی رۆژانەی ئەو خەباتە بەردەوامە، هەموو ئەدەبیاتێکی لە ئاراستەو بیرکردنەوەدا یەکگرتووی دروست کردووە، کە لە باس و بابەت و بۆچوون دا جیایە، زۆر گران نی‌یە کە تاقە باسێك یا چەند باسێك ببینین

که چەند شاعیرێك بۆی چووبن و بیرو بۆچوونیان یەك بێت، بەڵام ئالەت و وێنەو دەربڕینیان جیا بێت. ئەمەش وای کردووە کە بەرهەمەکە چڕو بە پێست و فراوان بێت. بۆ نموونەش دەتوانین لەم ڕووەوە باسی جەژنی نەورۆزو دەیان شاعیر بکەین کە باسیان لێ کردووە، یا باسی ڕاپەڕینی شەشی ئەیلوولی ۱۹۳۰ی سلێمانی بکەین، یا لە شەهیدبوونی شێخ عەبدولقادری نەهری‌و هاوڕێکانی بدوێین و لە ئەنجامی بەراووردێکی وردا بگەینە ئەنجامێکی ئایدیۆلۆژی ئیستاتیکی‌ی وا کە ئێرە شوێنی باسکردنی نی‌یە. هاوسۆزیی ئاسایی‌و مەوزووعیی نێو گەلێك دەستەی جیاوازی گەل لە کۆڕی ئەم خەباتە بەردەوامەدا، بیرو ڕای نزیك خستۆتەوەو هۆی دەربڕینی یەکخستووە، بەڵام تێڕوانینی وردە نەخشەیەکی ئاشکرای جیاکردنەوەشمان دەخاتە بەردەم و هێڵی جیاکردنەوەش جەنگی دووەمی جیهان و پاشان ڕاپەڕینی کانوونی دووەمی ساڵی ۱۹٤۸ی عێراقە، ئەوەش کە ئەدەبیاتی پێش ئەو هێڵە لە دوایی‌یەکەی جیا دەکاتەوە ئەمەیە:

سیمای خەم و ئازار بەسەر پلەی یەکەم دا باڵی کێشاوە، تەم و مژو ڕاڕایی لە باسکردنی مەسەلەکەدا دەبینین، تاقە شتێش کە هەموو ئەوانەی لێ‌ی دوواون یەك دەخات ئەو هەستی نەتەوەیی‌یەیە کە هەندێ جار نادیارو یا ڕەوانە، وەك ئەوەی بە وشەی چنراو دەست نیشانکردنی تەواوی هەموو لایەنێکی مەسەلەکە نابینین، تەنیا هەست دەربڕینی بە تەوژم دیارە کە دەداتە پاڵ چوارچێوەی گشتیی مەسەلەکە، زۆر جاریش ئەو چوارچێوەیە تەسك و سنوور دارەوە هەموو مەسەلەکە بە باشی لە ڕوانگەی ئەوەوە نابینرێ‌و شوێنی ڕاستەقینەو چوارچێوەی جیهانیی ئاشکرای دانانرێت، ڕەگەزەکانی کێشەو مەسەلەکەش بە شێوەی مەوزووعیی خۆی دەرناخرێت. ڕەنگی ڕەشی تێر بەسەر وێنەکێشانی ئەم سەردەمەدا زاڵە، ئەگەر خوێنی سووریش ڕژابێتە سەر تابلۆکە، ئەوەش بە دەگمەن مژدەی شەبەقی تازەی سپی دەهێنێت، بەڵکو تاڵیی دووکەڵ تێکەڵ بە تامی خوێن و فرمێسك دەکات، هەر ئەمەشە زۆرجار ڕەوایی‌و ئینسانیەتی مەسەلەکە دەخاتە قاوغی کەلابوون و هەڵچوون و بیر تەسکی‌یەوەو ئەمەش وا دەکات بەری فراوانی دەربڕین بگیرێت.

ئەوەش کە پاش ئەو هێڵە بەیانی‌یە دێت، ئەوە ئاسۆی جیهانیی بە سەرکەوتنی دیموکراتیزم و وردوخاش کردنی فاشیزم گەش و سەرهەڵ دانی بزووتنەوەی ئازادی‌خوازانەی نیشتمانی‌و بەرین بوونی خاکی سۆشیالیزم بووە هۆی بەرچاوگەشی‌و ئاوات بەخشین بە ئاسۆی کورد، بە تێکەڵی‌یەکی کار لە یەکترکەردا.

ئەوڕەنگە سوورە بوو کە لە ئاسۆی بڵندی کورد
مژدەی بەیانی بۆ گەلی دوورو نزیك ئەبرد.

لەم ماوەیەدا بە ئاشکرا بینینی مەسەلەو کێشەو هەمەڕو سووچەکانی دیارە، هەستی نەتەوەیی پڕ تەوژم دەبێتە ئارەزوویەکی ڕێ نێ نەگیراوی خەبات لە پێناوی مەسەلەیەکی شوێنەوار دیاردا، لە چوارچێوەیەکی فراوان و شوێنی خۆیِ دا، بە وێنەی ئەڵقەیەکی زنجیرەی خەباتی گەلان بەرامبەر ئیمپریالیزم و کۆنەپەرستی.

لێرەدا خوێنی سوور تێکەڵ بە شەفەقی سپی‌و گزنگی ڕۆژ دەبێت. ڕەوایی مەسەلەکە لە ڕێگەی هەستی ئینسانی قووڵ و فراوانەوە خۆی دەسەلمێنێت. خەباتی ئینسانی لەگەڵ هەموو هەژاندنێك، لە هەر سووچێکی کەلای جیهان دا کەوتنە هەژاندان، یەکێکە لە شەقلەکانی ئەدەبیاتی ئەم پلەیە (۳۲).

ئەمەش پرسیارێکی ڕەوا دێنێتە کایەوە:

ئەم هەمەلا گرەوەیی‌یە (شمولیە) لە بینینی مەسەلەی نەتەوەیی‌دا بە گشتی‌و لە بینینی مەسەلەی کورددا بە تایبەتی زادەی چ ئایدیۆلۆژی‌یەکە؟ دیارە کە دوو دڵی‌ی ناوێ بووترێ: سۆشیالیزمی مەسەلەی چارەسەرکردنی عادیلانەو چوون یەکی لە مەسەلەی نەتەوەیی‌دا لە ڕووی بیرو پراکتیکەوە (تطبیق) خستە کایەوەو برایی نێوگەلان و پێوەندیی هاوڕەگەزی لە نێوان تەوژمە شۆڕشگێری‌یەکانی جیهان دا کە بزووتنەوەی ئازادی‌خوازانەی گەلان یەکێکیان ئەوە شەقڵێکی بیری سۆشیالیستی‌یەوە لە درێژایی مێژوودا چینی کرێکارە ئەو چینە تەنیایەی لە بیری تەسك و قاوغی تەعەسوبی نەتەوەیی دوور بووە.

ئەگەر وەڵامی پرسیارەکە لە کۆڕی ئەدەبیاتی جیهان دا وا ڕێکو ڕەوان بێت، دیارە ئەمە بەسەر ئەدەبیاتی کوردیشدا دێتەدی‌و دەتوانین هاوکێشەیەکی ئاشکرای پێوەندیی نموونەیی ئینسانی لە بینینی مەسەلەی نەتەوەیی‌دا لەگەڵ بەگشتی بیری سۆشیالیستی‌و ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌دا ببینین کە دەربڕینی ئەدەبیی ئەو بیرەیە. لێرەدا پرسیارێکی تریش دێتە کایەوە: ئایا هەرچی لەم ڕوانگەیەوە لە مەسەلەی نەتەوەیی دواوە سەر بە ئەدەبیاتی تازەی ڕیالیزمی سۆشیالیستی‌یە؟ یا سەر بەو قوتابخانە تازەیەیە یا دەتوانین لە کونجێکی ترەوە بۆ هاوکێشەکە بچین.

مەسەلەی نەتەوەیی یەکێکە لە مەسەلە گەورەکانی ئەدەبیاتی هاوچەرخ. لێدوانی، چ لە تێکرای ئەم ئەدەبیاتەداو چ لای نووسەری جیاجیا بە چەند نیشانەدەری ئایدیۆلۆژیی جیاوازدا تێپەڕبووە. لەو قاوغە بچووکەی مەسەلەکەوە بۆ ئاسۆی فراوانی بیرکردنەوە، لە چارەسەرکردنی تەسکی بۆرژوازی‌یانەوە بۆ چارەسەرکردنی سۆشیالیستی، لە بینینی مەسەلەکەوە، لە کونجێکی عاتیفیی سادەوە بۆ کردنی بە مەسەلەی خەڵکی زەحمەتکێش و مەسەلەی هەقی گشتیی هەمە لایەنی ئەو خەڵکە، لە ژیانی ڕۆژانەو ئابووری‌و کەلچەریی گشتی‌دا. کە نووسەر گەیشتە دوا نوقتە، ئەوە نیشانەی دەربازبوونێتی لە سنووری بیرکردنەوەی بۆرژوازی لە مەسەلەکەو گەیشتنە کەناری بیری

سۆشیالیستی و چوونە ناو شەپۆلی ئەو بیرەوە، جاری واش هەیە هەر ئەم مەسەلەیە هونەرمەند بەرەو جیهان بینی یەکی هەمەلایی هەموو مەسەلەیەك دەبات و دەیخاتە سەر ڕێی خۆبەستن بە ئایدیۆلۆژیی سۆشیالیستی یەوەو ئەمە دەکات بە تاقە هەڵوێست و ڕوانینە ژیان و دەربڕینی بە وشەی ئیلهام بەخشی ئاوێنەڕەنگ، بە هونەرێك کە خۆی خەونەی یەك لەشی و یەکێتی ی هەڵوێست بێت، بەرامبەر بە هەموو ئەو شتانەی هونەرمەند لێی دوواوەو وێنەی یەکێتیی ڕوخسارو ناوەڕۆك و شێوەی زمان و چوونەوەی زیندو ـ وانە بێت بۆ سەر سامانی نەتەوەیی.

ڕەنگە هونەرمەند بگاتە کەناری ئەو بینینە لە تاقە مەسەلەیەك داو دوایەوە بەهۆی کارتێکردنی دەروونی و خۆیی یەوە یا بە کارتێکردنی ئەم یا ئەو تەوژمی ئەدەبی (خۆماڵی یا جیهانی) یەوە بگەڕێتەوە بەرەو ئاسۆ کۆنەو سەرەو سەر بەرەوخواریی تازە، یا بەرچاوی لە مەسەلەیەك دا ڕووناك و لە مەسەلەیەکی تردا نا ڕۆشن بێت[33]

دوا سەرنج

وەك لە سەرەتادا وتمان، ئەم باسە بەم شێوەیە نووسرایەوە تا باری ڕۆنینی زانستگا بەجێ بێنێ. ناچار دوو بەشی گرنگ کە لە قەوارەدا لەمەی نووسرایەوە کەمتر نین، لا دەدرێت. ئەویش دەربارەی ڕوخسارە ی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی داو دەربارەی ئاسۆی نوێی ئەو ئەدەبیاتە، دەگرێتەوە. ئەو دوو بەشەو، ڕێکخستن و فراوان کردنەوەی ئەمەی نووسراوە کەرەسەی کتێبێکی گەورەیە کە هیواداریین لە ساڵی داهاتوودا پێشکەشی بکەین.

## سەرچاوەکان

١ـ تەماشای زۆربەی ئەو سەرچاوانە کراوە کە دەربارەی ئەدەبیاتی کوردی و مێژووی ئەدەبیاتی کوردی نووسراون.
٢ـ ئەو وتارانەی لە ساڵانی دوایی دا لە گۆڤارو ڕۆژنامە کوردی یەکان دا بڵاو کراونەتەوە.
٣ـ بەرهەمی زۆربەی شاعیران و چیرۆك نووسەکان.
٤ـ هەندێك سەرچاوە بە زمانانی تر.
٥ـ بۆ لایەنی تیۆری زۆرتر سەرچاوە ڕووسی یەکان بوونە کەرەسەری نووسینی باسەکە.

لێرەدا گرنگترینی ئەو سەرچاوانە تۆمار کراون.

پەراوێز:

(١٦) شایانی باسە کە نووسەری ئەم وتارە لەو کۆنفرانسەدا ئامادە بووە بە هێنانەوەی چەند نموونە دەربارەی ئەدەبی کوردی و بە موناقەشەی گشتی بەشداریی خۆی نواند.

(١٧) الدكتور عزالدين مصطفى رسول. الواقعية في الادب الكردي. بيروت ١٩٦٦.

(١٨) الواقعية في الادب الكردي ص ٢٢١

(١٩) نووسەر لێرەدا بە مەبەس نووسەر و شاعیرە.

(٢٠) الواقعية في الادب الكردي. ص٢٢٢

(٢١) گۆڤاری گەلاوێژ. ژمارە، ٩ ساڵی ٥. ئەیلوولی ١٩٤٤. ل٥٧

(٢٢) گۆڤاری گەلاوێژ. ژمارە، ٩ ساڵی ٥. ئەیلوولی ١٩٤٤. ل (٥)

(٢٣) مەحموود ئەحمەد. گوڵاڵە. ژمارە ٣. سلێمانی ١٩٤٧

(٢٤) ئەم کۆمەڵەیە کە لە بابەتی «یادگاری لاوان» و «دیاریی لاوان» بوو هەر پاش دەچوونی کۆ کرایەوەو پۆلیس دەستی بەسەرا گرت.

(٢٥) لە ڕۆژنامەو گۆڤارەکان دا گەلێك وتاری نووسیوەو دوو چیرۆکی «جوان»و «لە پێناوی دەربەگی دا» لای خوێنەران ناسراون. بەڵام گەورەترین کاری چیرۆکی «کاخی ڕۆزگار»ە کە چاپ نەکراوە. ئەم چیرۆکە لە چوار چێوەی هونەری دا دەچێتە سنووری ڕۆمان و لە ناوەڕۆکی دا گەلێك مەسەلەی ژیان و ڕەفتاری ئادەمیزادی لە سنووری خەیاڵێکی فراوانی جوان دا چارەسەر کردووە، ئەمە لە خۆی دا شەقڵی ئەدەبیاتی ڕیالیزمی سۆشیالیستی لە هەموو شت زیاتر دەداتێ.

ئەم دابەشی کردنەمان لە کتێبی «الواقعيه في الادب الكردي. بيروت ١٩٦٦، ص ١١٣ ـ ١٩٧» دا پیشان داوە.

(٢٦) لە کتێبی «ریالیزم لە ئەدەبی کوردی دا» گەلێك نموونەی ئەم مەبەسە پیشان دراوە.

(٢٧) راسکاز، نوڤیل.

(٢٨) ئەم باسە پێش دەرچوونی «شارەی حسین عارف نووسراوە. هەروەك نەخشەی باسەکە وای کردووە کە لە ڕۆمانەکانی عەرەبی شەمۆو ئەو ڕۆمانە کوردی یانە نەدوێین کە بە زمانی تر نووسراون.

(٢٩) دیارترین نموونە پارچەی «کوڕانی ڕۆژی مەیدانی.... هەردیو.. لە پێشا پێشکەش ئەو چینەی... کاکەی فەللاحە.

(٣٠) ئەم نموونانە لای هونەرمەندان دەگۆڕێن. بۆ نموونە وێنەکانی قانیع چاو چنۆکی خۆماڵی، چەرچی لادێن... هتد. بەڵام لای گۆران شێوەی شایلۆکی و کوڵنکیان و مەنەپۆلیستی گەورەی نەوتە.

(٣١) ئایا ئەدەبیاتی کرێکارمان هەیەیانا؟ پرسیارێکە شوێنێکی فراوانتری دەوێت.

(٣٢) دەیان نمونەمان بۆ ئەم مەبەسە لەبەر دەستایە.

(٣٣) بۆ ئەم بڕیارە گەلێك نموونەمان بەدەستەوەیەو هەر دیاردەیەش نموونەی خۆی هەیە. تۆمارکردنی ئەو نموونانە دەمانخاتە ناو وردەشتی ئەو تۆوە کە قەوارەی ئەم باسە هەڵی ناگرێ. لەکاتی فراوان کردنەوەی باسەکەدا دەچینە ناو وردە نموونەوە. لێرەدا ئەوەندە بەسە کە پەنجە بۆ بەرهەمی گۆران و مارف بەرزنجی و دڵزارو کامەران و حسین عارف و نووسەرانی شەست ساڵەکان و حەفتا ساڵەکان ڕابکێشین.

## ملخص البحث

# الواقعية الحديثة والأدب الكردي

**الدكتور عزالدين مصطفى رسول**

**أستاذ بكلية الأداب ـ جامعة صلاح الدين**

القسم الثاني:

نشر القسم الأول من البحث في العدد السابق ـ وهو عن هذا الاتجاه الأدبي على النطاق العالمي ـ أما عن محتويات القسم الثاني من البحث، يكرس قسم من البحث للآداب القومية ويدرس ملامحه. بعلاقته وتأثيراته على الأدب العالمي وبتأثير منه ويستشهد الباحث دليلاً على ذلك وعلى تصورات كتاب بارزين لهذا المنهج يقول جورج أمادو:

«من أجل أن تكون كتبنا ورواياتنا وأشعارنا قادرة على خدمة قضية الثورة يجب أن تكون قبل كل شيء برازيلية، وفي ذلك بالذات تكمن قابليتها في أن تكون عالمية». ومن هذا المدخل يتطلع الباحث على العالم الثالث وارتباطه بالنهج الأدبي ـ ثم ينتقل الى نقاشات جديدة حول الموضوع ـ ومن هنا يجد نفسه ملزماً بالبحث باختصار عن الواقعية الحديثة والأدب الكردي ليضيف أفكاراً جديدة الى كتابة «الواقعية في الأدب الكردي ـ بيروت ١٩٦٦»، مبتدئاً بعرض البدايات وطرح منهج مفصل لدراسات مقبلة. ويستشهد الباحث بنصوص لعدد من الكتاب الكرد بينهم عبدالواحد نوري (١٩٠٤ ـ ١٩٤٤) ومحمود أحمد (١٩١٧ ـ ١٩٦١) ويعدد الموضوعات التي تصور في هذا الأدب ويصف خصائصها. ويرى أن الأفكار المطروحة في أدب الكاتبين هي أفكار بسيطة ولكنها تعبر عن إشعاعات فكرية جديدة. كما أنها تخص التطور في الشكل الى جانب المضمون، فنتاجات عبدالواحد نوري تعد عموماً ضمن الكتابات السياسية من مقالات وغيرها، ولكنها ليست بعيدة عن عالم الأدب وعن التعبير بأساليب أدبية للمقالة عن أفكاره. أما محمود أحمد فقد دخل عالم القصة القصيرة الكردية ـ وكان بروايته (قصر الأيام) من رواد إنشاء هذا النوع في الأدب الكردي. ورغم واقعية هذه الرواية مضموناً فإنها تنتمي الى الرواية الخيالية من حيث الشكل. وإعتبر الباحث هذه النماذج بدايات لهذا الاتجاه لها إستمراريتها التأريخية.

# لێکۆڵینەوە

# دەربارەی ئەو وشانەی لە «چاوگەوە» وەردەگیرێن:

**رفیق محمد شوانی**
**مامۆستای پەیمانگای مامۆستایانی هەولێر**

ئەم بابەتە بەشێکە لە نامەی ماجستێری نووسەر کە بۆ بەشی کوردی ـ کولیجی ئادابی زانکــۆی صلاح الـدین سالْی ١٩٨٨ پێشکێش کراوە. بە کەمێك دەستکاری‌یەوە بڵاودەکرێتەوە.

**پێشەکی**

چاوگ، وەك بەشێکی یەکجــار گرنگی ئاخــاوتن دەورێکی دیــارو جەلاك رادەگـەیـەنێ و دەبینێت لەزمـان دا. ئەمـە چ بە شێوەی ئاسایی خوی و چ وەکو وەرگرتن و دارشتنی وشەی تر لێوەی، بەهۆی رۆنان و ێکدانەوە.

هەروەك دەزانین زمــانی کوردی یەکێکـە لەو زمـانـانـەی بەهـۆی یکدانەوە، فەرهەنگی زمانەکەی دەوڵەمەند بووە، ئەوەش دەزانین کە چاوگ چ بە رێگـای دارشتن و چ بە رێگـای لێکــدانـەوە،⁽¹⁾ وشـەو زاراوەی بێ ئەژمــار لێــوەی پێــك دەهێــنــرێــت. بە هۆی گەران و خوخـــەریــك کردن و لێکـۆڵینـەوەوە، بە رێگـای دارشتن و وەرگـرتن لە چاوگـەوە، زمـانـەوان لەبـەر رۆشنـایی زمـانـەکەمان دا دەتوانێت یاساو دەستووری دارشتن و پێکهاتنی وشەو زاراوەکانی بدۆزێتەوە.

چۆن چاوگ بەشێکی چالاکی ئاخــاوتنــە هەر بەو چەشنــەش لە دارشتن و لێکـدانی وشـەی وەکـو: ناو، ئاوەڵنـاو، فرمـان. . . دا، کە بەشە ئاخاوتنی دین دەوردەبینێ.

باسـەکـەی ئێمـەش کەتـایبـەتـە بە (نـاوی بکـەر)ەوە لە چاوگـەوە وەردەگیرێت و دەچێتەوە ریزی بەشی ئاخاوتنی دی. بۆدارشتنی وشە، چاوگ بە بنەرەت و سەرچاوەی دروست بوون و پێکهاتن دەزانین، نەك فرمان، چونکە چاوگ و فرمان ئەگەرچی واتای رووداو دەگەیەنن بەڵام چاوگ وەك فرمـان کەس و کاتی تێـدای نی‌یـە، بابـەتەکانی سەرەوەش واتـایـەکی چاوگـەکانیان لەرووی رووداوەوە دەگەیەنن و وەکو چاوگیش نەبـەستـراون بەکـەس و کاتـەوە. فرمانیش بێجگە لە رووداو، کەس و کاتی تێـدایەو بۆیـەش گەردان دەکـرێت. کەواتـە ئەوجـۆرە وشـانەی سەرەوە لەم رووەوە ئەگەر جارێك لەچاوگەوە دووربن، ئەوە دووجار لە فرمـانـەوە دوورتــرن. لەرووی رۆنانەوە چاوگ نەك فرمان بە سەرچاوەو بنـەمـای وشـە دارشتن دەزانین. چونکـە فرمـان و هەموو جۆرەکانی بە

(رابـردوو، رانـەبـردوو، داخـوازی)یـەوە خۆیـان رەگ و قەدەکانیان لە چاوگـەوە بەلادانی (ن)ەکـەی وەرگیــراون و بەهـۆی خستنـەسـەری نیشـانـەی تایبـەتی بە جۆری فرمـانـەکـەو پێـوەلکـانـدنی راناوە لکاوەکانیانەوە ئەوسا دروست دەبن و جۆری فرمانەکان دیاری دەکرێن. کەوابوو فرمان خۆی درێژاوەو لەچاوگەوە وەردەگیرێ. بۆ بەڵگە فرمانی رانەبردوو

هەروەهـا داخـوازیش ئەگـەر نیشـانـەو رانـاوەکـانی کە بە هۆیانەوە دروست بوونەو هیچ واتایەك نابەخشن. وەك:

دەرۆم: فرمانی رانەبردووە لەرەگی چاوگی (رۆیشتن)ەوە وەرگیراوەو بە لابـردنی (دە)ی نیشـانـەی رانـەبـردوویی و رانـاوە لکـاوەکـەی (رۆ) دەمێنێتـەوە. ئەگـەرچی پارێـزەری مانـای بنەمای چاوگەکەیەو لەرووی دارشتەوە هەڵس وکەوتی وشـەی لەگەڵ دا دەکرێت بەڵام هیچ واتایەك نابەخشێت. لەپاشان دا راناوەکان لەگەردان کردن دا گۆرانیان بەسەردا دێت لە تێپـــەرەوە بۆ تێنــەپـــەرە وە هەروەهـا لە رابـردوو بۆ رانـەبـردوو داخـوازیش لەگـەڵیـان دا. کەواتـە فرمـان خۆی لەخـۆیدا وشـەیەکی سەربەخۆ نیە لەرووی پێکهاتنەوە چونکە مۆرفیمی تری جیاواز جیاواز لە دروست بوونی جۆرەکانی بەشداردەبن. وەك:

[دە]ی: نیشانەی رانەبردوویی، دەکەم، دەنووسم،

[دە]ی: نیشانەی رابردووی بەردەوامی وەك: دەخوارد.

[وە]ی: نیشانەی رابردووی تەواو وەك: نووسیوە.

(بوو): بۆ رابردووی دوورە وەك: خواردبوو.

کەچی چاوگ :خـۆی وشـەیـەکی سەربـەخـۆیەو هیچ مۆرفیمێکی تری ڕێزمانی بەشداری پێکهاتنی ناکات. تەنانەت (ن)ەکەش کەشی هی بنەرەتی چاوگەکە خۆیەتی و لەهەموو چاوگێك دا هەیەو ناگۆرێت بەڵام هەرچی نیشانەکانی فرمانە پێوەلکاوەو لەگەردان کردن دا

بۆ نموونە ڕاناوە لکاوەکانی دەگۆڕین وەك:
ڕۆیشتم، ڕۆیشتیت، ڕۆیشت
ڕۆیشتین، ڕۆیشتن، ڕۆیشتن      بۆ ڕابردوو
دەڕوم، دەڕوین، دەڕوات
دەڕوین، دەڕۆن، دەڕۆن      بۆ ڕانەبردوو
بنووسە، بنووسن      بۆ داخوازی

بۆیە لە ڕووی داڕشتنەوە[1] چاوگ بەسەرچاوەی وشە ڕوناك دەزانین.

بابەتەکانی ئەم باسەش وەك (ناوی‌بکەر، ناوی‌بەرکار، ناوی‌چاوگ، ناوی‌جێگا، ناوی ئامێر) لە چاوگەوە بە یارمەتی پێشگرو پاشگرەوە پێك دەهێنرێن. (لەمەولا بەپێی دەرفەت باسی هەموویان دەکەین)

ناو لەڕووی وەرگرتنەوە دوو جۆرە:

١ ـ ناوی سادە: ئەو ناوانەن کە سەربەخۆ هەن و لە وشەی ترەوە وەرناگیرێن. وەك: ئاسن، شاخ، پیاو، گوڵ.

٢ ـ ناوی ناسادە: ئەو ناوانەن کە بەرێگای داڕشتنەوە لە وشەی سەربەخۆی ترەوە وەردەگیرێن. وەك ناوی داڕێژراو، ناوی لێکدراو چ لە چاوگەوە بێت یا لە وشەی ترەوە بە هۆی زیادەو وشەی ترەوە. لێرەدا ئێمە تەنها لە (ناوی بکەر) دەدوێین، ئەگەر دەرفەتیش هەڵکەوت ئەوا ئەوانی دیش باس دەکەین.

لێرەدا تەنها لەجۆری دووەمی دەدوێین کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و تایبەتە بە ناوی بکەرەوە:

## ناوی بکەر (اسم الفاعل Nomen Agent )

ناوی بکەر بەو وشانە دەوترێت کە لە چاوگەوە وەردەگیرێن و واتای ڕووداوێك لە لایەن ئیش کەرەوە دەگەیەنن توانا تایبەتی‌یەکەیان سیفەتێکی بەردەوام و ـ هەمیشەیی‌یان پێ دەبەخشێت.

ناوی بکەر لەڕووی پێکهاتنەوە دوو جۆرە:

١ ـ ناوی بکەری داڕژاو
٢ ـ ناوی بکەری لێکدراو

ناوی بکەری داڕژاو:ـ

ئەو ناوەیە کە لە چاوگی سادەو داڕژاوی تێپەڕو تێنەپەڕەوە بە یارمەتی پێشگرو پاشگرەوە

وەردەگیرێت، وەکو: هاتوو، ڕۆیشتوو، دانیشتوو، هەستاو، گریاو، فراو، هەڵچوو، نووسەر، ڕۆیشتوو، بکێڵ، کڕیار، داپاچ، زانا، گەڕۆك، تەریدە.

أ ـ ناوی بکەر لە چاوگی تێنەپەڕی گوێزانەوە (انتقالی)دا بە لادانی نوونی چاوگ و پێوەلکاندنی پاشگری (و) بۆ سەر قەدی چاوگی کۆتایی‌هاتوو بە (ا، ی) سازدەبێ، بەلام ئەگەر بە (ت، د) کۆتاییان هاتبێت ئەوا (وو)ی پێوەدەلکێت، [2] وەك:

| چاوگی تێنەپەر | قەدی چاوگ | پاشگر | ناوی بکەری داڕژاو |
|---|---|---|---|
| هەستان | هەستا | و | هەستاو |
| گریان | گریا | و | گریاو |
| فرین | فری | و | فریو |
| دانیشتن | دانیشت | وو | دانیشتوو |
| گەیشتن | گەیشت | وو | گەیشتوو |

ئەم ڕێژەیە لە چاوگی (واو)ی تێنەپەڕی ناوێزەی (چوون، بوون)ەوە لەشێوە سادەکەیانەوە وەرناگیرێن، چونکە لەگەل ڕێژەی ڕابردووە نزیکەکەیەوە تێکەل دەبن و واتای (ناوی‌بکەر) تەنها بە داڕژاوی دەبەخشن نەك بە سادەیی «ئەگەر (مصدر)ێکە واوی‌و تێکەل بوو وەکو (هەڵچوون، لاچوون) اکتفا بەواوەکەی خۆی دەکرێ‌و یعنی هەر بەفڕێدانی نوون (مصدر)ی پێك دێ. وەکو (هەڵچوو، لاچو[هەڵبوو] ) (فقط) بە (لهجەو) قرینە لە ماضیی شهودی جوێ دەکرێنەوە».

ئەم ڕێژەیەی سەرەوە لایەنی بکەریتی‌یان بە شێوەی سادەیی‌یان بەهێزترە لەوانەی لە چاوگی داڕژاوو لێکدراوەو وەرگیراون، چونکە داڕژاوو لێکداروەکانیان ئەگەر چی لە بەکارهێنان دا دەوری بکەریتیش دەبینن، بەلام لایەنی ئاوەڵناوی یان ئاشکراو دیارە، بەتایبەتی لەگەڵ ئاوەلفرماندا، وەك: پاش کەوتوو، هەلکەوتوو، داکەوتوو، دۆش داماو، سەرکەوتوو. ئەم ڕێژانە (نە)ی نەرێش وەردەگرن و دەبنە ئاوڵناویش وەکو: نەهاتوو، نەهات.

ئەم ڕێژە ناوە بکەریانە لەبەرئەوەی لایەنی بزووتنەوەو هەڵس وکەوت و بکەریتی‌یان لەلایەن خاوەن کارەکانیانەوە تێدا ڕوون و ئاشکراو دیارە، بەناوی بکەر دادەنرێن و لەم ڕووەوە ئەم ڕێژەیە لەگەل ئەوڕێژەیەی کە بە هەمان شێوە لە قەدی چاوگی ڕوودانەوە ڕۆدەنرێت بە هەڵە لەلایەن زۆربەی زمانەوانانی کوردەوە هەر بەناوی‌بکەر دانراوە یاتێکەل کراوەو هەردووکیان بە ناوی‌بکەر دانراون، بێ ئەوەی هیچ بەلگەیەك هێنرابێتەوە. . .

ڕاستی‌یەکەی ئەوانەی لە چاوگی ڕوودانەوە پێك دێن ناوی بەرکارن نەك ناوی‌بکەر. ئەمجا ڕێژەی دووەم (ناوی بەرکار)ە چونکە بکەرەکانیان دیار نی‌یەو ئیش و کاریان بەسەردا هاتووە، نەك

ـرنيتيـان. لەم ڕووەوە پێـويستـە نمـوونـەيـەك بۆ بەڵگەی ڕاستی ئەم جووەمان بهێنمەوە وەكو: (ڕژاو، خنكاو، پساو، مردوو. . .) ئەمانە ێتيـن بەسـەردا هاتــووە، نەك ئيشيـان كرد بێت و بكـەرەكـانيـان ـرنی‌يـە، [٥] بەڵام ڕيـژەی يەكـەم كە لە چاوگی گوێـزانەوەيە ناوی كەرە. ديارە وەكو ناوی بكەری (كەوتوو، هاتوو، نووستوو، گرياو، ـمـو. . .) كاريـان كردووەو خاوەن كارەكـە بكـەرەكـانيـانن، واتـە، موونـەی كاری (كـەوتن، هاتن، نووستن. .) يان كردووە. هەروەهـا ـوی‌بكـەر) بە ڕيـژەيـەكی كەم لە قەدی چاوگی تێنـەپـەڕو پاشگری ە)ەوە پێك دەهێنرێت، [٦] وەكو:

ی كەوتن: لێ‌كەوت + ە = لێ‌كەوتە

پەك كەوتن: پەك كەوت + ە = پەك كەوتە

ـ ـ ناوی بكەری داڕژاو لە چاوگی تێپەرەوە:

ئەم ڕێژەيە لە ڕەگی چاوگی تێپەڕو پێشگرو پاشگرەوە وەردەگيرێت، وەك:ـ

ـ لە ڕەگی چاوگی تێپەڕو پاشگری (ەر)ەوە، وەك:

نووسين: نووس + ەر = نووسەر[٧]

بينين: بين + ەر = بينەر

خوێندن: خوێن + ەر = خوێنەر

ئاخوتن: ئاخێو + ەر = ئاخێوەر (بزوێنی (١))

دەگۆڕێت بە (ێ) لەوەرگرتنی ڕەگی چاوگەكەدا).

ليدان لێدە + ەر = لێدەر بە تێچوونی بزوێنی (ە) يەكيان

ڕاخستن ڕاخە + ەر = ڕاخەر هەمان هۆ

هێنان هێن + ەر = هێنەر

دانان دانێ + ەر (بە تێچوونی بزوێنی (ێ)بە پێی تايبەتێتی فۆنەتيكی ڕێزمانی كوردی دەبێتە = دانەر.

لە سەر ئەم شێوەيەی سەرەوە ئەمانەی خوارەوەش دروست دەبن:

بەخشين: بەخش + ەر = بەخشەر

ڕاكێشان: ڕاكێش + ەر = ڕاكێشەر

فرۆشتن: فرۆش + ەر = فرۆشەر

ناردن: نێر + ەر = نێرەر (نێنەر)

پێوان: پێو + ەر = پێوەر

چاند: چێن + ەر = چێنەر

كوشتن: كوژ + ەر = كوژەر (لە ئەنجامی وەرگرتنی ڕەگەكەيدا دەنگی نەبزوێنی (ش) كە كپە گۆڕاوە بە ئاوازە داری (ژ) ).

پيشـانـدانی تەواوی ئەو نمـوونـانـەی سەرەوە زيـاتـر يارمـەتی ڕوونكـردنـەوەو شی‌كـردنـەوەو تێگـەيشتنی بنـەواشـەكە دەدات، چونكە دەكەرت كردنی ناو لە ڕووی مۆرفۆلۆژی‌يەوە لە مەسەلەی لێكۆڵينەوەی زمـانی كوردی‌دا كارێكی گرنگـە. ئەمـە نەك تەنيـا چۆنيـەتی ڕۆنان و پێكـهـاتـن و دروست بوونی ناو ئاشكـرا دەكـا، بەڵكـو يارمـەتی ڕوونكردنەوەی تەواوو قوڵتری ماناو ناوەڕۆكيش دەدات و پێوەندی لەگەڵ وشەی تردا دياری دەكا»[٨]

ئەم پاشگـری (ەر)ە پاشگـرێكی زۆر بەكـارو لە بارو چالاكـە بۆ ڕۆنانی وشەی داڕژاوو (زاراوە). دەتوانێ لەگەڵ ڕەگی هەموو چاوگە تێپەڕەكان و بە تێپەڕكراوەكان دا ـ بە هۆی (اندن)ەوە ـ ناوی بكەری داڕژاو پێك بهێنێ وەكو ئەوانەی لە سەرەوە كە لە چاوگە تێپەرەكانەوە سازكـراون و وەك ئەمـانـەی خوارەوەش كە لە تێـپەڕكـراوەكـانـەوەن و (ا)كەيان دەگۆڕێت بە (ێ) لە وەرگرتنی ڕەگەكانيان دا، وەك:ـ

ڕوخاندن: ڕۆخێن + ەر = ڕوخێنەر

بەزێنەر، برژێنەر، سووتێنەر، نوێنەر، خنكێنەر، تۆقێنەر.

هەروەها لە دەنگە سروشتی‌يەكانەوە كە كراون بە چاوگی تێنەپەر، وەكو

جولاندن: جولێن + ەر = جولێنەر

ڕوخێنـەر، بارێنـەر، ڤيـژێنـەر، مرقێنـەر. . . بەڵام لە ئاخـاوتن و نووسين دا كەم بەكـاردەهێنـرێ وەكـو بە تێـپەڕكـراوەكـان نين، كە بەكارهێنانيان مەودايەكی بەرفراوانی هەيە.

پاشگری (ەر) توانای ئەوەی هەيە بە دوو شێوە لەگەڵ ڕەگی چاوگە تێپەڕەكان دا (ناوی‌بكەر) پێك بهێنێت:

١ ـ لەگەل چاوگە ئاسايی‌يەكان دا، لە سەرەود خستمانە ڕوو.

٢ ـ لەگـەڵ چاوگـە ناوێـزەكـان (شـاذ)دا. ئەوانـەی لە وەرگـرتنی ڕەگـەكـانيـان دا دەسـتـوری نين و بەلادانی نيشـانـەی چاوگ[٩] يەكسەر ڕەگـەكـانيـان وەرنـاگيـرێن و هەروەها ئەو ڕەگانە لە واتای چاوگەكانيان تەواو دووركـەوتـوونـەتـەوە. جا ئەم جۆرە چاوگـانە يەكـسەر بە سادەيی پاشگری (ەر) وەرناگرن، تا بەهۆی پێشگرەوە نەكرێن بە داڕژاو. واتە بە چوونـە سەری (ەر) نە واتـای چاوگـەكـانيان هەڵدەگرن و نە واتاش دەبەخشن و «ناشێ بڵێين ڕەگی فيعلەكە بە تەنها واتای تەواوی هەيە چونكـە بەڕاستی واتـای تەواوی نيـە: تۆ كە گوتت (خـۆر، شۆر، كەر. . .) كەس تێـت ناگـا مەبـەستت چيـە تا نەڵێی (نـان خۆر، جل شۆر، تێ‌كەر. . .)[١٠]

بەڵام لە ڕووی پێكهێنـانـەوە بريتين لە ڕەگی چاوگ و پاشگـری (ەر)ی ناوی بكەری‌و بە هۆی تايبەتێتی فۆنەتيكی زمانی كوردی، وەكو دەستوورێك دوو بزوێن نارێك و نالەبارەوە ناتوانن بچنە سەر يەكتری‌و لە ئەنجـام دا يەكێكيـان تێ‌دەچێت. جا تا ئێستـا بە هەڵـە ئەم جۆرە ڕەگی چاوگانەو پاشماوەی گۆڕانی پاشگری (ەر)، وەكو (كەر، بەر، دەر. . .)[١١] بە پاشگر دادەنێن كە لە ڕاستی‌دا بريتين لە ڕەگی

چاوگ و پاشگری (ەر)[12] وەکو:

داکردن = کەر: کەر + ەر = کەر = داکەر

رابردن = بەر: بە + ەر = بەر = رابەر

خواردن = خۆر: خۆ + ەر = خۆر = بخۆر

رادان = رادە + ەر = رادەر (وەکو ئاوەکە رابدە)

دان = بـ + دە + ەر = بدەر (بەتێچوونی بزوێنێکیان)

پاشگری (ەر) چالاکە بەو شێوەیەی لە سەرەوە نیشانمان دا لەگەڵ هەمـــوو چاوگـــە تێپـــەرەکـــان دا بۆ پێکهێنـــانی (نـاوی بکـەر) خۆی دەگونجێت، چونکە پاشگری (ەر)یش بۆ دروست کردنی ناوی بکەر یا ئاوڵنـاوی بکـەری دارێـژراو بەکـار دەبـرێ لەگەڵ کرداری سادە بێ، وەك: نووسـەر (لـەسـەرەوە نیشـانمـان داوە) یا نـاسـادە. ناسادەش بە هەردوو جۆرەکـەیـەوە لێکـدراوە، وەك: رەنـج بەر. . . دارێژراویش، وەك: داهێنـەر، دانـەر، . . کە لە (داهێنـان)و (دانان)ەوە وەرگیراون. ئەمەش چەند نموونەیەکی ترە کە دەستوورێك پێك دەهێنن بۆ (ناوی بکەری لێکدراو) لە چاوگی لێکدراوەوە.[13]

پەیام بردن: پەیام بە + ەر = پەیام بەر (بەتێچوونی بزوێنێکیان

نان کردن: نان کە + ەر = نانکەر (بزوێنێکیان تێچووە)

خوێن بردن: خوێن بە + ەر = خوێن بەر (بەهەمان هۆ)

راوکردن: راوکە + ەر = راوکەر (بە هەمان هۆ)

ئیش کردن: ئیش کە + ەر = ئیش کەر (بە هەمان هۆ)

سواڵ کردن: سواڵ کە + ەر = سواڵکەر (بە هەمان هۆ)

نان بردن: نان بە + ەر = نانبەر (بە هەمان هۆ)

رەنج دان: رەنجدە + ەر = رەنجدەر (بە هەمان هۆ)

رێبردن: رێ بە + ەر = رێبەر (بە هەمان هۆ)

بەم نموونانەدا دەردەکەوێت کە پاشگری (ەر) لە زمانی کوردیدا بناغەی بوونی داکوتاوە، بەڵام بەزۆری چۆتە سەر ئەو چاوگانەی کەوا لە ئیش و کاری رۆژانـەدا بەکـارهێنـانیـان زۆرترە لە وانی تر. باشـترین نموونەش بۆ کۆنی (پێغەمبەر ـ نانکەر)ە کە ناوی بکەرە. ئەمجا لەگەڵ رەگـــی چاوگـــەکـــانـــی تریش دا لە کۆن دا بەکـــار هاتـــووە، بەڵام «لـــەبـــەرئـــەوەی هەمیشـــە لە سەر زاربـــوونـــە سووك بوونـــەوەو دەنگی (ر)ەکەیان لێوە کەوتووە ئەم نموونەیەش ئاشکراتر دەبێت وەك لە وشەی (بخۆر) بەسوانی دەنگی (ر)ەکەی دەبێتە (بخۆ)و دەوترێت:

فلانە کەس بخۆیە. مام نەریمان نان بدەیە. لە جیاتی (بخۆر، بدەر).

هەروەها بۆ ئیسپات بوونی (ەر)و کۆنی لە زمانی کوردیدا دەبینین لە شێوەی کرمانجی سەروودا بوونی پارێزراوە. بە وێنە دەبینین، ناوی بکەری دارژاوو لێکدراو لە چاوگی (خوارن) دا بریتییە لە «خوەر، نانخوەر»[14] لەم رووەوە مامۆستا فازل عومەر دەڵێ:

«ئەم دبێژین. . . . پێغەمبەر، نانخوەر /نانخۆر، بالبەر، کارکەر، مێرکـوژ. . . هتـد ئەرێ رێـزمانکی، جوداهی دنێڤبەرا، بەر، خوەر، خۆر، کەر. . . هتـد. . . دا هەیـە؟ دیبینین هەمیـان داوییـا ناڤـان گرتییـەو ناڤێ بکـەری دروست کرییـە».[15] ئەمجـا ناوی بکـەری (نانخوەر) وەکو (نانکەرو دڵبەر) یەك رێژەیان هەیەو بریتین لە رەگی چاوگ و پاشگری (ەر). ئەمەش بەڵگەیەکە کە (کەر) پاشگر نییە، بەڵکـو وەکـو چەنـد جارێـك روونمـان کردۆتـەوە پێك هاتووە لە رەگی (کە)و پاشگری (ەر)ی ناوی بکەری. لە ئەنجامی کۆبوونەوەی دوو بزوێنی (ە)شدا یەکێکیان تێچووە.

ئەمە رەسەنایەتیو کۆنی ئەم پاشگرە نیشان دەدات. واتە (کەر)یش وەکـو (بـەر، خۆر، دەر) پاشگـر نییـە. جا بۆ سووك بوونـەوەی زۆر وشەی (ناوی بکەر) دەنگی (ر) سواوەو سووك بۆتەوە. واتە لە جیاتی (بخـۆر، بدەر) با (بخـۆر، بدە) بەکـار هاتـووە. وەك پیرۆت بخۆیە، جوامێر نان بدەیە.

رێـژەیـەکی تری بەشـدار بوونی پاشگـری (ەر) لە دارشتنی (ناوی بکەری دارژاو)ی لە چاوگی تێپەڕی ناوێزەوە وەکو لە سەرەوە هێمامان بۆ کرد، لە پێـشـگـری (بـ)و رەگی چاوگ و ئەم پاشگـرەوە پێـك دەهێنـرێت و «. . هەنـدێـك ماکی چاوگـەکـە بخـرێتە ناو «بـ. . ەر» دەبێتـە [نـاوی] بکـەر وەکـو: بکەر، بدەر، بخوەر»[16] وا لە خوارەوە بە تەواوی ئەو شێوە دارشتنەی ناوی بکەر دەخەینە پێش چاو، وەکو:

| چاوگ | پێشگر | رەگ | پاشگر | ناوی بکەری دارژاو |
|---|---|---|---|---|
| کردن | بـ | کە | ەر | بکەر |
| دان | بـ | دە | ەر | بدەر |
| خواردن | بـ | خۆ | ەر | بخۆر |
| بردن | بـ | بە | ەر | ببەر |
| خستن | بـ | خە | ەر | بخەر |

لە وەرگـرتنی ئەم رێـژە ناوە بکـەریـانـەدا دوو بزوێنی (ە)ی رەگی چاوگـەکـان و پاشگـرەکـە لە ئەنجـامی چوونـە سەر یەکتـریان بە پێی دەستووری دەنگسازی کوردی (ە) یەکیان تێچووە. ئێستا دەرکەوت کە ئەم جۆرانـــەی سەرەوە لە پێـشگـــرو رەگـی چاوگـی سادەو پاشـگــر پێکهاتوون و شێوەی ناوە بکەرییە دارژاو لێکدراوەکەی کە لە چاوگی دارژاوو لێکدراوەوە وەردەگیرێت پێشگری «بـ» ئەو پێکهاتنەیان بە دەرەو تەنها پاشگری (دەر) لەگەڵ رەگەکانیان دا (ناوی بکەری دارژاوو ناوی بکـەری لێکـدراو) بەشـداری دەکـات وەکـو لە سەرەوە لە باسی ئەم

ڕێژەیەدا خستمانە بەرچاو

نان خواردن: نان + خۆ + ەر نانخۆر (نانخوەر)

دارکردن: دار + کە + ەر دارکەر

داخستن: داخە + ەر داخەر (بەتێچونی (ە)یەکیان)

تێك دان: تێك دە + ەر تێك دەر (بەهەمان هۆ)

لە خستنە بەرچاوی تەواوی ئەم ڕێژەیەی (ەر) بە تایبەتی لە چاوگە ڕێزەکان دا کە «کەر، دەر، بەر»[17] کە ڕەگی چاوگەکانی (کردن، دان، بردن)ن و پاشگر نین و ڕەگە و پاشگرن، وەکو لە نموونەو نەقەکانی سەرەوە خستمانە ڕوو.

ناوی بکەری دارِژاو هەیە لە پێکهاتن دا ڕەگەکەی وەردەگرین و (ەر)ی دەخەینە سەر، بەتایبەتی لە چاوگی (ناردن)دا، کە «نێر» دەبێتە (نێرەر). لێرەدا دەتوانرێ و ئاسایشە نەبزوێنی (ن) شوێنی یادەوری (ر)ی نەبزوێن وەرگرێ و وەکو نیمچە بزوێنێك بچێتە نێوان هەردوو بزوێنی (ی، ە) کەوا لەیەکیان جیابکاتەوە. ئەمە لە ئاخاوتن و نووسینیش دا بە کاردێ. شێوەی وەرگرتنەکەی:

ناردن نێر + ەر نێرەر نێنەر

دوا شت بۆ بەڵگەی کۆنی (ەر) لەزمانی کوردیدا، ئەوەیە زۆربەی پاشگرە هاوبەشەکانی (ناوی و فرمانی) دەوری کاریگەر لە دروست کردنی وشەی دارِژاو لەناوو ئاوڵناوەوە دەبینین بۆ وێنە (گە، ەن، ار، ۆك، ك، ەك... هتد) وەك لە وشەکانی کارگە ـ ناوییە، ڕەونگە ـ فرمانییە هەروەها قۆیەن و سوتەن، بنارو کوشتار، تیرۆك و گەڕۆك، پەتك و سووتك، دەستەك و پەستەك و گەلێکی تر. دڵنیام ئەوەی «ەر» لەگەڵ ناویش و ڕەگی چاوگیش دا بەکارهاتووەو وشەی دارِژاوی پێکهێناوە. بۆ وێنە: چەپەر (دەرگای پەرژینی باخچەی بەداروقامیش دروست کراوە)، کە لە (چەپ + ەر) ساز بووە. هەروەها وشەی سەنگەر لە (سەنگ + ەر)؛ کۆچەر (ناوی بکەر)ە لە (کۆچ + ەر) لە ناوو پاشگری (ەر) پێك هاتووە.

نموونە:ـ

شەنگە بیری یارو دەسباری کوری کۆچەر نەبێ چۆن دەگاتە

جێ هەوارو هۆبە ئەو بارگەو بنە

(هێمن، ل٧١)

چەپەر سووتا، پەرژین سووتا

ئەها ئاوازی ژین سووتا

(دیلان، ل٣٢١)

هەموو بێ باك و دلپاك و مێرن

لە ناو سەنگەردا لە وێنەی شێرن

(هێمن، ل٧٨)

پاشگری «ەر» لە ڕووی واتاوە (بزووتنەوەو جوولەو چالاکی) دەبەخشێت لە تێکرایی وشەسازیی کوردیدا. ئەم پاشگرە کە دەبێتە «... هۆی دروست کردنی ناوی بکەری دارِژاو بۆ ناوی بکەری لێکدراویش بەکاردێت»،[18] وەك:ـ

ئاودان: ئاودە + ەر = ئاودەر (بە تێچوونی بزوێنێکیان)

پێ‌لێ‌خستن: پێ‌لێ‌خە + ەر = پێ‌لێ‌خەر (هەمان هۆ)

ژن هێنان: ژن هێن + ەر = ژن هێنەر (ئەم جۆرە تەنها لە ڕەگی چاوگی لێکدراوەکەوە دەبێت وەك ژن هێن.

لە ناوبردن: لە ناوبە + ەر = لە ناوبەر (بەتێچوونی ەیەکیان)

ڕەنج دان: ڕەنج دە + ەر = ڕەنجدەر

چێشت لێنان: چێشت لێ‌نێ + ەر = چێشت لێنەر

بە تێچوونی بزوێنی (ێ)، یاخود بەتێچوونی (ە)ی (ەر)ەکە دەبێتە لێنێر) بەڵام زۆرکەمە وەکو ڕێژەی (ئاودێر، ئاودەر).

سەرنج ڕاکێشان: سەرنج ڕاکێش + ەر = سەرنج ڕاکێشەر

خوێن خواردن: خوێن خوە + ەر = خوێن خوەر

نان خوارن: نان خوە + ەر = نانخورە

نموونەکانی وەك (سەرنج ڕاکێشەر، سەرسوڕێنەر...) شێوەیەکی نری ناوی بکەر لە چاوگەکانیانەوە بە وەرگرتنی ڕەگەکانیان و لابردنی نیشانەی چاوگەکانیان پێك دەهێنرێن وەك:ـ

سەرنج ڕاکێشان سرنج ڕاکێش

سەرسوڕمان سەرسوڕمێن

٢ ـ ناوی بکەری دارِژاو بە هۆی پێشگری «بـ»ەوە لە ڕەگی هەموو چاوگە تێپەڕەکانەوە بەئاسایی و ناوێزەیانەوە ڕۆدەنرێت. لە ڕووی واتاوە ئەم پێشگرە وەکو پاشگری «ندە» «تواناو هێزو زۆری و لێ‌هاتوویی» دەگەیەنێت. ئەم ڕێژەیەش لە ڕووی دروست بوونەوە دووبەشە:

أ ـ لەچاوگی ئاسایی‌یەوە: پێشگری «بـ» دەچێتە سەر ڕەگی هەموو چاوگە ئاسایی‌یەکان، یەکسەر بە لابردنی نیشانەی چاوگ و پێوەلکاندنی ئەم پێشگرە بە پێشی ڕەگەکانەوە وەك:

کڕین: بـ + کڕ ــــ بکڕ

فرۆشتن: بـ + فرۆش ــــ بفرۆش

کوشتن: بـ + کوش ــــ بکوژ بە گۆڕانی ش بۆ ژ

کێشان: بـ + کێش ــــ بکێش

چێشتن: بـ + چێژ ــــ بچێژ

نووسین: بـ + نووس ــــ بنووس

ناردن: بـ + بنێر ــــ بنێر

زانین: بـ + زان ــــ بزان

کێڵان: بـ + کێڵ ــــ بکێڵ

گۆران: بـ + گۆر ـــ بگۆڕ
ڕێشتن: بـ + ڕێژ ـــ بڕێژ
برین: بـ + بر ـــ ببڕ
کولان: بـ + کوڵ ـــ بکوڵ

ب ـ لە چاوگی ناوێـزەکـانـەوە، ئەم ڕێـژەیـە، یەکسـەر بە شێوەی ڕێـژەی یەکـەم وەرنـاگیـرێت، بەڵکـو ئەو چاوگـانـەی کەوەرگـرتنی ڕەگـەکـانیـان دەستـووری نین. بە تەنهـا بەهـۆی پێشگـری «بـ»و ڕەگـەکـەیـەوە پێـك ناهێنـرێت، بەڵکـو بە یاریـدەی پاشگـری «ەر»ەوە دروست دەبێت و ئەم ڕێژەیەش هاوبەشە لەگەڵ ڕێژەی (ناوی بکەری دارژاوی)داو وەکو (نووسەر، بخۆر، . . . هتد) تێکەڵە. نموونە:

کردن: بـ + کە + ەر ـــ بکەر (بە تێچونی بزوێنی (ە) یەکیان)
خستن: بـ + خە + ەر ـــ بخەر (هەمان هۆ)
بردن: بـ + بە + ەر ـــ ببەر (بۆ سووك بوونەوە دەبێتە بەر)
خواردن: بـ + خۆ + ەر ـــ بخۆر / بخۆ
دان: بـ + دە + ەر ـــ بدەر (هەمان هۆی سەرەوە)

لێـژنـەی یەکـەمی دانـانی کتێبی زمـان و ئەدەبی کوردی پۆلی سێـیەمی ناوەنـدی بەلایـانـەوە پێشگـری «بـ»ی ناوی بکەری شێوەی «بە»ش دەگـرێتـە خۆی،[19] وەکـو «بـەکێـل، بەگەر» کە لە ڕاستیدا «بە»ی دووەم ئامرازی پەیوەندییەو ناشێت بەو شێوەیە ناوی‌بکەر ڕوبێت.

هەروەهـا محـەمـەد ئەحـمەد سەعیـد دەربـارەی پێشگـری «بـ» سەرنجێکی لەم بارەیەوە دەربڕیوە بە نیشانەی «بـ»ی فرمانی داخوازی (ئامر) داوەتە قەڵەم.[20] لە ڕاستیدا لە ڕووی واتاوە ئەو دوو پێشگری «بـ»ی ناوی بکـەری‌و «بـ»ی پێشگـری فرمـانی داخـوازی لەیـەکترەوە دوورن. یەکەمیان وەکو لەپێشـەوە ڕوونمان کردەوە واتای «تواناو زۆری‌و جوولە» دەگرێتەوە، کەچی دووەمیان واتای «داخوازی کردن و فەرمان کردن» دەدات.

بۆ ئەوە ڕێژەو مەبەستە پێشگری «بـ»ی ناوی بکەری لەگەڵ ڕەگی چاوگی دارژاو لێکدراودا بەکارنایەت بەڵکو «ەر» یا تەنها ڕەگی چاوگە دارژاو لێکدراوەکە شوێنی دەگرێتەوە نموونە:

خواردن ـــ بخۆر، نان خواردن ـــ نانخۆر
شۆرین ـــ بشۆر، داشۆرین ـــ داشۆر

ناتوانرێت بڵێین (دابشۆر).

ئەم ڕێژەی ناوی بکەرییە، کە بە هۆی پێشگرو ڕەگی چاوگەوە پێکی‌دەهێنین، تواناو زۆری کارەکە لە لایەن خاوەنییەوە سیفەتێکی هەمیشـەیی‌یـان بە خۆوە گرتـووە بەڵام بەپێی بەکـارهێنـان دەبنـە (ناوی‌بکەر)و (ئاوڵناوی‌بکەر)[21]

٣ ـ ناوی بکەری دارژاو لە ڕەگی چاوگی تێپەڕی (یائی، تائی، ئەلفی)و پێوەلکاندنی پاشگری «یار»[22]ەوەش پێك دەهێنرێت، لە سەر ڕێژەی (کریار، فرۆشیار). وەك:-

| چاوگ | ڕەگی چاوگ | پاشگری (یار) | ناوی بکەری دارژاو |
| --- | --- | --- | --- |
| کڕین | کڕ | یار | کڕیار |
| سەندن | سەن (سێن) | یار | سەنیار (سێنار) |
| نووسین | نووس | یار | نووسیار |
| فرۆشتن | فرۆش | یار | فرۆشیار |
| بەستن | بەست | یار | بەستیار |
| ژماردن | ژمێر | یار | ژمێریار |
| خواستن | خواز | یار | خوازیار |
| دانان | دانێ | | دانیار (بزوێنی (ێ) تێچووە |
| زانین | زان | | زانیار |

«لە هەمـوو ناوچـەکـانی دەوروبـەریـەوە کڕیـارو فرۆشیـار ڕوویان تێ‌کرد. (قەلای دمدم. ل٣٢، ٣٣)
ئەگەر سەنیاری خانووەکە بکرە.

وشـەی (کـڕیـار، فرۆشیـار، جوتیـار. . .) لە زمـانی کوردیدا کە پاشگـری (یـار)یـان گرتـوتـە خۆ بەکـارهێنـانیـان کۆنەو وەك لە وشەی «ڕۆجیـار» دایـە، کە بەواتـای فریشـتـەیە لەلای «ئەهلی‌هەق»و بەمانای ڕۆژ یـار دێت. وشـەکـە لە ئاڤێـستـادا هەیـە، بە ڕۆژ دەڵێن «ڕاوچـاە ـ raocah» کە مانای (ڕۆژە)ە. کەواتە پاشگری (یار) لەزمانی کوردیدا زۆر کۆنە»[23]

ئەم ڕێژەیە لە ڕواڵەت دا لە (ناوی چاوگ)ەوە زۆر نزیکە، بەڵام جیـاوازی‌کـردنی ئاسـانـە چ لەڕووی واتـاوەو چ لە ڕووی دارشتنەوە. ناوی چاوگ لە قەدی چاوگ و پاشگـری «ار»ەوە دروسـت دەبێـت، هەرچی ناوی بکەرە وەکو لە سەرەوە وتمان لە ڕەگی چاوگ و پاشگری (یار)ەوە ڕۆدەنرێ لە جیاتی ئەم (یار)ە پاشگری «یار»یش بەکاردێت و هەمان ناوی بکەرەو لە دواتر لێوەی دەدوێن، وەکو: پارێزگار.

٤ ـ لە زمانی کوردیدا ئەم ڕێژانەی (ناوی‌بکەر) بەدی دەکرێن:

أ ـ لە پەراوێـزێـکـی تەسـك داو بە شێـوەیـەکـی کەم ئەم پاشـگـرانـەش ناوی بکـەری دارژاو یا ئاوڵنـاوی بکـەری دارژاو پێك دەهێنن. وەك:-

ڕەگ + پاشگر = ناوی‌بکەر[24] (ئاوڵناوی بکەری دارژاو)
زانین: زان + ا ـــ زانا
دانان: دانێ + ا ـــ بە تێپچوونی بزوێنی (ێ) دەبێتە دانا

توانین: توان + ا ـــ توانا

بینین: بین + ا ـــ بینا

«بەشێ زانایان، گوتوویانە مێژوو ئەوەیە ڕوو دەدا...»

(هێمن، ل٤٧)

زانا دانایە، دانا، توانایە

(عەلائەدین سەجادی .م.ئە.ك)

ئەم جۆرانە ئاوەڵفرمانی (نە، نا)ی نەرێ (نەفی)یان

دەچێتە سەرو[٢٥] لە ئاوەڵناویان نزیك دەكاتەوەو ڕەوشت و تایبەتیەتی بەكێش هەڵ دەگرن، كەچی لە لایەكی ترەوە پاشگری (١)یەكەیان تێ ئەچێت و ڕێژەیەكی دارڕاوی شێوەی نەرێ لە ڕەگی تێپەڕو تێنەپەڕدا دروست دەكات و لەگەڵ ئاوەڵناوەكەش دا لایەنی بكەریەتی‌یان بەهێزتر دەبێت. لە پاشگرەكانی تر چالاكترە لە دروست كردنی ناوی بكەری دارڕاوداو سیفەتی هەمیشەیی‌پانیش[٢٦] هەیە، وەكو: نەخۆر، نەشۆر، نەكر، نەفرۆش، نەزان، نابینا، نەمر، ناساز (نەساز)، نادیدە (نەدیدە).

ئەم ڕێژەیەی سەرەوە زۆر بەكارو چالاكەو تەنانەت بە یاریدەی پاشگری «دەر»ەوەش دوای گۆڕانی هۆی دەنگسازی ـ لە سەرەتاوە بەسمان كردووە ـ لە ڕەگی چاوگە ناوێزەكانەوە پێك دەهێنرێت.

ب ـ پاشگری (ندە):ـ ئەم پاشگرە دەلكێتە پاشكۆی ڕەگی چەند چاوگێكەوە (ناوی بكەری دارڕاو)و (ئاوەڵناوی بكەری دارڕاو)ی نێوەپێك دەهێنێت و مەبەستی (مەزنی و بەهێزی و زۆری و دەسەلات و توانا) دەگرێتەوە.

وەك:ـ بەخشین: بەخش + ندە ـــ بەخشندە

كوشندە، درندە، زیندە، گازندە، كەشندە.... بەم شێوەیە دەتوانرێ چەند نموونەیەك وەرگرین كە هەمان واتاو مەبەست دەبەخشێ، وەك: كرندە، فرندە، جرندە، برندە)[٢٧] كە لەو وشەسازی كوردیدا بەرچاو بگیرێت كە بەواتای توانای (زۆركرین، زۆرفرین، زۆرجراندن، زۆربرین) دێن.

جـ ـ پاشگری «ۆك»!

ئەم پاشگرە چالاكە لە دروست كردنی (ناوی بكەری دارڕاو.. ئاوەڵناوی بكەری دارڕاو)دا لە ڕەگی چاوگی (تێنەپەڕو، تێپەڕی لە [بەتێپەڕكراویش دا بە (اندن) ] (ئەلفی ـ یائی ـ دالی) (تائی بەكەمی) ئەمانەش دەبنە دوو بەشەوە:

١ ـ لە چاوگی گوێزانەوەوە:

لەم چاوگانەوە ناوی بكەر دروست دەكەن وەكو:

گەڕان: گەڕێ + ۆك ـــ بەتێچوونی (ێ) دەبێتە گەڕۆك

سازان: ساز + ۆك ـــ سازۆك

فڕین: فڕ + ۆك ـــ فڕۆك

خشان: خش (خشێ) + ۆك ـــ خشۆك (بزوێنی ی تێچوە)

بزووتن: بزوو + ۆك ـــ بزۆك (بزوێنی (وو) تێچووە)

٢ ـ لە چاوگی ڕوودانەوە:

لەم جۆرە چاوگانەوە پاشگری (ۆك) ئاوەڵناوی بكەری دارڕاو

پێك دەهێنن، چونكە بكەرەكانیان دیار نی‌یە پاشان سیفەتێكی بەردەوامیان گرتۆتە خۆ. وەكو:

لەرزین: لەرز + ۆك لەرزۆك

دزین: دز + ۆك دزۆك

پسان: پسێ + ۆك پسۆك (بە تێچوونی بزوێنی ی)

برژان: برژێ + ۆك برژۆك (هەمان هۆی سەرەوە)

پاشگری (ۆك) لە ڕووی واتاو مەبەستەوە (سووكی و نزمی دەبەخشێت) ئەم ڕێژەیە لە بە تێپەڕكراوەكانیشەوە، وەكو واتاو دروست بوونیش وەردەگیرێن و لەگەڵ ڕێژەكەدا خۆیان دەگونجێنن، بەڵام بەكارهێنانیان دەگمەنە وەك:

سازاندن: سازێن + ۆك ـــ سازێنۆك

ڕژاندن: ڕژێن + ۆك ـــ ڕژێنۆك

پساندن: پسێن + ۆك ـــ پسێنۆك... هتد

د ـ پاشگری «نۆك» ئەم پاشگرەیەش بە هەمان واتاو مەبەستی «ۆك» دێت و بەڵام (ئاوەڵناوی بكەری دارڕاو) بە هۆیەوە وەردەگیرێت.

وەك: گریەنۆك، ترسنۆك....

منالی گریەنۆك باوك و دایكی وەڕست دەكات.

پاشگری «ەك»:ـ

ئەم پاشگرە لە ڕێژەیەكی تەسك و كەم دا (ناوی بكەری دارڕاو)ی نێوە بەرچاو دەگیرێت و لە ڕوانگای تریش دا بەشدار دەبێ وەك لە (ناوی ئامێر)دا:

ڕووان: ڕوێ + ەك ـــ ڕووەك (بە تێچوونی بزوێنی ێ)

نووسان: نووسێ + ەك ـــ نووسەك (هەمان هۆی سەرەوە)

دزین: دز + ەك ـــ دزەك

نووسەك ڕووەكێكی دركاوی‌یە

هـ ـ پاشگری «ە، ەوار، گار، یەدە»:

ئەم پاشگرەیەش (ناوی بكەری دارڕاو) بە كەمی ڕودەنێن:

پاشگری «ە» لە هەندێ چاوگەوە زۆر بەكەمی ناوی بكەر پێك دەهێنێت:

خواردن: خوارد + ە ـــ خواردە

دیتن: دیت + ە ـــ دیتە (دیدە)

پاشگری (ەوار):-

خوێندن: خوێند + ەوار ـــ خوێندەوار . . . هتد

پاشگری «گار»:

ئەم پاشگرە (پاراستن و ئاگاداری» دەگەیەنێت. وەکو:-

پاراستن: پارێز+ گار ـــ پارێزگار، کردگار. . . هتد

و - «یدە»:- ناوی بکەری دارژاوو ئاوڵناوی بکەری دارژاو لە رەگی چاوگەوە زۆر بەکەمی دروست دەکات ئەم پاشگرە وەکو «وڵ»، «سووکیو نزمیو کەمی» دەبەخشێت:-

گەران: گەری + یدە ـــ گەریدە (بزوێنی (ی) سووك بوتەوە بووە بە (ی) ).

تەرین (تاران): تەری + یدە ـــ تەریدە

گەزین: گەز + یدە ـــ گەزیدە

ناوی بکەری دارژاو شێوەی دروست بوونی تری هەیە. وەك: لە رەگی چاوگی دارژاوی تێـەرەوە بەلاوانی نیشانەی چاوگەکانیو هەندیکیانیش کە ناوێزەن پێشگرو پاشگریش بەشداری تێدادەکەن. بەلام ئاساییەکانیان تەنها بە وەرگرتنی رەگەکانیان رودەنرین وەك:

هەلگرتن: هەلگر، هەلپاچین: هەلپاچ، داپاچ، ئیزان، هەلگیر وەرگیر.

ناوێزەکانیان: ئیخواردن: لیخو + ەر ـــ لیخور (دەنگی ە تیچووە)

داخستن: داخە + ەر ـــ داخەر

تیکردن: تیکە + ەر ـــ تیکەر

تیخستن: تیخە + ەر ـــ تیخەر

لینان: لینی + ەر ـــ لینەر

هەل کردن: هەل کە + ەر ـــ هەلکەر

لیدان: لیدە + ەر ـــ لیدەر

پێشگری «تی» بە واتای «چوونە ناوەوە»و «یی» بە واتای (پێوەلکان و پێوەنووسان) دێت.

## ٢ ـ ناوی بکەری لێکدراو:-

ئەم جۆرانە بریتین لە وشەیەکی واتادارو رەگ و قەدی چاوگی تێپەر ـ بەتێپەرکراویشەوە ـ و تێنەپەرەوە. ئەگەر چی ئەم رەگانە واتاکانیان روون نییە بەلام بنەمای پاراستنی واتای چاوگ و فرمانەکانن و دەبنە هۆی مانەوەی واتاکانیان و دەورێکی چاك و گرنگ و کاریگەر دەبینن لە کێشەی وشەسازی (مۆرفۆلۆجی)دا بەتایبەتی لە پێك هاتنی وشەدا. جا ئەو دەورە بۆ ئەم دەگەرێتەوە نەك بۆ ئەو ناوو وشە واتادارانەی لە گەڵیدان. لەبەرئەوەی رەگی چاوگەکە لە رووی واتاو دروست بوونی وشە تازەکانەوە بەهێزترە بۆیە واتای وشەکەی تەکیەوە پەلەکێش دەکات بۆ واتاو مەبەستی تازە، بەشێوەیەکی لێکدراوی. . .

«لەوانەیە بلێین کەواتە بۆچی پێی دەگوترێت فرمانی «چاوگی» ئاسادە یان بۆچی بۆ فرمانەکەیە نەك بۆ ئەو وشانە؟ لە وەلام دا دەلێین چونکە فرمان چاوگ دەگۆرێتەوەو دەوری ئەو وشانەو واتا تازەکانیان دەخاتە روو و ئەوان وەك خۆیان دەمێنیتەوە هەرچەندە بەبێ ئەوان ئەو واتا تازانە دروست نابن»[٨]

کەواتە ئێستا دەتوانین (ناوی بکەری لێکدراو) وەکو دارژاوەکەی بگەرێنینەوە بۆ چاوگ. سەرەرای ئەوەی کە زمانی کوردی بە هۆی چاوگ و رەگەکانیانەوە ژمارەیەکی بێ ئەندازە وشەو زاراوەی لێوە وەردەگیرێت. بەهۆی «. . . وشەو ئامرازو پێشگرو پاشگرو هی تریشەوە هەر دەچێتە ژێر خانەی دارشتن»[٩]ەوە، ئەگەر چی زمانی کوردی لە زمانە لێکدراوەکانیشە.

ئەمجا ناوی بکەری لێکدراو ئەم جۆرانەی هەیە

أ ـ لە ناوێك و رەگی چاوگ، دوای لابردنی نیشانەی چاوگەکە ناوی بکەری لێکدراو پێك دێت، وەکو: سەرتاشین، پیاوکوشتن: پیاوکوژ (دەنگی (ش) گۆراوە بە (ژ))، جل شۆرین: جل شۆر، دارفرۆشتن: دارفرۆش،

دانساز، چەخماخ ساز، زنجیرپسێن، ئەش مرین. . . بەم پێیە ئەم ناوە بکەرانەش وەردەگیرین: کوتاڵ فرۆش، دارتاش، کارێزکەن، ماسیگر، کاکێش، کوڵ هەلگر (لە وشەیەکی واتادارو رەگی دارژاو پێك هاتووە) رەنج کێش، رەنجدەر، بلوێرژەن، خوێنمژ، موچە خۆر، نانکەر، کوتان فرۆش، ئارام گر، جغارەکێش، قژهەلپاچ، نیشتمان فرۆش، بزن مژ، نان کر، نان خۆر. . .

ب ـ ناوی بکەری لێکدراو لە ناوێك و قەدی چاوگی تێنەپەرو تێپەر بەهۆی پاشگری (و، وو) یا تەنها ناوێك و قەدەکەیان بەمەرجێك ناوەکەی پێشیان دەوری بەرکاری وەرگرتبێت تا ببنە ناوی بکەر.[١٠] ئەم ریژەیە خۆی لە خۆیدا دەبێتە ناوەڵناو بەشێوەی لێکدراوی بێ بەکارهێنان، چونکە پێکهاتنێکی وەسفیی هەیە:

کوێست کەوتن: کوێست کەوت + وو ـــ کوێست کەوتوو باوك مردوو، دڵ رەنجاو، جل سووتاو، بارکردوو، سەرکەوتوو ماڵ بردوو، پەرۆسووتاو، مناڵ خنکاو، نێچیرکوشتو، پەرۆ سووتاندوو، دۆکولیو (دۆکولاو)، پەك گرتوو، ماڵ شێواو.

جـ ـ هەموو چاوگێکی تێپەر بێجگە لەوانەی کە بە (اندن) دەکرێن بەتێپەر دوو ریژەی ناوی بکەری لێکدراویان هەیە.[١١] یەکەمیان لە

ـتــەیەکی واتادارو ڕەگەکەی پێك دێ. دووەمیان لە هەمان وشەی
واتادارو ڕێژەی ناوی بکەری دارژاو ـ واتە قەدی چاوگ و پاشگری
«وو»، وەك :ـ

نانبەر ـــ نان بردوو
گۆشت خۆر ـــ گۆشت خواردوو
ئاورژێن ـــ ئاورژاندوو
جل درێن ـــ جل دڕاندوو
جل شۆر ـــ جل شۆردوو
هەواڵ نێر ـــ هەواڵ ناردوو

د ـ ئاوەڵفرمـانی شوێنی بەتـایبەتی «لا، بەر» لە دروست کردنی ناوی بکـەری لێکـدراودا بەکـارە لەگـەڵ ڕەگی چاوگی تێپـەردا. دەگمـەنیشە، لەگەڵ تێنەپەردا، بەکارهێنانیان کەمە:

لاگــرتن: لا + گر ـــ لاگـر، لابـڕ، لادڕ، لادەر، لاخـۆر، لابـەر، لاکـوت، لامـژ، لابین، بەرگـر، بەرهـەڵـست، بنگر، بەرچن، لاچن، بەرچین، بەرکێش، بەرمژ. . . .

ئەم ڕێژەیەی ناوی بکەر دەچێتەوە ژێر (ناوی بکەری لێکدراو) بەڵام بەجیا باس کردنی لەبـەر ئەوەیـە، چونکـە تایبـەتە بە ئاوڵفرمان و ڕەگی چاوگ و تێکەڵیش دەبن لەگەڵ (ناوی بەرکار)دا بەتایبەتی (بەر)[٣٣] ئەگەر لەگەڵ فرمانـەکـەدا، ڕوویـان یەك بێت، ئەگەریش دژی ڕووەکەی بێت (دژی ئتجاهی) ئەوا ناوی بکەرە.

ئەنـدامانی لەشی مرۆڤ و ڕەنگەکان و ئاوەڵناو لە کوردیدا (گوێ)ی لێ دەربچێت لەگـەڵ ڕەگی چاوگ وچەنـد قەدێـك دا ئاوەڵنـاوی بکەری لێکدراو پێك دەهێنن، بەڵام لەگەڵ (گوێ)دا ناوی بکەرە

## تایبەتی‌یەکانی ناوی بکەر

ناوی بکــەر چەنــد تایبــەتی‌یــەکــەی هەیــەو بۆمەبــەست و واتــای‌تـر بەکاردەهێنرێ، وەکو:

١ ـ ناوی بکــەر کە لە چاوگــەوە وەردەگـیــرێ، وەکــو چاوگ بەنــاو بەکــاردێـت و واتــای کرداری (پــرۆسـیس ـ عـمـلیــة) چاوگــەکــەی هەڵ دەگرێت و وەکو ئەویش بەپێچەوانەی فرمانەکەوە کەس و کاتیان تێدا بەدی ناکـرێت واتــە « . . ئەم سیغەیەش کەسدار نی‌یە، یەعنی ناتوانێ لە پێشەوە یەکێ لە بۆناوە کەسیەکان کە ئەبنە باسلێکراو (فاعل) وەرگرێ . . . ».

٢ ـ دەبنــە زاراوەو ئیــدیــدەم و [٣٥] خوازمو هەروەهــا هەنــدێ ڕیـژەی بەتایبەتی ئەوانەی لێکدراون و لە ناوێك و ڕەگی چاوگی یا ڕەگ و پاشگری (ۆك) پێکهاتوون) دەبنە ناوی ئامێریش،

وەکو: نووسەر، داهێنەر، لێکۆڵیار، تێکۆشەر، ڕێگر، مەلابەزین قنگ لێ کەوتـوو، دڵبەر، گێرەشێوێن، دووربین، لێکولەوەر، پێوەر، پرۆك لادەر، گەڕۆك، پێ‌بڕ، بەستۆك، دەسکێش، دووربین.

٣ ـ ناوی بکــەر پیـشــەو کارو تایبــەتێتی یەکێــك یا خاوەنــەکــەی دەگەیەنێت و بەپێی ڕەسەنایەتی[٣٦] ناوی بکەر ئەم بەشانەی لێ دەبێتەوە:

أ ـ ناوی بکـەر بۆ پێشـەی نێـر: دارتاش، ئاسنگەر، ئاودێر، کاکێش، سەرتــاش، کارێــز کەن، ماسی‌گــر، نانبـەر، قازان پاکـەر، سەربـاز، ڕاوکەر. . . گا دەبم بە نۆکەرو ، گا دەبم بە شوانە

(تحفه مظفریه، ل٢٩٣)

ب ـ ناوی بکـەری پیشەی مێ: تێلەکێش، مەلۆنێر، نانکەر، جلشۆر شیردۆش، مانگادۆش تەشی‌ڕێس، کارکەر.

جـ ـ ناوی بکــەر بۆ پیشــەی دوولایــەن: نووســەر، پارێـزەر، ڕابـەر، کۆڵکێش، کۆڵ هە ڵگر، چێشت کەر، سوالکەر، دەرۆزەکەرە، دارکەر.

٤ ـ ناوی بکـەر لەم چەنـد ساڵانەی دوایی‌یەدا بە زۆری و بەفراوانی بۆ ناوی تایبــەتی کەس بەکــارهێنــراوە. وەك: دانا، زانا، توانا، هەڵکەوت، سەرکەوت، ڕێبین، ڕابەر، ڕێبەر، سەربەست، . . هتد کە لە چاوگەوە وەرگیراون.

٥ ـ ناوی بکـەر لەڕووی بەکــارهێنــانــەوە: ناوی بکــەر وەکــو ناویش و ئاوەڵناویش لە ئاخاوتن و نووسین دا بەکاردێت، وەکو ناو ئەرك و تایبەتیەتی یەکــانی ناو لە ڕووی دەوریــوە لەڕستــەدا دەبینێ ـ واتە نیشانەی تاك و کۆو نیشانەی ناسراوو نەناسراو وەردەگرێت، وەك :ـ

پڕ لە دانیشتووی ناوخۆ
لە دڵشادو ڕەنجەڕۆ

(ع. ح. ب، ل٣٢)

«دانیشتووەکان هەموو چاو زیت ئەکەنەوە. . . »

(سەجادی، کوردەواری، ل٣٤٣)

هێزی لاو یەك بگرێ بۆ ئاشتی دنیا
شەرفرۆش مەگەر قوڕ بکا بە سەریا

(دیوانی گۆران، ل٥٢٢)

وەکـو ئاوەڵنـاویش بەکـاردەهێنـرێت ئەگـەر ببێتـە تەواوکـەری ناوی یا ڕاناوێك و سفەتیان هەڵبدات[٣٧] وەك :ـ

میوەی گەیشتووی زەردو سوری باخ
جریوەو جووکەی دارستانی شاخ

(گۆران، ل٩)

هەزاران کاوەی زەحمەتکێش
پاڵ پێوەی بنێ بەرەو پێش

(هێمن، ل١٦٠)

پیاوی زاناو خوێندەوار وشیار تێ گەیشتوشیان
دەنێودا هەبوون»

(قەلای دمدم، ل٣٥)

سوپای نووستوو ئەشکێنن
تۆڵەیان لێ ئەستێنن

(ع.ح.ب. ل٨١)

دڵ شاهینی دیدە بازە مەستی شەرابی نازە
دڵ دارو دڵ نەوازە، دڵ کێش و دڵ فرێنە

(نالی، ل، ٣٩٦)

٦ ـ ناوی بکەر پاشگری «ی» واتای (ئەبستراکتی ـ Abusract) وەرئەگرێ و لە مەبەست و واتای پێشووی دوورئەکەوێتەوە، دەبێتە ناوی واتایی
وەك: میللەت فرۆشی، خوێنمژی، سەربەستی، نیشتمان فرۆشی، ئاسنگەری: [38]

سەری راهاتووی، تاجی سەربەستی
کەی ئەنەوێ بۆ زیندان پەرستی

(دیوانی گۆران، ل١٨٧)

ئەگەر میللەت نەکا میللەت فرۆشی
لە خۆی نابینێ زالم خێرو خۆشی

(نالەی جودایی، ل٦٩)

٧ ـ بە هۆی پاشگری «ە»وە دەبێتە ناوی فەرهەنگی وەکو: ئەسپێ کوژە، دۆشاومژە.

## پەراوێز:

---

١ ـ بڕوانە: ـ أ ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، ناو، بەغدا، ١٩٧٩، ل١٠٦، دەڵێ: «لە زمانی کوردیدا بۆ ڕۆنانی ناو چەند ڕێگایەك هەیە. ئەوەی لە ناویان دا سەرەکی بێ (دارشتن) و (لێکدان)»».

ب ـ د. کامیل بەسیر، زاراوەی کوردی، زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩، ل٦٢، دەڵێ: «زمانی کوردی... زمانێکی (لەصقی) واتە بەیەکانووساوە...» لەم ڕووەوە دکتۆر ئەوەی ڕاگەیاندووە کە بە هۆی لێکدانەوە وشەیەکی زۆر لە زمانەکەدا پێك دێت.

٢ ـ أ ـ بڕوانە بیرورای قوتابخانە زمانەوانە بەسراوی‌یەکان کە بەلایانەوە، چاوگ بنەرەتە، نەك فرمان. چونکە چاوگ سەرچاوەی وەرگرتنی فرمانە، نەك فرمان بنەرەت و سەرچاوە بێت. لەم ڕووەوە دەڵێن «چاوگ جیاوازە لە فرمان، چونکە وەکو ناو وایەو کاتی تێدانی‌یە. بەڵام واتای ڕوودان و کرداری وەك فرمان تێدایە. لەم بارەیەوە، بڕوانە: د. عبدە‌الراجحی، التطبیق الصرفی، بیروت، ١٩٥٧، ص٦٦.

ب ـ سەعید صدقی، مختصر صرف ونحوی کوردی، بەغدا، ١٩٨٢، ل١٧.

جـ ـ نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، سلێمانی، ١٩٦٠، ل١٢٧ کە ئەم بابەتانەی سەرەوەیان لە چاوگەوە وەرگرتووە نەك فرمان.

٣ ـ بڕوانە: کوردۆییف، ڕێزمانی کوردی، وەرگێرانی لە ڕووسی‌یەوە. د. کوردستان موکریانی، هەولێر، ١٩٨٤، ل٢١٤.

٤ ـ سەعید صدقی، مختصر صرف و نحوی کوردی، ل١٩.

٥ ـ بڕوانە: د. وریا عومەر ئەمین، تینەپەر فرمانێکی بکەر نادیارە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١٠٧، بەغدا ١٩٨٥، ل١٩٧.

٦ ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕی زانیاری کورد، ل٢٤٦.

٧ ـ نووری عەلی ئەمین یەکەم ڕێزمان نووسە کە پاشگری «ەر»ی بەسەربەخۆیی بەکارهێناوە. بڕوانە کتێبی ڕێزمانی کوردی، ل٣٦.

٨ ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی «ناو»، ل١٠٦.

٩ ـ نیشانەی چاوگ مەبەست لە نوونی چاوگەکەو پیتەکەی پێشی‌یەتی

١٠ ـ بڕوانە ڕای مەسعوود محەمەد: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی زمان و زانستەکانی، ل٨٤.

١١ ـ (بەر) بە واتای لەش، بەواتای نزمایی، بە واتای بەری میوە، بەواتای لایەك بۆ جێگە وەکو (ئەم بەری دارەکە)... هتد، هەروەها (دەر)یش بە واتای تر دێت وەکو دەروازەو دەرەوە.... هتد.

١٢ ـ بڕوانە: محەمەد ئەحمەد سەعید، چەند سەرنجێکی زمانەوانی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ٩٣، بەغدا، ١٩٨٢، ل٤١، ٤٢.

١٣ ـ لەبەر لەیەکچوون و پێویستی باسەکە ئەم بەشە لێکدراوەی (ناوی بکەر)مان بە هۆی (ەر)ەوە پێش خست و لەگەڵ دارژاوەکەیدا لە پێکهاتن دا لەیەکتر دەکەن.

١٤ ـ بڕوانە: جگەرخوێن، ئاوا ئو دەستوورا زمانێ کوردی، ل بەغدا، ١٩٦١، ل٤٨.

١٥ ـ فاضل عمر، نێڤگر دزمانێ کوردیدا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١٠٩، ل٢٧٤.

١٦ ـ گیوی موکریانی، ئەلف و بێی کوردی وێنەدار بە تیپی لاتینی، چاپخانەی کوردستان، هەولێر، ١٩٧٢، ل١٣٩

١٧ ـ مەسعوود محەمەد لە بارەی «ەر»ەوە دەڵێ: «.... لەلای نووسەرانەوە بەکارهێنران بە قیاس لە (نان دەر، ئیش کەر...) بڕوانە زاراوەسازی پێوانە، ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١١١، ١٩٨٦، ل٢٦٥.

١٨ ـ زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، چاپی حەوتەم، هەولێر، ١٩٨٢، ل٣٢.

١٩ ـ بڕوانە: محەمەد مستەفا کوردی، ئەبوبەکر جەلال، مستەفا صالح کەریم، عەبدوڵڵا میدیا، زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، بەغدا، ١٩٧٢، ل٢١.

٢٠ ـ محەمەد ئەحمەد سەعید، چەند سەرنجێکی زمانەوانی، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ٩٣، ل٤١ ـ ٤٢.

٢١ ـ بڕوانە عبدالرحمن ئەمین زەبیحی، قامووسی زمانی کوردی پیتی ب، بەرگی دووەم، ١٩٧٩، ل٧.

٢٢ ـ أ: (یار) چەند واتایەك دەبەخشێت، وەکو پاشگر بە واتای «هاوڕێیەتی و لەگەڵ بوون» دێت، بۆ نموونە: (کڕیار، هۆشیار، هەستیار. . . .» ئەوەی پەڕەی (کڕین)و (هۆش)و (هەستی)ی لەگەڵ دایە، تەنانەت ئەم پاشگرە لە (کڕیار)و (فرۆشیار)یش دا هەر هەمان واتای هەیە، چونکە کڕیارێك ئەگەر پارەو هێزی کڕینی پێ نەبێت کرداری کڕینی بۆ جێبەجێ ناکرێت و (فرۆشیار)یش ئەگەر شت و مەکی فرۆشتنی پێ نەبێت و لەگەڵی دا نەبێت ئەو دیسان کرداری فرۆشتن دروست نابێت. هەروەها وەك وشەیەك دۆست و خۆشەویست دەگەیەنێت بە وێنە: یارێکم هەیە ئەڵێی بووکە جوانی شاری کەرکووکە. . . . زۆر باوەو کورد دەڵێت: خوا یار بێ ئەو کارە دەکەم.

ب ـ بۆ ئەوەی کە «یار» وەکو پاشگرێك دەچێتە سەر ڕەگی فرمان نەك قەدی چاوگ، بڕوانە: (أ) زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپی دووەم، بەغدا، ل٣٦.

(ب) زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی بەغدا، ١٩٨٢، ل٢٧.

(جـ) د. کامیل بەسیر ڕای وابوو کە (یار) بە واتای «هاو دەمێکی زۆر خۆشەویست هاتووە» وەکو پاشگرێك بۆ بکەری و هاوڕێیەتی دێت. زاراوەی کوردی، ل١٤١.

٢٣ ـ جەمال نەبەز، زمانی یەك گرتووی کوردی، بامبێرگ، ١٩٧٦، ل٥٧.

٢٤ ـ بڕوانە: نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، ل١٥٣.

٢٥ ـ مامۆستایان نووری عەلی ئەمین و مەسعوود محەمەد کوردۆییف تەنها هێمایان بۆ چوونەسەری «نە»ی نەرێ کردووە، کەچی «نا»ش بەکاردێت و باویشە. بڕوانە:

أ ـ نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، ١٩٦٠، ل١١٣.

ب ـ مەسعوود محەمەد، «ڕۆشنبیری نوێ»، ژمارە ١١١، بەغدا، ١٩٨٦، ل٢٣٤.

جـ ـ ك کوردۆییف، ڕێزمانی کوردی، ل١٠٩.

٢٦ ـ ئەم ڕێژەیە لە قەدی چاوگی تێپەڕو تێپەڕەوە دروست دەبێت، بەڵام ئاوەڵناون وەکو ئاوەڵناوی ئاسایی، نموونە: نەهات، نەبیست، نەبو (نەبو). . . . بە بۆچوونی من ئەوانەی لە تێپەڕەوەن کورت کراوەی ڕێژەی ناوی بکەری ئاساییین وەکو: (هاتوو) بۆتە (نەهاتووە، نەهات. . .) بڕوانە: کوردۆییف سەرچاوەی پێشوو، هەمان لاپەڕە.

٢٧ ـ بڕوانە: زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، ل٣٦.

٢٨ ـ لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆڕ لە ل (٢٤٧)ی (ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی)دا ئەم ڕێژەیەی بە ئاوەڵناو دەبات، بەڵام ڕاستی یەکەی ناوی بکەری داڕژاوە، بەتایبەتی (ڕووەك) کە ناوی داڕژاوەو گومانی ئەسەر نی یە نابێتە ئاوەڵناوی بکەری داڕژاو.

٢٩ ـ بڕوانە: د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی، ل١٢٩.

**٣٠ ـ (عبدالرزاق بیمار)، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١١١، بەغدا، ١٩٨٦، ل٢٩٤.**

**٣١ ـ بڕوانە: ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل٢٥٤.**

**٣٢ ـ بڕوانە: مەسعوود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، ل ٤٧ ـ ٤٨**

**٣٣ ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی، ل٢٥٦.**

**٣٤ ـ بڕوانە: أ ـ توفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، ل٢٦.**

**ب ـ زمان و ئەدەبی کوردی، بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپی دووەم، ل٢٠.**

**٣٥ ـ بڕوانە: ئیبراهیم ئەمین باڵدار، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٢، ١٩٨٦، ل٢١٢. ئەم جۆرە ڕێژانەی (ناوی بکەر)ی بەزاراوە داناوە کە لەڕاستی دا هەرواشە. هەروەها محەمەد مەعروف فەتاح بۆ ئەوەچووە کەهەندێك ناوی بکەری دەبنە ئیدیەم. لێرەدا لەوەی سەرەوە زیاتری لەسەر ناڕۆین، چونکە بابەتەکە پێوەندە بە واتا ناسێوە (سیمانتیك Symantic)، کە هەریەکەیان دووزانستی سەربەخۆن و لە یەکتر جیاوازن، بەڵام بە پێی پێوەندی بە باسەکەمانەوە ئاورمان لێدایەوە بڕوانە محەمەد مەعروف فەتاح دیسان ئیدیەم لە گۆڤاری کۆڕی زانیاری عێراق، ژ ١٥، بەغدا، ١٩٨٦ ل٩٤ ـ ٩٥.**

**٣٦ ـ بڕوانە: أ ـ ك. ك کوردۆییف، ڕێزمانی کوردی وەرگێڕانی د. کوردستان موکریانی، ل ٧٢، کە ناوی پیشەی تەنها بە یەك خاڵ باس کردووەو جیایانی نەکردۆتەوە.**

**ب ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٨ ـ ١٦٩ ناوی پیشەیی بە پێی نێرو مێ و دوولایەن جیاکردۆتەوە، بەڵام بێ ئەوەی دەست نیشانی ناوی بکەری لەگەڵ دا بکات.**

**٣٧ ـ بڕوانە: أ ـ نووری عەلی ئەمین، ڕێزمانی کوردی، ل١٣١.**

**ب ـ زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، ل٣٢.**

**٣٨ ـ بڕوانە: د. فاروق عومەر سدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، لە**

ب٢ ، ب٣ «گۆڤاری کۆری زانیاری کورد» دەرهێنراوە، بەغدا، ١٩٧٥ ، ل٥٠٥ . لەم ڕێژە ناوە ئەبستراکتی یە دواوە، بۆ ئەوەی ناوی بکەر بهێنێ ، بەڵام نموونەکانی زۆری ناوی بکەرو پیشەو کاردەگەیەنن و دەبوایە هێمای ئەوەی بکردایە کە ئەم ناوە ئەبستراکی یانە لە ناوی بکەرەوە وەرگیراون .

«سەرچاوەکان»


١ ـ ئەحمەد حەسەن ئەحمەد، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، چاپخانەی دار الجاحظ، بەغدا، ١٩٧٦ .

٢ ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، زمانی کوردی لە بەر ڕۆشنایی فۆنەتیك دا، چاپخانەی کۆری زانیاری کوردی، بەغدا، ١٩٧٦ .

٣ ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، وشەرۆنان لە زمانی کوردیدا، چاپخانەی کۆری زانیاری کوردی، بەغدا، ١٩٧٧ .

٤ ـ د. ئەورەحمانی حاجی مارف، ڕێزمانی کوردی، بەرگی یەکەم، بەشی یەکەم، «ناو»، چاپخانەی کۆری زانیاری کوردی، بەغدا، ١٩٧٩ .

٥ ـ ئیبراهیم ئەمین باڵدار، زاراوەو زمان لە کاروانی زانیاری ئەمرۆدا، ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١١٢، ١٩٨٦ .

٦ ـ بەهزاد، چاوگی کوێرەوە بوو لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری «بەیان»، ژ٢ بەغدا، ١٩٧٢ .

٧ ـ تۆفیق وەهبی، دەستووری زمانی کوردی، جزئی یەکەم، چاپخانەی دار الطباعة الحدیثة، بەغدا، ١٩٢٩ .

٨ ـ جگەرخوێن، ئاوا ئو دەستوورا زمانی کوردی، چاپخانەی صلاح الدین، بەغدا، ١٩٦١ .

٩ ـ ڕێزمانی ئاخاوتنی کوردی بەپێی لێکۆڵینەوەی لیژنەی زمان و زانستەکانی کۆری زانیاری کورد، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٦ .

١٠ ـ سەعید صدقی، مختصر صرف و نحوی کوردی، چاپخانەی نجاح، بەغدا ١٩٢٨ .

١١ ـ صالح حوسێن پشدەری، کورتەیەك لە ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی بەغدا، ١٩٨٥ .

١٢ ـ زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی پێنجەمی ئامادەیی، چاپی حەوتەم، هەولێر، ١٩٨٢ .

١٣ ـ عبدالرزاق بیمار، زاراوەکانی ناو کتێبانی قوتابخانە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١١)، بەغدا، ١٩٨٦ .

١٤ ـ عەبدولڕەحمان ئەمین زەبیحی، قاموسی زمانی کوردی، بەرگی دووەم «ب» بەغدا، ١٩٧٩ .

١٥ ـ عەبدوڵڵا شاڵی، ناوی بکەر لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری پەروەردەو زانست، ژ (١٥)، بەغدا، ١٩٧٩ .

١٦ ـ فازڵ عومەر، نێڤگر دزمانێ کوردیدا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٩)، بەغدا، ١٩٨٦ .

١٧ ـ فاروق عومەر صدیق، وشەسازی لە زمانی کوردیدا، لە ب٢ ب٣، گۆڤاری کۆری زانیاری کورد دەرهێنراوە، بەغدا، ١٩٧٥ .

١٨ ـ د. کامیل حەسەن بەسیر، پێناسینی زاراوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ(١١١)، بەغدا، ١٩٨٦ .

١٩ ـ د. کامیل حەسەن بەسیر، زاراوەی کوردی لێکۆڵینەوەو هەڵسەنگاندن چاپخانەی زانکۆی سلێمانی، ١٩٧٩ .

٢٠ ـ د. کامیل حەسەن بەسیر، زانستی ئاوەڵواتا، چاپخانەی کۆری زانیاری عێراق، بەغدا، ١٩٨١ .

٢١ ـ ك. ك کوردۆیێف، ڕێزمانی کوردی بە کەرەستەی دیالێکتی کرمانجی و سۆرانی، د. کوردستان موکریانی لە زمانی ڕووسی یەوە وەری گێراوەتە سەر زمانی کوردی، هەولێر، ١٩٨٤ .

٢٢ ـ د. کەمال فوئاد، موحازەرەکانی ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی دووەمی بەشی کوردی کۆلێجی ئاداب، زانکۆی سلێمانی، ساڵی خوێندنی ١٩٧٢ / ١٩٧٣ بە ناوی «وەرگێراوەکانی فرمان مشتقات الافعال» لە ڕۆژانی ٥/٧، ١٦/٥/١٩٧٣ .

٢٣ ـ محەمەد ئەمین هەورامانی، سەرەتایەك لە فیلۆلۆژی زمانی کوردی، بەغدا، ١٩٧٣ .

٢٤ ـ محەمەد ئەمین هەورامانی، زاری زمانی کوردی لە ترازووی بەراورددا، بەغدا، ١٩٨١ .

٢٥ ـ مەسعود محەمەد، چەند حەشارگەیەکی ڕێزمانی کوردی، چاپخانەی کۆری زانیاری کورد، بەغداد، ١٩٧٦ .

٢٦ ـ مەسعود محەمەد، زاراوەسازی پێوانە، ڕۆشنبیری نوێ، ژ ١١١، بەغدا، ١٩٨٦ .

٢٧ ـ مەسعود محەمەد، زاراوەی پێوانە، بەشی دووەم، ناوی دارێژراوە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١٢)، بەغدا، ل١٩٨٦ .

٢٨ ـ مەسعود محەمەد، (کۆری زانیاری کورد) چۆن ئەم ناوەی وەرگرت؟ گۆڤاری زانیاری، ژ (٤)، بەغدا، ١٩٧١ .

٢٩ ـ محەمەد ئەحمەد سەعید، چەند سەرنجێکی زمانەوانی دەربارەی کتێبی ڕێزمانی کوردی، د. ئەورەحمان، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (٩٣)، بەغدا، ١٩٨٢ .

٣٠ ـ زمان و ئەدەبی کوردی بۆ پۆلی سێیەمی ناوەندی، چاپی دووەم، بەغدا، ١٩٧٢ .

٣١ ـ محەمەد مەعروف فەتاح، دیسان ئیدیەم پێداچوونەوەیەك لەبەر ڕۆشنایی زمانەوانیدا، لە ب١١ی گۆڤاری کۆری زانیاری عێراق دەستەی کورد، بەغدا، ١٩٨٦ .

٣٢ ـ د. نەسرین فەخری و د. کوردستان موکریانی، ڕێزمانی کوردی بۆ پۆلی یەکەمی بەشی زمانی کوردی، زانکۆی سەلاحەدین ١٩٨٢.
٣٣ ـ نووری عەلی ئەمین، ڕێـزمـانی کوردی، چاپخـانـەی کامـەران، سـلێمانی، ١٩٦٠.
٣٤ ـ نووری عەلی ئەمین، دەوری پیتە بزوێنی (ە) لە زمانی کوردیدا، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١١١)، بەغدا، ١٩٨٦.
٣٥ ـ د. وریـا عومـەر ئەمین، تێـنەپـەر فرمـانێکی بکـەر نادیارە، گۆڤاری ڕۆشنبیری نوێ، ژ (١٠٧)، بەغدا، ١٩٨٥.
٣٦ ـ د. وریـا عومـەر ئەمین، مردنی وشـە، گۆڤاری کاروان، ژ (٤٥)، هەولێر، ١٩٨٦.
٣٧ ـ الاستـاذ الشيـخ احمـد الحملاوى، شذا العرف في فن الصرف، مطبعة دار الكتب المصرية، ١٩٧٢.
٣٨ ـ الـدكتـور عبـده الـراجحى، التطبيق الصرفي، دار النهضة العربية للطباعة والنشر، بيروت، ١٩٧٩.
٣٩ ـ محمـد التقى الحسين الجـلالي، نزهـة الطرف في علم الصرف، مطبعة دار النـعمان ـ النجف، ١٩٧٧.

## ملخص البحث

# أسم الفاعل

رفيق محمد الشواني

اسم الفـاعـل بأعتبـاره نوعـاً من انـواع الأسمـاء المشتقـة من المصـدر والأسم من حيث الاشتقـاق ووجـوده في اللغـة الكـردية نوعان هما:

الأسمـاء المشتقـة والاسمـاء غير المشتقة، يتناول الباحث في هذا المقـال الاسم الفـاعـل المشتق من المصـدر، لأن المصـدر برأيي هو الأصـل والأسـاس لأشتقاق وصياغة وتكوين الكلمات في اللغـة وليس الفعـل، لأن الفعـل نفسـه في اللغـة يشتق جذره من المصـدر وبعـد اضـافـة السـوابق واللواحق والضمـائـر الشخصية المتصلة يقـوم بدور الفعـل وحينـذاك يحتسب ككلمـة ذات معنى ويصـرف للأزمنـه المختلفـة وخاصة الى صيغة المضارع والامر.

هناك أسماء وكلمات غير قليلة تشتق من المصدر الا أن بحثنا هذا فقط يتناول اسم الفاعل ويعتبر من المواضيع الحيوية والمهمة غير المبحـوثـة بصـورة مفصلة تستحقـه كتسليـط الأضواء على جميع جوانبـه وقـد حاولت قدر الأمكـان وبعد جهد جهيد أن أبحث هذا الموضوع من حيث صياغة تعريف شامل له وصياغة قواعد ودساتير اشتقـاقـه من المصـدر مبينـاً الطـرق المختلفة لتكوينه مستنداً الى الأمثلة الحيـة في لغتنـا القـوميـة الكـرديـة مع اظهـار الخصـائص واستعمـالاته المختلفة والتفرعات التي يتفرع منها كأستعماله مثل الاسم والصفة والمصطلح في اللغة الكردية مع كشف وبيان معنى الزيادات التي تسبقه وتلحقة كالسابقة واللاحقة أي المعنى المراد لهما.

# چەند سەرنجێك دەربارەی نامیلكەی (زاراوەی كوردی زانستەكان)ی كۆڕی زانیاری عیراق دەستەی كورد

جمال عبدول ـ

**پێشەكی :**

لەم رۆژانـەدا دەستـەی كوردی كۆڕی زانیـاری عیـراق نامیلكەیەكی بەونـاوەی سـەرەوەوە بڵاوكـردەوە، هەرچـەنـدە ئەمـە یەكـەم جار نی‌یـەو لەمـەوبـەریش چەنـد جارێـك لیستـەو نامیلكـەی تایبـەتی‌یان دەربارەی زاراوەی زانستی‌و گشتی‌و هەمـەبـابەت بڵاوكردوتەوەو دەست خۆشانەی ئەوێ، بەڵام وادیـارە نیـازیـان وایـە زانستـە زاراوەی هەربـابـەتە بەجیا بڵاوبكـەنـەوە، كە لەراستی‌دا كارێكی پەسـەنـدەو بەهیـوام درێـژەی پێ‌بدەن و هەر بەم پێودانگە نامیلكەی تایبەتی بۆ هەموو بابەتەكانی تریش بڵاوبكـەنەوە، جا لەبەر گرنگی‌و پایەی زانستی ئەو دەزگا رۆشنبیری‌یەو كاریگـەریی بیـروراو بۆچـوون و بڕیـارەكـانیان و بایەخ و پەیوەندی ئەو لایـەنە گرنگەش بەهەموو بوارێكی رۆشـنبیری گەلەكەمانەوە بە ئەركێكی سەرشـانم زانی بەپێی بیـروڕاو بۆچوونی خۆم ئەم چەند باری سەرنجەم بخـەمـەڕوو بەڵكـو سوودێكی (هـەرچـەندێك كەمیش بێت) ئەم لایەنە گرنگەی تێدابێت و بەشداری‌یەكی شوان و هەڵەكۆكانەش بێت هەر ئاسـوودەم.

**لاپەڕە (٣) :**

(١) گوڕسەندن تعجیل Acceleration

* گوڕ: هێزوتەوژم دەگرێتەوە بۆیە (تاودان) گونجاوترە

(٢) رەها مطلق Absolute

* (رەهـــا) واتـە (رایی)، (رایی)ش شتێكـە خرابێتـەڕێ، (رایی بـوون) نەمـــانی بەرهـــەڵـست وكەوتنـــەڕێ شت، (رایی كـــردن) خستنـــەڕێ‌و رەوانـەكـردنی شتێـك بۆشوێنێك (بڕوانە لاپەڕە/ ١٧٨ی جزمی دووەمی فەرهـەنگی خاڵ)، بۆیـە (پـەتی) بۆ(مطلق) گونجـاوتـرە بەتایبەتی كە بۆ مەبـەستی سادەیی‌و ناتێكـەڵی‌و خاوێنی ماددەیـەك بەكـار بهێنـرێت وەك (الكحـول المطلق) ئەلكهـولی پەتی، الایثر المطلق) ئیثەری پەتی پڕ بە پڕی مانـــاكـــەیـــەتی، یان كە دەڵێت بەكـــوردی پەتی دەنـــووسێت یان دەدوێت. . . هتـد، كە. واتـە هەربەوپێ‌یـە سێ‌یەم زاراوە (سفری رەها) دەبێتە (سفری پەتی).

(٣) پەتی مجرد Abstract

* بۆجیاكردنەوەی لە (Absolute) (رووت) بۆ مجرد بەكاربهێنرێت باشترە.

(٤) نیشانەی كۆیەكی ـ دالة جمعیة ـ Additive Function

* كۆنما باشترە لەكیمیاش دا بارنما بۆ(دالة الحالة) بەكارهێنراوە كە مانای بار پیشـانـدەر یان بارنـوێنـەر دەبـەخشێت، (نمـا) لەكـوردی‌دا پیشاندەر دەبەخشێت وەك (جیهان نما)، قیبلەنما. . هتد.

(٥) گۆشەهاوتەكەكان ـ زوایا متبادلة Adjacent Angles

* جاری مانـا عەرەبی‌یـەكـەی (زاویتان متجاورتان) یان (زاویا متجاورة) دەگرێتەوە، ئەوكاتەش رەنگە (گۆشە هاوسێكان) گونجاوتربێ.

(٦) جەبری‌پرسە ـ جبرالقضایا ـ Algebra of Proposition

* (پـرسـە) لەكـوردی‌دا مانای (تەعزی‌یە)ش دەگرێتەوە، بۆیە باشتروایە

ـبي (جەبری وادانان) یان (جەبری گریمان)، چونکە (جبر لامتر ص)یش دەگریتەوە

(۷) گوشە ناوبرەکان      زوایا متبادلة      Alternate Angles

* (گوشە بەرودواکان) باشترە (بروانە لاپەرە/ ۱۲ی فەرهەنگی توفیق وەهبی - ئەدمونس)

(۸) بری نورەکار - زمرة متناوبة - Alternating group

* (کومەلەی بەرودوا) راست ترەو، (بر) کمیة، مقدار دەگریتەوە نەك زمرەو مجموعة یان (گروی بەرودوا)ش هەرراستە.

(۹) بەرزایی - ارتفاع - Altitude

* (بەرزی) کورت ترو رەوانترە لەسەرزمان و بەزوریش هەر بەرزی بەکاردەهینریت.

(۱۰) چەندایەتی، «تەپاپ» - مقدار - Amount

* (بر، هیند) راست ترو کورت تریشە

(۱۱) هاویەکی - مماثلة، مضاهاة - Analogy

* (چونیەکی)، (هاوشیوە) راست ترەو (هاویەکی) هیچ مانایەکیش نابەخشیت، چونکە (هاو) پیشگریکە بە مانای پیکەوە، یەکسان، بەکاردەهینریت، وەك هاوری، هاوتەمەن، هاوزمان، هاوولات، هاوجور، هاوسەر، هاوچەك، هاودەنگ، هاوباوەر، هاوپەیمان، هاوشان... هتد (بروانە لاپەرە ۵۹ی فەرهەنگی توفیق وەهبی - ئەدمونس)

(۱۲) شیکارەکی - تحلیلیة Analytical

* (شیکاری) کورت ترو گونجاوترە.

(۱۳) ئەندازەی شیکارەکی الهندسة التحلیلیة Analytical Geometry

* (ئەندازەی شیکاری) کورت و گونجاوترە.

## لاپەرە (٤):

(۱) ژماردن - الحساب - Arithmetic

* ژماردن (عد) دەگریتەوە، (ژمیرە) بو (حساب) بەکارهینراوەو باشترە. بەوپی‌یە یەکەم زاراوەی سەرەوەی لاپەرەکە (تیکرای ژمیرەیی) دەبیت نەك (تیکرای ژمارەکی).

(۲) ناهاودیتمەیی - لاتناظر - Asymmetry

* وابزانم زور ئالوزەو رەنگە هەر ئەوەی دایناوە تی‌ی بگات، (ناریکی)، (ناهاوتایی)، (ناچونیەکی) هەرسیکیان مانای (لاتناظر) و(لاتناسق) دەگەیێنن وهەمووکەسیش تی‌یان دەگات.

(۳) هاوشانی پیچەوانە - مختلف التوازي - Anti Parallel

* عەرەبی یەکەی (مخالف التوازي) یە و ئەوەش واتە (تەریب پیچەوانە) یان (دژە تەریب).

(٤) ریکخستنی هەورازی - ترتیب تصاعدي Ascemaung Order

* (بەرەوژوو ریزکردن) یان (بەرەو ژوور ریکخستن) جوانترە

(٥) ئەژمیر - مسحبة - Abacus

* رەنگە (پی‌ژمیر)یان هەر (ژمیر) جوانتربی.

## لاپەرە (٥):

(۱) (رەها)کانی زاراوەی دووەم و سی‌یەم و چوارەم وپینجەم وشەشەم و حەوتەمی سەرەوەی لاپەرەکە هەموویان بکرین بە (پەتی).

(۲) هەلمژ ممتص Absorber

* (مژە) یان هەر (مژ) کورت تروسادەترە و عەرەبی یەکەشی (ماص)ە نەك (ممتص).

(۳) مژوگ - ماض Absorbent

* (مژراو)و عەرەبی‌یەکەشی (ممتص) راستە

(٤) هەلمژین - امتصاص Absorption

* (مژین) کورت ترەو ئەو (هەل)ەی ناوی

(٥) پیکهینی بەکار - مرکبة فعالة Active Componemt

* (پیکهینی کارا) یان (پیکهینی چالاك) باشترە

(٦) بیستەکی - صوتي، سمعي Achromatic

(بیستەنی) گونجاوترەو لەلاپەرە/ ۷دا بیستەنی بەکارهینراوەو (بیستەك) بو (سماعة)، بەوپی‌یە (بیستەکی) (سماعي) دەبیت نەك (سمعي).

## لاپەرە (٦):

(۱) تاوی لووزەو- شدة التیار Amperage

* (تینی لووزەو) یان (تینی تەزوو) باشترە

(۲) دەرك - فتحة Aperture

* (کون، گوزەر)و رەنگە (گوزەر) گونجاوترینیان بیت

(۳) دەرك گر منظمة الفتحة Aperture of stop

* (کونگرە) یان (کونپوش) راست ترە

(٤) لار      لابؤري      Astigmatic

(٥) لاری      لابؤرية      Astigmatism

(ناتیشکویی)و (ناتیشکویەتی) گونجاوترە

## لاپەرە (۷):

(۱) بنیاتی گەردیلەیی      ترکیب ذري      Atomic structure

* (پیکهاتنی گەردیلەیی) راست ترەو، لە هەموو کتیبە هەمەبابەتەکانی قوتابخانەش دا چەسپیوە.

## لاپەرە (۸):

(۱) سەنگ و کیشی دارایی - المیزانیة المالیة Finantial

* (تەرازووی دارایی) ریك و پیك ترە

(۲) وشار پیوی هەوا - مضغاط جوي Barometer

* (پەستانپێوی‌هەوا‌شی بخرێتە پاڵ

(٣) کۆکەرەوە (پاتری)   نضیدة   Battery

* (خـانکـۆ) راست ترەو لەکتێبـەکـانی قوتابخانەدا بەکار هێنراوە، چونکە (نضیـدة) لە کۆکـردنەوەی چەند خانەیەك (خلیة) پێك دێت، بۆیە لەسەر پێودانگی زانکۆ، گڵکۆ. . . هتد ناونراوە (خانکۆ)

(٤) گرتۆك   کابح   Brake

* (دابینە، دابینۆك) باشترە، لە (دابین کردنەوە). .

(٥) سەرئاوکەوتن   طفو   Buoyamcy

* (کـەوتنـە سەر) راست تر و گشتگـر (شـامـل)تـرە، چونکـە (طفو) هەر (سـەرئـاوکـەوتن) نی‌یە بەڵکو هەموشتێکی سوك دەگرێتەوە کە بکەوێتە سەر شتێکی قورسـتـــر وەك ئەوەی (ئـاسن) دەکـەوێتـە سەر (جیـوە). . بۆ نموونە چۆنی پێ دەووترێ سەر ئاوکەوتن (کە سەرجیوەکەوتن)ە.

(٦) ژمارەی پێکەڵ   عدد مرکب   Complex number

* (ژمارەی ئاوێتە) باوترە.

لاپەرە (٩):

(١) جمینی چەمەرەکی ـ حرکة دائریة Cincular Motion

* (جووڵەی بازنەیی)یان چەمەرەیی باوترو بەگوێ ئاشناترە

(٢) ژمارەی سەرەك   عدد رئیس   Cardinal number

* (کەڵە ژمارە) یان (شاژمارە) جوانترە

(٣) چەماوە نەخشەکێشان ـ رسم المنحنیات Curve tracing

* (چەماوەکێشان) راست ترە، ئەو (نەخشە)یەی ناوێ

(٤) بەرامی خاچی   جدار اتجاهي   Cross praduct

* (خـاچـە لێکـدان) یان وەك لەکتێبـەکـانی بیـرکـاریی قوتابخانەکان دا دەووترێ (لێکدانی (دوولاو دووێنوان).

لاپەرە (١٠):

(١) دەستەژمارەکی ـ مجموعة قابلة للعد Countable set

* (کۆمەڵەی ژماردەنی) راست ترە

(٢) هاوراستەبان ـ متحد المستوي Coplanar

* (هاوڕووتەخت) خۆشترە

(٣) پەستران   إنضغاط   Compression

* (پەستێوران) بۆ (انضغاط)و (پەستێوراو) بۆ (مضغوط) راست ترە

(٤) بێ‌وچان   متصل   Contimuous

* (سەرومر، یەکبینە) باشترە

لاپەرە (١١):

(١) ئەستوورپێو   قدمة   Caliper

* (ئـەسـتـووریپێـو) راست ترە، چونکـەبـۆپێـوانی ئەستووری شتی باریکیش بەکار دەهێنرێت، (ئەستوورپێو) وادەگەیێنێت کە هەرشتی ئەستووربێوێت.

(٢) گەرمۆڵە   حراري، سعري   Caloric

(گـەرمـۆکە) بۆ Calorie یان Calory بەکارهێنراوەو وردتریش ماناکە دەدات. هەر بەوپێ یەش (گەرمۆکەپێو) بۆ Calorimeter لەجیاتی (گەرمۆڵەپێو) لەکتێبە هەمەبابەتە تازەکانی قوتابخانەدا چەسپیوە.

(٣) رەنگدار   لوني   Chromatic

* (رەنگدار) ملون دەگرێتەوە، (رەنگەنی)یان (رەنگەکی) راست ترە

نیسکە ئاوێتە   عدسة مرکبة   Compound lems

* (نیسکەی ئاوێتە) وردترە.

(٤) لێکدان   تصادم   Collision

* لێکدان (ضرب، تضارب) دەگرێتەوە، بەیەکداکەوتن یان پێکداکەوتن بۆ (تصادم)ە

لاپەرە (١٢):

(١) وردبینی ئاوێتەیی ـ مجهر مرکب Compound microscope

* (وردبینی ئاوێتە) وردترەو (یی) یەکەی ناوێ.

(٢) گەیاندنایەتی ـ توصیلیة Conductivity

* (گەیێنی) راست ترەو کورت تریشە

(٣) بروسکەکوژ ـ مانع الصواعق Conductor, lightning

* (بروسکەگر) یان (بروسکەبر) راست ترە.

(٤) گواستنەوە   حمل   Convection

* (هەڵگرتن) واتە گەرمی گواستنەوە بەهەڵگرتن.

(٥) گلێنە   قرنیة   Cornea

* (کـۆرنیـە) راست ترە، چونکـە پێشـە ڕوونەکەی چاوەدەگرێتەوە، بەڵام (گلێنـە) هەمـوو گۆی چاو(تۆپی‌چاو) دەگرێتەوە (بڕوانە فەرهەنگی تۆفیق وەهبی ـ ئەدمۆنس لاپەرە/ ٥٣ (gilene: eye - ball

لاپەرە (١٣):

(١)دوورایی   مسافة   Distamce

* (دووری، ماوە) راست ترە.

لاپەرە (١٤):

(١) بنك   مقام   Denominator

* بنـك بۆ (قـاعـدة) یان (قعـر) بەکـارهێـنـراوەو (ژێرە) بۆمقام)ی کەرت (سەرە)ش بۆ (بسط) وچەسپیوو گونجاون.

(٢) گهۆری دەستدا   متغیر تابع   Depemdent Variable

* گۆڕراوی پەیـوەست (پـەیـوەنـدیـدار) ڕوونتـرەو، بێ باس کردن و ڕوون کردنەوە باوەڕناکەم (کەس) لە (گهۆری دەستدا) بگات.

(٣) ڕێکخستنی نشێوەکی ـ ترتیب تنازلي Desemaing Order

* (ڕێکخستنی (ریزکردنی) بەرەوخوارە) باشترە و (بەرەوژوورە)ش

تصـعدي) وەك لەپێشەوە ووتمان .

**لاپەڕە (١٥) :**

(١) هەڵ هێنك ـ مولد تيار مستمر Direct Current - generator

هەڵهێنك، بۆ (مفقسة) دەشێت،

* هەڵهێنـان بۆ (مفقس) دەبێت بۆ هێلكـە، تەنـانەت بۆ (گەرا) ترۆكاندن بـێ ترۆكـان بەكـاردێت، پێكهێن، پەیـداكـەر، دروستكـەر راست ترە بۆ (مـولـد)، ئەوكـاتـەش (مـولـد تيـار مستمر) دەبێتە لووزەو (يان تەزوو)ی بەردەوام (يان يەكبينە) پێكهێن .

(٢) هاودژە موقناتيس ـ متعاكس المغناطيسية Diamagnetic

* جارێ، (هـاو) واتـە لێكچـووو چونيـەك، (دژ)یش پێچـەوانـەكـەی، تێ نـاگـەم چۆن ئەو دوو دژە پێكەوە كۆدەكرێتەوە، دوای ئەوە Diamagnetic (قليل الحساسية)، (قليل التأثرية)، (مجانية للمغناطيسية) دەگرێتەوە، كەواتە هەر بووترێ (دژە موگناتيسێتی) باشترە .

(٣) نەگەیەنی كارەبا     عازل كهربائي     Dielectric

* (كارەبا نەگەیێن) جوانترە .

**لاپەڕە (١٦) :**

(١) هەڵهێنەری كارەبا ـ مولد كهربائي Dynmic

* جارێ (Dynumo) (مـولـد)ە نەك (Dynamic)، جا ئەگـەر داينـەمـۆبێ ((پێكهێن) يان پەیـداكـەر باشـە، ئەگـەر (داينـەميك) بێ ئەوا چالاكی، چوستی، جووڵەیی باشە بۆی چونكە (فعال) يان (مليء بالقوة والنشاط) دەگرێتەوە .

(٢) هاوكێشی     توازن     Equilibrium

* (هـاوسـەنگی) بۆ توازن راستـە، (هاوكێشی)ش بۆ تعادل، لە لاپەڕە/ ٢٠ یشدا بەكارتان هێناوە .

**لاپەڕە (١٧) :**

(١) ژمارەی جووتەك     عدد زوجي     Even number

* (ژمارەی جووت) پراوپڕێتی، (ژمارەی تاك)یش بۆ عدد فردي

(٢) دەنگ دانەوە     صدێ     Echo

* (زايـەلـە) بۆ صدێ باشترە، (دەنگ دانەوە)ش بۆ (رنين)، بەوپێیەش (زايەڵە پێو) بۆ مقياس الصدێ لە جياتی دەنگ دانەوە پێو .

(٣) مانگ گیرانی خشت     خسوف أو كسوف كلي     Eclipse, total

خۆرگیرانی خشت

* (تـەواو) لە (خشت) جوانتـرە، هەر خۆشتـان وشەی پێش ئەم لە جياتی (جزئي) (ناتەواو)تان بەكارهێناوەو ئەوكاتەش (تەواو)و (ناتەواو) گونجاوترە لە (خشت)و (ناخشت) .

**لاپەڕە (١٨) :**

لێكدانی جيری     تصادم مرن     Elastic vollision

* (لێكـدان) زۆرتـر (ضـرب)و تضـارب دەگـرێتـەوە، (تصـادم) (پێكـداكـەوتن)ەوجگـە لەوەش (لێكـدانی جيـری) تصـادم المـرونـة دەگـرێتەوە، جاكەوابوو يان بووترێ (لێكدانی جير) يان (جيرە لێكدان)، (جيرە پێكداكەوتن) گونجاوترە يان هيچ نەبێ (پێكداكەوتنی جير) .

(٢) گەیاندنايەتی كارەبا ـ توصيلية كهربائية Electrical Conductivily

* (كارەبا گەیاندن) يان (كارەباگەیێنی) جوانترە .

**لاپەڕە (١٩) :**

(١) شی كراوەی كارەبایی     منحل كهربائي     Electrolyte

* (بەكارەبا شی یەوەبوو) گونجاوترە

(٢) شێوەپێ دانی ئەلەكترۆنی ـ تشكيل الكتروني Electron configuration

* (ريـزبـوونی ئەلـەكترۆنی) راستەوعەرەبی یەكەشی (ترتيب ألكتروني) وچـۆنێتی ريزبوونی ئەلەكترۆنەكانی دەوری ناوكی گەردیلەی توخمەكان پيشان دەدات .

(٣) شيرەگرتن     إستحلاب     Emulsification

* (شيرەگەری) راست ترە .

(٤) گەرمی دار     محتوى حراريي     Enthalpy

* (ووزەی خۆیی) يان (خـۆووزە) روون و ئاسـانتـرەو بەمـانـای (الطاقة الذاتية)يان (المحتوى الحراري) .

(٥) شڵەقاوی     اختلاج     Entropy

* (نارێكی) روون و باشترە چونكە ئينترۆپی، شلەقاوی و نارێكی دەگرێتەوە

(٢) بەهەڵم بوون     تبخر     Evaporation

* (هەڵمين) گونجاوترەو كورت تريشە .

(٣) پابەند     دالة     Function

* (پـابـەنـد) بەمـانـای (لەجووڵە خراو) دێت، لەكيميادا (نما) پيشاندەر دەگـرێتـەوە و(بارنما) بۆ دالة الحالة StaLe Fumction بەكاربهێنرێت باشەو (كـارا)ش واتـە (عـامـل) يان (فعـال) دەگـەیێنێت، (كـۆمەڵەی كارا) يان (كـۆمـەڵـەی چالاك) بۆ (المجمـوعـة العـاملة) يان المجمـوعة الفعالة) FunctionaL group بەكـارهێنـراوە

**لاپەڕە (٢١) :**

(١) شەكڵ، رەنووس     شكل، رقم     Figure

* (شێوە) هەبێ بۆچی (شەكڵ)ی عەرەبی بەكاربێنين!؟ .

(٢) ژمارەی كەرتی     عدد كسري     Fractional Number

* (كەرتەژمارە) راست ترە .

(٣) قەڵشان، قەڵشين     انشطار Fission

* (كـەرت بوون) راست ترو گونجـاوتـرە لەگـەڵ چەمكە زانستی یەكەدا، چونكـە قەڵشـان (يـان قلیشـان) درزبـردن دەگـرێتـەوە، بەڵام إنشطـار دووكەرتبوون و لێك جيابوونەوەی شتەكەیە .

(٤) قەلەشينی گەردیلەیی ـ إنشطار ذري Fission, Atomic

* (کـەرتبـوونی گەردیلەیی) یان (گـەردیلە کەرتبـوون) راست ترە، هەر بەوپێ یەش (بەرهەمی کەرتبوون) لە (بەرهەمی قەڵشین) باشترە.

(٥) مۆلکە، دۆلکە. دورق Flask

* (دۆلکـە)، بەدەفـرێکی دەسکداری دەمپەل دەڵێن، (Flask) نەدەسکی هەیەو نەدەمی پەلە، بۆیە رەنگە ئەو (کەمۆڵە)یەی کە تا ئێستا لە کتێبەکانی قوتابخانەدا بەکاردەهێنرێت باشتربێ.

(٦) شلاو مائع Fluid

* لە بەر ئەوەی (مـائـع) (شـل)یش و (گـاز)یش دەگـرێتـەوە (هـەرچی رەق نەبێت)...، کەواتـە (شلگـاز) رەنگـە لەم (شـلاو)ەو (گـازاو)ەکەی کتێبەکانی جارانی (فیزیا)ش باشترو راست تر بێت.

(٧) گەشانەوە تألق Fluoresemce

* (گـەشانەوەن) توهج دەگرێتەوە، بۆ (تألق) (درەوشانەوە) پر بەپێستێتی، (لە لاپەرە /٢٢دا بۆ توهج بەکارتان هێناوە).

**لاپەرە (٢٢):**

(١) ناسك قابل للكسر Frgile

* ناسك (هـش) دەگرێتەوە، (شکستەنی) راست ترە

(٢) بنیات أساسي Fundamental

* بنچینەیی و بنەرەتی باشترن.

(٣) توانەوە، جۆشخواردن ـ انصهار، إندماج Fusion

* (توانەوە) بۆ ذوبان باشە، بۆ انصهار (شل بوونەوە) تەواوترە

(٤) تیروانەی گرۆکان نظرية الزمرة Group theory

* گرۆبیـردۆز یان (کـۆمەڵە بیردۆز) یان هیچ نەبێ بیردۆزی کۆمەڵە (یان بیردۆز) جوانترە، چونکە پیردۆز بۆ نظریەو بیردۆزی بۆ (نظري) چەسپیوەو هەرنـەبێ (سـەرنـج) لە تێـروانـە باشـترەوئەویش (ملاحظة) دەگرێتەوە، وەنەبێ (بیردۆز)یش زۆر باش و بێ خەوش بێت بەڵام هەرباشترە.

(٥) پێوگی گەلڤانی مقياس غلفاني Galvanometer

* (گـەلڤـانـۆپێـو) راست ترو جوانتـرە یان (تـەزوودۆز) چەمکـە زانسـتی یەکەشی دەدات بە دەستەوە.

(٦) هەڵ هێنك مولدة Cemeration

* جاریٚ عەرەبی یەکەی (تولید)ە نەك (مولدة)و ئەو کاتەش وەك لە مەوبەر باسـمان کرد پێکهێنان یان پەیداکردن یان دروست کردن راست ترە.

**لاپەرە (٢٣):**

(١) کێشە گەردیلەی گرامی ـ وزن غرامي Gram atom

* کێشە گەردیلەی گرامی) ذرة وزن غرامي دەگرێتەو، کێشی (گەردیلەیی گرامی)یان (گەردیلەکێشی گرامی) راست ترە.

(٢) هاوێژك قاذفة Gun

* (هـاوێـژ) کورت ترورەوانتـرە، وەك بەردهـاوێـژ، تیـر هاوێـژ، تۆپ هاوێژ... هتد.

(٣) بڵندی ارتفاع Heigh

* (بەرزی)یشی بخرێتە سەر

(٤) شەش گۆشە سداسي Hexagon

(شەش گۆشە) (سداسي الزوايا) دەگرێتەوە بەڵام (Hexagon)

* (شەش گۆشە)و (شەش لا)ش دەگرێتەوە بۆیە هەر دەدوترێ (شەشی یان (شەشە):

(٥) ژمارەی شەش گۆشەیی ـ أعداد سداسية Hexagenal number

* (ژمارەی شەشی) راستەو ژمارەی شەش گۆشەیی کوا هەر هەیە!؟

(٦) شەش رووی مجسم سداسي Hexahedron

* (شەش روو) یان (شەش رووە) باشترە.

**لاپەرە (٢٤):**

(١) راستەبانی ئاسۆیی ـ المستوى الأفقي Horizontal plane

* (رووتـەختی ئاسـۆیی) باوتـرە وچەسپیـوە لە هەمـووکتێبـە هەمـە ـ بابەتەکانی قوتابخانەدا.

(٢) تەمەنی نیوە عمر النصف Half - life

* (نیوەتەمەن) راست ترەو لەزۆر کتێب دا عەرەبی (نصف العمر)ە

(٣) گەرم کشی تمدد حراري Heat expansion

(گەرمە کشێ) راست ترە، یان بەگەرمی کشان.

(٤) ناوبرەی گەرمی عازل حراري Heat Insulator

دابڕی گەرمی

* (گـەرمی برە) راست ترو گونجـاوتـرەو لەکـوردیدا شتی لەوبابەتە زۆرە وەك (بۆن برە) بۆ نموونە.

(٥) گەرمی لکاندن ـ حرارة الأمتزاز Heat of adsorption

* (لکـانـدن) (التصـاق) و(لصق) دەگـرێتـەوە، هەرچـەنـدە امتزاز جۆرە لکـاندنێکی تیا بەدی دەکرێت، بەڵام مژین و بڵاوبوونەوەی (گەردەکانی گازێکـە بە نێـوان گەردیلەکـانی رووی کانـزایـەك دا بۆیـە (رووژە) یان (رووژین) بۆ امتـزاز (امـدصاص) و(مژین) بۆ (امتصاص) absorption بەکاربهێنرێت راست ترە کە بڵاوبوونەوەو مژرانی شتێکە (ماددەیەکە) بە ناو هەمووبەشەکانی ماددەیەکی تردا. (ماددەیەکە)

**لاپەرە (٢٥):**

(١) گەرمیی بە بلوور بوون ـ حرارة التبلور Heat of Crystalization

* (گەرمیی بلوورین) خۆشترو رەوانترە.

(٢) گەرمیی داژەنران ـ حرارة التفكك Heat of decomposition

* (گـەرمیی شیبـوونـەوە) راست ورەوانتـرە، هەرچـەنـدە (داژەنین) لە

ـه صـگـر حـ ـ)دا بۆ تفكك بەكارهێنراوە.

- گەرمی پەرچە پارچەبوون ـ حرارة التجزؤ Heat of dissociation

● گەرمی نێك هەڵوەشان) راست ترە لەرووی چەمكە ـــر ـيەكەيەوە.

- گەرمی بەهەڵم بوون ـ حرارة التبخر Heat of enaporation

● گەرمی هەڵمین) كورت و رەوانترە، (هەڵماندن)یش بۆ تبخیر

- گەرمی ئاودان ـ حرارة التمية Heat of hydration

● گەرمی (گـەرمی) ئاوێن راست ترە چونكە ئاودان (سقي) دەگرێتەوە ـيـ و (تميؤ) واتە یەكگرتن لەگەڵ ئاودا، یان بە ئاو دەورەدان.

- گەرمی بە ئایۆن بوون ـ حرارة التأين Heat of ionization

● گەرمی ئایۆنێن) سووك و رەوانترە.

- گەرمی بێلایەن ـ حرارة التعادل Heat of neutralization

گەرمی هاوكێشبوون) راست ترە، یان (گەرمی هاوتا بوون).

- گەرمی تایبەكار حرارة نوعية Heat specific

● گەرمی جۆری) یان (خودەگەرمی) باوترە.

لاپەرە (٢٥):

(٩) ناهاوچەشن غير متجانس Heterogemeous

● (ناچونیەك) باشترە

(١٠) هاوچەشن متجانس Homogemous

● (چونیەك) باشترە

(١١) هێزی ئەسپی قوة حصانية Horse Power

● (ئەسپەهێز) گونجاوترە.

(١٢) ئاوی قورس الماء الثقيل Heavy water

● (قورساو) خۆشترو سادەترە

(١٣) هایدۆرجیناندن اضافة الهيدروجين Hydrogenation

● (هـایـدرۆجینێن) ئاسـانـترە لە سەر پێـودانگی غارغـارێن، مووشێن، هەلووكێن.. هتد

لاپەرە (٢٦):

(١) ئاشۆپ خيالي، تخيلي Imaginary

● ئەگەر ئەو (ئاشوپ)ە (ئاشوب) بێ واتە ئاژاوەو ناخۆشی گەورە وەك پیرە مێرد دەفەرموێ: «لەبەر ئاشـوبی خێڵم هیچ شەوێ خەونایەتە چاوم...» بۆ خیالي) ئەندێشەیی بەكار دەهێنرێت.

(٢) بەرەواژی تعاكس Inversion

● پێچـەوانـەبـوون، پێچـەوانـەكردن راست ترەو لەلاپەرە/ ٢٧دا خۆتان بەكارتان هێناوە.

لاپەرە (٢٦):

(٣) تەوەرەی شێوەیی محور تخيلي Imaginary Axis

● (تەوەرەی ئەندێشەیی) تەواو ترە

(٤) ژمارەی شێوەیی عدد تخيلي Imaginary Number

● (ژمارەی ئەندێشەیی) تەواوترە

لاپەرە (٢٧):

(١) گۆشەی یەكسان متساوي الزوايا Isoclinal

● (هاوگۆشە) یان هیچ نەبێ (گۆشە یەكسان) راست ترە

(٢) گەردیلە یەكسان متساوي الأجزاء Isotonic

● گەردیلە (ذرة)یـە، بۆیـە (هـاوبـەش یان هـیـچ نەبێ (بـەش یەكـسـان) راست ترە.

(٣) خشت، ژمارەی خشت صحيح، عدد صحيح Integer

● (تەواو، ژمارەی تەواو) گونجاوترە

(٤) گۆشەی ناوەكی زوايا داخلية Interior Angles

● (ناوەگۆشە)) رەوانترە.

(٥) یەك باری تعطل (استمرارية) (بەكەم وشەی لاپەرەكە) Inertia

● (یەكبینە) یان (سەرومر) استمرارية دەگرنەوە

لاپەرە (٢٨):

(١) لێكەوتن صدم Impact

● (لێكەوتن) (تماس)ە، پێداكەوتن راستە

لاپەرە (٢٩):

(١) هاندان حثية Inductance

● هاندانی، هاندانێتی راست ترە

(٢) توانی هاندان حث Induction

● هەر (هاندان) باشە، توان واتە (اس).

(٣) ناجیری غير مرن Inelastic

● (ناجیر) راستە

(٤) لێكدانی ناجیری تصادم غير مرن Inelastic Collision

لێكدانی ناجیری صدم غير مرن Inelastic Impact

● (پێداكەوتنی ناجیر) گونجاوە

(٥) سستی قصور ذاتي Inertia

● هیچ نەنووسراوە

(٦) روون بوونەوەی بێپایان ـ تخفيف لانهائي Infinite dilution

● (روون كردنەوەی) راست ترە، چونكە (روون بوونەوە) وادەگەیێنێ كە

گیراوەیەك لە خۆیەوە روون بێتەوە.

(٧) هۆگەیەنەکی   توصیل ذاتي   Intrinsic Conduction

* رەنگە (خۆگەیەنەکی) بێ و هەڵەی چاپ بێ، خوگەیێنی) باشترە.

**لاپەرە (٣٠):**

(١) هێوزەکی   طاقة ذاتية   Intrinsic emergy

* ووزەی خۆیی راست ترە.

(٢) هۆبەرگری   مقاومة ذاتية   Intrinsic emergy

* بەرگری خۆیی راست ترە.

(٣) خۆلێنجی   لزوجة ذاتية   Intrinsic Viscocity

* (لێنجی خۆیی) راست ترە.

(٤) پێکگۆرینی ئایۆنی   تبادل أيوني   Ion exchange

* (ئالوگۆری ئایۆنی) راست ترە

(٥) خەست کردنەوەی ئایۆنی   تركيز أيوني   Ionic concemtratior

* خەستی ی ئایۆنی یان پەیتی ی ئایۆنی راستە.

(٦) ئەرکی بوونە ئایۆن   جهد التأين   Ionization potential

* ئەرکی ئایۆنێن) راست ترە

(٧) بەشلەقاوی چەسپاو - بثبوت الأنتروبي   Isentropic

* بەجێگیری ی (نەگۆری ی) نارێکی

یەکسانی بارست

(٨) یەکسانی هاووشار - تساوي الضغط   Isobar

* (هاووشار) یان هاوپەستان خۆی یەکسانی پەستان دەگرێتەوە، (یەکسانی)یەکە زیادەیەو نایەوێ.

(٩) یەکسانی شێوە   متشاكل   Isomorph

(هاوشێوە) جوانترو پاراوترە

(١٠) یەکسانی گەرمی   متساوي درجة الحرارة   Isotherm

* (هاوگەرمی) گونجاوترە، یان (هاوپلەی گەرمی)

(١١) خەسیەت یەکسان   متساوي الخصائص   Isotropic

* (هاورەووشت) راستە

**لاپەرە (٣١):**

(١) دیتانەی لڤینی - النظرية الحركية   Kinetic theory

* (بیردۆزی جووڵە) یان (جووڵە بیردۆز) روونترو دیارترو راست تریشە

(٢) دیتانەی لڤینی گاز النظرية الحركية للغازات   Kinetic theory of gasses

* (جووڵە بیردۆزی گاز) یان (بیردۆزی جووڵەی گاز).

(٣) ئاست کردن   تسوية   Levelling

وەرگێرانێکی پیت بەپیتی (تسوية) عەرەبی‌یەکەیەو هەرگیز بەکار ناهێنرێت،

* (تەخت کردن) بەکار دەهێنرێت تەنانەت لەلای ئەندازیارو وەستاو کرێکاروخەڵکی رەمەکیش، یان هیچ نەبێ (هاو ئاست کردن)

**لاپەرە (٣٢):**

(١) جێگای ئەندازیاری   محل هندسي   Locus

* (ئەندازگە) راست ترەو لەهەمان لاپەرەدا (یەکەم وشە) بەکار- هێنراوە.

(٢) چریسکانەوەیەتی   ضيائية   Luminosity

* (چریسکەیی) راست ترەو زۆرتریش (بریسکە) لە جیاتی (چریسکە) بۆ (لمعان) و (ضياء) بەکاردەهێنرێت، (درەوشە) زۆرباشە (بروانە فەرهەنگی ت. وەهبی - ئەدمۆنس لاپەرە/ ٣٩)

(٣) گری چریسکانەوەیی   لهب ضوئي   Luminous flame

* (چریسکەگر) کورت تروڕەوانترە، یان هیچ نەبی گری چریسکەیی)، یان (گری درووشە)

(٤) تینی چریسکانەوەیی   شدة الأضاءة   uminous intemsity

* (چریسکە تین) یان (تینی چریسکەیی) باشترە

(٥) تیشکدانەوەی چریسکانەوەیی - إشباع ضوئي   Luminous radiation

* (درەوشەدانەوە) راستەو ئەو دێرەزاراوە بەکارهێنراوە زۆر درێژ و ناقوڵایە.

(٦) چریسکەدار   مضيء   Luminescemt

* (درەوشەدار) یان (درەوشن) جوانترە (بروانە لاپەرە/ ٣٩ هەرەنگی ت. وەهبی ئەدمۆنس)

(٧) مانگی هەیڤی·   شهر قمري   Lunar month

* (هەیڤە مانگ) خۆشترە وەك هەیڤە شەوو کەوەرۆژ و.. هتد.

**لاپەرە (٣٣)**

(١) شلە نەویست - صاد للسائل   Lyophobic

* (شلە نەخواز) گونجاوترە لەگەڵ (شلەخواز)ەکەی پێش خۆی، هەروەهاش (خاکی شلەنەخواز) لە جیاتی (خاکی شلەنەویست)ی دوای خۆی.

**.لاپەرە (٣٤):**

(١) لێك دراو   ضرب   Multiplication

* (لێکدان) راستە، لێك دراو مضروب)ە

(٢) ژمارەی تێکەڵ   العدد المختلط   Mixed Numbers

* (تێکەڵە ژمارە) لە بارترە.

(٣) هورەك   دقيقة   Minute

* رەنگە (هوردەك) بێت یان (وردەك),

(٤) ژمارەی پێکهاتوو ـ عدد مركب Number, Compound

* (ژمارەی ئاوێتە) گونجاو ترە مانا زانستی یەکەی زۆرتر دەبەخشێت.

**لاپەرە (٣٥):**

(١) ژمارەی تاکی عدد فردي Odd number

* (ژمارەی تاك) راست ترەو، (تاك)یش بۆ Odd نەك (تاكی).

(٢) وشار ضغط Pressure

* وشار، فشار، پەستان

(٣) هەشت پاڵو مثمن Octagon

* (*هـەشـتـە) راستـە، چونکە (هەشت لا) و (هەشت گۆشە) دەگرێتەوە (هـەشـت پاڵـو) یان (هـەشـت روو) بۆ ئۆکتـا هێـدرۆن Octahedron واتـە (المجسم الثماني) بەکار بهێنرێت باش و راست ترە.

(٤) راستەبان مستوي Plane

* (رووتەخت) راست و باوترە.

**لاپەرە (٣٦)**

(١) بەرنامەرێژی برمجة Programming

* (بەرنامێن)و، (بەرنامەگەری) بەتایبەتی یەکەمیان رەنگە زۆر باش بێت.

(٢) قووچەك هرم Pyramid

* هەر (هەرەم)ەکەی کە بەکارهێنراوە (لەکتێبەکانی قوتابخانەدا) باشترە، ئەی بە (مخروط) چی بووترێ؟!

(٣) هاوشان متوازي، موازي Parallel

* بۆ هێڵ (تەریب) گونجاوترە (هاوشان) ناگونجێ.

(٤) بر جزء Part

* (بەش) بۆجزء و (بر) بۆ (مقدار) راستە.

(٥) دەسکار مشروع Prpject

* زۆرتر (پدوی) دەگرێتەوە، (پرۆژە) باوترو چەسپیوە

(٦) هاوشانە موقناتیس متوازي المغنطيسية Paramagnetic

* (هاو موگناتیسێتی) راست ترە.

(٧) چوارگۆشەکی رباعي الزوايا Q uadrangle

(٨) هەر چوارلایەکی رباعي الأضلاع Quadrilateral

* هەر (چوارلا) ماناکە دەدات و خۆشتریشە

(٩) گۆشەی چوارەکی زوايا ربعية Quadrant Angle

* (زوايا رباعية) دەگرێتەوە، (چارەکە گۆشە) یان هیچ نەبێ (گۆشەی چارەکی).

**لاپەرە (٣٨):**

(١) ژمارەی راستین عدد حقيقي Real number

* (ژمارەی راستینە) یان (ژمارەی راستەقینە) جوانترە.

(٢) بەرەواژ مقلوب Reciprocal

* (ئاوەژ و)و (هەڵەوگێراو)یش باشن.

(٣) کەمکردنەوە اختزال Reduction

* (لێ کردنەوە)شی بخرێتە سەر.

(٤) هەڵگەڕانەوە إنعكاس Reflection

* (پێچەوانە بوونەوە) جوانترە.

(٥) گۆشەی راست زاوية قائمة Right angle

* (گـۆشـەی وەسـتـاو) بەکـارهێنـراوە لەکتێبە بیرکاری یەکان داو (گۆشەی راست) یان (راستەگۆشە) بۆ (زاوية مستقيمة) گونجاوترە.

(٦) دەستە مجموعة Set

* (کۆمەڵە)شی بخرێتە سەر.

(٧) گۆیەکی کروي Sphencal

* (گۆیی) کورت و رەوانترە.

(٨) تاو إنطلاق Speed

* (دەرپەرین، خێرایی)شی بخرێتە پاڵ.

(٩) هاودیتمەیی تناظر Symmetry

* (هـاوتـایی) یان (چـونیـەکی) راست تر و هاودیتمەیی بە هیچ جۆرێك گونجاوی یە بۆ (تناظر) وکەس تێ ی ناگات.

**لاپەرە (٣٩)**

(١) نیوە چەمەرە ـ نصف دائرة، شبه دائرة Semicircle

* نیوە (یان نیمچە) بازنە.

(٢) یەك لەدوایەك هاتوو متتابعة Sequence

* (بەرودوا) کورت و راست ترە.

(٣) دیتانەی دەستەجات نظرية المجموعات Set theory

* بیردۆزی کۆمەڵە (یان دەستە)، یان (کۆمەڵە بیردۆز) جوانترن و (دیتـانـەی دەستەجات) زۆر ناقۆڵاو نەبیستراوو ناناشنایەو لەو باوەڕەدانیم کەس تێ ی بگات.

**لاپەرە (٤٠):**

(١) ئامارگری احصاء Statistics

* (ئەژمار) باوترە

(٢) دەستە، سەرجەم   مجموعة جزئية   Subset

* (بەشەکۆمەڵە) راست تر و گونجاوترە لەگەڵ چەمکە زانستی یەکەدا .

(٣)؟   مجموعة   Sum

* (سەرجەم) کەلەگەڵ دەستەکەی سەرووتر تێکەڵ بووە یان (کۆ) باشە

(٤) نیشانە   رمز   Symbol

* (نیشانە) بۆ (علامة) بەکار هێنراوە، (هێما)ش بۆ (رمز) . وەك چوار وشە خوارتر بە رچاویش دەکەوێت لە لاپەرەکەدا .

(٥) دیتانە   نظرية   Theory

* (دیتانە)وتێروانی) هیچیان وردو لەبارنین بۆ (نظریة)، (بیردۆز) گونجاو و چەسپیوە .

(٦) دیتانەی هاوتا   نظرية المعادلات   Throry of equations

* (هاوتا) (متعادل)ە، (بیردۆزی هاوکێشە) راستە .

(٧) دیتانەی گرۆ ـ نظرية المجموعات (الرمز)   Theory of groups

* (بیردۆزی گرۆ) یان (گرۆ بیردۆز) یان (کۆمەڵە بیردۆز) باشترن .

(٨) هەموو، هەمەکی   كلي   Total

* (گشتی) جوانترە .

**لاپەرە (٤١)**

(١) نەخشەگرتن   ترسم   Tracing

* ناوتری نەخشەگرتن) بەڵکو دەووتری (نەخشەکێشان) بۆ تصویر (وێنەگرتن) بەکاردەهێنرێت .

(٢) نیمچە تەریب   شبه منحرف   Trapezoid

* (نیمچە لاتەریب) راست و باوترە .

(٣) تەقەلا   محاولة   Trial

* (هەوڵ)، (کۆشش) باشترە .

(٤) رووبانی رێك ـ سطح منتظم   Uniform Surface

* (رووتەختی رێك) باشترە .

(٥) دەستەی گشتی   مجموعة شاملة   Universal Set

* (کۆمەڵەی گشتگر) باشترە

(٦) چەندێتی نەزانراو   كمية مجهولة   Unknown Quantity

* (بری نەزانراو) گونجاوترە .

**لاپەرە (٤٢)**

(١) بەتاڵی   فراغ   Vacume

* بەتاڵی عەرەبی یە، (بۆشایی) کوردی یە وراست ترە .

(٢) بایی رەهایی   قيمة مطلقة   Value, Absolute

* (بەهای پەتی) جوانترە .

(٣) بگۆر   متغير   Variate

(گۆڕراو) راست ترە، بگۆر (مغیر)ە

(٤) شی کردنەوەی رووتی کەر   تحليل المتجهات   Vector analysis

(٥) جیاوازی رووتی کەر   فرق متجهي   Vector. Differemce

* (ئاراستە جیاوازی) گونجاوترە

(٦) چەندایەتی رووتی کەر   كمية متجهة   Vector. Quantity

* (ئاراستە بڕ) گونجاوترەو چەسپیوە

(٧) گۆشەی سەرەوەیی   زوايا رأسية   Vertical angles

* (زاوية عليا) دەگرێتەوە، (سەرە گۆشە) راستەو گونجاوە .

پاشماوەی لاپەرە (٤٢):

(٨) هێلی ستوونەکی   خط رأسي   Vertical Line

* (سەرە هێڵ) یان (ستوونە هێڵ) لەسەرپێودانگی (راستە هێڵ) گونجاوترە .

**لاپەرە (٤٣):**

(١) ژمارەی شەپۆل،   عدد موجي   Wave number

* (شەپۆلە ژمارە) گونجاوترەو چەسپیوە .

(٢) ژمارەی شەپۆلی   سرعة الموجة   Wave Velocity

* (خێرایی شەپۆل) راستە .

## ئەنجام و پێشنیار:

بڵاوکردنەوەی نامیلکەی (زاراوەی کوردیی زانستەکان) ـ کە بەلای منەوە (زانستەزاراوەی کوردی) وردترە ـ هەرچەندە بەعەرەبی نووسراوە (في الفيزياء والرياضيات) و کوردی یەکەی بووە بە (فیزیاو کیمیا)، کارێکی پەسند ودڵخۆشکەرو پێویستە، لەگەڵ ئەوەش دا زۆر دواکەوت و دەبوو زۆر لەمەوپێش بوایەو پاڵپشت و یاریدەدەرێکی وەرگێڕانی کتێبە قوتابخانەیی یەکان و چاووگێکی درەوشاوەی هەموو بابەتە زانستی و رۆشنبیری یەکان بوایەو نووسەر و وەرگێڕ و خوێنەری کوردی لەو پاشاگەردانی یە رزگارکردایە، کارێکی وا مەزن و گرنگیش هی ئەوە نی یە بە کەسێك یان چەند کەسێك رابپەرێت و کەس بتوانێ بەتەنیا

ی بیروراوی ئەو کارە گرنگە بگرێتە ئەستۆ وراست وایە هەموو روشنبیریکی هەتەرو بەتەنگەوەبووی مەسەلەکەی تێ دا بەشداربێت سا هەمو ریگەیەك بێ و بەپێی گونجانی باری ئەو دەزگا روشنبیری و کەسانە هەرموەزی لێ بکرێت، تاکو بەپێی توانا بەرهەمی کارەکە کاڵ وکرچ و نەست و ترۆسك نەبێت، بەڵکو سەرچاوەیەکی وا پرشنگدارو تەسەل و مرون و شوێن متمانە بێت نووسەرو زاناو روشنبیری کورد لە دوودڵی و سەمینەوەو باوەر- بەخۆنەبوون رزگار بکات. . . ، بۆئەمەش رەنگە ئەم چەند سەرنجەی خوارەوە بێ سوود نەبن و، ئیستاش نەچووە بچێ و کردە پەشیمان بین لە نەکردەپەشیمان باشترە:

(١) باشتر وایە پێش ئەوەی لیژنەی زاراوە زانستی یەکان هیچ نامیلکەیەکی ئەم بابەتە بلاوبکاتەوە، دەربارەی هەر- زانستە بەنامیلکەیەك گرنگترینی ئەو زاراوە زانستی یانەی لەو بابەتە زانستی یەدا بەکار دەهێنرێن (ئینگلیزی و عەرەبی) یەکەی بلاوبکاتەوەو راستەو خۆش بینێری بۆ ئەو زاناو شارەزاو روشنبیرانەی لەو بوارانەدا دەستیان- هەیەو داوایان لێ بکات هەریەکە بەپێی تواناو سەلیقەو بۆچوونی خۆی لە ماوەیەکی دیاری کراودا بیانکات بە کوردی، دوای ماوەکە ئەو وەلامانە کۆبکرێنەوە سا یان هەر لە لایەن لیژنەی زاراوە زانستی یەکان خۆی یان لیژنەیەکی زاناو بەتواناوە هەوڵ بدرێ بژارو تەتەڵەو بەراوردبکرێن و باش و گونجاوترینیان لێ هەڵبژێرن و ئینجا چاپ بکرێت و ئەوساش بلاوبکرێتەوەو ماوەیەکی تریش دابنرێت بۆ بیرورا لەسەر دەربرینی پسپۆرو روشنبیران، دواجار جێگیر بکرێت، کە رەنگە ئەوسا ئەگەر پەسەندی هەموانیش نەبێت هیچ نەبێ گلەیی کەم بکاتەوە.

(٢) سوود لە هەموو ئەو فەرهەنگ و فەرهەنگۆك و نامیلکەو نووسراوو بلاوکراوانە وەربگیرێت کە هەن، بە تایبەتی ئەو زاراوانەی لە کتێبە قوتابخانەیی یەکان دا بەکار هێنراون، باش و گونجاوەکانیان پشتگیری و جێگیر بکرێن و واز لە ئایەخ و ناتەواوە کانیان بهێنرێت و ئەفەرۆزکرێن و گوێ نەدرێتە چەسپین و نەچەسپینی ئەو زاراوانە لەو کتێبانەدا.

(٣) بەچاوی بایەخ سەیری بەدەنگەوە هاتن و وەلامی روشنبیرانی دڵسۆز بکرێت و بەپێی گونجاوی و ریك وپێکی و ئاستی زانستی و زمانەوانی و زاراوەسازیی وەلامەکەی سوودی لێ وەربگیرێت و فەراموش نەکرێت و لەخەملین و جێگیرکردنی ئەو زاراوانەدا رەچاوبکرێن.

(٤) هەوڵ بدرێ هەموو ئەوزاراوە زانستی یانەی لەچەند زانستێکی جیاوازدا بەکاردەهێنرێن یەك بخرێن لەلایەن چەند پسپۆریکی شارەزا لەهەر بابەتێکی زانستی یەوە، تاکو وەرگێرو نووسەرو خوێنەرو فیرکاریش چەواشەنەبن.

(٥) لە دارشتنی زاراوە زانستی یەکان دا کارێکی وا بکرێت زاراوەکان پێش هەموو شتێك چەمکە زانستی یەکە بەوردی دەرببرن ئینجا لایەنە زمانەوانی یەکەو تا لە تواناداییت هەوڵی ژیاندنەوەو زیندووکردنەوەی ئەو وشەو زاراوە فۆلکلۆری یانە بدرێ کە لەگەڵ زاراوە زانستی یەکەدا دەگونجێن ئەگەر نەشبوو، دارشتنی زاراوەکە بەجۆریکی وابێ دووربێ لە دەقە وەرگێرانی پیت بەپیتی زاراوە عەرەبی یەکە بۆ ئەوەی دووچاری زاراوەی ناقۆلاو دزێو نەبین.

جا بەو گیانەوە هەر لەگەڵ نامیلکەکەم بەرچاوکەوت، وشە بە وشەییم بە بۆچوونی خۆم هەڵسەنگاند، گرنگترین و زەق و دیارترینی ئەو کەموکووری و ناتەواوی یانەم هەڵبژارد کە لە زاراوەکان دا بەدی دەکرین و هەوڵم دا بەپێی تواناو رەچاوکردنی ئەو خاڵانەی باسم کردن لە بیرورای خۆم دەستەی کۆر ئاگادار بکەم، بە هیوام توانیبێتم راژەیەکی بچووکی زاراوە سازیی کوردیم کردبێ و ئەرکێکی کەمی رووی مەجلیس نەبووی سەرشانم بەرانبەر بەو لایەنە پیرۆزە بەجێ هینابێ و داواشم ئەوەیە بەچاوی بایەخ سەیری بکەن و ئەگەر راستی یان پێکابوو سوودیان- لێ وەربگیرێت و لە داهاتوودا رەچاوبکرێن، سەرکەوتن و پشوودرێژی و لەخۆبوردن و کۆڵ نەدانیان ئاواتمە.

## ملخص البحث

# بعض الملاحظات حول كراس (المصطلحات الكردية العلمية) للهيئة الكردية في المجمع العلمي العراقي

جمال عبدول ـ السليمانية

لقد أصدرت الهيئة الكردية في المجمع العلمي العراقي مشكورة كراساً تعريفياً بالمصطلحات الكردية العلمية. ولأجل افادة أعم سلط الباحث في دراسته هذه الأضواء على تلك المصطلحات من خلال خبرته وممارسته العملية التربوية كتدريسي ومشاركته في أغلب لجان الترجمة واختيار المصطلحات العلمية المناسبة لدروس الكيمياء والفيزياء والبايولوجيا ـ الأحياء والنبات ـ وفي مقدمة البحث يقترح الباحث أن توزع مسودات المصطلحات مسبقاً على المختصين كي يكون هناك شبه اجماع على تسمية هذه المصطلحات. في الوقت الذي يثمن الباحث عمل الهيئة الكردية في اصدار وتعميم هذه المصطلحات الخاصة بالفيزياء والكيمياء والرياضيات يقترح جملة مصطلحات بديلة للتسميات التي أقرتها الهيئة الكردية وقد أولى الباحث من خلال دراسته هذه أهمية خاصة الى المصطلحات التي لها بدائل أخرى أكثر ملاءمة وانسجاماً، وعلى سبيل المثال لاالحصر يشير الى المصطلحات التالية.

دالة الحالة. زوايا متبادلة. تحليلية. مختلف التوازي. لاتناظر. ممتص. مركبة فعالة. شدة التيار. مضغاط جوي. طفو. نضيدة. انضغاط. مضغوط. مانعة الصواعق. عازل كهربائي. مولد كهربائي. متعاكس المغناطيسية. تصادم مرن ترتيب ألكتروني. المحتوى الحراري. المجموعة الفعالة. عدد كسري. توهج. هش. توليد. عازل حراري. حرارة التبلور. تخيلي. قوة حصانية. تخفيف لانهائي. متساوي الخصائص صاد للسائل. متوازي المغنطيسية. شبه منحرف. تحليل المتجهات. مجموعة شاملة. خط رأسي. سرعة الموجة. **وقد اعتمد الباحث في هذه الدراسة اضافة الى خبراته العلمية على كل المعاجم الخاصة بالمصطلحات والتي سبق وأن أصدرها بعض المعنيين من ذوى الخبرة والدراية التامتين بأصول وجذور المصطلحات العلمية.**

# گەشتی ژیانم

**مسعود محمد**

**ئاڵقەی (١٣)**

لە کانــوونی دووەمی ١٩٦٤ دەست بە گفتــوگــۆ کرا لەگــەڵ وەفـدی حکـومـەت بەڵام یەکەم ڕۆژ ی دەســت پیٚ کردنەکەم لە بیرنەماوە. لە ڕانیە کۆدەبــووینــەوە. هەرچی ڕوەتێکی سیاسي وەیا دەسەڵات وەیا لیٚ هاتویی بیـوو بوونە کوردانی ئەودەوروبــەرە دەهــاتــە کۆبــوونەکان بەڵام ئەوانی بۆ وتــوویــژ ی پێك هێنانی لیژنەی سەرپەرشتی کردن لە دوورەوە هاتبوون بۆ شوێنی خۆیان گەڕابوونەوە. ئەو دوو ئەندامەی مە کتەبی سیاسی بەردەوام بوون لە هاتــوبــاتی وتــوویــژ ی ڕەسمی. ڕاستی یەکەی لەلایەن خۆمانەوە چەنـد کەسـێـك قسـەی دەکرد ئەوی دیکە گوێ گر بوون. پێی ناوێ بڵێم ڕەنگــە خوێنــەر لەخــۆوە بزانیٚ بەهـەمــوو دەڵ حەزم دەکـرد موفـاوەزات سەربگرێت. چەندین جار لەچەند ڕۆژ ی جودادا وەفد دەهاتە ڕانیە وهەتا نانی نیوەڕۆو دوای ئەویش لەقــەدا دەبووین. ناوناوە دڵگەرمی دەگەیشتە ڕادەیــەك دەتگـوت ئیـــە مووی معـاویە دەپــێت، دووجار سێ جاریش وەهــابــوو متصــرفی سلێمـانی کە من بە زۆری لە تەنیشتی یەوە دادەنیشتم خەریــك بوو هەڵــستێت و بە نائــومێــدی بچێتــەوە بۆماڵی خۆی من دام دەنیشاندەوە نازانم ئەگەر وەهام نەکردایە کەسی دیکەی کە پایەیان لە دەسەڵاتی چەکداری هەبوو بەخۆیان ڕەوا دەدیت یاخود شەرمیان نەدەکرد لەوەی بە عوزر هێنــانــەوەوە متصـرف دانیشێننــەوە؟ ئەمە دەڵێم چونکــە سەرۆکی چەکــدار لە هیــچ جارێکــدا بەدەنــگ نەهــات بۆ تەسکینی متصـرف. دڵگـە رمی یـەکـەش هەرجارەی لەقسەی ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی یەوە پەیدا دەبوو دیبارە ئەویش ڕێ بەخۆی نادات پاشگەزبێتەوە. ئیتـر کەسی دیکـە بەحـەقی خۆی نەدەزانی لە حزوور ئەودوولایەنە خۆلە قسان هەڵقوتێنێ..

بۆم دەرکـەوت متصـرفی سلێمـانی، عمیـد سیـد عبـد الـرزاق سیـد محمـــود، بەدڵ و بی فیــڵ بۆئاشتی ی دەکــۆشـــا. لە ساڵی ١٩٦٥ کە حکـومـەت کەوتەوە سەر هەناردنی هێز بۆ کوردستان ئەو بیاوە استقالەی د

لە متصـرفـا یەتی... ئـەو دەمـە من وەزیـر بووم بەرهــەڵستیم کرد لەقبوڵ کردنی استقـالـەکـەی، وەزیـری داخلیە گوتی ئەگەر وەهابیٚ من استقالە دەدەم. ئەووەزیـرەش ناصـری بوو کە استقـالـەی دابـایـە دەبـوو هەمـوو ناصریەکان لیٚ دەرچن.

ڕۆژ ی (١٠) ی شوبــاتی ١٩٦٤ نزیـك نیـوەڕۆلێك ڕازی بوون پێك هات. سەرۆکی چەکـدار گوتی بڕۆن هەمـووتــان کۆببنــەوە بەیاننامەیەك بنـــووسن بە ئارەزۆی خۆتـــان و بەپێی بەرژەوەنـــدێکی ڕەچاوی دەکـەن من ئیمزای دەکەم. لە هۆڵێکی گەورە هەرچی براگەورە و قسـەزان و زایتی یەنـابـەر هەبوون بۆ ماوەیەکی پێویست لەسەر چەند خاڵێك ڕێك کەوتن. من بەیاننامەکەم نووسی، لەگەڵ ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی بردمانەوە بۆ لای سەرۆکی چەکدار و پێمان گوت ئیمزای بکە. دەقی بەیانەکەم لانی یە بی نـــووسمـــەوە بۆ خوێنــەر بەڵام لەو ڕەوژەدا کە ڕوژەڕەش بوو لەلایـەن نەداری و بیٚ دەســەڵاتی یـەوە شتێـك بوو تێکـڕای خاوەن ڕایان پەسـەندیان کردبوو، هیچیشی تێدانەبوو یەك دانە پۆلکەی ڕزیو لەکیس کورد بدات.

متصـرف وەهـا گەشـایـەوە دەرحـاڵ بەیـانەکەی لەگەڵ خۆی بردو بەو ڕێگـەی قوڕاوی ئەوســا لەو وەختــە مەیلەو درەنگـەدا ملی لیٚ نـا بۆ بەغـدا هەمـــان شەو لەڕادیــۆی بەغـدا خوێنـدرایـەوە. لە خەڵقم دەبیستــەوە چ خۆشیەکی خـــتبوە وڵات.

پاش ئیمزاکردنی بەیانەکە هاتوچۆی متصرف نەپسایەوە بۆجیٚ بەجیٚ کردنی پێـداویستیکی هەبیٚ. خەڵقی دیکـەش دەهــاتن بۆڕانیە، لەوانە، وەفدێکی (صحفی) بوو هی قاهیرە شیان تێدا بوو لەناویاندا جلال کشك نووسەرێکی ڕوزالیوسف بوو کەچۆوە قاهیرە مەقاڵێکی ڕێکوپێکی لەسەر ئەو سـەفــەرەی خۆی و وەزعی کورد و کەســانی کە دیبـــوونی نووسی بوو نەختێکیش باسی منی تێدا بوو.

لەمارتی ١٩٦٤ خدری حاجی ڕەسواغای پژدەر گیانی سپارد. تازیەی

له دیێ گەرمکانی بناری ئاسۆس بەدیوی پژدەردا بوو. من لە شۆینیکی نزیك بەو دێیە بەکەلەك لە زێ پەڕیمەوە یەکەم جار بوو سواری کەلەك ببم کە بریتی یە لە دارەڕییەکی شاش بەسەر چەند کوندەیەکی فوو دراوەوە ، وەختە بلێم کەلێنی نێوان ڕایەلی دارەکان پتر بوون لەدارەکان خۆیان : دەتتوانی لەو کەلێنانەوە بەگۆلم ئاو بخۆیتەوە، ئنجا من مەلەش نازانم . . دەترسام بەلاّم نەم دەهێشت ترسم پێوەدیار بێت. لەو تازیەیە بووم دیتم لە دوورەوە، لای سەنگە سەری نوێ کۆیتە ڕێك نیشتەوە دوای ڕۆژ یك بیستم ڕۆژنامەچی تێدا بوون نوێنەریکی حیزب گوتبووی بەیانەکەی دەی شوبات هەموو شتێك نی یە، بەند هەیە نهێنی لەوێدا نەنووسراوە. حکومتی بەغدا زۆری پێ ناخۆش بوو ڕۆژ یك دوانی دیکە چوومە سەنگە سەر ئەم مەسەلەیە قسەی لێ وەکرا : وەها پەسەند دیترا بەدرۆخستنەوەیەك لە زاری سەرۆکی چەکدارەوە بلاو بکرێتەوە. من دەقەکەیم نووسی بەجۆرێك حکومەتی ڕازی کرد ئەمە جێی ئەوەشی تێدا دەبۆوە. ئەگەر بەندی نهێنی هەبوویێت بەدرۆخستنە وەکە ڕەشی نەکردبێتەوە : نووسی بووم هەموو بەیانێکی ئەوتۆیی بە ناچاری هێندێ تەفسیلاتی دەبێت کە لزوم نەدیترێ بە بلاوکردنەوەی بێ ئەوەی پێی بگوترێ بەندی نهێنی . . دوای یەك دوو مانگ کە هاتمە بەغدا قەرەنی دوغرەمەچی گوتی حکومەت بەو تەکزیبە زۆر کەیفی هاتبوو کەچی نە تەکزیب بوو نە هیچ . .

پە ڕاگەندەی شارەکان بەتایبەتی کۆیی یەکان ڕوویان کردەوە کۆیێ ، مالی منیش لە مانگی نیسان گەڕایەوە کۆیێ ، من ناوناوە سەفەری دیوی ڕانیەم دەکرد کارێکی زۆرم بە ملەوە بوو بەتایبەتی هی ئەو موەزەفانەی فەسل کرابوون. بۆگەلێك سەروبەری ئەو بەیانە دەبوو هاتوچۆی بەغدابکەم ، چەند جاری چووشبام خەبەرسازان و خاوەن نیازان لە دەرەوەو ناوەوە پێوەندی یان پێم دەکرد تائەوەی هەندێ جار بە شەو لە جێگەی وەها دیدەنیم دەکردن نە خاوەن مالم دەناسی نە سەرەدەریم لە گەڕەکەکەی دەکرد بەلاّم هەرچی گوترا بێت و پێش نیاز کرابێت لەو دیدەنی یانەدا بابی موویەك منی نەبرد بەلای تێك دانەوەی ئەو ئاشت بوونەوەیە، ئەم جیهانەی سیاسەت زۆر چلکنە، گەلێك چلکنترە لەوەی بە خەیالت دا دێت ڕێگا چلکنەکەشی چەشەی وەها لە مجێزی تێدایە کورم دەوێ خۆگیری لێ بکات.

بەپێی پێویست ناوناوە سەردانم لە سەرۆك وەزیران فەریق طاهر یحیی دەکرد ، بۆلای وزیری داخلیە (حاکم عسکری عام) رشید مصلحیش ڕیگای هاتوچۆم کرایەوە بوو. من لە تەبیاتم دا نی یە بە ناچاری نەبێ خۆم لە کاربەدەستی حکومەتی نزیك بکەمەوە. جارێکیان لە وتووێژدا گوماناوی بووم سەرەك وەزیران گوتی : باوەڕت پێم نی یە؟

گوتم : أنـا أثق في طاهـر يحيى ولكن لاأثق في رئيس الـوزراء ، چونکە وەك لە شتی عایەد بەخۆی دەتوانێ دروست بێت ناتوانێ لە شتێك کە لە زۆر لاوە تاوی بۆدێت ئەو دروستە بێت . بێ گومان طاهر یحیی ژ یرتر بوو لە عبدالسلام پتریش متمانەی پێ دەکرا. ناشیەتە بیرم لەو هاتوچۆیانەم دا سەرم لە عبدالسلام دابێت.

نێوانی مەکتەبی سیاسی و سەرۆکایەتیّ چەکدار بەرەو لێلتر بوون دەبۆوە جارێ موویان نەپساندبوو هەولێك درا بۆچارەسەوکردنی گیروگرفتی نێوانیان بەناوبژ ی کردن لەلایەن کۆمەلێك لەکوردە پەروشدارەکان و خاتر ویستراوەکانی بەغداوە. من لەبەر مەشغەلەتی کە پێم سپێردرابوو نەمتوانی بە کۆبوونەوەی یەکەمیان ڕابگەم کە لە ڕانیە لەگەل سەرۆکی چەکدارانیان کردبوو. ڕۆژ ی دوەم کە گەیشتمە ژووری لێ کۆبوونەوە یان و سەلامم کرد یەکێك لەو کوردانە لەجیاتی وەلاّمم گوتی هەموو شتێکمان تەواو کردوە هاتنی تۆی پێ نەدەویست. گوتم خەبەری خۆشتر پە یدا نابێ لەوەی ڕزگارم بکا لە دەردی سەری چەقەچەقی موناقەشە. نووسراوێکی ئیمزا کراو لەلایەن سەرۆکی چەکدارانەوەیان دامێ کە ڕێك خرا بوو بەناوی داخوازی یەکانی کوردلە حکومەتی عیراق. کە خوێندمەوە دیتم هەرە شەی قورسی تێدایە دەتگوت هی شەڕ پێ فرۆشتنە گوتم هیچ بەرهەلستیم نی یە لەو شێوازە توندە بەمەرجێك کە بزانین ئەمە ئەرزوحالی محامی نی یە تا ئەگەر حاکم ڕەفزی کرد هیچی خرابی لێ ڕوونەدا ئەمە داخوازیی میللەتێکە لەڕێگای سەرۆکی چەکدارەوە بۆحکومەتێك ئنجا دەبێ لەحالی ڕەت کردنەوەیدا دەست بکرێتەوە بە شەڕ. . تێکرایان قسەکەمیان پەسەندکرد. بابی ئەوەی لە ڕەفز کردندا شەڕ پەیدا نەکات شێوازی نووسینەکەمان گۆڕی . . سوبحانەللا لە پێنج دەقیقەدا دەرکەوت هاتنەکەم بێ ئرۆم نەبوو سەعاتێکیشی نەبرد تێ گەیشتم ئەو کابرایە بۆچی وەها بە ڕەهایی و دلنیایی گوتی هەموو شتێك تەواو بووە : تومەز توانی بووی بەهانە بدۆزێتەوە بۆپێویستی بەرژەوەندیکی کورد بە دوو نامە لە سەرۆکی چەکدارەوە یەکێکان بۆسەرۆك کۆمار ئەوی دیکەش بۆسەرەك وەزیران خۆیشی کاغەزەکانی وەرگرتبوو هەتا باشتر و مسوگەرتر بیانگەیەنێتە جێگەی مەبەست. دواتر کە خەلقەکە گەڕانەوە بەغدا منیش بۆ ئیشێك چووم ، دیتم کابرا بەدەست ئەو دوو کاغەزەوە گیری خواردوە. گوتی چەندی تەلەفۆن دەکەم بۆقصری جمهوریو جێگەی سەرەك وەزیران کە کاغەزی ئەوتۆیم پێ یە دەبێ خۆم بەدەستیان بگەیەنم کەس گوێم ناداتی . . یەك دوو ڕۆژ ی دیکە گوتی : باوکیان وەها وەها لێ بکەم بە پۆستە کاغەزەکانم هەنارد . پێم گوت فلان تۆ کە هێندەت مەبەست بوو بگەیتە ئەو شوێنانە دەم توانی من یاریدەت بدەم چونکە هەر کاتێك بمەوێ دەتوانم بیان گەمێ . . . سبەینە لە سەردانی فەریق طاهر یحیی پێم گوت حەز دەکەم لە دەرفەت دا مجاملەیەکی فلانەکەس بکەیت . . دوو ڕۆژ ی نەبرد ئەو مجاملەیەی لەگەل دا کرد.

گرووپی کوردەکانی بەغدا تەکلیفیان لە سەرۆکی چەکداران ئەوە بوو

کە وا لەگەڵ مەکتەبی سیاسی ئاشت بێتەوە. لەپاش گەلێك وتووێژی ئەندامێز قسەی خەڵقەکەی هەڵ گرتەوە بەڵام گوتی: پسندیدم گرچە مصلحت ندیدم، واتە: سەلماندم هەرچەند بە مەصلەحتیشی نازانم. لەم بارە هەستیارەدا نەشرەیەکی شکڵ بەیانی سیاسی لە مەکتەبی سیاسی یەوە دەرچوو بریتی بوو لە دەوری ١٥ ـ ١٦ رووپەڕەی پڕ لە رەخنەی هەرە هەرە بڕندە دەربارەی رێك کەوتنەکەی دەی شوباتی عەرەبیەکەی لەژێر سەرناوی (أسلم یاخود اصلح ام (استسلام)دا بوو هەرچی حەق و ناحەقە لە توانجی تفت و تاڵ و ژاڵ بەو رێك کەوتنەوە گوترا بوو:

کاتێك موفاوەزارت بوو بە دوا ئەویش دا بەیان بڵاو بۆوە ئەندامێکی هەرە بەهێزی مەکتەبی سیاسی لە دەرەوەی عیراق بوو. کە هاتەوە ئەو بەیانە دەرچوو بەو هەموو هێرشە لەحەد بەدەرەوە. ئەوسا مەکتەبی سیاسی کە هەموو ئەندامانی بەقوتابی ئەو ئەندامە بەهێزە (وا بزانم سکرتێری حیزبیش بوو) حیساب دەکران بەبەریەوە نەبوو خۆی بەرانبەر بیروڕاو خوایشتی رابەری روحی خۆی راگرێت. بەیان کەئیمزا کرا لەلایەن سەرۆکی چەکدارەوە بەقسەی نوێنەری حیزب ئیمزا کرا.. بەڵام مەنتیق کەرو لاڵە ناتوانێ لەگەڵ خوازی نەفسی ئادەمی هیچ بکات، خوازیش لەوانەیە سەرکێشی بێت و لەوانەیشە تەسلیم بوون بێت..

خەڵقەکەی لە رانیە بەلای خۆیانەوە سەرکەوتوو بوون لەو ئامانجەی بۆی هاتبوون کەوتبوونە سەر خۆ کۆکردنەوە بۆ گەڕانەوە بەغدا دەتگوت کەس ناپەرژێ خۆ لە مەدلوولی ئەو هێرشە کوشندە یەی مەکتەبی سیاسی بگەیەنێت. ڕاستی‌یەکەی بێ ئەوەی ورتە لە کەسەوە بێت سری و گێژی‌یەك خەڵقی تەنی بۆوە.

لە کۆتایی مایس وەیا نەختێك زووتر سەرەك وەزیران سەردانێکی سەرۆکی چەکداران و هاورێکانی کرد لە دوکان. بەیەك گەیشتنی هەر دوو لایەن زۆر بە گەشی و خۆشی چووە سەر تائەوەی لە تەکلیف دا شەوێکیش لایان مایەوە بەمیوانی لە ڕانیە. ئەو بەینە هەتا بەرچایی سبەینەش تەواو دەبێ خیلاف لە نێوانیان دا نامێنێ و لەسەر هەمووشتێکی باس کرابێت پێك دێن:

من لەوێ نەبووم بەڵام بۆیان گێڕامەوە کەوا بەر لە هەڵستانی سەرەك وەزیران بۆ گەڕانەوە بەرەو بەغدا یەکێك (وەك پێم گوترا ئەو ئەندامە بووە کە بەیانەکەی «استسلام»ی نووسی بوو) گرفتێك قسە لێ دەکات بوو بەهۆی هەڵوەشانی ریسی ئەویەك دوو ڕۆژە. من چیم گوێ لێ بووە ئەوە دەگێڕمەوە، لە زۆر کەسیشم بیستوە، تەنانەت دوای ئەو یەکتردیتنە لە دوکان و ڕانیە کە سەردانی فەریق طاهر یحیام کرد لە بەغدا ئەویش هەمان شتی گوت. بەدەست خۆم نەبوو لە شێوەی گلەیی بە طاهر یحیام گوت: کێ زەرەری دەکرد ئەگەر خەبەر بە من درابایە لەو یەکتر دیتنەدا بەشدار بم؟

ئەمە دەڵێم چونکی بە ڕاشکاوی و دڵنیایی و لەخۆ ئەمین بوونەوە لەوانە بووم بێ پەروا لەسەر بەیانی دەی شوبات و هەر رێك کەوتنێکی بەدوای‌دا هاتبێت بکەمەوە چونکە لە گۆشەنیگای کەسێکی سەربەخۆی وەکوو منەوە رێك کەوتن بە ڕوونی و بێ پەردە دەدیترا نەك لە پشت چاویلکەی سیاسەتی حیزبی و هەق و حسێبی پەنامەکی یەوە. بە هەمە حاڵ کەسانێکی لەو یەکتردیتنەدا مافی بیروڕا دەربڕینیان بەکار نەهێنا لەبەر هۆی هەمەچەشنە هەر خۆیان بوون لە وتووێژەکانی گشتی قەڵادزەش لەبەر هەمان هۆی هەمە چەشنە لەسەر بەرژەوەندی خۆشیان بەدەنگ نەدەهاتن. هەڵبەت من وەکوو ئەوان نەدەبووم. من هەر نەبێ لە سێ نوختەی گرنگەوە تەجرەبەی جودام هەبوو لەچاو ئەو خەڵقە: نوختەی یەکەم ئەوە بوو، من لە نیابەت دا ڕووبەڕووی دەوڵەت دوواوم. نوختەی دووەم ئەوەبوو لە تەمووزی ١٩٦٠ بیروڕای گرنگم بڵاوکردەوە بە ڕەخنە لە سیاسەتی حیزب. نوختەی سێ‌یەم ئەوە بوو کە من ئەو زەرەرە قورسە ناکەم لە دەربڕینی بیروباوەڕ وەك کە خاوەن بەرژەوەندی زل دەی‌کات. زەرەری من تەنها لەوەدا دەبوو کە قازانج ناکەم..

هەرچۆنێك بێت من ئێستا کەدێم ئەم کۆنە خەرمانە دەکوتمەوە مەبەستم نی‌یە کەس زەدە بکەم: شتێکە پێوەندی هەیە بە گەشتی ئەو ڕۆژگارمەوە ناشێ خۆمی لێ خامۆش بکەم، هەلێکیش بوو لەدەست چوو وەك زۆر هەلی دیکە کە یەکێك لەوان هەر ئێستا دەی گەمێ:

سێ مانگێك بوو ئاشتی‌نامەی شوباتی ١٩٦٤ ئیمزا کرابوو لە سەفەرێکی بەغدام دا کاتێك بە کتێبخانان دا دەگەڕام بۆپەیداکردنی نوسخەیەکی کتێبی (هەڵستان و کەوتنی ڕایخی سێ‌یەم) هەتا بی‌کەمە دیاری بۆ (سەلیم فەخری) کە ئەوسا لە قەڵادزە و ڕانیە بەسەری دەبرد، لە یەکێك لەو کتێبخانانەدا کابرایەکی شکڵ بێگانە بەنامەی تەماشاکردنی کتێبان هاتە تەنیشتمەوە بێ ئەوەی ڕووم تێ بکات بە ئنگلیزی‌یەکی شکستە دەنگی هەڵبڕی بایی ئەوەی هەر من بی‌بیسم گوتی: لایەنێك هەیە دەیەوێ لە بابەت مەسەلەی کوردەوە بت دوێنێ، ئەگەر ئامادەیت بە دوات دا دەنێرێت.. گوتم ئامادەم.

بەشەو منیان بردە شوێنێك و ماڵێك کە نەم دەزانی کوێ‌یە. بابایەك بە ئینگلیزی‌یەکی ڕەسەن قسەی دەکرد گوتی من نوێنەری هێزێکی زلم و ئاگاداری پەناو پەسێوی سیاسەت هەم. حکومەتی عبدالسلام هیچ مافێك بۆ کورد ناسەلمێنێ ئەگەر ئەو بڕوات حکومەتێك دێت لەگەڵ کورد ڕێك دەکەوێت. ئێوەش دەتوانن لەڕێی شەڕەوە بێ‌هێزی بکەن. هەرچی یارمەتی‌یەکی بتانەوێ لە چەك و پارەو بژێو بێ‌حیساب بۆتان دێت.

بۆمن پێشنیازەکە هێند کوتوپڕ بوو، ئەرکی زۆر و تەمای گەورەشی تێدا بوو، هەڵوەستێکی پێ کردم هەتا ئەم پرسیارە خۆی ڕەپێش کرد، لێم پرسی: ئێوە وەیا ئەو هێزەی تۆ وەکیلیانی چ سوود دەبینن لەو مەسرەفە

قورسەی بەملەوەی دەگرن؟ گوتم پێشنیازەکە بۆ ئێوە doesnt seem duisiness like واتە لە مامڵەتی سوودبەخش ناچێت. گوتی: بۆ ئێمە دامەزرانی کورد ئاسایش و هێمنی پێوەیە سوودی لێ دەبینین.

وەڵامەکەی متمانەبەخش بوو، ڕەنگە زووتر خەیاڵی لێ کردبێتەوە. گوتم دەمەوێ بزانم، بە وردی یارمەتی یەکە چەندە؟! گوتی بێ سنوورە.

من کابرایەکی حوقەبازو دنیادۆست نیم مەبەستم خۆتەسەڵ کردن بێت و بەس چونکە ئەگەر ئەمەم مەبەست بوایە هەلی باشم بۆ ڕێك کەوتبوو بەر لە شۆرشی تەمووزو لە دەورانی عەبدولکەریمیش دا خورجینەم پڕبکەم. لەم حاڵەتەدا جگە لەوەی کە من هاندەری سوودی شەخسی پاڵی پێوە نەدەنام چارەنووسی ئەو ڕەش و ڕووتەی لە هاتنەوەی شەڕدا ماڵ کاوول دەبن، ئا ئەویش لغاوێکی قورس بوو دەخرایە زاری هەر تەمایەکی بیژۆکی کە وەکوو وەسوەسەی شەیتان لەگوێی حەزو مجێزی نەفسی خوازۆکی بچرپاندبایە. پێی ناوێ بێ لزوم بەرگی دەروێشایەتی لەبەر ئەوسای خۆم بکەم وبڵێم دڵم لێی نەدا بۆ گەشەگەشەی تێکەڵ بوون بە کاروباری گرنگەوە کە دەوڵەتانی تێدا لایەن بن چونکە ڕاست نی یە. بەڵام بێ دوودڵی و بێ گومان لەخۆکردن و بێ خۆگنخاندن ئامادە بووم خەزینەی قاروون ڕەت بکەمەوە بەرانبەر بەشداری کردن لە نانەوەی هەرایەك سوودی میللەتی تێدا مسۆگەر نەبێ.

من چ باوەڕم نەبوو بە عبدالسلام کە لە پیاوچاکی خۆیەوەو لە عیشقی چاوی کاڵی کوردەوە دەستی بۆ ئاشتی درێژ کرد وەیا بە تەمایە دان بنێ بە کورد و مافی کورد بەڵام دڵم نەیدەهێنا من یارمەتی گەڕانەوەی شەڕ بدەم بێ ئەوەی توانی بێتم کوتەکەکی لەسەر خۆکردنەوە بخەمە ناو دەستی کوردەوە وەیا چ ئومێدم هەبێت بە پاداشێك کورد پێی بگات لەبری ئەو کارەساتەی بەسەری دێت. بەڵێ: دەزانم و دەشم زانی بەخۆگێرانەوەم لە یاریدەدانی گەڕانەوەی شەڕ دنیا بۆ کورد تەباو ڕەبا نابێ و ئەو لایەنەی یەخەی منی گرت واز لە نیازی خۆی ناهێنێ و هەموو کابرایەکیش وەکوو من نییە چارەنووسی میللەتی بێ پەناو دەرەتان پێش هەموو حیسابێك بیەخێتەوە، بەڵام خۆ دەم توانی من نەبمە پۆستەچی ئاگربازی و پەندیاری کوشتار و سووتار. هەر بۆیەش بوو بە بەڵێنی بێ سنوور کەوا ڕەنگە دەریایەك بێت و ڕەنگیشە کاسەیەك پڕنەکات دڵم تێراو نەدەبوو. لەو دەمەدا کە مێشك و دڵم لە ئاست ئەو بەڵێنە بێ سنوورەی کابرادا تێکیان دەهاویشت تەنها یەك ڕێگەی قسانم هاتەبەر هەست کە پێی دا بڕۆم و زەرەری لێ چاوەڕوان نەکرێت: گوتم: چەند کاتت پێ ویستە بۆ ئەوەی پرس بەو لایەنە بکەیت کە خۆت نوێنەری ئەویت لەبارەی ڕاستینەی یارمەتی یەکی بە کوردی دەدەن، من هەتا وەڵامت بۆ دێتەوە لەئاست ئەو پرسیارەدا بەغدا جێ ناهێڵم.

کە ئەمەم دەربڕی کابرا بێ وەخران، یەکسەر گوتی: egnore every thing واتە: چی گوتوومە لەبیرخۆتی ببەرەوە.

ئاوێك بە ئاگر داکراو کوژایەوە: یەك وشەی دیکەی لە زار دەرنەچوو بەلای شەڕوئاشتی و کوردو حکومەت دا بچێتەوە. لەوەش بەولاوە ببرای ببرای جارێکی دیکە کەس لەبەرەی ئەو هێزە زلەوە سەری لێ خوار نەکردمەوە. دوای پشوویەکی کورت دانیشتنمان کۆتایی هات بە دەست گوشینێکی ساردوسڕ. لەم تەجرەبەمەوە دوو شتی بنەڕەتیم لێ ڕوون بۆوە: یەکیان ئەوەیە لایەنی وەها بەهێز لەباری وەهادا بەڵێنێك نادات بۆ هەڵخەتاندنی کاتەکی، چی بێ لێ بە تەمایە تێی دا ڕاست گۆ بێ دەنا کابرا دەیتوانی دوای چەند ڕۆژێك لیستەیەکی ساختەم بداتێ کە جێی ڕەزامەندیی گومانکارێکی وەکوو من بێت و پێشەکیش یەك دوو لوقمەی چەور بهاوێتە سەرخوانەوە هەر کاتێکیش تێوە گلاینەوەو دەستمان لە پنچکان برا ئەو داناشە بخاتە نێوان بەرداشی شەڕەوە کەخۆی بە چاکی دەزانێت بۆ سوودی خۆی. دووەمیان ئەوەیە، کە لە بەرنامەی لایەنی بەهێزی ئەوتۆرا نی یە خۆی بردە باری بەڵێنێك بکات لە ئاست بێ دەسەڵاتی وەکوو کورد کە بە عادەت لە ئاست دەوڵەتێك دا دەی کات، ڕەنگە دەوڵەتی بێ دەسەڵاتیش لە تەرازووی ئەودا فەرقی هەبێت لەگەڵ هی مەیلەو بەدەسەڵات. لەمەوە دەتوانم بڵێم چ کوردێك لەباری وەك ئەو بارەی منی تێدا بووم هێندەی ڕووەت و گرنگی بەخۆیەوە نەدیتووە توانی بێتی بەرانبەرەکەی ناچار بکات نوختە لەسەر پیت دابنێت: هەر ڕێك کەوتنێکی ئەوتۆیی لەگەڵ دەسەڵاتداری بێگانەدا بووبێت لە شێوەی سەلماندن و مل نانی بێ پەیمان و پرسینەوە بووە. ئەم دیدەنی یە بێ ئەنجام و تام ناخۆشە ناچارم دەکات بازبهاوێژم بە قەڵەمم بۆ ساڵی ١٩٦٥ کە بە باوەڕی من لەو ساڵەدا شتێك ڕووی دا بەرهەمی هەوڵی ئەو هێزە بوو کە بێ سوود و ئەنجام بوو لەگەڵ من دا.

لە دەمی ئاشتی دا بووین، جارێکیان لە نزیك دەربەندی بازیان قافڵەی جەیش لێی درا بێ ئەوەی هۆیەکی بەرچاو هەبێت. من چوومە سەفەرێکی لای ڕانیە. لە دانیشتنێکی دووقۆڵی، سەرۆکی چەکداران گوتی: کە چوویتەوە بەغدا سەرۆك کۆمار عبدالسلام دەبینیت لە زاری منەوە پێی بڵێ فلان سەلامی هەیەو دەڵێ ئەوانەی لە قافڵەی جەیشیان دا خائینی میللەتی کوردن.. ئەگەر بمزانی بایە سوودی دەبێت هەمووم دەگرتن و دەم ناردن بۆی هەتا لە باب الشرقی بە سێدارەیانەوە بکات. بەڵام نە ئەوان بەڵکوو خۆیشم بەپەتەوە بکرێم فەرقێك ناکات چونکە لایەنی لەو گەورەتر ئەمری بەسەرەوەیە کە دەبێ شەڕ لەگەڵ کوردان دەست پێ بکاتەوە ئنجا هەر ئەوە لە بۆ من دەمێنێتەوە کە بگوترێ پێشمەرگەی کوردی بە کوشتن دا. ئەم هەرایەش کە بەرپا دەبێتەوە لە ناکام دا خۆی، واتە عبدالسلام، تێ دەچێت.

کە گەڕامەوە بەغدا دەبوو هەر بچم بۆ قصری جمهوری چونکە لەو

سەفەرەم دا وەزارەت هەڵوەشابووەو پێك هاتبۆوە منی تێدا مابووەمەوە، دەبوو بچم سوێند بخۆم لای سەرۆك کۆمار کە ئەوسا نەساغ کەوتبوو لە چەند ڕۆژێکیش دا، وەك لەبیرمە، ئاڵووی دەرهێنا کە چوومە لای لە نوێن دا بوو. دوای سوێند پێم گوت ڕاسپاردەی قسەم هەیە دەبێ پێی بگەیەنم: چەندێکی لە توانام دا بوو دڕیو تیژایی قسەکانم لە مەخمەڵ و ئاوریشمی تەعبیری نەرم ونۆڵ دا سەرپۆش کرد بێ ئەوەی هیچ شتێك لە مەبەستەکە بشارمەوە. چەند تروکەو چرکەیەك، ڕوو لە سەقف، ڕاما ئنجا گوتی: دمايات العالم برقبة هذا الظالم.

تۆ سەیری! وەڵامی سەرۆك کۆمارێك لە بەرانبەر قسەی وەها ترسناك و ناکام بەخش ئەو دوو وشە ساردوسڕە بێت کە بە عادەت خەڵق بە دەوری یاریی دامەو تاوڵەیەوە دەڵێ. ئەو بەشەی قسەکان کە گەڕانەوەی شەڕی دەگەیاند بەتەواوی هاتەجێ. تێچوونی عبدالسلامیش هەر گەیشتە جێ ئەگەرچی دەشێ کاری ڕێکەوت بێت. .

نێوانی سەرۆکایەتیی چەکدارو مەکتەبی سیاسی ڕۆژ لە ڕۆژ دژ وارتر دەبوو تا ئەوەی گەیشتە پلەیەك جارەك لە جارانی یەکتردیتنم لەگەڵ سەرۆکایەتیی چەکدار ڕووی لێ نام کە بە پاڵ پشتی ئەو قبوڵ بکەم ببمە سکرتێری حیزب: بەکورتی حەق وحسێبەکە دەگێڕمەوە، پێم گوت نە من دەبمە داود صائغ (کە وا عبدوالکەریم لە جێگەی حیزبی شیوعی مێژوویی عیراقی چاند) نە داود صائغ بە کەلکی تۆ دێت. . یەکێك لە ئەندامانی حیزب یاریدە بدە بۆ سکرتێرایەتی نەك لەلاوە شەتڵ بهێنی و تێ چێنی بکەی. حیزب ئەو حیزبەیە لە سەر ڕگی خۆی هەڵستابێت. . .

زۆر قسەی دیکەش هەن پێویست بە گوتنەوەیان نی یە. وەك بۆم دەرکەوت و لە زۆر کەسیشم دەبیستەوە. گەلێك کەس بە قسە لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بوون و دنەیان دەدا بۆ بەرهەڵستی کردن لە سەرۆکایەتیی چەکدار هەتا ڕادەی بەگژدا چوونەوە، بەڵام لە کردەوەدا هەڵوەستیان جۆرێکی دیکە بوو.

لە سەروبەری ئەم تێك چوونەی نێوان دوو لایەنی بەهێزی بزووتنەوەدا دوو خاڵ هەیە پێویست دەکات بیان نووسم. خاڵی یەکەم ئەوەیە کە من لە وتوێژ دەربارەی چەندوچۆنیی کەسان وشتان، لەگەڵ سەرۆکایەتیی چەکداران پرسیکم کرد لەوەدا ئایا ئەندامە چالاکەکەی کە بەیەکەوە من و ئەو بەیاننامەی دەی شوباتمان دایێ ئیمزای بکات، ئایا تاچەند بەدوا خوایشتی سەرۆکایەتی دا دێت؟ گوتی، ئەگەر داوابکەم هەتا بەغدا بە تەقڵە دەڕوات [ئەمە دەقی قسەکەیەتی] من بەدەنگ نەهاتم. .

خاڵی دووەم ئەوەیە کە من لە ساڵی (وابزانم ـ سەرەتاکانی) ١٩٨٧ بیستم ئەو ئەندامە لەلایەن سەرۆکایەتیی چەکدارەوە لێی داوا کرابوو لە هەڵبژاردنی ئەندامانی مەکتەبی سیاسی [یان زاراوەیەکی دیکەیە من نایزانم] خۆیالاوتە بکات بۆ سکرتێرایەتی. . ئەویش بە برادەرانی ڕاگەیاندبوو کە ئەو تەکلیفەی لێ کراوەو بەچاك دەزانێ قبوڵ بکرێت و بۆ ماوەیەك هەتا گرێ‌وگاڵ دەرەوێتەوە سکرتێری حیزب کنارەگیر بێت، دوای بەینێك دەشێ بێتەوە کایە. بەڵام لێی نەسەلمێندرابوو. هەرچەند لەبەر هاتوچۆی بەردوام بۆ بەغدا هەموو وردو درشتی کەین و بەینی کوردەواریم نەدەزانی بەڵام لەوە ئاگادار بووم کەوا ڕۆژ لە دوا ڕۆژ نێوانی مەکتەبی سیاسی و سەرۆکی چەکداران ناخۆشتر دەبێ، خۆیشم شایەدی ئەوە بووم کە هەندێك لە ئەندامی خوێن گەرم پێکۆڵی شەڕ دەکەن.

ڕۆژێك لە ڕۆژانی ئەو قۆناغە، لە ژوورەکەی سەردەمی قوتابیەتیم، لە ئوتێلی فلۆریدا بووم، کوردێکی ناوداری بەغدا لەپڕ بە حەماسەتێکەوە هاتە ژوور بێ سەلام و کەلام هێرشێکی هێنا بۆم گۆیا من بەدوا مەنصەب دا دەگەڕێم. وەی کە لە دڵم گران هات. قسەیەکی یەکجار قورسم بەزاردا هات بۆ هەر کەسێکی چاوی بڕی بێتە مەنصەب. . یەکسەر بەغدام بەجێ هێشت و گەڕامەوە بۆ لای سەرۆکایەتیی چەکدار کە ئەوسا لە چوارقورنەی بیتوێن بوو. حیکایەتەکەم گێڕایەوە بۆی و گوتم خۆت و دەزنوێژت تازە ناچمەوە بەغدا. گوتی چاکە ئەتۆ کە سەغڵەت بووی دێتە لای من دەردی دڵت هەڵ دەڕێژ یت ئەدی ئەمن بچمە لای کێ پێم دەڵێن کوردستانی بە سێوو پرتەقاڵ فرۆشت. . گوتم تۆ چارت نی یە دەبێ تەحەمول بکەیت بەڵام من ئەو ناچارە نیم، لە ماڵی خۆم دادەنیشم بە محاماتەوە خەریك دەبم. . دوای ئەمە نامە نووسران بۆ کوردی بەغدا کە فلانەکەس لە خۆوە هاتوچۆی بەغدا ناکات و دەبێ یاریدە بدرێت. .

کە گەڕامەوە بەغدا ڕۆژێك کریم قرنی هاتەلام گوتی بەم زووانە سەرەك وەزیران بەدوات دا دەنێرێت بۆ وەزارەت. . کریم قرنی دۆستی فەریق طاهر یحیی بوو، بێ پرس دەچوە لای. . من ئەو قسەیەم بەجێ هێشت بۆ بڕیاری ڕۆژانی داهاتوو چونکە هیچ هەنگاوێکی منی نەدەگۆڕی: دەبوو ئەوەی لێم داوا کرابوو لە لایەن کوردەوە تاپێم بکرێ بە ئەنجامی بگەیەنم، خۆ بە تەلەفۆنیش نەم دەپرسی لە سەرەك وەزیران ئەرێ خەبەرەکە چەندی ڕاستەو چەندی. . . ؟

دوو ڕۆژ ی پێ چوو طاهر یحیی داوای کردم. پێشتر وەها دەبوو داوای دەکردم بێ ئەوەی تەکلیفی وەزیفە لە بەین دا بێت. کە چووم گوتی تەعدیلی وەزارەت دەبێت وەهامان پەسەند کردوە بە وەزیر دەولە بۆ (شؤون الشمال) لەگەڵمان دا بیت سپاسم کرد لەسەر متمانە پێ کردنم بەڵام گوتم هەتا کوردەکان نەبینم ناتوانم وەڵام بدەمەوە. . ویستی بسەلمێنم کە بەیانی دانانی وەزارەت دەربچێت ئنجا بڕۆم بۆ سەرەوە، نەم سەلماند. . گوتی ئێستا بە تەیارە بڕۆ بۆ کەرکوك لەوێشەوە بە کۆپتەر بۆ ڕانیە بەڵکوو بەزوویی دەتوانیت وەڵام بدەیتەوە. گوتم پار ئەم ڕۆژانە بوو بەدەستی کەلەپچەدارەوە لە تەیارەی حکومەت دا بووم بەرەو بەغدا دەهێنرامەوە، چ

مجێزم لە تەیارەی حکومەت نی یە. . خولاسە ئەو سەلماندی و بەیانی دامەزرانی وەزیران هەڵگیرا هەتا دیمەوە لە سەفەری خێری.

کە گەڕامەوە ئوتێل مرحوم کەمالی حاجی مەجید گوتی ڕەنگت گۆڕاوە خۆ نەساغ نیت؟ گوتم تەکلیفێك کراووم هەتا بڵێی سەغڵەتم. . ئیتر وەزعەکەم تێ گەیاند. بەرەو کۆیێ ڕۆیشتم.

لە کۆیەوە چوومە ڕانیە، نیوەڕۆژەم بە ڕادان دا لای خاڵە خدرم تا ئەگەر دیدەنی پێوەستم جێ بەجێ کرد بگەڕێمەوە لای ئەو. چوومە سەرکەپکان لای سەرۆکی چەکدار و حیکایەتی ڕوولێ نانەکەی فەریق طاهرم بۆ باس کرد: زۆری پێ خۆش بوو. . نیوەڕۆژەم هێنایەوە لای خاڵم. بیستم ئەندامە زلەکانی مەکتەبی سیاسی لە خدران مێوانی کاکەزیادن. پێش عەسر چوومە خدران ئەحمەدی حەمەدە میناغاش لەوێ بوو. . گوتیان سبەینێ وەڵامت دەدەینەوە. شەو هاتمەوە کۆیێ. سبەینێ نیوەڕۆ کاڵ بوو بوو ئەندامێکی مەکتەبی سیاسی هات گوتی: ئێمە بەرهەڵستیمان نی یە، بڕیار بۆ خۆت بەجێ دەهێڵین بەڵام بەرپرسی هیچ شتێکیش نابین کە لەم هەنگاوە سەر هەڵ بدات.

ئەو شەوەش لە کۆیە مامەوە. سبەینێ بەکاوەخۆ سەرفەرم کرد، لای مەغریب گەیشتمە بەغدا. بڕیاری موافقەی سەرەوەم پێ گوت و هی خۆیشم ئیتر بە شەو لەڕادیو تەشکیلی وەزارەتی نوێ بلاو کرایەوە. باسیان دەکرد. لەو سێ ڕۆژەدا هەندێك کە ناویان لە لیستەی وەزارەت دا بوو بوو بەهی دیکە گۆڕان. .

خوێنەر حەقیەتی بپرسێت بۆچی سەلماندم ببمە وەزیر مادەم هێندەی پێ سەغڵەت بووم؟

ئەوەی دەستی منی دەبەستەوە مەنتیقی خۆم بوو! من کە بە گەرمی بۆ ئاشتی خەریك ببم دەبێ بە تەماش بم کوردێکی سەر بە چەکدارەکان ببێت بە وەزیر. ئەنجا کە خۆم پێ ڕازی نەبم دەبێ داوا لە هەموو کەس بکەم ڕازی نەبێت، بەوپێیە دەبێ بە دەستی خۆم دیوارێك برمێنم کە خۆم شاگردیم لە هەڵنانی کردوە. سەغڵەتیشم لەوەوە بوو کە دەم زانی گوزەران و حەوانەوە لەگەڵ جۆری بیرکردنەوەی حکومەت و دەسەڵاتداریی سپا بۆ یەکێکی وەکوو من ئاسان نی یە جگە لەوە کە لایەنی بەهێز هەیە برکەدار دەخاتە چەرخی عەرەبانەی ئاشتی یەوە. بەشی هەرەزۆری کەسانێکی لە بزووتنەوەدا قسە ڕۆیشتوو بوون حەزیان نەدەکرد لەلاوە وەزیر بەناوی ئەوانەوە قوت بێتەوە، کوردی بەغداش تێیان دا هەبوو، زۆر نەك کەم، حەزیان بە غەیری من دەکرد. . . وەکوو کتێب گرەوەش دوارۆژێکی نزیکم دەخوێندەوە، کە لە وەزارەت دەردەچم، ئابووریم وەها شل بۆتەوە گوزەرانم زەحمەت بێت.

ئەم تەکلیفە لە حسیابی خۆم دا دووەم میحنەتی سیاسی بوو لە ژیانم دا: میحنەتی یەکەم بە دوای هەڵوەشاندنەوەی هەڵبژاردنەکەی ١٩٥٤ کە تێیدا بووم بە ئەندامی نائیبەکانی بەرەی نیشتمانی یەکگرتوو، ئەوە بوو کە حیزب تەکلیفی لێ کردم خۆم پالاوتە بکەم و کردم: دەتگوت بۆ مەرگ ڕام دەکێشن. .

خەڵکێکی بێ ئەژمار ڕوویان لێ نام بۆ ڕاپەڕاندنی ئیش وکاریان منیش هەم لەبەر دڵی خەڵقەکەو هەم لەبەر ئەوەی دەمزانی غەیری ئەو جۆرە کارانە چ کاری گرنگی گشتی بە دیارەوە نی یە کە هەموو کورد پێی سوودمەند بێت چەند توانیم یاریدەی خەڵقم دا: ڕۆژ هەبوو بەدرێژایی بوونم لە ژوورەکەی تایبەت بەخۆم لەو بینایەی پێی دەگوترا (مجلس وطنی) بە نامەی سفارش و بە تەلەفۆن، بێ وچان خەریکی تکاو خواییشت و تەنفیذی بەندی گێرانەوەی موەزەفی فەصل کراو لە بەندەکانی بەیانی دەی شوبات بووم تا ئەوەی دەستم شل دەبوو بە تەلەفۆنەوە چ جایی زارو زمانم. بێ پرس و دەرگە لێدان ئەو خەڵکە دەهاتە ژوورەکەم، تێیاندا هەبوو کەیفی بە دارودیواری (مجلس وطنی) دەهات وەیا حەزی دەکرد بەگەڵ قەڵەبالغی بکەوێ بۆ بیستن و دیتن و کات بەسەربردن. . ڕۆژێکیان دارتاشێك دووجاران هاتە ژوورەکەم، جاری سێیەم سەفیری هیندم لا بوو دارتاش دەرگای کردەوە، بێ پرس، خەریك بوو بۆم ببێ بە دیبلۆماسی لە مەجلیسی سەفیر، دوو دەستم لەسەر ڕانم بوو، ڕجاکارانە نەختێکم بەرەو ژوور هەڵبڕین و چاوێکی بەخواییشتیشم بۆ لارکردەوە، خواخێری بنووسێ کشایەوە.

ئوتێلەکەم سبەینان و عەصران بەر لەوەی بەخەبەر بێم دەبوو بە دیوەخانە. هەمان ژووری کە تێیدا قوتابی بووم و دواتر بە محامیەتی و نائیبەتی بەسەرم دەبرد کە بووشم بە مامە وەزیر نەم گۆڕی. مستەر لێکلاندیکی ئەمەریکایی لە داوەتی سەفارەتێکم دیتمی گوتی: لێرە بەولاوە، بێ گومان، لە ئوتێل بەغدا سەرت لێ دەدەم. گوتم ژوورەکەی جارانم مێوانداریت دەکات. .

سبەینەیەك لەو سبەینانەی خوا بۆ منی بە قەلەبالغی سازاندبوو ژووری ئوتێلم پڕ بوو لە خەڵق. بە پێجامەوە لەسەر چارپایەکەم بۆیان دانیشتبووم قسەی شەش و بێشمان دەکردو، یەکێکی پژدەری دیتی چێشتەنگاو ڕابوورد گوتی. ئەدی کەنگی دەچیە وەزارەت؟ گوتم کەنگی ڕێم بوو جلك بگۆڕم، ئنجا بەجێیان هێشتم. . بەڕاستی لەخۆڕایی و لەبەر شەرم هاتنەوە عەزاب و سەغڵەتی یەکی زۆرم دەچێشت لەدەست مێوانی بێ لزوم و بێ کۆتایی.

لە نموونەی ئەرکی ئێسك قورس ئەمە دەگێڕمەوە: لەبەر شتێکی کەم بایەخ دڵم لە وەزیری تەربیەئیشا، سوێندم خوارد مەرحەبای لێ نەکەم. هەستی کردو دەشیەویست دڵم ئاشت بکاتەوە بەڵام من خۆم لێ بێ ئاگا دەکرد. دوو ناسیاو، یەکێکی سلێمانی و یەکێکی کۆیی [وا بزانم مفتشی تەربیە یان مودەڕیسی سانەوی بوون] هاتنەلام،

نەگەرەیەك کەوتبوە ئیشیانەوە بە وەزیر چار دەکرا. گوتم من لەگەڵ ئەم وەزیرە بەینم نەماوە. برادەرەکەی سلێمانەتی گوتی ئەی ئەم ئیشەی ئێمە چۆن چار دەکرێ؟ گوتم بۆ من قسەکردن لەگەڵ ئەو وەزیرە دەبێتە پێ لە کەرامەت نان. برادەرەکەم گوتی: یەکێك مەسئولیەتی بەئەستۆوە گرت نعی پێ لە کەرامەت بنێت. قسەکەی زۆر نابەجێ بوو. ئازاریشی دام ـلاە ئەوەنـدەم سەغلەتی بەدەورەوە بوو قورسایی ئەو قسەیەشم کردە ـەربارو گوتم: ڕاست دەفەرموویت، تەلەفۆنم هەڵگرت لەگەڵ وەزیری

نەریـە دوام، وابـزانم بێ وەخـران ئیشەکەی چارکرد. ناسیاوەکەم حونی خـۆش بێت نەئاست بەرژەوەندی خۆیدا تەکلیفی وەها ناقۆلای ی کردم، یەکێکی دیکە قسەکەی ئەوی پێ گوتبامایە شەڕی لەگەڵ دەکرد.

بەڵێن لە حکومەتەوە ئەوە بوو ئەنجومەنێکی کارگێڕی لە دە کورد پێك بێت بۆ هەڵسووڕاندنی کاروباری ئاوەدان کردنەوەو پرۆژەی جۆراجۆر لە کوردستان بەڵام هەم لەبەر دەردە ئەزەلی یەکەی بەڵێنی بێ ئاکامی عادەت پێوەگرتوومان هەم لەبەر نەپشکووتنی غونچە چاوەڕوان کراوەکانی دوای بەیانی دەی شوبات کە دەبوو دۆستایەتی و لێك ئەمین بوون هەموو وڵات بتەنێتەوە هەم لەبەر وردەو درەشتەی حیساباتی بن پەردە ئەو ئەنجومەنە پێك نەهات. ڕاستی یەکەی ئەگەر دەستم نەبەستراباییە بەو پێوەندی یەی لەگەڵ کوردەواریم هەبوو خامۆش نەدەبووم: ئەگەر ئیستیقالەشم نەدابایە هاموشۆی وەزارەتم دەبڕی.

دوژمنایەتی ناوخۆیی گەیشتە ڕادەیەك مەکتەبی سیاسی و لایەنەکەی دیکە چەکیان لێکتر هەڵگرت و بۆ بە هەرا.. ئاکامی ئەوە بوو کە کۆمەڵەی مەکتەبی سیاسی بە کۆمەڵێك لە ئەندامانی حیزبەوە عیراقیان جێ هێشت. ئەو ئەندامە چالاکەی کە دەبوو بەپێی قسەی سەرۆکی چەکداران بە تەقلە بۆ بەغـدا بڕوات، ئەویش لەگەڵ مەکتەبی سیاسی بۆی دەرچوو. لە موناسەبەدا بە سەرۆکی چەکدارانم گوت: لەبیرتە چیت گوت و چۆن دەرچوو؟ من دەم زانی ئەو ئەندامە کوری مەکتەبی سیاسی یەو لە دەمی خۆساغ کردنەوەدا هەر بەلای ئەوی‌دا دەشکێتەوە بەڵام بە چاکم نەزانی هیچی تێدا بڵێم. گوتی: فێڵی لێ کردم و هەڵی خەڵەتاندم..

بەڵام نە فێـڵ بوو نەهیـچ. تەنانەت کە حاڵ گەیشتە چەك لێکدی هەڵگرتن ئەو ئەندامە چونکە خۆی لای ڕێك کەوتنەکەی دەی شوبات بوو بە حاڵەتێکی نەفسی وەها سەخت دا تێپەڕی گەیاندی یە سنووری شێـوان. من لەو ڕۆژانەدا ئەم دەدیت بەڵام بزووتن وگەڕانی بێ لزوم و تێکەڵ پێکەڵی بیرەو بەوی‌دا هەر ئەو ڕاگەیاندنەوی پێوەبوو. کەپێ لە جەرگی خۆی دەنێت بەوپێ شێل کردنەی بەیانی شوبات بۆ خۆدانە پاڵ هێلانەو کۆنە ئاشی مەکتەبی سیاسی. ئەمە دەڵێم قەتیش لەم بارەوە

لەگەڵی نەدواووم، بەڵام چی گوتم بەڕاستی دەزانم خۆ مرۆڤ داروبەرد نی یە پەرۆشی کردەوەو قسەی دوێنێ و پێرێ نەبێ.

من لە ڕۆژی ١٧ی حزیرانەوە بە وەزیر حیساب بووم، لە نێوەندی ئەمـووز سەفـەرێکی کوێـەم کرد.. شەوی یەکەمم بوو، کە سبەینێ هەڵستـام دیتم ماڵەکەم پڕە لە کچی قوتابخانەکان، لەوانەی گرفتێکیان

هاتوەبەر لەو

ڕۆژانـەدا کە هەرا بەردەوام بوو هاتبوون داوام لێ بکەن بۆیان چارەسەر بکـەم. هەرچـەند نازانم وەیا لەبیرم نەماوە خوایشتیان چی بوو بەتەواوی بەڵام ئەوسـا دەرحـاڵ قسـەم لەگەڵ طاهر یحیی کرد گوتم: کچان، ئابڵوقەیان داووم فریام نەکەویت ئیشم خراپە. بێ سێ ودوو بڕیاری پێویستی بۆ دەرچواندن.

سەرێکی ڕانیەم دا: بەپەلە خەبەرم درایێ کە خێراخێرا بگەمە بەغدا.

تومەز بڕیار درابوو وەفدێکی پیرۆزبایی لە سەرەك وەزیران و چەند وەزیرێك بچن بۆقاهیرە بەشداری بکەن لە ئاهەنگی بیرەوەریی ساڵانەی ٢٣ی تەمـووز. کە گەیشتمە بەغداو تێگەیشتم، دیتم پەساپۆرتم نی یەو سبەینێش سەفەر لەپێشە. لای طاهر یحیی بووم. پاسپۆرتیان بۆم سازداو هەر ئەو ڕۆژە پێیان دامەوە. بەر لە بەرێ کەوتنمان بۆ فرۆکەخانە لە حزوور عبدالسلام، سەرۆکی کۆمار، گوتم دەستم بۆ ج جێگە ڕانەگەیشتوەو چ پارەش شك نابەم. عبدالسلام گوتی من بۆت دەنێرم.. لە قصرەوە دوو صەد دینـاری بۆ ناردم کە هەر ئەوەنـدەشم داواکـردبـوو، لەڕێی فرۆکەخـانە پێم گەیشت. دوای گەڕانەوەمان لە قاهیرەوە، بۆم ناردەوە، ماڵی ئاوابێ وەری‌گرتەوە.

لە ئاڵقـەیەکی سەرەتاکانی ئەم گەشتـەم دا گوتبـووم کەوا لە ساڵی ١٩٣٥ کاتێك بەسەفـەر چوومە بەغداو دەمی سبەینە لەبەر سوورانەوەی شەمەنـدەفـەر بۆ ئیستگەی باب الشرقی ڕۆژ لە دەستەڕاستمەوە هەڵات، هەمـوو خواروژ وورو چەپ وڕاستم لێ شێـوا چونکـە دەبـوو بەپێی جوغرافیە لە چەپمەوە هەڵێ ئەم جارەش کە چووینە قاهیرە دیسانەوە تەییـارەی هەرام سوورێکی خوارد کە من هەستم پێی نەکرد، لە جیاتی لەلای ڕۆژهەڵاتـەوە بۆ فرۆکەخـانـە دابـەزین لە ڕۆژئاواوە بۆی شۆڕبـوویـنەوە. دەریـای سپی ناوەڕاست بۆخۆی چوە شوێنی ئەفەریقای باشـوور، سوودانیش ـ لە مێشکم دا ـ نۆی‌داوە بۆلای ئاورووپا.. چیای مقطم کەوتە ڕۆژاوامان و هەرەمـەکانیش چوونە لای ڕۆژهەڵات. ماڵی سەرنج گرتن بشێوێ! ئەو خەڵقە کەسیان خۆی دانەنابوو بە (شرطی مرور)ی ڕۆژ و ئاسمـان. تەنانەت کە لە جنوبی (عقبە)وە بەسەر دامەنی یەك لەو دوو گوێ‌یەی دەریای سووردا تێپەڕین بەرزاییشمان حەڤدە هەزار پێ بوو سەرنجم دایە لای باکوور. دەریای سپی ناوەڕاست لە دووری هەرە دوورەوە وەکو خەتێکی ڕاست لە ڕۆژهەڵاتەوە بۆ ڕۆژاوا بەسەر

هەورانــەوە تێکشی بووئەگــەر نەم زانی بـا دەریـا لەوێ هەیـە بۆم لێـك نەدەدرایــەوە ئەوخەتـە چی‌یـە چونکـە زۆرمـان لێ دووربوو بەسـەری‌دا رانـەدەشکـاین هەتـا هیـچ پانـایی‌یـەکی لێ بەدی‌بکـەین جگە لەوخەتە راستـە. هەورەکـان نزیك بوون لێمانەوە ئێمەش لەوان بلندتر بووین بۆیە خەتی‌دەریـا بەسـەر ئەوانەوە راکشابوو. ئەهلی ناوفرۆکە لەوخەیالاتە بێ ئەنجامە رەهابوون.

تەیـارەکەمان پەروانەدار بوو لە چەشنی (ڤایکاونت)ی چوار پەروانەیی. خێــرایی ی فرینی نێــوان ٤٠٠ ـ ٥٠٠ کیلۆمــەتـری سەعـاتی بـوو، بەرزاییشی لەچاو (نفاثە) کەم بوو بۆیە لە ١٧ هەزار پێ بەرەژوورتر نەچووین.

عەصر بووسـەرۆك جەمال هاتە بەخێر هێنانی فەریق طاهرو وەفدەکە. رێکـەوت وەهـا بوو کە سرەی وێنـەگرتن بەسـترا لەگەڵ سەرۆك، بەتالایی نەبوو لەوماوەیەی کامێرا دەی‌بینێـت منی تێدا راوەستم، پاڵەپەستۆی جێگە داگـرتنیشم نەکـرد، دواتـریش نەم ویست بەتـەنهـا وێنـە لەگەڵ سـەرۆك جەمـال دا بگـرم ئنجـا ئەگـەر یەکێـك وێنـەی ئەورۆژە ببینێت منی تێـدا نادۆزێتـەوە بەوەش دا تووشی هەڵە دێت کە ناسـەلمێنێ مسعود محمد لەو وەفدەدا بووە..

شوێنی لێ‌دابــەزینمــان (قصـــر الطـاهـرە) بوو. ئەم قەصـرە بەشـە بنـەرەتیـەکەی بەمیرات مابۆوە بۆمەلیك فاروق، ڤێلایەکی بەتەنیشتەوەی بوو خرابـووە سەری: من و چەنـد کەسێـك لەوڤیللایـە دەنـووستین. بە رێکــەوت ژووری نووسـتنی فاروق بەرمن کەوت. چ لەوبــەشــەو چ لەبـەشـەکـەی دیکـە بێت هەرچی کەرەستە هەبووبەدەقی خۆی‌وشـەقڵی خۆی لە زەمانی فاروقەوە مابۆوە: لە ئاغلەب کەلوپەلی (ملك مصر فاروق الأول) وەکوتوررە نەقش کرابوو. خزمەتچی‌یەکان هی زەمانی ئەوبوون. پێش خەزمەتیان لەوڤیللایە کە بە زمانی قاهیرەم دواند پتر لە عادەتی خۆی بۆم کرایــەوە، حیکـایــەتی سەردەمی فاروقی بۆدەگێــرامــەوە. گوتی ژوورەکەی تۆی تێدایت تەنها یەك شتی گۆڕاوە ئەویش ئاوێنەیەکی گەورە بە پانـایی چارپـایـە چوار نەفـەریەکەی بەرانبەریەوە بووگۆڕا بەوکانتۆرە. گوتی. (الاوضە دی کان ینام فیها فاروق). بەدەست خۆم نەبوو، وەکوو قافیــەی کەقـاضی (قم)ی‌پێ عەزل بوومنیش ئەوەنـدە شارەزایی‌یـەم لە لەهجـەی قاهیـرە بەکـار هێنـاو پرسیم: (لوحدە والا مع ستات؟) گوتی: (بقی زی ماهو عاوز!).

هەرچــەنــد حەز لەم قســەیــە ناکــەم کە خەریـکم بی کــەم بەڵام لەبـەرپـەنـدێکی فەرامـۆش کراوی کەتێـدا هەیـە دەڵێم: چارپـایـەکەی کەگــوتم چوارنــەفـەری بووتۆیڵێ شەش نەفـەری‌بـوو. حیکمـەت لەو ئاوێنــەیــەی بەقــەدەرچارپــایـە پان ئەوە بووە کە (صـاحب الجـلالـة) ویستوویەتی لەدەمی عیشقبازی‌دا سەیری ئەوفیلمە بکات لە ئاوێنەدا کە خۆی قارەمانیەتی! ناشبێ ئاوێنە تەسکتربێ لە چارپایە نەکا خوانەخواستە دیمـەنی هیچ هەڵسـوکەوتێکی لەیل و مەجنوون فیلم بەدەربێت. خەڵقی دوای سـەردەمی خۆیشی هـەر لەبـەر بەبیـردا هاتنی ئەوحیکایەتانە هاتوون ئاوێنــەیــان گۆڕیــوە بە کانتـۆر. من کەم وزۆر لەم لایـەنـەوە پرسم لەو پێش خزمـەتـە نەکـرد ئەویش هیچی نەگـوت بەڵام لزوم نەبوو بەپرسین: ئاخور بۆ ئالیکە...!

لە ئوسـوولیان دا هەبووشەو کە مێوان دەچۆوە ژوورەکەی یەك تەبەق لە مێوەو شەکەراتیان دانابوو. من بە مەبەست تابڵێی بەدەگمەن دەستم دەگەیاندێ.

ژوورەکە حەمامێکی لەناوەوە هەبوو، حەوزی مەلەی تێدا بوو بە ئاوی ساردو گەرم لە یەك دەقیقـەدا پڕ دەبـوو. . لای سەرووی ژووری حەمـام بەپـانـایی ژوورەکـە سەکـۆیەکی یان بەقەدەر درێژایی باڵای پیاو کرابوو: دۆشەگەکەی‌و دیواری سێ لایەکەی بە پەشتەماڵ داپۆشرابوو کە ئەگەر مرۆ ویــستی، بتــوانێ بە گەوزێــك لەم سەر بۆئەوسەری سـەکــۆکــە خۆی وشـك بکـاتەوە. دەرگایەکی بەسەر کوریدۆری ناوژوورەکان دەکرایەوە، پەیکـەری ئافـرەتێکی رۆمـانی لەدیـوی دەرەوەی ژوورەکـە بەلای دەستی راست دا دوو دەستی هەڵێ نابوو تاکوو پەشتەماڵ وەیا رۆبی حەمامت لێ وەربگـرێ. . لەبیـرم چوو بڵێم: ئەوکـانتـۆرەی جێی ئـاوێنەکەی گرتبۆوە دیکۆرێکی وەهای پێوە بوو دەتگوت بەئەسڵ لەگەڵ نەقشی ژوورەکە سازدراوە.

قەصـــری طاهــرە بە جەستـە مام ناوەنجی بوو لە چاو (قصـر القبـه و زعفــران ورأس التین..و) هی‌دیکــەش بەڵام زۆرشیــك وجوان بوو. ئینجێکی تێـدا نەبـووبێ شوێن پەنجەی هونەر. ژوورێك لە ژوورەکانی تێـدادانیشتنی بریتی بوو لە سەقـافـەتی فارسی بە قاڵی‌وتەخت ورەســم و روبـاعی‌یـات و هەمووشتێکی‌یەوە: تەنها یەك مێزی زۆر قەشەنگی نەبێ کە رووەکــەی نەقشی ناپــولیــۆن و دوازدە جەنـەڕالی جەیشـەکـەی لێ چەسپ بوو یاخود لێی‌کوترابوو وەك (وشم).

ژووری دیکـەی لە سەقـافەتێکی دیکە. . تابلۆی هونەری زێدە بەنرخ لە هەمـووژوورەکـانی هەبـوون، لە دیواری ئەم بەرو ئەوبەری ناردوانە دوو رێگایی‌یەکەی کە لە قاتی یەکەم و دووەم تێکیان دەکردەوە وێنەکێشـرابوون بەپانایی‌و بەرزایی دیواری نهۆمەکان ئەمما چ وێنە!! جیهازی کۆندیشنیان لە هەنـدێ سالـۆن وژووری دانـابوو بەڵام هێندە بەوەستایی کەبووبوونە بەشێك لەدیکۆری شوێنەکەیان.

ئێـوارەی رۆژی ٢٣ یۆلیـە حەشـامـاتێکی لە ژمـارە بەدەر لە مەیـدانی (تحـریـر) کۆبوو بـوونـەوە. رەئیس جەمـال سەرۆك وەیا سەرەك وەزیرانی سی‌وچــوار دەوڵـەتی ئەفـەریقـایی وعـەرەبێ بانـگ هێشتن کردبـوو. برا

ڕەشەکان بە قەلەبالغی هاتبوون قیچکە تەنگیش بوون. . ڕیزی ئیمە ئەو ئاهەنگەی مەیدانی تەحریردا کەوتبوە دوای ڕیزی هەرەپیشەوە کەهی سەرۆك دەوڵەت و سەرۆك وەزیران بوو. بە ڕیکەوت کورسی من کەوتبوە دوای ئەو کورسی یەوە کە بو مصطفی ئیسمعیلی قورئان خوین تەرخان و میکروفونی بە تەنیشتەوە بوو. برایەکی ڕەش لەومیوانانە هات لەسەر ئەوکورسی یە دانیشت کە بەتاڵ بوو. جاری قورئان خوین نەهاتبوو. چەندیکی بەرپرسی تەشریفات بەوپەری ئەدەبەوە بەو کابرایەی گوت کەوا هەر کەسە کورسی خوی بەناوی خوی بو داندراوە گویی بی نەبزووت و ڕەگی لە کورسییەکە داکوتا. من لەدوایەوە پیم گوت کە منیش وەك ئەو میوانم بەلام بەپیویستم زانی پیی بلیم کەئەگەر لەسەر کورسی یەکە بمینیتەوە دەبی لە سەرەتای ئاهەنگ دا قورئان بخوینی. چاویکی بری یە میکروفونەکەو یەکسەر بوی هەلستاو لەگەل تەشریفاتی دا ڕوییشت، دواتر لە شەویکی میوانداریی سەرۆك جەمال لە ئەسکەندەری یە کە لیمانی کرد گوتی: من زور بەو برا ئەفەریقایی یانەوە خەریك دەبم و دەچمە لایان و بانگ هیشتنیان دەکەم دەمەوی تییان بگەیەنم کە عەرەب و ئیسلام هەر ئەوە نین کە بە دریژایی میژ وو قولەرەشیان ڕاو کردوەو فروشتوویانن وەیا سوخرەیان پی کردوون. لەمەوە زانیم کە کابرای قورئان گرتوو و هی دیکەش کە باسیانم دەبیست وەها لەسەلمین خودەنوینن تومەز هەموو نیگایەکی چاوانیش بە توانج دادەنین.

ئەو شەوە گەلیك لە سەرۆکەکانی وەك بن بیللا وجومو کینیاتا و هیلاسیلاسی خوتبەیان خویندەوە، فەریق طاهریش بە ئینشای خوی شتیکی ڕیك وپیکی نووسی بوو خویندیەوە. بەپیی گیانی نوکتەبازیی میسرییەکان کە لەختیکی لی شارەزام و ناوناوە بەکاریشی دەهینم لەو شەوەدا کە جوموکینیاتا دەستی کرد بە وتوویژ لە سەرەتاوە گوتی: من هیندە سالە لە بەندیخانەی ئیستیعمار بەسەرم برد. . بوو بە چەپلە کوتان من بەو دوو میسری یەی دەستی چەپ و ڕاستم گوتن: خوشی لەخوی وائیستا سەرۆکە دەنا لەوانە بوو بکەوێتە دەست هەندیك لە ئینسان خورەکان، دەبوو بە مەرەگە. .

دوای هەموان سەرۆك جەمال دەوری سەعاتیك قسەی کرد بەلام جەماهیری میسری دەهینایە هەژان. . لە کوتایی دا گوتی. هاوولاتیەکانم بمبەخشن چی دیکە ڕیم نی یە میوانەکانم بەدیار قسەی خومەوە ڕابگرم با قەرز بی. . بوو بە پیکەنینیکی گشتی لە جەماهیرەوە و چەپلەڕیزانیکی لەحەدبەدەری بەدواداهات. سەرۆك جەمالیش هەر بەنوکتەی مەبەست بوو.

شەوی دواتر ئاهەنگیکی (عشا) و گورانی لە یانەی هیزی چەکداران سازدرا میوان و نامیوان میرگەپان و بەرینەکەی یانەی پڕکردبوەوە. لە سەرەتاوە کەلسووم نەشیدی (علی باب مصر)ی گوت. کە هەلستاین بو نان خواردن ڕەئیس جەمال میوانەکانی پیش خوی یەخست، بەڕاستی دەتگوت شوانە لە دوا میگەلە دەڕوات. کەلسووم وعەبدولوەهاب بانگ هیشتن کران کەلسووم لەدەستی ڕاستی سەرۆك جەمال و عەبدولوەهاب لەدەستی چەپی هیلا سیلاسی دانیشتن. .

پاش نان وپات میوانە ئەفەریقاییەکان ڕوییشتن، کەلسووم ئەمجارەیان گورانی (انت عمري) گوت کە بەر لە حەفت مانگیك من لە قەلادزە بووم یەکەم جار لەسەری سال دا لیم بیست. عبدالحلیم نوڕەی هات: لەپیشەوە بەشان وبالی ڕەئیسی دا هەلگوت ئنجا گوتی: نازانم لە حەفلەیەکی (ست الکل) تییدا بخوینی ئایا خویندنی خوم دەبیتە (مضب وإلا تشریف)؟ خەلقەکەی ئەو شەوە کە زوربەیان میسری بوون تیکرا گوتیان: (مضب. مطب) واتە: تەپکەیە تەپکە. فرید الاطرشیش نەشیدیکی (انتباه)ی گوت بە کورسیکی ٥ ـ ٦ کەسی یەوە تییاندا سعاد محمد، نجاة الصغیرة، فایدة کامل وهی دیکەش هەبوون. . لەتەنیشتی ڕاستمەوە وەزیری تعلیمی عالی عبدالعزیز السید دانیشتبوو. مرویەکی بەساڵداچووی باخەبەری ئەدیبی قسەزان و عالم بوو. وتوویژ ی خوشمان لە بەین دا بوو پیویست نابینم لیرەدا دووپاتی بکەمەوە وابزانم لەمونासەبەدا لە بەرگیکی کتیبی حاجی قادری کویی باسی هەندیکی ئەو وتوویژەم نووسیوە. .

لەهەندی گەشت وگەڕانی ناوقاهیرە کەلەلایەن حکومەتی میسرەوە ڕیك خرابوو خوم دەدزیەوەچونکە حەزم لیی نەدەکرد. چووین بو دیتنی فابریقەی خوردە سیلاح، هەناسەم پی سوار دەبوو: خەلق بە زەرری ڕازی نی یە خەریکی ئەوەوی یە، خوردە سیلاح چی یە من لە عیراقەوە بوی بیم! بو خوم ناوناوە دەچوومە شوینی ئەوتو پیشتر ناویانم بیستبوو وەك (الجامع الازهر) کە جگە لە حەرەمی مزگەوتەکە سەرم لە (رواق الأکراد)یش دا. چوومە خان الخلیلی و کافیتریای گروپی و سەر مقطم کەوتم. . بەزوری دوستیکی کویی کە لەوی دکتورای لە ئەزهەر تەواو دەکرد لەگەلم دا دەبوو. کە بومقطم چووین ئەویش وحاجی ڕسولیش کە ئەوسا قایمقام بوو هاوڕیم بوون. لە سەرکەوتن دا بووین دیتم لیخوری تاکسی گویی قولاغ بووە لە بیستنی زمانیك کە پیشتر نەی بیستووە. بە لەهجەی خویان پیم گوت: دی لغة الجان والعفاریت بتاعە افتح یاسمسم واقفل یاسمسم. ئیوارەیەکی دیکەش بوی چوومەوە کازینویەکی زور خوشی لی بوو بەسەر قاهیرەی دا دەنوڕی، ئەوەندەش ساردبوو حەزم دەکرد قاپووتم لەبەر بایە.

فینکایی میسر قەرزداری بای شەمالی دەریای سپی یە. دواتر کە چووینە (اسکندریة) دیتم ئەوەی ناوی (نسیم البحر)ی پیوەیە لەڕاستی دا ڕەشەبایە چونکە لەوانەیە ئەگەر پەنجەرەو دەرگەی بەرانبەر یەکتر بەڕووی بەحردا بکرینەوە ئەو نەسیمە کورسی وەربگیریت. شەپولی دەریای

دەگـەیـانـدە جادە ـ ئیـواران کە ئوتومبیل لە شەقامی کورنیش ڕۆیشتبایە تەرایی هەواو ئەو بایە وەهای دەکرد جامی پێشەوە فرچەی بو بەکاربێت وەك لە دەمی باران دا دەکری.

لە قاهـیرە جاریکیـان بەرەسمی و جاریکیـان بە شەخسی سەردانی (أهـرام)و (بـرج القـاهرة)م کرد. چاك بوو گەرانم بە یەکێك لەو سەیارانە بوو لیی نووسـرابوو (رئاسة الجمهورية) ئیتر دەرگای داخراوی دەکردەوە. لە برج القاهرة نەجیاتی پارەم لی بستینن خزمەتیشیان کردم بە خورایی

حەفلەیـەکی سەفـارەتی عیـراقی بە شەو بوو، گەلیـك کەسی ناسراوم لەوێدا دیت بەلام ئەوە خوش بوو کە مرحـوم د. عبـدالرحمان نورجانیش بانـگ کرابـوو بە ناوی کـونـە مامـوستـایی زورم حورمـەت گرت، حەقی خویــشی بوو. چەنــد جاران لەو شەوەو شەوی دیکــەش دا (جــلال کشـك)ەکـەی ڕانیـەم دیتـەوە. شەویکیان بە سەیارەی حکومەتی گەلێك جێکەی قاهیرەی نیشان دام، بەپێش فیللای کەلــووم دا تیپەڕین..

ڕەئیس جەمـال هەوەل ڕۆژ ی هاتنمان لەگەل سەرەك وەزیران و لەگەل وەزیری داخلیە ـ حاکم عـسکری عام، رشید مصلح کوبوونەوەی تەنهای لەگـەل کردن. دوای یەك دوو ڕۆژ سەفیـرمـان، شکـری صالـح زکی کە پێشتـر ناسیـاوم بوو. پیی گـوتم ڕەئیس سەلامی هەیـە دەلی حەزم دەکـرد بەتـەنهـا دیتبـامـایـە بەلام حکـومـەتی عبدالسـلام لە مەسەلەی کورد زور هەستیـارە ئنجـا ئەگـەر حەز دەکا [واتە من حەزدەکەم] دوای گەڕانەوەی بو بەغـدا بەنـاوی (استجمـام) سەریکی ئەورووپـا بدات و لەگـەڕانـەوەدا بە قاهیرەدا بێت یەکتر ببینین..

من بە لیکدانەوە بڕیارم دا وەهانەکەم: بەکورتی، نە سیاسـەتی کورد و نە هی میسـر بە من ناگوڕدرێن، عیراقیش کە پێوەندی یەکوردو میــریشەوە هەیە لەوانە نی‌یە بەدیدەنی ئەوتویی چارێ بکرێت. کەواتە دیدەنی‌یەکەم دەبێتە شتێکی شەخـسی، منیش لەمێژەوە بوو ڕوح پەرەیی و شاگەشکەییم بودیـدەنی پیـاوی گەورە نەمـابـوو ئیتـر ئەم سەفەرە دروزنەو چاوشێرکێ لە کوردو عیراق بوچی بکەم؟

سەرۆك جەمـال هەمـو مێـوانـەکانی بانگ هێشتن کرد بو (عشا)یەك لە ئیسکەندەری‌یە. یەکێك لە قەسرەکانی خدێو ئیسماعیل کەوا هەنابلێی لە چاو خانووی ئەم ولاتانەی من دیتومن بەشکو بوو جێگەی داوەتەکە بوو. سالـــونی نان خواردنی دوو هەزار کەسی گرتبـوو هەمـووش دانیشتبـوون لەســەر کورسی بەدەوری مێـزەوە لە وتـووێژدا بەرانبەر تی‌بینی وەزیریکی میسری کە گوتی خدێو ئیســماعیل دەست بلاو بووە گوتم: دەبینم کەیفتان دێت بەم قەصرە کە دەتوانن داوەتی وەها بەشکوی تێدا بەرپابکەن. مادەم وەهـایـە نابێ لەم فەقـەرەیـە گلەیی لە خدێو بکرێت. ئەگەر دوای شورش قەصرەکـەتـان تێـك دابـایـە دەشیـا بیـر بکـرێتەوە لە لومەی ئەوتویی.. سالـونێکی بچـووکتـری لێ‌بـووپێی دەگوترا (قاعة النجفة) سورەیـایەکی زیدەکەورەی لە قوبەکەیەوە شوڕ بووبوو کەپێی دەبێن (نجفة). نەقش و نیگــاری دیـوارەکـانی لەوپـەڕی جوانی‌دا بوون. بە خەتێکی زور خوش ناوی پاشاکان لە محمد علی‌یەوە هەتا فاروق نووسرا بوو بەلام نەحتیت بە زەحمـەت جێی ناوی فاروقی تێـدا بووبـووە چونکە بازنەیەکی بەو ستوونە بازنـەیی‌یـە تەواو دەکرد. هەلبەت ئەم نووسینە هی ڕۆژگاری فاروق یان دوای ئەوە [دەبی هی فاروق بێت چونکـە بە هەمـووی دوازدە سەت بەسەر لادانی‌دا تی‌پەڕی‌بوو، دیارە شورش لەخووە ئەو نوور شەبشە بە بنەماڵەی محمد علی نابەخشیت].

میـوانـە عیـراقی‌یـەکـان دوو شەو لە ئیسـکەندەری‌یە مینەوە بە ئوتێلی سان ئیستیفانو دابەزی بووین بەسـەر بەحری دا دەنوڕی.

شـەوی دووەم لە ڤیـللای ڕەسـمـی سەروك کومـار کە لە کەردکــی (المعمورە) بوو میوانی سەرۆك جەمال بووین. لە بەری میســری‌یان جگە لە ڕەئیس جەمـــال و نائیبـەکـانی ڕەئیس جمهـور و سـەرەك وەزیـران علی صبـری و أنـور سلامـە وەزیـری وەرزش، هاوڕیی شەرەفی طاهر یحیی حازر بوون. لە هەشـتـی ئێـوارەوە تا یەکـی پاش نیـوەشـــەو مایـنـــەوە. شەوێکی گەش و خوش ڕۆیشت.

سەرۆك جەمـــال هەتـابلێی (ألمعی) بوو: چ لە شیـوەو چ لە ناوەرۆك هاوتای ئەووم لە سیاسی کون و نوی نەدیتبوو، ئەشم بیـستبوو بە وتووێژ و قـــەرەوانی بگـاتـە جەمـال. دەنگی مەخمـەلی و ئوریشمی بوو هیندەی دەنگی فاروق شووشە بو بەرگوی دەشلایەوە. وێنەی لە هەمو ئاکتەرەکانی میســر دلکێشـتـربـوو. لە زەکـاوەت بلیمـەت بوو. عەیبی هەرە گەورەو کوشـندەی بەخووە گلان و لەخودا نقوم بوون بوو.

لەئـاسـت ئەو تەئمیمـانـەی لە ڕۆژ ی ١٤ی تەمـووز، بەر لە دە دوازدە ڕۆژ یـك کردبوومان ڕەئیس جمال گوتی: چ پێویست نەبوو بەو تەئمیمە، ئیوە دەولەتی نەوتن. بابایەکی عیراقی چەند هەزار دیناری لە بانك داناوە ژ یـان و پاشـەڕۆژ ی مندالانی پی تەئمین بکات هی ئەوە نی‌یە حکومەت چاوی‌تی‌ببـڕێ. گوتی من بە تەئمیمی بەنگـەکان هەزار ملیون جنیهم لە بیگانە گل دایەوە، ئیوە بیست سی ملیون دینار لە عیراقی‌یان دەستینن چ کەلینیکی پی‌دەگـرن.. خولاسـە زور لە دژ ی تەئمیمـەکەمان دوا کەچی عیـراق لەبـەر خاتری ناصری‌یەکان ئەو هەنگاوەی هەلێنا گویا مصری پی ڕازی دەکـــات لەو ڕووەوە کە ئەمـەش جوریکـە لە جورەکـانی یەك شکـل کردنی مصر و عیراق بو هەموارکردنی ئاوهەوای (وحدة)..

کوبوونەوەیەکمان کرد لەگەل علی صبری و هەندیك لە وەزیرەکانی بو دیـار خستنی پیـداویستیکی عیـراق هەبێت کە مصـر بتـوانی جی‌بـەجی بکـات. ڕاستی‌یـەکـەی خواییشتیکمان کرد لە ڕوالەت دا خواییشت بوو بەلام لە ناوەرۆك دا بەخشـین بوو: وەزیــری تەربی‌یـە گوتی چەنـد هەزار مامـوستـامـان دەوی بو دەرس گوتنـەوە لە قوتـابخـانـە سەرەتـایـیـەکـان و

-وەندی‌یەکان لەحالێکدا هەزاران دەرچووی دار المعلمین ومعلمات وفنون بێیەمان هەبوو چاویان بڕی‌بووە هەڵێك بۆدامەزرانیان ئەمەش هەر حیکایەتە ئەزەلیەکەی جووتەوەری (ازدواج الشخصیه)یەکەی جیهانی سی‌یەمە کەحەزی کردوە بڵێ: شەل نی‌یە پای شکاوە: چ دەبوو بگوترایە میسر باری ئابووریەکەی نالەبارە، پێویستی هەیە بە یارمەتی‌دان ئنجا هاتباین لەجیاتی ئەو مەعاشە گەورانەی کە موعەللیمی میسری لە عیراقی وەردەگرت کە پتر لە دوو هێندو سێ هێندی مافی خۆی بوو مەعشەکی عادەتیمان بۆ هەناردیایەو چی دەمایشەوە لە فەرقەکە دوو جاران بەشی ئەو مامۆستایە بێچارانەی عیراقی دەکرد. میسریەکی لە عیراق ۱۰۰ دیناری بدەیتێ ڕازی‌یە بە ٥٠ دینار کە لە میسر بێتە دەستی، ٥٠ دینارەکەی دیکەش گەلێك زیاد بوو لە مەعاشی ئەوسای دەرچوی دارالمعلمات وفنون.. حکومەتی عیراقیش نەختێکی پارە بۆ دەمایەوە. جیهانی سی‌یەم حەز لە نانی درۆزن و پێوەندی درۆزن و تیجارەتی درۆزن و هەڵوەستی درۆزن دەکات چونکە لە درۆکەدا نازوفیزو خۆفش هەڵێنان هەیە. لەلایەکی دیکە شەوە سەیر بکەیت، لەوانەیە میللەتی عیراق کەمتر ڕازی بێ بەوەی من گوتم لەچاو زەرەرە گەورەترەکەو درۆزنەکەش.. ڕەنگە بوو بگوترێ مانای چی بێ سەبەب پارە بدەین بە میسری‌یەکی چ سوودمان پێ ناگەیەنێت؟

لە گەڕانەوەمان بۆ قاهیرە بە ڕێی سەحراوی‌دا سەرێکی (مدیریة التحریرمان) دا... لەئەسکەندەریە سەرەوبن بوونی دنیاکەم بۆ چووە باری ئاسایی خۆی‌و دەریا کەوتەوە باکوور و ڕۆژ لە ڕۆژهەڵاتەوە سەری دەردەهێنا. ئەم وەزعە خۆشە ئارامە بەردەوام بوو هەتا لە سەرەتاکانی شاری قاهیرە پێچێکمان بە دەستە چەپ دا کردەوە دنیاکەم لێ وەرگەڕایەوە: دەتگوت لە پەردەی مێشکم دا فیلمێك گۆڕا بە یەکێکی سەرەوبن. نە ئەوساو نەئێستاش بۆم ساغ نەبۆوە هۆی ئەم تەقلەبازی‌یە چی بوو؟ من لە ئالقەیێکی کۆنی ئەم گەشتەدا گوتم سەرەوین بوونی دنیاکە لە هەوەڵ سەفەری بەغدام نەقش بەستووی مێشکم بوو کاتێك کە لە گەڕانەوەدا سەردانی سلێمانیم کرد دنیاکە کەوتەوە باری ئاسایی خۆی‌و لێم تێك نەچۆوە، کەچی لە میسر وەها نەبووم. خوێنەر لێم بسەلمێنێ کە دەڵێم، ئەو دەمەی لە زارکی شاری قاهیرەدا بە پێچ کردنەوە دنیاکە لەپێش چاوم سووڕا، ئا لەو چرکەیەدا کە ڕاست و چەپ و پێش و پاش جێ گۆڕکێیان کرد دەتگوت دەست و پەنجەیەکی مەوهووم هەناومی گوشی، تارماییەکیش بەبەر چاوم دا ڕەت بوو بێ‌گومان ڕوومی سوور هەڵگێرا بوو... دیاردەی ئەوتوویی لە مرۆدا، وەك بزانم، سەردەکێشێتەوە بۆ نەفس، دەبێ لە زانستی نەفس دا شی‌کرابێتەوە بەڵام من بەسەری‌دا نەکەوتووم. ئەم دیاردەیە لە من دا زۆر ڕەگ داکوتاوە. دوور نابینم سەرسووڕکێی دەمی پەرینەوەم لە زێ‌و

ڕووباری بەرینیش شێوەیەکی ئەم دیاردەیە بێت. ناڕاحەت بوونم لە بەرزایی سەر شاخ و خانووی بلندو ناو فڕۆکەش خزمی ئەم خەسلەتەمە هەندێ جار لەناو نوێنی نووستن دا بە خەیاڵ دەچمە سەر شاخێکی یەکجار بەرز لەوێوە خۆم بۆ بنارەکەی هەڵ دەدەم، دوای چەند سانی‌یەیەك سەغڵەت دەبم و ناتوانم بەردەوام بم لە سەرەژێر بوونەوەی خەیالی بەناچاری بیرم بۆ لایەکی دیکە دەبەمەوە..

لە قاهیرە ڕۆژێکیان بە فڕۆکەچووین بۆئەسوان. جارێ لە سەرەتاکانی هەڵ نانی بناوانی ئەسوان بوون. ئەو سەردانەی ئەسوانم زۆر نابەدلی کرد چونکە بریتی‌بوو لە کات بەفیڕۆدانێکی ئێسك قورس: من چیمە لە نیلێکی مەجرای گۆڕابێ بۆ هەڵنانی بەهەشت یان هەرچی دەبێت. ئێمە لە عیراق دوکان و دەربەندی خانمان هەبوون جێی گەشت وگەڕان و تێدا حەسانەوەش بوون: زیخ وبەردی بنی نیل بە من چی؟ ئەم تەرزە ناچاربوونە بۆ گەڕان و سەردانی ئێسك قورس وەهام لێ دەکات هەرچی داوەتی ڕەسمی ئەوتۆیی بێت حەزی لێ نەکەم..

گەڕاینەوە بەغدا. ڕۆژ بە دوا ڕۆژدا ئاوادەبوو بێ ئەوەی هیچ چالاکی‌یەك دەرکەوێ بۆ ئاوەدان کردنەوەی کوردستان. ئەو ئەنجومەنە دە کەسی‌یەی کە دەبوو ئەندامەکانیان دیاری‌بکرێن پشت گوێ خرا: ئەنجومەنەکە گۆیا پرۆژەی ئاوە دان کردنەوەی دادەنا وەك کە کۆنە (مجلس الاعمار) بۆ هەموو عیراقی دەکرد..

پاش ملەی من حکومەت خەلقی بۆلای دەسەلاتداری سیاسەتی کورد دەناردو لەوێوە ڕاسپاردە بۆ حکومەت دەهات بێ ئەوەی خەبەری من بدرێت.

ڕۆژێك لە ژوورەکەی سەرەك وەزیران؛ لە دەمی سەردانێکی کە سەرۆك کۆمار عبدالسلام عارف لە ئەو و منیشی کرد، بە هەردووکیانم گوت، ئێوە ئەگەر لە من ئەمین نین با یەکێکی دیکە بێت و ببێتە ئالقەی پێوەندی لەنێوان ئێوەو کورددا. ئەگەر لێم ئەمین مانای چی بێ‌ئاگای من پێوەندی بە دنیای کوردەوە دەکەن؟ من گۆیا هاتووم تەم برەوێنمەوە نەك خۆم تەماوی ببم. لەمەش پتر: بەدزی‌یەوە دەنێرن کەسانێك لە کوردان بەپارە دەکڕن گۆیا بنگەی هێز لە ئۆردوگای دوژمن ساز دەدەن کەچی ئەو کەسانەی کڕیوتانن وەکوو هایدرۆجین، نەك بێ‌سەنگن بەڵکوو لە هەر دەفرێك بکرێن دەفرەکە سووك دەبێت. سیاسەتی خەلق کرین بەدرێژایی مێژوو لەباو بووە بەلام کردراوەکە دەبێ نرخەکە بهێنێت: فەرموون شێخ لەتیف و عەباسی مامەنداغاو شێخ حسێنی حاجی سەید بکڕن..

لە کۆبوونەوەیەکی دوولایی لەگەڵ وزیری داخلیە باسی کوردێك هات کە ڕاسپاردەی کوردو حکومەت بە جێگەی خۆی دەگەیەنێت. وەزیری داخلیە مەدحی ئەو کەسەی کرد.. پێم گوتەوە، ئەو کەسە یەکێکە لە زیرەك و موسەقەفەکانی کورد، خۆم لەزەت لەگفتوگۆی دەبەم بەلام

بەپێی باوەڕی خۆم هەستێکی خۆبەکەم زانینی تێدایە لە ئاکامی ژیانی هەژارانەی تیی دا ڕسکاوە بوتە هۆی بێ ئوقرەیی و دڵەسورکێ و هێلانەگۆڕێ. لەو ماوەی پاش جەنگی دووەمەوە تا ئیمرۆ ڕاوکەی لە چەپ و لە کوردپەروەری و لە حکومەت و لە دەسەلاتی دیکەش داناوە. ئێستاکەش کە نامە لە کوردەوە بۆ حکومەت وەیا لە حکومەتەوە بۆ کورد دەهێنێت و دەبات لەپێشەوە بە چەپەکانی ڕادەگەیەنێت.

ئەم قسانەم لەگەڵ رشید مصلح، وەزیری داخلیە کرد چونکە هەلێک بوو نەدەشیا لەدەستی بدەم: من لەخۆمەوە باسی هیچ کەسم لەگەل حکومەت نەدەکرد، کە لەوجارەش دا باسی ئەو کەسەم کرد لە نوختەی بەرژەوەندی کوردو ئەمانەت و ڕاست گۆیی خۆم بوو لەئاست کوردویستی دا کە ئەوسا ئاشتیی پتر بۆ دەست دەدا. هەرچی چەپەکان بوون حەزیان نەدەکرد کوردو حکومەت ڕێك بن هەر وەك کوردیش ئەگەر لەباری ئەواندا بایە حەزی نەدەکرد چەپ و حکومەت ڕێك بن. لەمەوە ئاشکرایە ئاگادار بوونی چەپ لە هەموو نهێنی یەکی نێوان کوردو حکومەت دەی کێشایەوە بۆ پەیدابوونی کەلێن کە دەشیا نابەرژەوەندی پێدا تێپەڕێت. سەیر لەوەدا بوو کە من بە سیفەتی نوێنەرایەتیی کورد ئەو نهێنیانەم نەدەزانی کە چەپ لەڕێی ئەو کەسەوە پەیتا پەیتا لە کۆشی دەکرا. وابزانم دوای ئەم گفتوگۆیە کابرا وازی لێ هێندرا بەلام وەعدم لە رشید مصلح وەرگرت کە هیچی خراپی لەگەڵ دا نەکرێت و نەشکرا.

دامەزراوێکی ئەمەریکایی سەر بە کەنیشتەکانی جیهانی کە (K. A. R. E یان (K.E.R) ڕەمزی بوو، بایی دوو ملیۆن دۆلار بژێوی پێشکەش بە لێقەوماوی کورد کرد بەلام هەتا من نەبووم بە وەزیر و تەخویل نەکرام بە ئیمزاکردنی خاڵەکانی ڕێك کەوتن نامەی ئەو پێشکەشە، شتومەکی تەسلیم بە حکومەت نەکرد. سەفیری ئەمەریکا ئاهەنگێکی گەورەی بۆ ئەو موناسەبەیە لە ئوتێلی بەغدا گێڕا. هەر لەبیرمە، لەبارەی زووکردن لە گەیاندنی بژێو بە لێقەوماوان گوتم: ئەگەر بە پەرەشووت لەو هەرێمەی فڕێ بدەن جێی خۆی دەکاتەوە. سەفیر مستر سترۆنگ گوتی: خۆ دەبێ پەرەشووت هەبێ ئنجا خواردەمەنی پێ فڕێ بدەیت. مەبەستی ئەوەبوو بڵێ پێویستە متمانە هەبێت بۆ گەیشتنی شتەکان بە لێقەوماوان. ڕاستیشی بۆچووبوو: هەر من ئیمزام کردو سەرەك وەزیران بڕیارێکی لەلای خۆیەوە دەرکرد کە بە فەرمانی ئەو شتەکان دابەش بکرێن. لە ئاکام دا بەشی هەرەزۆری بژێوەکە بە پیاوی وەها درا هەم دەوڵەمەند بوو هەم قازانجی کردبوو لە هەرای کوردستان هەم دوژمنی کوردایەتی بوو. . ئەم ڕەفتارە زۆر کاری تێ کردم بەلام وەك ئێستا بۆت ڕوون دەکەمەوە هیچم پێ نەدەکرا:

لەو هاوینەی ١٩٦٤ جارێکیان لەگەڵ لیوا عبدالرحمان عارف، برای سەرۆك کۆمارو سەرەك ئەرکانی سپای عیراق، بە ڕەفاقەتی متصرفی سلێمانی و چەند ئەفسەرێکی گەورە لە سلێمانی یەوە بە هەلیکۆپتەر چووین بۆ دیدەنی کردن لە کوردە چەکدارەکان لە ئاوایی چوارتە. ڕۆژەکەی ڕەشەبای هەبوو تەیارەکەمان دوو جاران خۆی تێ کرد نەی توانی لە ئەزمر تێپەڕێت تومەز (جیوب هواش) هەبوو جاری سی یەم زۆری لێ کشایەوە ئنجا ٤٠ مەترێك لە شاخەکە بەرزتر بووە. سەفەرەکە بۆ هەوێی یەك لا کردنی هەموو گرفتێك بوو بەلام وەکوو هەموو جاران نەزۆك بوو. من شەو مامەوە. لە دەسەلاتداری کوردم داواکرد ڕێم بدات لە پێویستە استقالە بدەم. دەستی گەیاندە کەمەرم و گوتی تکات لێ دەکەم باسی استقالە مەکە. تائێستاش تێ نەگەیشتم ئەم پەروشەی لەچی یەوە بوو بەلام لەودەمەدا وەها بەدڵ قسەکەی کرد هەموو کەلێنێکی لە استقالەم گرت و پەکی خستم.

لە زستانی کۆتایی ١٩٦٤ دوو سەفەری پرسەم بۆ کۆیی کرد: یەکێکیان هی حاجی جەلالی حاجی ئەمینی حوسێنی، لە بنەماڵە مەیدەو کۆنەکانی کۆیەو قەدیمە دۆستی جەلی زادان بوو. وەك بزانم ئەوان لە ئیمە زووتر نیشتەجێی کۆیە بوون، لە سەردەمی محمدی عیساغا کە لەگەل غەفووریان لەسالی ١٢٣٧ك. بەر قەتلوعام کەوت. هەر لە ڕقی ئەو محمدی عیساغایە بەینێك کۆیەیان چۆل کردوە دواتر بۆی هاتوونەتەوە.

حاجی جەلال برای چوارەم بوو لەنێوان پێنج برایاندا دوای هەموان بە ڕەحمەتی خوا شادبوو

پرسەی دوەم هی مامۆستا مەلا عصومی هەورامی، قوتابیی باوکم و جێ نشینی ئەو و مامم لە مزگەوتی گەورەو دۆستی خۆم. بەر لە دەرچوونم بەرەو کۆیێ بە تەلەفۆن لە سەرۆکی دیوانی قصری جمهوریم گەیاند کەوا کارێکی شیرن دەبێ ئەگەر سەرۆك کۆمار سەرەخۆش لە تازیەدارانی مەلا معصوم بکات: قسەکە جێی گرت و قائمقامی کۆیی لە وەکالەتی سەرۆك چوە پرسەیان.. مەلا معصوم لە ١٩٦١ دووچاری بەندیخانەهات لە ١٩٦٣ش دە مانگان دەربەدەری چێشت سالێکیشی نەبرد دوای گەڕانەوەی بۆ کۆیێ چوە ڕەحمەتی خوا.

حکومەت لەلای خۆیەوە گلەیی هەبوو کە باری ئیدارەی کوردستان پێوەی دیارە حکومەتی نی یە. کوردەکەش گلەیی هەبوو کە جگە لە گێڕانەوەی موەزەفی مفصول چی ئەوتۆ بۆکورد نەکراوە دڵ خۆش بکات. بەناوی دۆزینەوەی چارە کۆبوونەوەیەکی دوورۆژ ی بە سەرپەرشتی کردنی رشید مصلح لە وەزارەتی دیفاع گیرا چەند وەزیرێك و سەرۆکی ئەرکان و قائد فیرقەکان و ئەفسەری دیکەش بەشداری یان تێ داکرد. پاش وتوویژ و لێکدانەوەو هەلگێرو وەرگێر لێم داواکرا بچم بۆ دیدەنی کاربەدەستی چەکداران. ڕێکەوت وەهابوو بەر لەو کۆبوونەوانە لەلایەن سەفیری ئەمەریکاوە داوەت کرابووم بۆ نیوەڕۆژەیەك کە ڕۆژ ی دوای کۆبوونەوەکانی بۆ داندرا بوو. گوتم تا ئەو داوەتە بەسەر نەچێ پێم ناکرێ سەفەر بکەم

چونکـه بەلێنم داوە. لای دەپلۆماسی یانیش زۆر ناخۆشە بەڵێن شکاندن بەرنامەیان لێ بشێوێنێ.

ڕۆژ ی داوەتــەکـە تەنهـ من و سەفیـر بەدەوری مێـزێکی بچـووکـەوە دانیشتبـووین: خانـووی سەفارەت هەتا بڵێی فرەوان بوو مێزەکەش هەتا بڵێی بچـووك بوو. ئەممـا خواردنـەکـە هەرباسی مەکە. . . بریتی بوو لە گۆشتێکی ناو قتـوو لەگـەڵ سەلاتە، ئاوێ بێنەو دەستان بشۆ. سەرو کاسە ئاوێکیــان بو دانـــبـووین هەر کاسـەیـە گوڵێکی تێ دا بوو. دیـاربـووبو دەست پێ تەڕکردن بوو: فتارەکەی لای عبدالکریم قاسمم بەبیرهاتەوە کە چۆن بەر لە دانیشتمـان بەسـەر کورسی یەوە دەستێکی نە ئاوەکەی کاسەی خۆی تەڕ کرد نەکا من بە هەڵە تەمای خواردنەوەی لێ بێنم. حەکایەتەکەم بوسـەفیـر گێـڕایـەوە وگوتم ئێوە بەو گوڵەی ناو ئاوەکە ڕێی ئەو هەڵەیەتان لە میوان بەستوە گوتی. ئەمما سەیر دەبێ میوان وەها بزانێ گوڵەکە بو خواردنە!.

لەبیـرم نەمـاوە چەندو چیمان گوت بەڵام لەبیرمە، چ جاری ئەو داوەتە بێت و چ جاری دیکەی موناسەبان بووبێت مـــتر سترۆنگ شتێکی نەگوت ئەوانـە بێ لای عبـدالســلام عارف نەیلێت. سیاسەتەکەی بێ خوارەکەو خیچـەکـە دۆستی تیکـڕای عەرەب بوو تەنـانـەت لە وتـوویـژدا کە باسی تەدەخـولی میــسری ئەوسـا لە کاروبـاری یەمـەن هاتـەپێـش یەك ڕەخنەی لێ نەگرت و چ پەرۆشـێـی نەبوو بو سعودیە کە بەو تەدەخولە سەغلەتە هەر گیـــزیش بۆئەوە نەچـوو کە دەشێ سەرۆك جەمـال چاوی بڕی بێتـە نەوتی خەلیج. بگرە بەئاشکرا لای سیاسەتی شۆرشی میـسری دەگرت لەئاست (رجـعیــة)ی عەرەب. بابی سەری دەرزیش وشـــەی نەدرکـانــد بێنی خۆهەڵقوتاندنی لێ بیت لە کاروباری عیراق ئەوە نەبێ کە بۆ ئاشتی و لێك ڕازی بوونی دادەتـاشی. ئەم تارمـاییـانـەم لەبیـرن بێ ئەوەی قسەکان یاد بکەمەوە وەیا بابەتی دیکەی وتووێژمان بەبیرم دا بێتەوە، ئەوەندەش دەزانم کەمن بەتەمای هیچ شتێك ئەوداوەتەم پەسەند نەکردبوو تەنها یەك نوختەم لە مێشـك دا بوو ئەویش ئایـا ئەگەر لە بارێك دا کەوتمە مەترسیی گیران و خەتـــەری کوشنـدەوە دەتـوانم پەنـا بۆ سـەفـارەتی ئەوان ببـەم؟ ڕووداوی ١٩٦٣م لە بیـربـوو نەم دەویـــت دووچاری وەزعێکی وەك ئەوسا ببمەوە. لە ئاست ئەم پرسیـــارەدا گوتی: ئێمـە لە سیاسـەتمـان دا نی یـە تەمـای پەنـاهێنـان بۆ لامـان لە بەر کەس بنێین حەزیش ناکـەین کەس پەنـامـان بۆبهێنێ بەڵام کە کار گەیشتـە خەتـەری کوشنـدە دەرگـا لەڕووی هەڕەشە لێ کـراو داناخەین. . ڕەنگە قسەکانی ڕاستی یەکی ڕووت بن و ڕەنگیشە پەردەیـەکی دەبلۆماسی یانەی بێت بەسەر موجامەلە کردن لەکەڵ من دا کە بە قسەی تۆێکلدار تێم بگەیەنێ ڕەت ناکرێمەوە.

من کە چوومـــەوە لای کوردەکـــان، هەرچـــی ڕا ســـپـاردەی ئەو کۆبـوونەوەیەی دوو ڕۆژ ی بوو بەکۆمەڵەی دانیشتوانی دیوانی سەرۆکایەتی چەکدارانم ڕاگەیاند، ئاکامیشی هەر نامەی دۆستانەو قـەی متمانەبەخش بوو لەلایــەن کوردەوە بۆ حکـومـەت، ئەوەی ڕاستیش بێت چی دیکـە لە دەسەڵات دا نەبوو چونکە حکومەتی عبدالسلام زەینی مەیلەو بەتاڵ بوو لە داخـوازی یـەکـانی کوردەواری. ئەوپـەڕی بەخشنـدەیی و ڕەچـاوکـردنی ماف پارێـزی بەلای ئەوەوە هەر ئەوەنـدە بوو بێ هـەرا (وەکوو جاران بەدوو پاران) خەڵقــەکــە لەمــالی خۆی دابنیشێت و مل لەکێـلان و چانـدن و مامـلەتـی بازاڕی بنێت. مرۆ مەخلووقێکی عەنتیکــەیــە، بەدرەنگــەوە تێی دەگـەیت، ڕەنگـە هەر تاکێکیشی بە هەموو عومری لە خۆی نەگات: عبـدالســلام کە پەندی وەهای لەمێشك دا بوو بۆ سـەلامەتی کورد، ئەدی بۆچی هەمــان پەنــدی بۆخۆی بەکـار نەهێنـا لە ڕۆژ ی ١٤ ی تەمـووزی ١٩٥٨؟ عەقیـدێکی ڕێك وپێك بوو مەعاشێکی تێرو تەسەلی وەردەگرت خەلقیش لە دەشـت و شار خەریکی کێـلان و پێـوان و لێ نان و خوێندنیش بوون ئیتر بگرە بکوژەی بۆچی بوو؟

وتووێژ ی خۆمم لەگەڵ سەفیری ئەمەریکایی هەلگرت بۆ دیدەنی یەکی مەحـرەمانە کە لەگەڵ سەرۆکی چەکداران بە بەشداری کردنی دوو کەسی دیکەی بەرپرسی کورد پێك هات. چەندی بە بیرم دا هاتەوە لەو وتووێژە بۆئەو سێ کەسەم گێڕایەوە.

لێرەدا پێش دەستی دەکەم بۆ گێڕانەوەی کورتە حیکایەتێکی مەزەدار کە پێـوەنـدی هەیە بەم وتووێژەوە ئەگەر بازی بۆ نەهاوێژم جاری دوو ساڵێکی ماوە نۆرەی بگـاتێ، ئەوسـاش بەزەحمـەت ڕۆژگـارم بۆ هەڵ دەکـرێتەوە تازەیی خوێنەر بەرەوپاش بگێرمەوە بۆ ڕۆژانی وتووێژەکە:

دوایـن جار کە فەریـق طاهــر یحیـی بوو بەســەرەك وەزیـــران لە سەرۆکـایـەتیی عبـدالرحمان عارف دا، چەند ڕۆژ ێکی بەسەردا تێپەڕی ڕێکـەوت وەهـا بوو لیوا ناجی طالب و عەقید رجب عبدالمجید بەدوام دا هاتن تابـــەیـەکـەوە بچین بۆ یەك دوو پرســەی خوالێ خـۆش بوان. ناجی گوتی: دەبینم (مـاجـابوك وزیر) گوتم، تۆخۆت بوویت بەسەرەك وەزیران (مـاجبتنی وزیـر) ئیتـر بۆچی سەیـر بێ یەکێکی دیکـە (ماجابنی وزیر)؟ نەختێــك ڕامـــاو گوتی. کانت غیـر ظروف. . . من نەم پرسی ئەو (غیـر ظروف)ە چی بوو: لەباری وەهادا ئایەتی (لاتسألوا عن اشیاء ان تبد لکم تسؤکم) بەچاوەوە دەگرم: . پاش ئەمە بەماوەی دوو ساڵێك دیدەنی برادەرێکی وەفاکارم کرد کە بەیەکەوە لە حقـوقمـان دەخـوێنـدو بەیـەکەوەش وەزیر بووین، دوایمنیش بەوەزیری مایـەوە هەتـا خۆی بێـزار بوو لە سیاسـەت و کەوتە باری محاماتەوە. گوتی. شتێکت بۆ دەگێـڕمـەوە هەرگیـز دەرفـەتم نەبـوو بۆتی بگێـڕمـەوە. گوتی: جارێکیان لای عبدالسلام بووین، سەرەك وەزیران و چەند ئەفسەرێك و وەزیری دیکەش لای بوون ڕاپۆرتێکی بۆ هات و بۆمانی خوێندەوە لەبارەی وتـوویـژ ێکی کە تۆ لەگـەڵ سەفیـری ئەمەریکات کردوە، تەقریرەکە فلانە

شت و فلانە شتی تێدا نووسرا بوو کە گوتبووتە . . . برادەرەکەم چەندێکی شتێك لەو شتانەی باس دەکرد کە گوتبوومە بەبیرم دەهاتەوە کەوا راستە گوتبوومە تا ئەوەی وەك کە دینار خوردبکەیتەوە بە درهەم و هەموو درهەمەکانی دانەدانە بژمێریت ئەو راپۆرتەش هەموو قسەکانی منی خورد کردبۆوە . ئەودەمە بیرم بو قسەکەی لیوا ناجی طالب چووە کەگوتی (کانت غیر ظروف) : دیارە ئەو راپۆرتە جارێ لەمێشکان دا گەرم و گوڕ بوە بایی ئەوەی دۆستێکی وەکوو لیوا ناجی رێیی نەبێ پرسێکم پێ بکا بەبوون و بەنەبوون . .

لێرەدا دەمەوێ خوێنەر لەدزێوی دیمەنەکە رابمێنێت . : جارەهای جارگوتوومە سیاسەت (monkey business ـ کاری مەیموون)ە . تۆ سەیری! وتووێژێك تەنها پێنج کەس بی زانن هەموویشی بە روالەت جێی متمانە بن ئنجا بەگردی و بێ کەم و کورتی لە کۆشی سەرۆکی دەولەت بکرێتەوە . بێ گومان من و سەفیری ئەمەریکا دژی خۆمان شتی ئەوتۆیی ناکەین . کابرای سەرۆکی چەکداری کوردیش ئەوزەرەرە لە خۆی نادات . دەمێنێتەوە ئەو دوو بەرپرسە تێ هەلکشیوە لە کوردایەتی یان یەکێکیان یان هەردوویان خزمەتەکەیان کردوە ، بەرێکوردەریش کراوە دەنا مێشکی عادەتی وەها بەسەلامەتی بیست درهەمی دینارێك دەوروتەسلیم ناکاتەوە . لەم بابەتەی رەفتاری گلاو نموونەی دیکەم بیستووە لەتەجرەبەی دۆستی باوەڕ پێ کراوم بەلام هێندەی ئەمیان سفت نەبوە چونکە جغزی خەبەرزانەکان هەرەمەیی بووەو ژمارەیشی پتر بوە . .

رووداوێکی خۆش و شیرنی پێوەندی بەخۆمەوە هەبێت لەو رۆژانەدا ئەوە بوو ، لە رۆژی ١٥ /٨/ ١٩٦٤ لە کەرکووکەوە بە تەلەفۆن خەبەرم پێ درا کەوا کوری دووەمم (محمد) پێی ناوەتە ئەم جیهانە . شەوی بەرایی خەونم دیت ، منداڵێکی ساوا بە باوەشی ئافرەتێکی ماڵی خۆمانەوە بوو، ئافرەتەکە پێمی گوت : مزگێنی خوا کورەکی پێ داین . خەونەکە سەیر نی یە چونکە ئاگام هەبوو کە منداڵێکمان بەرێوەیە . راست بوونیشی لەوەدا کە کور بوو نەك کچ هێندێکی دەچێتەوە بۆ حەزی خۆم کە پێم خۆش بوو کورێکم بەناوی باوکمەوە ناوبنێم ، هێندێکیشی دەچێتەوە بۆ رێکەوت ، خۆ ئەگەر نەختێکیشی هی راست بینی بێت لەوەدا نەماوە پێی بگوترێ ئەفسانەو جنۆکەپەرستی چونکە ماتیریالیستەکانی ئەم سەردەمە لەچاو ماتیریالیستی کۆنە مۆدێل هێندەی شێخی سەر بەرماڵ باوەڕیان هێناوە بە (پەنامەکیەتی)ی زۆر باری جیهانی گیان لەبەرو سروشتیش ، چ جایی مرۆڤایەتی . شالڵا زۆر نەبات ماتیریالیست بەوەدا بناسینەوە ریشی بەردابێتەوەو تەزبیحی دوعایانی بەدەستەوە گرتبێت : جاران چەند حەزمان دەکرد مەلای (منۆر) ببینین ئێستا خەریکین بەدوا ماتیریالیستی (منۆر)دا بگەرێین کە لە قەپێلکی رەق وتەقی ماتیریالیزمی سەدەی نوزدەیەم دەرچوویێت . . بڵێن ئامین!

نێوانی حکومەت و کورد هەتا دەهات بەرەو ناخۆشی یەوە دەچوو، بەوەر پێك کردن تەنك بووبوو. رۆژێك لەو رۆژانە فەریق طاهر یحیی ، سەرەك وەزیران ، لە ژوورەکەی خۆی کە بەجووتە دانیشتبووین گوتی : راپورتێك لە کەرکووکەوە هاتوە دەربارەی شتێکی تۆ گوتبێت ، لای سەرۆك کومار ، خوێندمانەوە . گوتی من باوەڕم نی یە قسەی ئەوتۆیی بکەریت بەلام راپۆرت دەلێ ، گوتووتە ئەگەر حکومەت داخوازی یەکانی کورد جێ بەجێ نەکات هەر لە رەواندز هەتافاو دەکەینە ئاگر . گوتم ، أبوزهیر : قسەی ئەوتۆیی لەوانە نی یە بە کورێنی بڵێم . بەڵێ گوتوومە ، ئەگەر گوتبێتیشم دەبێ بڵێم نەم گوتوە . تۆ خۆت شارەزای تەبیاتمی ، لە نیازەکانیش بەڵەدیت : ئەگەر پێت وەهایە قسەی وەها لە من رەچاو دەکریت بی سەلمێنە ، دەنا لەلای خۆتەوە فتی بکە . گوتی بێ مجاملە من لە هەوەڵەوە ئەو راپۆرتەم بە درۆیەکی بێ ریشە حیساب کردوە .

لەو تەرزە بارەدا دەژیاین ، بریارێك وەیا پێش نیازێك هاتەپێش کە من و صبحی عبدالحمید وەزیر داخلیەی ئەوساو عارف عبدالرزاقی سەرۆکی هێزی ئاسمانی بەیەکەوەمان بچین بۆ دیدەنی کوردەکان لە رانیە . من بە ئۆتۆمۆبیل چووم بۆکەرکووك وابزانم ئەو دوو بەرپرسە بە فڕۆکە چووبوون . لە ژووری زعیم رکن فیصل أنصاری قائدی فرقەی دووەم چوارقۆڵی کۆبووینەوە بەدیار داهاتنی دەمی لەبار بۆ فڕینمان بەرەو رانیە کەوا رەنگ بوو ئەو رۆژە وەیا سبەینێ بێت . . دووروودرێژ قسەمان کرد ، بەزۆریش عارف عبدالرزاق لەگەلم دەدوا . تێکرای قسەکان دەوری هەلکەوتی نالەباری ئەودەمە لەنێوان حکومەت و کوردی چەکدار هەڵ دەهات ، لەناویان دا سێ خاڵ بۆ ئێرە رادەگوێزم : یەکیان ئەوەبوو لێمی پرسی : ماهو الحکم الوطني؟ گوتم : نەکا وەلامەکەم ئەو نەبێ کە بەتەمای شتی دیکەی لەسەر هەڵ بستێنیت خۆت وەلام بدەوە . گوتی الحکم الوطني هو إدارة البلاد بواسطة أبنائها . لەمەوە بۆ هێندی چوو کە عیراق لەلایەن کورانی خۆی بەرێوە دەبردرێت ئیتر بۆچی بشێ لەڕووی هەلگەرێنەوە؟ گوتم : خۆشای ئێران کوری ئێرانە ، بۆچی ئێوە بەپیاوی چاکی نازانن؟ بۆشۆرشی تەمووزیش چوومەوە تا بتوانم بڵێم هەلگەرانەوە وەیا موعارەزە بەندە بە باوەڕی خەلق بەچاك بوون و چاك نەبوونی حوکمەوە . بەدەم ئەم قسانەوە راشم گەیاند کە من خۆم حەز لە ئاشتی دەکەم و بەدەستم بێت حکومەت و کورد لە سەعاتێك دا ئاشت دەکەمەوە .

خاڵی دووەم ئەوەبوو گوتی ، ئیستیعمار ١٦ جیپی بۆ چەکداران هەناردوە لەگەڵ چەند کەلوپەلێك . گوتم ، پێم باوەڕ بکە نازانم و نەم بیستوە شتی وەها هاتبێت بەلام ئەگەر ئەمە راست بێت دیارە ئیستیعمار حەسقێلی لەگەڵ ئەو چەکدارانە بەکار دەهێنێت چونکە وەك ئاگادارم تا پێی کرابێت کۆسپی بەرپێی حکومەتی عیراقی هەموار کردوە لە

تیجارەت و چەك و جبەخانە . . .

خالی سێیەم ئەوە بوو، لە قسانی دا گوتی : أحب الصراحة والوضوح . پێم گوتەوە : عندك تفاؤل مسلي ، چونکە سیاسەت دوژمنی پاتەوپات و ئاشکرایی یە . گوتیشم ، کاتێك لێت داواکرا بیبت بە سەرەك وەزیران تەکەی بسەلمێنیت چونکە بەرپرس بوون دژی ئاشکرایی و سەراحەتە . گوتی : منویگول راح أقبل اکون رئيس وزرا . . گوتم : من باب الاحتياط أتقدم لك بنصيحة أخوية، یاخود شتێکی بەو مانایەم گوت .

سەیر لەوەدا بوو دواتر زانیومەوە، لەو دەمەدا کە باسی (صراحةو وضوح) دەکرا شەوکەت عەقراوی لە ژوورێك دانرابوو، کە من نەی‌بینم . نامەی هێنابوو بۆیان لەلایەن چەکدارانەوە . ئەم قسەیەشم لە شەوکەت خۆی بیستەوە .

من گەڕامەوە مالی شێخ رەئووفی خانەقا . زۆری نەبرد تەلەفۆنیان بۆکردم کە چوونی ڕانیە بەتال کرا . ئەوسا نەم زانی بۆچی ، دواتر مەعلوومم کرد کە هاتنی شەوکەت هۆی گۆڕانی بەرنامەکە بوو ئیتر ئەو هاتنە هەرچی یەکی بەدمەوە بوو بێت فەرق ناکات . .

لێرەدا دوو خالی بچووك دەبێ بێتە یادکردنەوەوە : یەکیان ئەوەیە کە من ناتوانم بڵێم عارف عبدالرزاق ئاگادار بوو لە پەنادانی شەوکەت عەقراوی لێم . دەشی لەو دەمەدا کە قسەمان دەکرد ئەو هاتنی شەوکەتی نەبیستبێ . ئەمە دەڵێم چونکە من لە موناقەشەی گرنگ دا ئەوپەڕی سەراحەتم لێی بیستووە .

خالی دووەم ئەوە بوو کە من صمدی حاجی محمدی بەنێنم لەگەڵ دا بوو، هەڵبەت لە دانیشتنەکەمان وەکوو گوێگر بەشدار بوو . صمد بە (تنیب) هاتبوە (إعماری شمال) لە زۆر هاتوچۆدا بەهانام دەهات .

خەتەری هەڵبوونەوەی بڵێسەی شەڕ سەری دەرهێنا . متصرفی سلێمانی سید عبدالرزاق سید محمود إستقالەی دا ، وەکوو زەنگی ئاگادار کردنەوەم هاتە بەر گوێ .

لە شوباتی ١٩٦٥ دوو چالاکی پەلەکوتکەی (ژیان)م بۆ پاراستنی ئاشتی کرد . هی یەکەمیان لەلایەن چەند بەرپرسێکی باڵیۆزخانەی میسرەوە سەری هەڵ دا : سکرتێری یەکەم و دووەمیان داوایان کرد بیان بینم . لەمالی صمدی حاجی محمد دیتنم . یەکەمیان قسەی‌کرد ، دیار بوو میسر ترسی هەبوو لە سالی ١٩٦٥ ئیسرائیل زەبرێکی گەورەی لێ بدات . ڕای نواند کە تەنها پالپشتێکی میسر ئومێدی پێی هەبێت سپای عیراقە . عیراقیش کە سەرلەنوێ بە کوردانەوە خەریك بێت میسر بەتەواوی بێ دۆست دەمێنێتەوە . پێم گوت وەزارەت چەند وەزیرێکی ناصری تێدایە بۆچی نایان دوێنێت . چاوی فرمێسکی تێ گەڕاو گوتی : چوومەتە لایان و پێم گوتوون ئێوە ئەگەر بۆخاتری میسریش شەڕ لەگەڵ کورد دەکەن (على شان خاطر مصر سيبوهم) واتە : لەبەر خاتری میسر وازیان لێ بهێنن .

میسرییەکان دەیان ویست من لەلای خۆمەوە هەوڵێك بدەم بۆ هێمنی و ئاشتی . هەرچەند من چی لەدەستم هاتبێت کردبووم دیسانەوە بەردەوام بووم لەسەر هەوڵ و تەقلام . لەپێشەوە (ملحق عسکری) میسرم دیت ئەویش پاتەوپات قسەکانی سکرتێری یەکەمی کردەوە ـ چوومە لای سەفیری میسر (امين هويدی) ، ئەویان لە سنووری دەپلوماسی خۆی دامەزراند بێ ئەوەی (ئا) وەیا (نا) دەربڕی کە هیچ لزوم نەبوو بەو خۆشیرکییە لەگەڵ من دا کەپێشتر شناسایی و وتوویژی مەحرەمانەشمان هەبوو بەلام خامۆش بوون لەباری وەهادا دەلالەتی (ئا)ی هەیە . . چوومە لای صبحی عبدالحميد وەزیری داخلیە : دادوبڕوی میسرییەکانم پێ گوت ، ئەویش نەی‌دەزانی چ بڵێ . پێم گوت ئێوە ناصرین ، فەرمانی سەرشاناتانە لەسەر میصر بکەنەوە . . گوتیشم ، فلانە کەس : چاك بزانن ، هەلێکی کە ئێستا لە دەستاندایەوتیی دا گەیشتوونەتە وەزارەت ئەگەر بی دۆڕێنن جارێکی دیکە بە خەونیش پێی ناگەنەوە . . قسەمان زۆر بوون لەبیرمە بەدڵێکی خەفەتبارەوە گوتی : چ بەختێکی بەد بوو منی هێنایە ئەم وەزعە بۆ خۆم لە جەیش حەسابەوە بووم چ ئەرکێکی زیادم بەسەرەوە نەبوو . . . خولاسە لەم چارچێوەیە دەرنەچووین بۆ مەیدانێکی نەختێك هەناسە تێدا هەڵبێت . .

وەها ڕێك کەوت ، دوای یەك دووڕۆژ سەفیری سۆڤێتیم هاتەلا . سکرتێرێکی لەگەڵ دا بوو قسەی تەرجەمە دەکرد لەنێوان ڕووسی وئینگلیزیدا . من یەکسەر تەنگەتاویی میسرییەکانم باس کرد . سەفیر گوتی ئەگەر مانیع نەبێ قسەکانت بە شۆرت هاند دەنووسینەوە . من زۆرم پێ خۆش بوو . چی‌گوتم سکرتێرەکە نووسیەوە، گوتم :

میصر هەستی خەتەرێکی کوشندە دەکات لە ئیسرائیلەوە بۆی بێت . هیچ دۆستێکی بەهێزیش لەم ڕۆژهەلاتە شك نابات پشتی پێ ببەستێت عیراق نەبێت . خولاسە هەموو حیکایەتەکەم بۆ گێڕایەوە تا ئەوەی کەئەگەر سپای عیراق بە کوردانەوە خەریك بێت ئەم دۆستەشی بۆی بەکەڵك نامێنێت . ئنجا لێرەدا ڕووی لاپەڕەیەکی مەسەلەکەم کردەوە کە پێوەندی هەبوو بەبەرژەوەندی ئەوانەوە گوتم : ئێوە لەو چەندین سالەی دوایی‌دا بۆ میصرتان کردوەو کۆشیوە هەمووی دەچێتە هیچە ئەگەر جمال عبدالناصر تێ بشکێت و لەهەموو ڕۆژهەلاتی ناوەڕاست دەست بەتال دەمێننەوە . لێمی پرسی ئێمە چ دەتوانین بکەین لەو ناوەدا . گوتم : دەتوانن لە ڕادیۆو ڕۆژنامەکانتان دا بڵێن ، ئەگەر شەڕ لە کوردستانی عیراق دەست پێ بکاتەوە ناتوانین (فدائی) کوردی ڕووسیا بگێڕینەوە لەوەی بەشداری بکەن لەو شەڕە . گوتی دەترسم ئەم قسەیە بە تەدەخول لە کاروباری ژوورەوەی عیراق بژمێردرێت . گوتم ئەگەر ترسی میصرییەکان بێتە جێ

ئیوه ئیفلاس دەکەن، تازە چ جیی دوودڵی کردنە لە کومانی (تدخل)؟ لەمەدا مەسەلەیەکم بوی هینایەوە [دواتر کە بوچەکدارانم باس کردەوە بوو بەهوی پیکەنینیکی خوشکەڵە] گوتم دەڵین کابرایەك ویستی خوبکوژیت، هەر ئاوی زی هەبوو خوی تیدا بخنکینی پیی گەیاندە ئاوەکە خیرا کیشایەوە گوتی زور ساردە قوننجی پی دەکەم. . .

ماوەی سەعاتیك و چل دەقیقە ئەم جورە قسانە نووسران.

دوای سی روژ ئیوارەیەك چوومە داوەتی سەفارەتی یەکیك لە دەولەتەکانی عەرەبی باکووری ئەفەریقا [وابزانم توونس بوو]. من گەیشتمە سالونی پیشوازی موستەشاری سەفارەتی رووس و چەند کەسیکی لە بەرپرسەکانی [پیشتر نەمدیتبوون] هاتنە دەورم و بەدل سپاسگوزارییان لەووتوویژەی چەند روژ پیشتریان لی کردم، گوتی: هەمووقسەکان بەرالی بوونی تیکرای بەرپرسی سەفارەت درایە وەزارەتی کاروباری دەرەوەی سوڤیەت بە تەئییدەوە. .

ئەم رووداوە، وەك بیستمەوە، یەك ئاکامی هەبوو: دوای مانگیك وەیا پتر وەفدیکی حکومەتی ئەوسای عیراق چووە موسکو بوریك کەوتن لەسەر هەندی لایەنی نان و ویری نابووری کە یارمەتی دانی تیدا بی بو عیراق، رووسەکان گوتبوویان پیویستە وتوویژ لەسەر وەزعی کوردیش بکریت ئنجا باسی ئابووری بیتەپیش عیراق ئەی سەلماندبوو، وەفدەکەش گەرایەوە بی دەسکەوت.

دەبی لیرەدا بەر لەبەسەر چوونی کژی لەباری قسەلیوە کردن، بلیم: سەفیری ئیران (مهدی پیراستە) کە پیشتر هەر ناویم بیستبوو نەختیك بە درەنگەوە هاتە موبارەك بادی بوونم بە وەزیر. دوای چاك وچوونی گوتی: ئەمین بم کە ریکوردەر لە ژوورەکەت دانەندراوە؟ ئنجا گوتی: بە ئانقەست خوم وەخراند لە موبارەك بادیت تاکوو کەس خەیالیکی بەدن دا نایەت لە هەبوونی نیازیکی تایبەتی لە هاتنم بولات. گوتی: شاهەنشا منی بە سەفیر ناردوە کە مەعلوومە پایەم لە دەولەتی ئیران و لای شاهەنشا چون بووەو چونە هەر هەتا لە نزیکەوە پیوەندیم بە کوردەوە هەبیت چونکە ئاریا میهر متمانەی بە هەموو کەسیك نی یە لە زاری ئەوەوە وەیا لە زاری حکومەتی ئیرانەوە دەربارەی کورد بدویت. . . ئیتر لەم بوارەوە زور قسەی کرد هەمووی هەر بو دوستایەتی ئیران و کوردی دادەبری. منیش لەوەلام دا چەندی توانیم قسەم بو ئەولایەنە ئاژ وا کە ئیران دەتوانی دوستی کورد بیت لە ریی دل راگرتنی ملیونەها کوردی ئیرانەوە، لە سنووری ئیمکان دا باسی پەنابەرەکانی مەکتەبی سیاسیشم هینایە ناو کە حەواندنەوەیان بەشیوەیەکی حورمەت کارانە شیرنی لەزاری کورد دەگیریت. .

دکتور مەهدی پیراستە ناوی هەبوو: وەزارەتی داخلیەی ئیرانی درابوویی کە دەزانین چ پایەیەکی گرنگە بەلای حکومەتەکانی روژهەلاتەوە. دەشی من بەهەلەدا چووبیتم، بەلام ئەوەندەی بوم دەرکەوت بایی پایەو شورەتەکەی نەبوو. ئیرانی یەکان ئەو زوعەکی زور بەکار دەهینن کەوا رەنگە نەختیك لە شەخسییەتی راستینەیان بشارنەوە لەکەن ئەمەش دا هی وەهایانم دیتووە هیندەی پیراستە نەدەچووە قەپیلك. ئاوناوە سەردانی دەکردم و لە داوەتی رەسمیش پییانەوە دیاربوو کە دەیانەوی هەستی رەزامەندی بکەم.

ملحق عەسکەری ئیران کوریکی کورد بوو ناوی عیسی پیشمان بوو، کوردی یەکی رەوانی قسە دەکرد. ئاوناوە وەکوو کوردیك ئەك بە میفەتی رەسمی دەهاتە لام لەئوتیل. لەقسان دا دیاربوو شارەزای کوردستانی عیراقەو چوتە سلیمانی و کویەو شاری دیکەی کوردیش گەیشتە کیشی دەناسی لەوانەی ئاویکیان هەبوو، لە هیندیکیان میوانیش بووبوو.

ئەم بابەتە دانەیان بە من هەر بەردەوام بوون دوای وەزارەتیشم. لە جیی خویدا بوی دەگەریمەوە.

کیشەیەکی زور رەبەنلاحی بی تکە هاتە پیش وەکوو گەرمانەی بەهاران بە گرمەگرم هات و بی باران رەت بوو ئەویش مەسەلەی (مجلس الشوری) بوو. ئەم مەجلیسە کەوا لەلایەن حکومەتەوە ئەندامی بو دەست نیشان دەکران دەبوو جیگرو بریتی لە مەجلیسی نوینەران کە لەلایەن گەلەوە هەل دەبژیردرین. ژمارەی ئەندامانیم لەبیرنەماوە ئەوەندە نەبی کە لە ١٠٠ کەس پتر بوو.

دوو - سی روژ بە ئیوارەوە مەجلیسی وەزیران و ئەفسەری گەورەی سەرەك ئەرکان و کاربەدەستی زی دیکەش بە سەرپەرشتی ی کردنی سەروك کومار و ئامادە بوونی سەرەك وەزیران لەخانەی (المجلس الوطنی) کەبنەی سەرەك وەزیران بوو کوبوونەوەیان تیدا کرد. دوورو دریژ وتوویژ کرا لەهەموو بابەت و لایەکەوە، بە زوری عارف عبدالرزاق فرماندەی هیزی ئاسمانی قسەکەری رەخنەگر بوو بە جوریك هەرگیز نیم چووبوون نەدەکرد. گەلیك بیروڕای بنەرەتی دەربری وەکوو دەمە چەقودەی گەیاندە سەرئیسك: زور بەسەیری هەندیك لە وەزیرە سویەکان [ئەوانی زیت نەبوون] پترلە زاپتەکان مەترسییان نیشان دەدا لە پەیدابوونی دەمەتەقەی نیوان ئەندامانی شوورا کە بکیشیتەوە بو وروژاندنی خەلقی کووچەو بازارو هەرای تیدا پەیدابیت. لە ئاست ئەمەدا عارف عبدالرزاق گوتی: هەرگیزاو هەرگیز خەتەر لە کووچەو بازارەوە بو حکومەت نایەت، خەتەر هەبی لە جەیشەوە دیت. ناشی پیاوی عەسکەری لەلایەکەوە فەرماندەی فیرقە بیت و لەلایەکیشەوە لە مەجلیسی شووری ئەندام بیت ئیتر هەر روژیك دنیای بەکەیفی خوی نەهاتە پیش چاو فیرقەکەی لی خوریت و ئیزاعە بگریت و بەیانی ژمارەیەك بەسەر میللەت دا بخوینیتەوە. عەسکەری دەبی لەسەرەك وەزیرانەوە فەرمان وەرگریت و بی گرفت جیبەجیی بکات دەنا بابچی لەمالی خوی دابنیشیت.

گوترا ئەوانەیە ئەو ئەندامانە هەموویان جێی متمانە نەبن کەدێن بۆ مەجیسی شوورا. لێرەدا عارف قسەیەکی کرد ئەدوو نوختەدا هەتابلێی تێریگەربوو. گوتی: ئێمە بەپێی بڕیاری ئێرە بەپێشەوە دەبێ دوای ماوەیەك کە قوناغی (انتقال) بەجێ دەهێلین و هەڵبژاردنی نوێنەرانی میمەت بە ئازادی دەکەین. ئەوسا نوێنەر بە زەقەی چاوی هەمووتان دێت بەخوی و بیروڕایەوە. ئنجا کە حاڵ وەها بێت ئەو بارەدا دەبێ چی بڵێن؟ چکوری هەڵ دێن؟ لەلایەکی دیکەشەوە حکومەتێکی نەتوانی لەنێوان چەندین ملیۆن کەسدا صەد ئادەمی بدوزێتەوە متمانەیان پێ بکات عەیبە بەخوی بلی حکومەت. چاکتر ئەوەیە واز لەحوکم بهێنێت.

لەئاکام دا وەها پەسەند کرا کە یەك دوو کەس، لە نێوانیان دا وەزیری د خیە، لیستەیەك ئامادە بکەن بەناوی کەسانێکی بشی بینە ئەندامی شوورا، لە ڕوژیکی داهاتوودا بخرێتە بەر چاوی ئەو ئەنجومەنەوە.

لەو ڕوژانەدا خواردنی نیوەڕوژەو هەندی جار هی شەویشمان هەر لە جێگەی کوبوونەوەمان سازدەدرا. عبداللە شەریف متعهد بوو هەتا بڵێی خواردنی نایابی دەداینێ. لە جەمیکیاندا کە چووین بوسەر مێزی خواردن کورسی یەك بو عبدالسلام داندرا، وەها ڕێك کەوت بریانی یەکی بەرخی وەکوو گوڵ سوورە بوویەوە لەبەر دەمی ئەوبوو خەلقەکە بوی نەدەچوو. ڕستی یەکەی پیم خەساربوو حەزیشم لێی بوو. چومە لای بریانی یەکەو گوتم: یضهر هذا القوزی فی حمی رئیس الجمهوریة لاأحد یمد أیده عیه.. عبدالسلام خوی دەنگی بەرزکردەوە: عبداللە، عبداللە تعال فش القوزی.. ئوخەی صەد ئوخەی، عیراقیش نەحەسێتەوە، با هەر نەبێ تامەزرویی ئازارمان نەدا. بێ ئیوە ناخوش زور بە لەزەت بوو.

دوای چەند ڕوژێك کوبوونەوە لیستەی ئەندامانی شوورا ڕێك خرابوو کە ناوەکان خوێندرانەوە دەبینم هەرچی کوردی سەر بە حکومەتە لە ناحەزانی کومەڵەی چەکدار کە لە (١٠)ی شوباتی ١٩٦٤ بەر لە چەند مانگێك بەیاننامەی ئاشتی یان لەگەڵ دا ئیمزاکراوە، ئا ئەو کەسانە بە ئەندام پالاوتە کراون. من پەرگیریم لە قسەم دا نەکردو ئەوەندەم گوت کە بەرژەوەند نابێن کەسی ئەولایەنە بێت بو شوورا هەر نەبێ کوردی بێ لایەن و ڕوشنبیر هەن با ئەوان بێن. گوتیان ئەم پالاوتانە هەموویان لەوانەن ئەگەر هەڵبژاردنیش عەیارە بێت دەردەچن. گوتم لە لای دیکەش هی وەها زورن کە دەربچن کەچی ناویان نی یە.

تێبینی یەکی ڕواڵەتی و هەستیارم دەربڕی بەوەدا کە گوتم: ئەو کەسانەی لە کوردان نامزەدن بستێك ڕێگە نارۆن ئەگەر مەفرەزەیەکی چەکداریان لەگەڵ دا نەبێت وەیا بە هەلوکوپتەر نەبێ سەفەر ناکەن ئیتر دیمەنێکی زور سەیر دەبێ لە ڕوژی کرانەوەی مەجلیسی شووراداکە یەك موزاهەرەی موسەللەح لە دەست و پاوەندی ئەو ئەندامانە بە شەقامی ڕەشیددا بەرەو کوبوونەوەی مەجلیس برۆن. عبدالسلام گوتی: چ قەیدی هەیە! سەروکی دەوڵەتەکانیش چەکداریان لەگەڵ دا دەبن..!!

بەڕاستی ئەمەیە مەتەڵی عەرەبی عیراق کە دەڵی: تعال فهم حاجی احمد اغا.

خوا ڕەحمی زور بوو: مەجلیسەکە لەبنەڕەتەوە بەلاوەنراو دەردی سەری شوورا بەو ئەسپرینەی لەبیرخوبردنەوەیە چارەسەرکرا. تێ ناگەم دەوڵەتە زلە پێشکەوتوەکان بوچی چاری گیروگرفت ناکەن بە ئەسپرینی ئەوتویی؟ تو سەیری چەند ئاسان و بێ ئەرکە!

کە گەیشتینە ئازاری ١٩٦٥ گومان لەوەدا نەما چی ئەوتو نەماوە شەڕ دەست پێ بکاتەوە. بە عارف عبدالرزاقم گوت: بەتەمام سەفەرێکی سەرەوە بکەم وەك دوایین هەوڵ بو بەلاوەنانی شەڕ، بەڵێنم دەدەیتێ هەتایەك حەفتە مولەت بێت فروکە بومباردمان نەکات؟ گوتی ـ دوو حەفتە مولەت بێت..

گەڕامەوە کوێ. بو سبەینێ چوومە قەلادزە چەند ڕوژێك مامەوە، لە هیچ لایەکەوە بایی کونی دەرزی ڕووناکایی دیار نەبوو. ڕاستی یەکەی من خەریك بووم بزانم باری ڕاگوێستنی ماڵەکەم بو ناوشاخ وداخ چوناوچونی دەبێت.

بە هەمە حاڵی کە گەڕامەوە کوێی ڕێوبان وەها تەنداربوو تێپەڕینی ماڵی من لەوانە نەبوو چاوڵێ بە سەهوو بچێت. سەری خوێنەر نەیەشێنم هەموو ئازارو نیسان و دوازدە ڕوژی مایسیشم لە کوێی بەسەربرد. لە حەفتەی یەکەمی مایس خەبەرم پێگەیەندرا کە بروسکەیەکی حکومەت هاتووە لیستەی گومان لێ کراوانی بە ئیدارەو ئەمن گەیاندوە. یەکەم کەس منم، دوەم شێخ حسامی تاڵەبانی سێیەم و چوارەم دوو خوشکم.. کە سرەگەیشتە ئافرەت مانەوەم لەکوێی بێ کەڵك بوو چەندی سەرمان هێناو برد ئیمکان نەبوو ئافرەت و منداڵ بەپێ یان بوماوەی دوو سەعات ڕێگە برۆن بەشەوی تاریك هەتا دەگەنە ولاغ وپێی برۆن بو ناوشاخ وداخ. یەك ڕێگە هەبوو کەبە ئوتومبێل لەکوێی بەناوی سەفەری بەرەو بەغدا دەربچین، لەولای دیکەڵەوە بە ڕێگەی دەربەندی گومەسپان دا بابدەینەوە بەرەو لای ڕانیە ئەوساش دەبوو ئەو ئوتومبیلانەی ئێمە ڕادەگوێزن جارێکی دیکە ڕوونەکەنەوە مەڵبەندێك کە دەسەڵاتی میری تێدا بێت. پارەم نەبوو ئەو ئوتومبیلانە بکڕمەوە، ویژدانیشم لێی نەدەسەلماندم خەلق لەپێناو بەرژەوەندی خوم دا دووچاری سەغڵەتی بکەم. هیچ چار نەما غەیری ڕاگوێستن بو بەغدا، لە ١٣/٥/١٩٦٥ بەرەو بەغدا لەڕێی کەرکووکەوە ڕویشتین. لە ١٤/٥ گەیشتینە بەغدا چەند ڕوژێك لەماڵی صمدی حاجی محمدی بەننا مێوان بووین هەتا خانوویەکمان لە (منصور) بەکری گرت. ژمارەمان ١٨ کەس بوو، خوابەرەکەتی بهاوێتێ.

ڕۆژی ٥/١٥ چوومە لای فریق طاهـر یحیی، سەرەك وەزیران، هەر بە زمان و بێ هیچ رسمیات إستقالەم داو گەڕامەوە ماڵەکەم.

ئەو ڕۆژەی من کۆیـەم بەجـێ هێشت، دوای دەرچـوونم لەشـار، حکومەت پێوەر بوو بە گرتنی خەڵق.

پێشتر یەك دووجار بەدوا فیرارو مەشبوهدا شار تەفتیش کرا، هەر جارە لەلایـەن ئامیـر فەوجـەوە چەنـد حەرەسێـك لەبـەر دەرگـای ماڵـەکەی من دادەنـدرا نەوەك گەرووپی تەفتیش ماڵـەکەم نەناسن و بە سەهوو بۆی بێن هەر جارە هەنـدێ لەوانـەی بەتـرس بوون لە خۆیان دەهاتنە ماڵەکەم هەتا تەفتیش بەسەر دەچوو.

بۆمبـاردمـان و تۆپ باران دەستی پێ کردبـوو بەڵام لەلای ناوچەی ئێمە حەرەکات نەبوو.

لە بەغدا ماڵەکەم موراقەبەی بەسەرەوە نەبوو تەلەفۆنی (حکومی)شیان بۆ دانـابـوو جگـە لە هی شـەخـسی. هێنـەکەی حکومی کە هەرگیز بەکارم نەهێنا هەندێ ڕۆژ لە ئیش دا بوو واتە مومکین بوو بەکار بهێندرێت هەندێ ڕۆژیش لە ئیش دەوەستێندرا. وەها بزانم ئەم شلەپەیتە یان بە نیازی ئەوە بوو کە ئەگـەر بمـەوێ، بتـوانم لە إستقالەکەم بگەڕێمەوە بۆ وەزارەت: بە تەلـەفـۆنی حکـومەتی یەکسەر لەگەڵ سەرۆکی کۆمار وەیا سـەرەك وەزیران ئەو پێـوەنـدیـە مومکین بوو. بە درەنگـەوە هاتن و تەلـەفـۆنـەکـەیـان هەڵ گرت: سێ مانـگ دوای استقـالـەکـەم لەم ڕۆژنـامـەی (الـوقـائع) مەرسـوومی (إقـالـە)م بڵاوکرایەوە، ئنجا تەلەفۆنەکەش هەڵ گیرا. بەڵام (إقـالە)کە لە ١٩٦٥/٥/١٥ موە حیساب کرابوو نەکا مەعاشی ئەو چەند مانگەم بکەوێت، مەعاشی مارت و نیسان و نیوەی مایسیشیان بە درەنگی درەنگەوە بۆ سەرف کردم.

نە فلسێـك داهـات نەفلسێـك مەعـاش نە هیـچ کەسب وکار، بە کۆمـەڵێـك خێـزان و مێوانی بێ ئەژماریش یەك ساڵ و حەفت مانگی هەر سەخت و سەغڵەتی ژیانم بردەسەر. لە ڕۆژی کە تەکلیفی وەزارەت کرام ئەم ڕۆژە ڕەشـەم لەبـەر چاو بوو: دەم زانی وەکـوو ماسی بێ ئـاوم لێ دێت چونکە مومکین نەبوو چاو ببڕمە فلسێکی حەرام.

لەلایـەکی دیکـەشـەوە بێ تـەلی چەکـداران زۆر بێ ئینسـافانە شتێکی لەبـارەی استقـالـەمەوە بڵاوکردەوە هەر لەگەڵ من دا کراوە. وا بزانم لەژێر سەرناوی (استقالە علی مراحل) شەکری شکاندبوو. بەرپرسێکی حیزب هاتـە لام، ئەو مەسـەلـەیەم لە ڕووی دا، زۆر بە سەیری گوتی ئێمە دەبێ وەهـا بڵێین چونکـە نازانین خەڵق چیمـان پێ دەڵێ. استقـالـەت بڵاو نەبۆتەوە هەرچەند دەشزانین استقالەت داوە گوتم، تۆ لەسەر قسەی خەڵق ڕانـەوەسـتـاوی بۆ هیـچ شتێـك کەچی لە ئاست من دا ڕاستیش بڵاونـاکـەیتـەوە. حکـومـەت استقـالـە بڵاو ناکـاتەوە وا من ئامادەم ئیستا استقـالـەکـەت بۆ دەنـووسمـەوە بەو تەئـریخەی کە تێی دا استقالەم کردوە بێ نێـرە لە بیـروت بڵاوی بکـەوە بە هەر شێـوازێـك کە خۆت پەسـەنـدی دەکـەیت... ئەم حیکـایـەتـانـە هەتا لە ئەیلوولی ١٩٦٥ (اقالە) کەم بە تەئـریخی ٥/١٥ بڵاو نەکـرایـەوە هەر بنێشتۆکەی زاران بوو. باوەڕم نی یە شتی ئەوتـۆیی لە کەس ڕووی دابێت هۆیـەکـەش دەچێتەوە بۆ دڵ سافی خۆم کە هیـچ پێـچ وپەنام نەبوە. پیاوی سیاسی زۆر خەندەقان بە دەوری خۆیـەوە هەڵ دەقـەنێ کە ساچمـەی ناحـەزانی نەگـاتێ... برادەری نێـزیکم کە هاتـوچـۆی ماڵـەکـەمی دەکـرد حیکایەتی تەلەفۆنی حکومی و بران و کرانـەوەی بە خەڵقـەکـە ڕادەگـەیـانـد بەتـەعلیقـاتی خۆیـەوە کە گوتبـووی: خۆی دەڵێ استقـالـەم داوە تەلـەفـونی ڕسمیشی هەر لە جێی خۆیـەتی. لە وتووێژدا برادەرێکی دیکەم دواندمی تا گەیشتینە ئەوەی کە گوتم: فلانـە برادەرم قسـەی وەهـا و وەهـا لەبـارەی وەزعی منەوە بە خەڵق ڕادەگـەیـەنێ. گوتی کە ئاگـاداری ئەو حاڵـەتـەیت بۆچی وەکـوو جاران لەگـەڵی دا ڕادەبـوێـریت؟ گوتم، کابـرا حەز دەکـا بە جۆرێـك لە جۆران سەنگێـك بەخـۆی بدات، خۆدەستی ناگـاتـە کەسی ئەوتـۆ خۆی پێ هەڵ بداتەوە من نەبم، کە منیش دەسەڵاتم نەبێ چاکەی پێ بگەیەنم هەر نەبێ ئەو هەلـەی بدەمێ بە باسی منـەوە خودنمـایی لای خەڵق بکـات و نەختێك نەفسی بحەسێتەوە.

سەفـارەتی ئێـرانی لەڕێی عیسـا پیشمـانـەوە پێوەندیی ئەحواڵی پرسی پێوەم نەبڕایەوە، ناوناوە سبەینەی زوو سەری لێ دەدام. لە وتووێژدا باسی ئەم کۆمەڵەی مەکتەبی سیاسی کرد کە لە ئێران پەنابەرن ئەوانیشی لەسەر حەق دەزانی بەرانبـەر هێـزی چەکـداری کورد. هێشتـان عبـدالسـلام بەرحـەیـات بوو پیشمـان لە زاری مەهـدی پیراستەوە پێمی ڕاگەیساند کە حکـومـەتی شاهـەنشا ئامادەیە بە مێوانت قبوڵ بکا لە ڕوتبەی وەزیر، هەر کاتێك ویستت بچیت بۆ تاران بەخۆت و ماڵەوە، هەموو شتێك بە دروستی بۆتـان سازدراوە. ئەمـەی گوت بە سەراحـەتـیش گوتـی کە سەفیـرو هەمـووشمـان دەزانین باری ئابـووریت لە بەغـدا زۆر لاسـەنگە. مۆڵەتم خواست بۆ چەند ڕۆژێك هەتا دەتوانم وەڵام بدەمەوە.

پرسم بە برادەرێکی قسە نەبەزاندووی حورمەتی خۆگرتوو کرد. گوتی فلان، بە خراپی نازانم بچیت. ئەمـانـە ئەگـەر بێ حورمـەتی یـەکیـان لە نەزردابـایـە تەکلیفی یارمـەتی یـان دەکردی کە لێرە بت دەنێ، زۆریشیان کردوە لەگەڵ خەڵق. باوەڕم هەیە لەچوون پەشیمان نەبیتەوە، بەغداش بۆ تۆ لەم وەزعەت دا زۆر بە ئەرکە..

ڕاستی یەکەم من بڕیاری خۆم لەگەڵ خۆمم دابوو کەچی دەکەم و چی دەڵێم بەڵام ویستم بزانم ئایا چوونم بۆ دەرەوە بە هیچ جۆرێك عەیبی لێ دەگیرێ؟

کە عیسـا هاتەوە لام پێم گوت من بەمەرجێك دێم ئەویش ڕێم بدەن بە ڕەهـایی هەوڵ بدەم بۆ ئاشت کردنـەوەی مەکتەبی سیاسی لەگەڵ کوردی

چەکداری دیوی عیراق. تێم گەیاند کە من مەبەستی شەخسیم لە هیچ شتێکدا نی یە. دەمەوێ کورد بحەسێتەوە، هەتا دووبەرەکیش بەردەوام بێت حەسانەوە مومکین نی یە. ئەمەم لەگەڵ عیاداگوت، لە قووڵایی حیساباتیشمەوە بۆ ئەوە دەچووم کەوا کاتێك حکومەت بابداتەوە بۆ ئاشت بوونەوە ئەوساش ئەگەر مەکتەبی سیاسی لەدەست ئێران دا بێت حەسانەوە وە زەحمەت دەکەوێ.

عیسا دوای چەند ڕۆژێك هاتەوە لام گوتی دکتۆر پیراستە دەڵێ بۆقبوڵ کردنی ئەومەرجە موافقەی تاران پێویستە. ڕەنگە دوو حەفتەیەکی بوێت هەتا لەوێوە وەڵام دێتەوە. کارتێکی داوەتیشی بۆهێنام کە بچم بۆئاهەنگی دوعاخوازیی خۆی لە دۆستانی عیراقی بەبۆنەی بەسەرچوونی خزمەتی وەك (ملحق عسکری). داوەتەکەش لە سەفارەتخانە بەرپادەبوو. ڕاستی یەکەی حەزم نەکرد نەقل بێت چونکە باوەڕم هەبوو کە وەکوو کوردێك تی دەفکرێت. گوتم ئەی چۆناوچۆنی خەبەرم پێ دەگات؟ گوتی: بەردەستێکی خۆم، کە ئەویش کوردە، دەبێتە جێ نشینم تا ملحق خۆی دێت ئەو بەردەستەم وەکوو خۆم هاتوچۆت دەکات و چی لەمنی ڕادەپەڕموێت ئەویش وەهایە ناویشی (منصور)ە.

شەوی داوەتەکە لە میعاددا چووم: زۆریان بەخێرهێنام. عیسا وازی لە استقبالات هێنا لەگەڵم خەریك بوو، کۆمەڵێك تازەمیوانی تارانی هێنان شناسایی پێ کردین و بە زیادەوە باسی فارسی‌زانیمی کرد سێ بەشی زیاد بوو. بەو خەڵقەم گوت هەر ئەوەندەی لێ دەزانم کە ناشارەزاییم بە فارسی ئاشکرابکات.

من عیسام نەدیتەوە. لە یاداشتێکی دەستنووسی (عزیز یاملکی)م خوێندەوە کە کاتێك لە شەستەکان چۆتە تاران و بەینێك بە گرتوویی ماوەتەوە تێ گەیشتووە کە فەرماندەیەکی گەورەی ساڤاك خەریکی بووە قسەی لێ وەربگرێت دژ ی عیسا پشمان بەنیازی تێوەگلاندنی عیسا بۆ هەندێ نیازی گڵاوی خۆی بەڵام عەقید عزیز هیچی نەدرکاندوە دژ ی عیسا. بیستم لە ئەسپ کەوتووەو بەینێك خەستەخانە نشین بووە، دواتر نازانم چی لێ هاتەوە.

حکومەتی عبدالسلام عارف بایی توانای خۆی تێ کۆشا بۆهان دانی خەڵق بەرەو لای خۆیەوە بەتایبەتی کوردی خاوەن نفووز تائەوەی کۆبوونەوەیەکی گشتیی زۆر فرەوانی لە پیاوە ئایینی یەکان پێك هێنا لە زستانی نێوان ١٩٦٥و١٩٦٦. من لەماڵەوە گوێم گرتە گوتەی خەتیبەکان. مالم حەقە یەکێکیان شتێکی لە دوولێوە دەرنەچوو عبدالسلام کەیفی پێ بێت. دەڵێن خوالێ خۆش بووی مەلا صالحی کۆزەپانکەیی لەدەمی سلاولێ کردندا بە عبدالسلامی گوتبوو: هەر دڵۆپە خوێنێکی برژێت تۆی تێدا بەرپرسیاریت.

بێ ئەوەی ناوبهێنم دوو نموونەی مامڵەت کردنم لەگەڵ کرووبری نەم دنیایە بێ سەروپێ یە بۆخوێنەر دەور دەکەمەوە کە دەچنەوە بۆ دەمی دوای دەرچوونم لەوەزارەت. خەڵقێکی زۆر لە خێرەومەندی ناوچەکدارەکان و لە کوردی بەغداو غەیری بەغداش هەتابڵێی ناحەزیی خۆیانیان دژ ی من وبوونم بە وەزیر دەردەبری [خۆمنیش دژ ی وەزارەتەکەم بووم]. لە ناویان دا یەکێکی دۆست و مەیلەو خزم هەبوو کە بە ئەسڵ لەسەر قۆناغی پێش تەمووزو پێش (١١)ی ئەیلوولی ١٩٦١ حیساب دەکرا. ڕۆژێکیان منی دەگەیاندەوە ماڵەکەم لە (منصور) کەوتینە قسەی ڕازونیازو ڕەخنەو گلەیی. بە هەڵم زانی پێم گوت: من دوو جاران بەهانات هاتووم لە دوای شۆرشی تەمووز، ئەمەش شتێکە دۆستایەتی و تێرادیتن داخوازی دەکا لە مرۆ. تۆ هاتیت وەکوو ئەوانەی بە تەمای پایەو پلەو پلەی سیاسی بوون لە پاشەملە زەبری خۆت وەشاند، ئەمەش شتێکە لە مێژووڕووی‌داوە بە زۆریش ڕووی داوە کە هی لە تۆمەزنتر، دوای بەڵێنی ئەمانەت، زەبری لە پیاوی لە من گەورەتر داوە. ئەوەی گلەیی من لە ئاست تۆدا بەخەبەردەهێنێ مەسەلەی وەفاو خزمایەتی و برادەری نی یە، شتێکی دیکەیە بەندە بە خۆتەوە: تۆ دەبوو لەوە زیرەکتر بیت کە نەزانیت جاری نۆرەی تۆ نەهاتووە ببیتە وەزیر، لادانی من سوودی تۆی تێ دا نەبوو. برادەرەکەم نەختێك لە پشت سوکانی سەیارەکەیەوە ڕاماو گوتی: تۆ هەر لەلایەکەوە سەیری دنیا دەکەیت. گوتم، لایەك و دوو لا مەبەست نی یە دام نا من سافیلکەم دیسانەوە مانی من زەرەری تۆی نەبوو لادانیشم بۆتۆ بەقازانج نەدەگەڕا..

مامڵەتی دووەمم هەرلەم بابەتەیە، پاشتر مەودای بۆپەیدابوو. لە دەمی پشووی ئاشتی یە کورتیلەو درێژەکان دا کە لەلایەن چەکدارانەوە کەسانێك دەهاتن بۆبەغدا من بە یەکێك لەوانەوە خەریك دەبووم کە بی بینم و داوەتی بکەم، ئەو کەسە لە کۆنە دۆستەکان و بنەماڵەشی لە قەدیمەوە دۆستمان بوو. دوای دوو سێ جار لەوپێوە خەریك بوونەم صمدی حاجی محمد پێی گوتم: تۆ هێندە خەریکی ئەو کەسەی کەچی ئەو لە ئاست تۆدا، پاشەملە، وەها پیاو نی یە. گوتم بێ ئاگا نیم، بەڵام هێندێك پێوەندی هەیە لە ژیانمان دا هی ئەوە نین چاویان پێدا بگێڕینەوە، هەتا ئەو تەرزە کەسە لەخۆوە پێوەندی‌یەکە هەڵ نەبڕێتەوە من نای پسێنم..

بگەڕێمەوە بۆ ڕچەی گەشتەکەم:

ئەو منصورەی باسم کرد، دوای دوو هەفتە سبەینەیەکیان هاتەلام، لەبارەی چوونم بۆتاران گوتی: وەڵام هاتۆتەوە دەڵێ زۆرمان پێ خۆشە بەخێری بهێنین بە دەرەجەی وەزیر بەڵام دەرفەتێك نابینین بۆئەو هەوڵەی بە مەرجی دانابوو بۆ هاتنی.

دوای ئەو وەڵامە جارێکی دیکە باسی چوونە تاران نەهاتەوە پێش بەڵام لە کاتی موناسەبەی ڕەسمی دا کە بانگ هێشتن دەکرام تێیان دەگەیاندم

که لەبیرنەکراوم ئەویش لەربی زیدە خەریك بوونی هەندی لە کاربەداستانیان پیمەوە. ئەوسا داوەتی سەفارەتی ئیران خەلقێکی زۆری تێ کوردەبووە. جاریکیان یەکێك لە بانگ کراوەکان، وابزانم کریم مراد خاوەن کتێبخانەی مەکەنزی بوو، لەدەوری مێزی نان خواردن بووین گوتی: سەیری ئەوبەری مێزەکە بکە کابرایەکی سەرزلەی بەخۆوە خەریکە بەچالاکی نان دەخوا، ئا ئەمە (شعبان بی مخ)ەکە (حسین فاطمی)ی وەزیری دەورانی د. مصدقی کوشت.

لەو کاتانەدا کە بەهۆی وەزارەتەوەو دواتر کە مالم گوێستەوە بۆ بەغدا ژیانم کەوتە غەریبی و کەوتمە بارێك پتر لە عادەت خەلق بناسم و بشناسرێم لەگەل بەشێکی زۆری سەفیری دەولەتەکان مەرحەبای گەرم و گوڕم بۆ پەیدابوو بەلام من لەلای خۆمەوە هەنگاوی زیادم بۆ ئەو دۆستایەتیانە هەل نەدەهێنا. لە نێوانیان دا سەفیری هیند، سەعادەت عەلی خان و سەفیری سوید کە ناویم لەبیرنەماوەو سەفیری ڕووس د. نیکولاییڤ پتر لە هەموان گەرم وگوڕ بوون. هەرچی سەفیری ئەمەریکایی بوو لە کولانەی سیاسەتەوە لێم نزیك دەبۆوە. سەعادەت عەلی خان مسلمان بوو، بنەمالەکەی لە ولاتی خۆی ناودار بوو. خێزانەکەی کە ئەویش لەبنەمالەیەکی گەورەی مسلمانی سەرووی هیند بوو خاتوونێك بوو بەڕاستی شاژن. ڕێکەوت وەهابوو سەفەری کەرکووکم کردبوو، لە کتێبێکی تورکی (قاموس الاعلام) لای شێخ ڕەئووفی خانەقادا خوێندبوومەوە، شاعیرێکی گەورەی صەدەی نۆزدەیەمی مسلمانی هیند باپیری ئەو ئافرەتە دەرچوو. چەند نموونەیەك لە شیعرە فارسی‌یەکانیم هاتبوونە بەر، کە گەڕامەوە بەغداداوەتی ئاهەنگی یەکەم ڕۆژ ی حەفتەی فیلمی هیندی کرابووم، کە چووم بۆ ئاهەنگەکە سەعادەت خان بردمیە لۆجی تایبەت بەخۆی و خێزانەکەی. لەگەل موبارەك بادی ئاهەنگەکە خەبەری ئەو شاعیرە مەزنەو وێنە شیعرەکانیشیم کردە دیاری بۆ خۆی و بۆ خێزانەکەی. ئەم ڕێکەوتە یەکجار خۆش بوو بۆ ئەوان و بۆ منیش. سەعادەت خان نەقلی فرەنسە بوو، زۆری نەبرد بیستم مردوە. بەداخەوە.

سەفیری سوید جگە لە داوەتی ڕەسمی ناوناوە بۆ مالەکەی خۆیشی داوەتی دەکردم و لە زورشتی ئەم جیهانی دیبلوماسی‌یەی دەگەیاندم، تەنانەت گوتی: هەرچی دەست وپاوەندی ئەم سەفارەتەوزوربەی سەفارەتەکانی ڕۆژاوا هەن پیاوی سەفارەتی ئەمەریکان، ئەوانیش مزەیان دەدەن. سەقافەتی ئینگلیزی بوو، لە وتووێژدا وەها دەبوو کە من وشەیەکی نالەبارم بەکاردەهێنا بێ ئەوەی بمشکێنێتەوە قسەکەمی دووپات ددکردەوە بە وشەی ڕێکوپێك. جارێکیان من (handicap)م بەکارهێنا ئەو قسەکەمی گوتەوە بە (misadvantage). لەجیاتی (off his head) ئەو (mentally sick)ی گوت..

د. نیکولاییڤ مرویەکی خۆش خوق بوو هەمووددم گرژینەوەیەکی بەسەر ڕووانەوە بوو تا ئەوەی سەفیری چیکوسلوڤاکیا، لە داوەتێك بووین کە د. نیکولاییڤ لە دەرگاوە هاتەژوور، گوتی: وا (smiling ambassador) هات واتە: ئەوا سەفیری لێوبەخەندە هات.. دوای ئەو بە دەقیقەیەك سەفیری کوێت هات ئەمجارە من گوتم (Ismell money) واتە. بێنی پارە دەکەم..

شەوێکیان لە داوەتی سەفارەتی چیکوسلوڤاکیا بووین د. نیکولاییڤ جودای کردمەوە گوتی: دەوێرێت داوەتم قبول بکەیت لە مالەکەم بۆ وتووێژ لەبارەی کوردەوە؟ گوتم: بۆ کورد هەتا جەهەندەم بەدوات دا دێم. نەشمگوت بەهەشت چونکە باوەڕت پێی نی‌یە.. دوو مانگێکی پێ چوو ئنجا داوەتی کردم ئیتر نازانم ئەووەخرانە هی ئەوە بوو هەت پرسی بە خارجیەی خۆیان کردو ئیزنی وەرگرت یاخود پێشتر ئەو ئیزنەی هەبوو بۆیە توانی ئەو پێشنیازە بکات..! خوێنەر مرخی خۆی لە تەعاماتی زەمانی قەیسەر خۆش نەکات، ئەشەدو بیللا لە کاڤیار و ڕۆنەکەرەو سەموون بەولاوە هیچی دیکە نەهاتە بەر دەممان. بەلام قسەکانمان خۆش بوون هەرچەند بەدەگمەن نەبی باسی سیاسەتی تێدا نەکرا. د. نیکولاییڤ لە سەرەتای دانیشتنمان دەهات و دەچو بولای ژوورەوەو دەهاتەوە بێ ئەوەی خزمەتچی لەو ناوەدا دەرکەوێت. گوتی: چونکە من سەفیری دەولەتێکی پرولیتاریم بۆیە خۆم بە خزمەتەوە خەریکم لە جیاتی خزمەتچی. گوتم: جەنابی سەفیر من بەدل لەگەن پرولیتاریادا بەلام ئیشتیهەم بورجوازیانەیە.. د. نیکولاییڤ کە گەڕایەوە بۆ موسکو چەند سالێکی بەسەردا تێپەڕی خەبەری مەرگیمان پێ گەیشت.

جارێکیان لە موناسەبەی بەسەرچوونی خزمەتی سەفیری تورکیا. سەفیری ئەمەریکا داوەتێکی کرد بەهەمووی ۳۰ کەسێك بوی بانگ هێشتن کرابوون لەمانە تەنها پێنج عیراقی هەبوون هەر منیش تێیاندا کورد بووم. پێ دەچوو سەفیری تورکیا خۆی ئەو ناوانەی هەل بژاردبێت. کژەکە زستانی نێوان ۱۹٦٦ و ۱۹٦۷ بوو. من و سەفیری ئەمەریکاو سەفیری سوڤیەت بەیکەوە ڕاوەستابووین. هەردووکیان پرسی‌یان: ئایا مومکین نی‌یە کوردو حکومەت ڕێك بکەون؟ گوتم: ڕێك کەوتنەکە مومکینە بەلام ئێمەی خورهەلاتی خۆمان (مستحیل)ین مومکینیش کە بەند بوو بە نامومکینەوە دەبێتەوە نامومکین لەگەل ئەمەش دا من دوو کەس دەناسم لە دەستیان دێت شەڕەکە بگێڕن بە ئاشتی: گوتیان کام دوو کەس؟ گوتم: تۆو تۆ! دەستم بۆ هەر دووکیان درێژ کرد

ئەو دیپلوماسی‌یانەش، براینە، وەکوو ئێمە ئادەمزادن حەز بە نوکتە دەکەن. ڕۆژانی سالی ۱۹٦٥ تێ دەپەڕی و من بە دەست گوزەرانەوە سەغلەتتر دەبووم، کەسیش ئاگای لە دەردی کەس نی‌یە لە خۆم بەولاوە

کە بەپێی خوبەرپرس ز نیی دەچمە ژ یر ئەرکی ئەوانەی بە دەورمەوەن وەی چویـن نە دەست و قامـە بزانن چی یـان بودەکەم . لە نموونەدا دەلێم ، هووینی ١٩٦٤ کە نە هووینـەواری پیـرمـەم کوبـوونـەوەیـەکی سەر بە مەعـەریفی کورد گیراو مەموستەیانی کارگیـروهی خاوەن رای لەگـەل متصـرفـەکـانی ئەونیـوایـانەی کوردنشین بوون تیی دا بەشدار بوون ، لەو دەمـەدا هەنگاوم هەڵینـا بو پیپلکـەی ئەوخانـوەی تیی دا کودەبـووینـەوە ئافـرەتیکی رەش پوشی خوڵ بەسـەر ئامێـزی لیٚدام و دەستی کـرد بە گریـان : دەرچوو دایکی ئەو موەزریعەی پوستەی کویەیە کە لە بومباردمانی سبـەینـەی (١١)ی تەیـلوولی ١٩٦١ لە ریی تەقتـەق خوی و یەك دوو خەیـاتی سنیمـانی کوژ ران . . لەو دەمـەوە دەرگەی حکومەت و کوردیش نی دەدات بو ناگـزووری و بی نـانی یـەکی لە پاش کوژ رانی کورەکـەی دووچاری خوی و خیزانەکەشی بووە بی ئەوەی بگاتە کەرتە نانیك . . رەنگە لەم جیهـانـەی کوردەواری دا کەسی لە من بی گـوناهتـر نەبـوو بی لەو کارەسـاتـەی بەسـەر کوری ئەوو غەیـری ئەویش دا هات چونکـە هەتـا توانیـم و نەشـم توانـی ویـستم نەقـەومی . ئەو کورەم خوش دەویست ، مەحـرەمـانـەش ناونـاوە هاتـووچوی ماڵەکەمی دەکرد لە کویی و حەزیشی دەکـرد لە دەرفـەت دا بمبینی . لەو دەمـەدا بو چارەی دەردی ئەو ئافـرەتـەو خیـزانی کورەکـەی هەر ئەوەنـدەم پی کـرا چی بەدوای دەستم دا هات لە پارەی گیـرفانم بی خەمە دەستییەوە . . . لە نموونەی دووەم دا دەلێم ، سی مەلای کورد هاتبـوونـە موراجەعەی وەزارەتی ئەوقاف کە وەزیرەکەی کورد بوو ، بە نائـومیـدی و بی لی پـرسینـەوەش وەدەر نرابـوون . . هاتنـە لام لە ئوتیلەکەی تروکادیرو ، کە ئەوسا لە وەزارەت دا بووم گوتیان وەزعمان زور سـەغلەتـە نە ئەوقـاف هیچی بو کردین و نە پارەشمـان ماوە پیی بژ ین و وەیا پیی بگـەرێینـەوە بو مالـەکەمان . . من لەگەل ئەوقاف هیچم پی نەدەکرا ، چی لە دەستم هات بو گەرانەوەیەکی موحتەرەمانەی بەرەو مالیان وەهام کرد . .

نمـوونـەی دیکـە زورن بەلام یەکیکیـان تامیکی مزری لی دیت . . لە وەزارەت بووم برایـەکی کوردی بەری بادینـان هاتـەلام ئیشـەکـەی کە بریتی بـوو لەوەی بگـەرێتـەوە سەر کاری جارانی گری پچکەی کەوتبوویی زوری هاتـوچـوی پی کردبوو . گوتی نانم نەما مندالم برسین دەستم بەهیچ بنچکیـك رانـەگـەیشـت ئەگـەر چارم نەکـەیت ئیزنت بەسەرەوەیە دەست بکـەم بەبی نـامووسی ؟ چەندیکی دلم بوی سووتا هیندەشی بەپرسیارەکە ناراحەت بووم پیم گوت : ئەم پرسیارە روو لەمن ناکات چونکە من هوی فەسـل بوونت نیم ، دەبی پرسیـارەکـە لە سەروکایەتی چەکدارو مەکتەبی سیاسی بکـریت . من بەرپـرسی شتیکم کەبتـوانم بی کەم وەیا شکـستی دەستی من بیت . بو چارەسـەرکـردنی حالـەتی زور زەروور دەهـەزار دنیار تەرخـان کرابـوو بەلام ئەو کابـرایـە نەدەچـوە قالبیکی قانـوونەوە کە لەژ یر عنـوانیکـدا کاریکی پی بسپیـردریت . هەر ئەوەم پی کرا کە لە باخەلە نیوە بەتالەکەمدا چی هەیە بو ئەو بیت . .

لەو حالـەتـەی زیـدەسـەغلەتیـەی بی ئیشی و بی دەرامـەدی پاش وەزارەتمـدا قسـەم بیستـەوە لەزاری کونـە دوستیـك و هاوریی حقـوقمەوە گوتبـووی نازانم فلانـە کەس لەم بەغـدای وەهـا بەمـەسـرەف پارە لەکـوی دینیت بوگـوزەرانی بەو هەمـوو قەلەبالغیەی کەلەگەلی داهاتوون؟ دەبی لەو شازدە هەزار دینـارەی کە بەنـاوی (تعـویضـات) وەری گـرتـوە مەسـرەف بکـات ! ! گوتم هەرچـەنـد بەعادەت یەکیك کەبوو بەوەزیرلەوە بەولاوە گوزەرانی جێی پرسیـار نامینیت بەلام بەریکـەوت لەحـالەتی مندا پرسیـارەکـە جیی خـویـەتی چونکـە بەراستی دەبی بزانـدریت من بەچی دەژ یم : نەمـەعـاش نەهیـچ دەرامـەد نەهیـچ کەسب وکـار دیـارنی یـە پیی بـژ یم . ئەوەی دەی ژ یـانـدم تەنهـا قەرز بوو بەس . لەمـاوەی یەك سال وحـەفت مانگـدا چی خـوادابـووی تەرووشك هەمووی خورا چەند هەزار دیناریکیش قەرزداری هاتە سەر : ئا ئەمە بوو ژ یانم .

ئەو شازدەهـەزار دینـارەی (تعـویضـات)یش شازدە هەزار نەبـوو هەزار وپینجصەد بوو هەر لەدەمی وەزارەتم بەگەل مەعاش و دەرامەدیکی هەبوو کەوت و خوراو برایـەوە : من نەمـویرا لەکاتی وەزارەتدا مالەکەم راگویزم بو بەغدا لەترسی مەسرەفی زیاد . لەکوتایی سالی ١٩٦٥ کە چەند مانگیك بوو کەوتبـوومـە بەغـدا کاك ئەمجـەدی ئامـوزام خانـوویەکی سـازدابوو لە ئەرزی حکـوبـەتی سەر بەجمعیـەی خانـوو دروست کردن لە هەولیـر ، خانوەکەی فروشت وپارەکەی بو من هینا . . ئا بەشتی وەها دەژ یام .

وەزارەتی طاهـر یحیی لەپـر کەوت ، طاهـر یحیی لە حکـوومـەتی عبـدالسـلام دا وەك عبـدالسـلام حیسـاب دەکرا لەلایەن دامەزراوی یەوە ، دیاربوو عبدالسلام لەبنەوە خەریکی کنە ێ کردنی بوو هەتا ئەوی لاداو عارف عبدالرزاق بوو بە سەرەك وەزیران . ماشەئلا چەند کەمی پی چوو ئەو دەمەرا کە لە ژووری قائد فرقەی دوو پیم گوت نەکەی بسەلمینست ببیتە سەرەك وەزیران تا ئەو دەمەی بووبی !

ملخص البحث :

# رحلة حياتي

بقلم الاستاذ مسعود محمد

تبدأ هذه الحلقة وهي الثالثة عشرة من سلسلة مذكرات الاستاذ مسعود محمد ببدأ المحادثات بين وفد حكومي والمسلحين الاكراد بداية سنة ١٩٦٤ في رانية وكانت نتيجتها ايجابية اذ جرى اتفاق بينهما في ١ شباط ١٩٦٤ واذيع بيان رسمي حول ذلك في الاذاعة استقبلته الجماهير بارتياح فعادت من جرائها العوائل المنتشرة في اكناف الوديان والجبال الى مساكنها في المدن ورجع المفصولون الى وظائفهم وعاد الهدوء والامان الى انحاء المنطقة. وقد شارك في اعداد البيان بالاضافة الى جمع من رؤساء المسلحين مندوب الحزب الدمقراطي الكردستاني وهوعضو المكتب السياسي وقد بذل متصرف السليمانية آنذاك العميد السيد عبد الرزاق السيد محمود جهودا مثمرة في انجاح المباحثات.

وتوسعت في تلك الايام شقة الخلاف بين المكتب السياسي للحزب وقيادة المسلحين فأصدر المكتب السياسي للحزب بيانا شديد اللهجة في حدود ١٥ صفحة وبعنوان «أسلم ام استسلام؟» اشتمل على كل ما هو حق وباطل حول الموضوع من تجريح مرّ و رفض قاطع للأتفاق وإنتقاد عنيف له. وما كان من العضو المذكور والذي كان ذا شخصية قوية في الحزب(وربما كان امين سر الحزب) إلا ان ينقلب هو الاخر على الاتفاق الذي ساهم في اعداده!! لكن المنطق اصم اخرس لا يستطيع فعل شيء مع اهواء النفس البشرية.

ويذكر صاحب المذكرات نموذجاً من محاولة الاجانب للتدخل في امور الحركة الكردية واستغلالها لصالحهم وسعيهم الى اشعال نار الاقتتال ثانية، ويذكر كيف ان فترة السلام كانت فترة حرجة يتوقع المرء منها اعادة القتال بين آونة واخرى ولا سيما ان موقف السلطة آنذاك لم يكن موقف الموحد المتفهم للمسألة والساعي الى حلها حلا جذريا.

ويذكر بانه تم إستيزاره سنة ١٩٦٥ وزير دولة لشؤون الشمال وكان قبوله للمنصب على مضض وخلافا لرغبته الحقيقية لاسباب منها: علمه بان ثمة معوقات كثيرة امام عجلة السلام وانه لايستطيع دفعها وتنفيذ ما ينوي وما يرجوه من اكتمال اسباب توطيد السلام والاستقرار والفهم الحقيقي للمشكلة الكردية. ومنها ما يلحق به من ضرر مادي حين يخرج من الوزارة مستقبلا وما يؤثر ذلك على الحالة الاقتصادية له ولعياله. ومنها هاجسه بان المسلحين ومؤيديهم لايروق لهم استيزار احد من خارج صفوفهم ويرون بأن من الواجب اشراك جماعتهم بالحكم وليس شخصا من خارج الحزب والحركة المسلحة. وفي الوزارة ظل يستقبل يوميا المراجعين من الموظفين المفصولين والاشخاص المتضررين جراء حوادث الشمال افواجا افواجا بغية تسهيل امر اعادتهم لوظائفهم وتعويضهم عن خسائرهم وغيرها.

ووسط زحمة المشاكل وفي غمرة العمل الوزاري التي يخصص في سردها صفحات من مذكراته يعرج بنا الى محطة راحة.. وهي زيارته للقاهرة ضمن وفد رسمي برأسة رئيس الوزراء للأشتراك في احتفالات مصر في ذكرى ثورة تموز ١٩٥٢. فينزل هناك في قصر (الطاهرة) الملكية ويصف لنا القصر بغرفه و ردهاته وأثاثاته.. وينام في نفس الغرفة التي كان ينام فيها الملك فاروق. ويستمع الى ام كلثوم وفريد الأطرش وعبد الحليم حافظ في حفلة خاصة.

# فلۆراوی کردنی ئاوی خواردنەوە و مەترسی یەکانی بۆ تەندروستی


**دوکتۆر ذەنوون محەمەد پیریادی**

**پرۆفیسۆر بەشی کیمیا ،**

**دانشگای زانست**

**زانکۆی بەغدا**



پوختەی وتار

لە سالی د ١٩٤٥ز بۆیەکەم جار لە ئەمەریکا دەست کرا بە فلۆراوی کردنی ئاوی خواردنەوەی هاوولاتەکان . بەلام بە شێوەیەکی کەم و بە رەزامەندیی هاوولاتەکانی شاری (گراند رەپید ـ Grand Rapids لە ولایەتی مشیگان) ئەم تاقی کردنەوەیە دەست پێ کرا . لەوساوە هەتا ئیستا ژمارەی ئەو شارانەی کە فلور دەکەنە ناو ئاوی خواردنەوەیان لە زیادبوون دایە . بەلام لەگەل ئەوەیش دا هێرشێکی گەورەو دژ وەستان بەرامبەر بە فلۆراوی کردنی ئاو لە ئەمەریکدا هەیە . ئەم زانایانەی کە دژی فلۆراوی کردنی ئاون دەلێن کەوا زەرەری فلۆر بۆ تەندروستی زۆرترە لە قازانجی . ئاو فلۆراوی دەکرێت بۆ کەم کردنەوەی ژمارەی ددان کلۆری بە تایبەتی لای مندال . ئەم وتارە بە درێژی باسی تازەترین لێکۆلینەوەو تاقی کردنەوەکانی پسپورەکان لەم بابەتەوە دەکات .


## سەرەتا :

چل و پێنج سالێك لەمەوبەر پسپور و زاناکانی کیمیاو تەندروستی ددان (ددان سازەکان) لە ئەمەریکا بریاریان دا توخمی فلۆر (F) بە رێژەیەکی تایبەتی کەم پێویستە بە هەمیشەیی لەناو ئاوی خواردنەوەدا هەبێت . کەم بوونی ئەو رێژەیەی فلۆرە بەلکو دەبێتە هۆی کلۆربوونی ددانی مندال . لە سالی د ١٩٤٥ز لە شارێکی بچووکی ولایەتی مشیگان لە ئەمەریکا واتە لە شاری گراندرەپیدا فلۆر کرایە ناو ئاوی خواردنەوەی هەوولاتەکانەوە . دوابەدوای ئەوە ئاوی خواردنەوەی گەلێك شار و دێهاتی

تریش فلۆراوی کران نەك هەر لە ئەمەریکا بەڵکو لە هەموو ئەوروپاو ژاپۆن . کۆمەڵێك لە زاناکان هەر لە سەرەتای ئەم پرۆژەیەوە دژی فلۆراوی کردنی ئاو وەستان . ئەم زانایانە دەیان گوت ، ئێستاش هەر دەڵێن کە فلۆراوی کردنی ئاو هەرگیز سوود نابەخشێت و کار ناکاتە سەر کەم کردنەوەی کلۆریی ددان ، بەڵکو بە پێچەوانە فلۆرەکە زیان و زەرەر دەبەخشێت بە تەندروستی هاوولاتەکان . بێ گومان هەڵبژاردنی ئاوی پاکژ و دروست بۆ خواردنەوە لە شارەکان و گوندەکان دا یەکێکە لە ئەرکەکانی شارەوانی و کاربەدەستانی ئەو شوێنانە . هەموو ئاوێك هەر چەندە روون و بێ خلت بێت مەرج نی یە بۆ خواردنەوە بەکەڵك بێت ! ! ئاوی خواردنەوەی دروست مەرجەکانی تایبەتی خۆی هەیەو بە شی کردنەوە لە تاقیگەدا ئەو دروستی یە دیاری دەدات . هەروەها ئاوی خواردنەوەی دروست پێویستە هیچ جۆرە میکرۆبێکی تێدا نەبێت . یەکێك لە مەرجەکانی ئاوی دروست ئەوەیە کە رێژەیەکی کەم لە چەند جۆرە خوێیەکی کیمیایی پێویست لەناو ئاوەکەدا هەبێت . واتە ئاوی پەتی [٣] دلۆپاو [٤] کە هیچ جۆرە ماددەیەکی تێدا نی یە بە ئاوێکی تەندروست ناژمێرێت . .

لێکۆڵینەوەکانی چلەکانی ئەم چەرخە ئاشکرای کرد کە رێژەیەکی کەم لە توخمی فلۆر لەناو ئاوی خواردنەوەدا پێویستە بۆ نشونەمای [٥] ئێسقانەکان و پتەوبوونیان بەتایبەتی لای منداڵ . ئەم دۆزینەوەیە بوو بەهۆی هاندانی دانیشتوانی ئەو شوێنانەی کە ئاوی خواردنەوەیان بێ فلۆر بوو بە سروشتی ، هانیانیدا بۆ ئەوەی هەندێك فلۆر تێکەڵ بکەن لەگەڵ ئاوی خواردنەوەی ئەو شوێنەدا . بەم جۆرە فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوە دەستی پێ کرد لە ساڵی ١٩٤٥ وەکو لەسەرەوە گوتمان . پاش دە ، دوانزە ساڵێك سەیریان کرد ژمارەی ئەو کەسانەی تووشی ددان کلۆری بوون لەو ماوەیە کەم بۆتەوە لە (حەوتەوە) بۆ (سێ) واتە (٧ : ٣) ، ئەمەش بێ گومان ئەوە دەگەیەنێ کە فلۆراوی کردنی ئاو ژمارەی ددان کلۆری لە (٥٠٪) زیادتر هێناوەتە خوارەوە .

ئەمە لە لایەکەوە ، لەلایەکی ترەوە جوونێك لە زاناو پسپۆر هەر لە سەرەتای پرۆژەی کلۆراویکردنی ئاو دژی پرۆژەکە وەستان . ئەم جوونە زانایانە لەگەڵ فلۆراویکردنی ئاو نەبوون و بە هەمیشەیی ئەنجامی لێکۆڵینەوەو کتێب و وتاریان بڵاوەکردەوە دژی پرۆژەکە ئێنجا پاش (٤٥) ساڵ لە دەست پێ کردنی پرۆژەی فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوە ئایا ئەو کۆمەڵەی دژی پرۆژەکە بوون ئێستا چی دەڵێن؟ لێکۆڵینەوە لە ئەمەریکاو ئەوروپا چ ئەنجامێکی نوێی دۆزیوەتەوە؟

دوکتۆر ئەدوەرد گرۆث Edward Groth دوکتورای وەرگرتوە لە ساڵی ١٩٧٣ و نامەی دوکتۆراکەی [٧] لە مەسەلەی گیروگرفتی فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوە دەکۆڵێتەوە . لە نامەکەیدا باسی هەردوولایەن دەکات :

لایەنگیرەکانی فلۆر دەڵێن ئاوی فلۆراوی نەك هەر کلۆریی ددان کەم دەکاتەوە بەڵکو سوودی هەیە بۆ هەموو ئێسقانەکانی لەش . ئەوانەی دژی فلۆرن دەڵێن : ئەنجامی فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوە بە لێکۆڵینەوەی زانستی تەواو نەچەسپاوەو قسەکانی لایەنگیرەکان ناسەلمێنن . بەڵکو بروایان بە لێکۆڵینەوەکانیشیان نی یە . . هەروەها کۆمەڵەی دژ بە فلۆر داوا دەکەن کە فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوە بە ئەوانەی کە لایەنگیری فلۆراویکردنن و ئەوانەش کە دژی پرۆژەکەن . بەکورتی ئەوانەی کە لەگەڵ فلۆراویکردنی ئاون دەڵێن فلۆر هیچ زیانێکی لابەلای نی یە بۆ مرۆڤ و سوودەکانی لە زیانەکانی زیادترە . کەچی زاناکانی دژ بە پرۆژەکە بەڵگەیەکی زۆریان هەیە بۆ بەکارنەهێنانی فلۆر و مەترسی یەکی زۆریان دەربارەی تەندروستی نیشان کردوە کەوا بە هۆی فلۆرەوە مرۆڤ تووشی دەبێت .

**بۆچی ئاوی خواردنەوە فلۆراوی دەکرێت؟**

کۆمەڵەی دانسازەکانی ئەمەریکا (ADA) [٨] دەڵێت [ئاوی خواردنەوەی فلۆراوی کاردەکاتە سەر کلۆربوونی ددانەکان بە تایبەتی ددانی منداڵ . فلۆر وا دیارە رێژەی ددان کلۆری لە (٤٠٪) هەتا (٦٥٪) کەم دەکاتەوە لەناو هاوولاتەکان . ] هەروەها (ADA) دەڵێت فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوە هیچ جۆرە مەترسی یەك یان زیانێکی لابەلایی نی یە بۆ تەندروستی مرۆڤ .

وێنەی ژمارە (١) ژمارەی ئەو منداڵانەی کە ددانیان کلۆر بووە لە ساڵەکانی (١٩٧١ - ١٩٧٣) ، (١٩٧٩ - ١٩٨٠) ، (١٩٨٦ - ١٩٨٧) نیشان دەدات . وێنەکە باش ئاشکرای کردووە کەچون ئاوی فلۆراوی رێژەی کلۆربوونی ددانی لە ٥٠٪ زیاتر هێناوەتە خوارەوە .



ڕەزامەنـدیی میللەتـەکـە بکـرێت نەك بە زۆر. واتـە بە ئارەزووی هاووڵاتییەکان فلۆر بکرێتە ناو ئاوی خواردنەوەیان.

هەندێك لەو زانایانە دەڵێن کە گوایە ئاوی فلۆراوی لەوانەیە ببێت بەهـۆی شێـرپـەنجـە،( ) ناتـەواوی (نـوقسـانی)( ) منـداڵی تازە لەدایـك بوو، و گەلـێـك نەخـۆشـی تر. هەروەهـا دەڵـێـن کەوا فلۆراویکـردنی ئاوی خواردنـەوە هیـچ کاریکی وای نییـە بەسـەر کەم کردنـەوەی کلۆریی ددانـەوە. ئەم کۆمـەڵـە زانـایـانـەی دژ بە فلۆراویکردنی ئاو هەروەها بە ڕەحەتی دانەنیشتوون، بەڵکو کتێبێکی زۆریان بڵاوکردۆتەوە دژ بەم مەسەلەیە هەتا ئەوە بوو لەساڵی ١٩٨٦دا بە شێوەیەکی ڕەسمی شکاتیان لە (وەکالەتی پاریزگەری دەوروبـەر)ی( ) ئەمـەریکـا کردو داوایـان کرد کە وازبهێنن لە پرۆژەی فلۆراوی کردنی ئاوی خواردنـەوەو دەست بکـەن بە لێکـۆڵینـەوەیـەکی دوورو درێژ دەربارەی کاری فلۆر بەسەر تەندروستیی مرۆڤەوە بەگشتی نەك هەر بەسەر کلۆریی ددان و ئیسقانەوە.

**فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوە لە جیهان دا:**

هەر وەکـو گوتمـان لە پێشـەوە لە ساڵی ١٩٤٥ز کاربـەدەستـانی ئەمـەریکـا یەکـەم تاقیکـردنـەوەیـان جێبـەجێکـرد دەربـارەی فلۆراویکردنی ئاوی خواردنەوەی چەند شارێك لە ئەمەریکا بۆ هەڵسەنگاندنی ( ) ئەنجامەکانی پاش دە ساڵ تاقیکردنەوە بڕیاردرا کە فلۆراویکـردنی ئاو بە ڕێـژەی (یـەك بەش لە یەك ملیـۆن بەش ئاو ا ppm) ژمـارەی ددان کلۆریی کەم دەکـاتـەوە نیـوە (٥٠٪). بەم جۆرە لەسـاڵی ١٩٥٠ کاربـەدەستـانی تەنـدروستی گشتی ئەمـەریکـا)( ) بڕیـاریـان دا فلۆراویکـردنی ئاوی خواردنەوە پێویستەو بەسوودە. ئێستا نیـوەی ئەمـەریکـایـەکان (٥٠٪) ئاوی فلۆراوی دەخۆنەوە، واتە ١٢٠ ملیۆن کەس لە هاووڵاتەکان.

دوا بەدوای ئەمـەریکـا وڵاتـەکـانی تریش دەستیان کرد بە فلۆراوی کردنی ئاویخـواردنـەوە، وەکـو کەنـەدا، ئینگلتـەرە، وڵاتـەکـانی ئەمەریکای لاتینی و ڕوسیا دەوڵەتە ئەوروپایەکان و ژاپۆن... بۆ وێنە:

٣٣٪ی بەرازیلییەکان

١٥٪ی ڕووسەکان

٩٪ی ئینگلیزەکان

٦٦٪ی ئوستراڵییەکان

٥٠٪ی کەنەدییەکان

هەموو ئاوی فلۆراوی دەخۆنەوە بە هەمیشەیی.

ئەوەی ڕاستی بێت وڵاتەکانی ئەوروپای خۆرئاوا ماوەیەك دژی فلۆراوی کردنی ئاوبوون. بۆ وێنە لە هۆڵەندە پاش دە ساڵ خواردنەوەی ئاوی فلۆراوی لەسـاڵی ١٩٧٦ وازیـان لێ هێنـاو هیچی تر فلۆر ناکـەنە ناو ئاوەوە بەبـۆنـەی نارەزایی هاووڵاتـەکـان و گومـانیان کەوا فلۆراویکردن زیانی لە سوودی زیادترە بۆ تەندروستی.

هەروەهـا خەڵکی شارەکـانی ئەلـەمـانیـا پەیتـا پەیتـا داوادەکـەن لە کاربەدەستان وازبهێنن لە فلۆراویکردنی ئاو.

بێگومان گەلێك لە زاناکان و پسپۆرەکانی فەرەنساو ئەلەمانیاو دانیمارك ئاشکـرایـان کردوە کە فلۆراویکـردنی ئاو زیـانی لە سوودی زیادترە بۆ تەندروستی. ئەم زانایانە پاڵ پشتی ئەو زانایانەی ئەمەریکا دەکەن کە پێش ماوەیەك باسیان کرا.

ئەوەی ڕاستی بێت لەم ساڵانەی دواییدا پرۆژەی فلۆراوی کردنی ئاو لە ئەمـەریکـا ئەو باوەی جارانی نەمـاوەو ژمـارەی ئەوانـە دژی پرۆژەکەن هەتا بێت زیاد دەکەن.

**کلۆریی ددان و ئاوی فلۆراوی**

٤٠ ساڵێك لەمەوبەر زاناکان و پسپۆرەکانی ددان لەو بڕوایەدا بوون کە توخـمـی فلۆر (F) پێـویسـتـە بۆ پێگـەیشتن و پێکهـاتنی ددان و ئیسقـانـەکـان، بەتـایبـەتی چینی مینا.( ) واتە فلۆر ددان بەهێزو پتەو دەکات و بە ئاسانی کلۆر نابێت.

مرۆڤ کە ئاوی فلۆراوی دەخـواتـەوە فلۆرەکـە هەڵ دەمـژرێت و دەچێتە ناو جۆگەلەی خوێنەوە. کەمێك لە فلۆر دێتە ناوخوێنی لەشەوە لە خواردن و خواردنەوەو مەعجونی ددان و مەڵبەندی تر... بەشێك لە فلۆری ناو خوێن لەگەڵ میزدا فڕێدەدرێتە دەرەوە بەڵام بەشی گەورەی دەچێتە ناو پێکهاتووی ئیسقانەکان و ددانەکان. ئایۆنی فلۆر(F)کارلێك دەکات لەگەڵ فۆسفاتی کالسیوم( ) بەگوێرەی هاوکێشەی ( ) خوارەوە:-

$$Ca(PO_4)_6(OH)_2 + F_2^- \rightarrow Ca_{10}(PO_4)_6F_2 + 2OH^-$$

بەڵام لەم دواییەدا دوو ڕای نوێ هاتەکایەوە بۆ چۆنێتی میکانـسمی( ) کارلێك کردنی فلۆر لەگەڵ ددان.

میکـانسمی نوێ دەڵێت ئایـۆنـەکـانی فلۆر (F) لە ناو لیك ( ) یان لەنـاو ئاو یان لەنـاو مەعجـونی ( ) ددان کارلێـك دەکـەنە سەر ڕووی دەرەوەی ددانەکان و خەستی ئایۆنەکانی هایدرۆجین واتا (PH)( )ی دەگـۆڕن. بۆ ئەوەی لەم کارلێکـە باش تێبگـەین پێـویستـە بزانین کە چینی مینـای ددان بە هەمیشـەیی بە توێـژێکی تەنـك لە بەکتریا ( ) پۆشراوە. بەم توێژە دەڵێن پلاك plaque. واتە ئیسقانەکانی مینا ئایۆن و کانزاو شتی تری بۆ دەچێت لەنـاو چینی پلاکـەوە. هەروەهـا ئایـۆن و کانزای تر کە لە ئیسقانی ددانەوە جیادەبنەوەو دەچنە ناو پلاکەوە. ئینجا کە ڕادەی ترشی پلاك زیاد دەکات (واتە فنجەنی PH کەم دەبێتەوە بە

ڕەنووس) ئایۆنی کالسیۆم و فۆسفات لە میناوە بۆ پلاك دەچن بەڵام کە ترسی پلاك کەم دەبێتەوە (ڕادەی بێ لایەنی)[٢٣] واتە دەبێت بە(7 = PH) ئەوسا بەپێچەوانە ئایۆنەکان لە پلاکەوە دەچن بۆ ناو میناوە. فلۆر ناهێڵێت بەکتریاکانی پلاك شەکری ناو ددانەکان بگۆڕین بۆ ماددەی ترش .بەم جۆرە خەستی هایدرۆجین کەم دەبێتەوە لە پلاك و[٢٤] بەرزنابێتەوە. ئەمەش واتە (PH بەرز) گواستنەوەی ئایۆنەکان بۆ مینا ئاسان دەکات. گواستنەوەی ئایۆنەکان لە پلاکەوە بۆ مینا پێی دەڵێن Mi neralization کەچی پیچەوانەی ئەم کردارە واتە گواستنەوی ئایۆن لە میناوە بۆ پلاك پێی دەڵێن Deminiralizotion واتە فلۆری ناو لیك یان ئاو بەسوودە بۆ ددان و بەربەستی کلۆربوون دەکات. بۆیە هەڵسان ماددەی فلۆریان تێکەڵ بە مەعجونی ددان کرد لە ئەمەریکاو شوێنانی تر

هەندێك لە زاناکان دەڵێن فلۆر دەچێتە ناو پێکهاتووی ئیسقانە ـ کانەوە بەتایبەتی کاتێ کە لەباری (کەم کانزا) بێت واتە باری Deminiralized Surface.[٢٥]

زۆربەی پزیشکەکانی ددان واتە (دانسازەکان) لە مێژەوە بڕوایان بە کەڵك و سوودی فلۆر هەیە بۆ کەم کردنەوەی ددانکلۆری بەڵام ئەم بڕوایەلەم ساڵانەی دوایی‌یەدا لاوازتر بوە بەلکو چەند لێکۆڵینەوەیەکی نوێ دەڵێن فلوراوی کردنی ئاو هیچ سوودیکی بۆ کەم کردنەوەی ددان کلۆری نی‌یە

خشتەی ژمارە ـ ١ ناوی ئەو وڵاتانەی تێدایە کە ئاوی فلۆراوی دەستکرد دەخۆنەوە یان نایخۆنەوە.

| وڵات | ژمارەی هاووڵات | ڕێژەی ئەوانەی ئاوی فلۆراوی دەخۆنەوە |
|---|---|---|
| نەیبانیا | ٣,١ ملیۆن | - |
| ئوسترالیا | ١٦,١ ملیۆن | ٪٦٦ |
| نەمسا | ٧,٦ ملیۆن | - |
| بەلچیکا | ٠و١٠ ملیۆن | - |
| بولگاریا | ٩,٠ ملیۆن | - |
| کەنەدا | ٢٦ ملیۆن | ٪٥٠ |
| چیکۆسلۆفاکیا | ١٥,٦ ملیۆن | ٪٢٠ |
| دانیمارك | ٥,١ ملیۆن | - |
| ئەلمانیای ڕۆژهەلات | ١٦,٦ ملیۆن | ٪٩ |
| فینلەندە | ٥,٠ ملیۆن | ٪١,٥ |
| فەرەنسا | ٥٥,٦ ملیۆن | - |
| یۆنان | ١٠ ملیۆن | - |
| هەنگاریا | ١٠,٦ ملیون | - |
| ئیرلەندە | ٣,٥ ملیۆن | ٪٥٠ |
| ئیتالیا | ٥٧,٤ ملیۆن | - |
| ژاپۆن | ١٢٢ ملیۆن | - |
| لوکسەمبورگ | ٠,٤ ملیۆن | - |
| هوڵلەندە | ١٥ ملیۆن | - |
| نیوزیلەندە | ٣,٣ ملیۆن | ٪٦٦ |
| نەرویج | ٢و٤ ملیۆن | - |
| پۆڵەندە | ٣٧,٧ ملیۆن | ٪٤ |
| پۆرتوگال | ١٠,٣ ملیۆن | - |
| ڕۆمانیا | ٢٣ ملیۆن | - |
| ئەسپانیا | ٣٩ ملیۆن | ٪١ |
| سوەید | ٨,٤ ملیۆن | - |
| سویسرە | ٦,٦ ملیۆن | ٪٤ |
| ئینگلترە | ٥٦,٨ ملیۆن | ٪٩ |
| ئەمەریکا | ٢٤٣,٨ ملیۆن | ٪٥٠ |
| ڕوسیا | ٢٨٤,ـ ملیۆن | ٪١٥ |
| ئەلمانیای | ٦١,ـ ملیۆن | - |
| یوگسلافیا | ٢٣ ملیۆن | - |

لە خشتەی ژمارە ـ ١ بۆمان دەردەکەوێت کەوا ڕێژەی ئەوانەی ئاوی فلۆراوی دەخۆنەوە بەتایبەتی لە ئەوروپا کەمن.

با بگەڕێینەوە بۆ مەسەلەی ددان کلۆری‌و هۆیەکانی. بەڕاستی دەتوانین هۆیەکانی کلۆری کۆبکەینەوە لەم خاڵانەی خوارەوە:ـ

١ ـ خواردەمەنی

٢ ـ پیس بوون و ناتەندروستی ناو دەم.

٣ ـ ئاگاداری‌و پاریزگاری ددان.

٤ ـ کاری ڕەچەڵەك (سکماکی)[٢٦]

٥ ـ هۆی جوگرافی‌و کیمیایی.

٦ ـ بوون یان نەبوونی توخمەکان بە ڕێژەیەکی زۆر کەم بۆ نموونە چەندێتی فلۆر لە ناو ئاوی خواردنەوە.

٧ ـ چەندێتی شیرینی خواردن وەکو پاقلەواو حەلوا. . هتد. .

٨ ـ چەشنی مەعجونی ددان کە مرۆڤ بەکاری‌دەهێنێت.

شیـانی باسـە ئەو جۆرە تاقی‌کـردنـەوەی دەیکـەن بۆ ئەوەی سوودی فلۆر ئاشکرا بکەن بۆ کەم کردنەوەی‌ددان کلۆری زۆر بە تەواوی بەجێ نی‌یە.

تاقی‌کردنەوەکان بەم جۆرە کراون:ـ

دوو ناوچـــەی مرۆڤ نشـیـن وەردەگــرن ناوچـــەیـــەکـیـــان ئاوی خواردنەوەیان فلۆری تیٰ‌دا نی‌یە بە سروشتی ناوچەی دووەم هەندێك فلۆر تێکەڵ بە ئاوی خواردنەوەیان دەکرێت واتە ئاوی فلۆراوی دەخۆنەوە.

لەپاش پێنج ساڵێك دێن ژمارەی ئەو کەسانە دەدۆزنەوە کە ددانیان کلۆر بوە لەو ماوەیـەدا. ئەم ژمـارەیـە بەراوردەکـرێت لەگـەڵ ژمـارەی ئەوانەی ددانیان کلۆربووە لە ناوچەکەی تر.

ئەم جۆرە تاقی‌کـردنـەوەیـە هەنـدێـك جار ئەنجـامی هەڵـە دەدات چونکـە تەنهـا لایـەنێـك وەردەگـرێت ئەویش ئاوی خواردنـەوەیە؟ کێ دەڵێت هاوولاتەکانی ناوچەی دووەم فلۆر لە مەڵبەندی ترەوە وەرناگرن؟ بۆوێنە خواردەمەنی؟

لەگەڵ ئەمەش دا گومانی تیٰ‌دا نی‌یە کە ژمارەی ددان کلۆری لە ئەمـەریکـاو نیـوزیلەنـدەو ئوسترالیا لە ماوەی چل سـاڵەی رابوردوودا لە ٤٠٪ زیـادتـر هاتــوتـە خوارەوە بەڵام لەلایـەکی ترەوە دوکتـۆر مارك دیسنـدۆرڤ Mark Diesendorf - پرۆفیـسـوری زانکـۆی ئوسـتـرالیـا (٢٤) لێکـۆڵینـەوەی جیـاجیـای کردوە لە دە وڵاتی هەمـەجۆر و ژمارەی ددان کلۆریی هاوڵاتـەکـانی تومـارکردوە. لە ئەنجام دا دەڵێت ژمارەی ددان کلۆری لای هەمـوو شوێنـەکـان هاتـەخـوارەوە لە (٤٠٪) بەبێ ئەوەی ئاوی فلۆراوی بخۆنەوە؟؟.

ئەم دوو ئەنجامە پێچەوانانە دوکتۆر دای‌سندۆرف روونی‌دەکاتەوە و دەڵێت:ـ وا دیـارە ئەو (٢٤) ناوچـەیـەی کە ئاوی فلۆراوی ناخـۆنـەوە لەگـەڵ ئەوەش دا ژمـارەی کلۆربـوونی ددانیـان کەم بوتـەوە هەڵبـەتـە فلۆریـان لە مەڵبـەنـدی ترەوە دەست کەوتـوەوە وەکـو مەعجونی ددان و دەرمـانی غەرغـەرە.. هتـد.. بەڵام هەنـدێك لە ناوچەکان ئەم جۆرە مەڵبەندەیشیان بەکار نەهێنابوو کەچی کلۆربوونی ددانیان کەم بوبووەوە. دەبێ ئەمـــانــەی دوایی فلۆریـــان لە خواردەمـــەنی و مەڵبـەنـدی ترەوە دەست کەوە تبێت.

ژمـارەیـەك لە زانـا ئەمەریکی‌یەکان بە هەمان ئەنجامەکانی دوکتور دای‌سیـنـدرۆف گیشتن. بۆ وێنـە دوکتـور هایفتـزو هاوڕیکـانی S.B Heiftz لە لێکۆڵینەوەیەکی هەمەجۆردا بلاویان کردوتەوە و دەڵێن:ـ [لیکۆڵینەوەکانمان لە چەند ساڵەی رابوردودا وا نیشان دەدات کە ئاوی فلۆراوی‌و ئاوی ئاسایی هەردووك ژمارەی ددان کلۆری کەم دەکەنەوە. هەروەها لیکۆڵینەوە دوایی‌یەکانی ئاموژگای (NIDR) [٢٩] وا نیشان دەدات کە فلۆراوی‌کردنی ئاوی خواردنەوە رێژەی کلۆریی ددان تەنها لە ٣٠٪ دێنێتـەخـوارەوە نەك وەکـو لە پێش دا بلاوبـوبـوە کەوا لە (٥٠٪ یا لە ٦٠٪) کەمی دەکاتەوە.

**مەترسی‌یەکانی ئاوی فلۆراوی لە زیادبوون دایە**

ئەوانـــەی پاڵ پشـتـی فلۆراوی‌کــردنی ئاون دەڵێن فلۆر سوودێکی گشتی هەیە بۆ پێکهێنانی ئێسقان و رەقیان دەکات واتە فلۆر نەخۆشی ئێسکـەنـەرمـە (osteoporosis) چاك دەکـاتەوە. بەڵام زۆربوونی فلۆر لە لەشی مرۆڤ ئەوانەیە بەپێچەوانە کاربکات و ببێت بە هۆی نەخۆشی (osteosclerosis) [٣٠] واتـە (هــەرەرەقـی ئێـسقـــان). شیـــانی باســـە کاربـــەدەستـــانی دەرمـــان لە ئەمـــەریکـا (FDA) [٣١] بواری نەداوە کە نەخۆشی ئێسکەنەرمە osteoposis بە خواردنی ئاوێتەی فلۆر چارەسەربکرێت.

ئەوەی راستی بێت هەتا ئێستا لێکۆڵینەوەکان بە تەواوی‌و بە روونی مەترسی‌یەکانی ئاوی فلۆراوی‌یان بۆ ئاشکرا نەبووە، زۆربەی هەموو پرۆپـاگـەنـدەو بۆچـوون و قسـەیـە دەکرێن دژی ئاوی فلۆراوی‌و هیچ بنچینەیەکی زانستی‌یانەی جێگیری نی‌یە.



وێنەی ژمارە - ٢

یەکـەم مەتـرسیی فلۆر بۆ تەنـدروستی بریتی یـە لە نەخـۆشیی (فلۆرکاری ددان Tooth Flourosis). ئەم نەخۆشی یە ناسراوە بە گۆڕانی رووی ددانـەکـان و پەیـدابوونی پەڵەی رەنگدار بەسەریانەوە. پەڵەکان وەکـوو خاڵی بچـووك دیـاردەبن و رەنگیـان هەنـدێـك جار زەردە یان قاوەیی یە یان سپی یە وەك پەڵەگەچ بەسەر ددانەکانەوە. تووش بوون بەم نەخـۆشی یـە دەبێتـە هۆی هەڵـوەرین و شکـانی ددان بە ئاسـانی چونکـە بێ هێـز دەبێت و دەفـەوتێت. ئەم نەخـۆشی یـە بەهـۆی زۆر وەرگرتنی فلۆر تووشی مرۆڤ دەبێت بۆیە ناوی نراوە بە (فلۆرکاری).[illegible] وێنەکانی خوارەوە (وێنەی ژمارە ـ ٢) ددانی ساغ و ناساغ بە نەخۆشیی فلۆرکاری نیشان دەدات.

وێنـەی ددانـەکـان لە قۆنـاغـەکـانی نەخـۆشیی ؟فلۆرکـاری ددان Fluorosis tooth). ١ . ساغە ٢ . کەمێك نەخۆشی یەکە دەستی پێ کردووە ٣ . زیادتر نەخۆشە ٤ . پەڵەی سپی وەك گەچ پەیدابووە ٥ . پەڵەکان زیادبوون و زەرد بونەتەوە د. پەڵەکان زۆربوون و رەنگیان قاوەیی یە.

شیانی باسە کاری ئایۆنی فلۆراید F بەسەر تەندروستی ئێسقان دا زۆر کارێکی سەیـرو دەگمـەنـە چونکـە قەبـارەیـەکی زۆر کەم لە فلۆر کفایەتە بۆ رەق بوونی ئێسقانەکان بەتایبەتی ددان کەچی هەندێك جار ئەو قەبـارە کەمـە زیـان بە تەنـدروستی دەگـەیـەنێت وەکـو نەخـۆشی فلۆرۆسـس Fluirosis وەکو باسمان کرد لە سەرەوە. توخمەکانی تر وەکو کرۆم (Cr) یان مەکـنـسیـۆم (Mg) یان توتیـا (Zn)[illegible] هەرچـەنـدە بە قەبـارەیـەکی زۆر کەم پێـویسـتن بۆ تەنـدروستی مرۆڤ بەڵام مرۆڤ نەخۆش ناکەن. لە ساڵی ١٩٦٢ ڕێژەی فلۆریان نیشانەکرد بە (٧, . ـ ٢, ١) بەش لە هەر ملیۆنێك (0.7 - 1.2 ppm). بەڵام ناوچە گەرمەکان ڕێـژەی فلۆرەکـە پێـویستـە کەم تر بێت لە ناوچـە ساردەکـان چونکـە هاوولاتـەکـانی شوێنی گەرم ئاو زیـادتـر دەخـۆنـەوە لە هاوولاتـەکانی شوێنی سارد. هەر چۆنێك بێت ڕێژەی فلۆر نابێت لە (٤) بەش لە ملیـۆن (4 ppm) زیـاد بکـات. بەگشتی نەخـۆشیی (فلۆرکـاریی ددان tooth Fluorosis) لەو شوێنانە زۆرە کە ڕێژەی فلۆری ئاوی خواردنەوەیان زیـادە. ئاوی خواردنـەوەی فلۆراوی لە گەدەو ریخـۆڵـەکـان دا ٩٨٪ی فلۆرەکەی هەڵ دەمژرێت بۆ ناو خوێن و لە پاشان دەگەنە خانەکانی ئێسقانەکان و ددان. بەشێك لە فلۆرەکە لە گورچیلەوە بەهۆی میزەوە فڕێ دەدرێننـە دەرەوە. شیـانی باسـە هەنـدێـك لە فلۆرەکـە لە ناو شانەکانی لوولەی (خوێنبەری گەورە)[illegible] دا کۆمەڵ دەبێت. قەبارەی فلۆری وەرگیـراو لە لایـەن ئێسقـانـەوە بە گوێـرەی تەمـەن دەگۆڕێت. منـداڵ (٥٠٪ی) فلۆری ناو خانـەی ددانـەکـانی بەکاردەهێنێت بەڵام مرۆڤی پێ گـەیشتـوو تەنهـا لە (١٠٪ی) فلۆر بەکـاردەهێنێت. شیـانی باسە ڕێژەی فلۆر لەناو ئێسقانەکانی مرۆڤ زیاددەکات بە زیادیی تەمەن.

**نەخۆشیی فلۆرکار Fluorosis**

هەر وەکـو لە سەرەوە گوتمـان زۆر بوونی فلۆر لە ناو پێکهـاتـووی ئێسقان بەتایبەتی ددان دەبێتەهۆی نەخۆشیی فلۆرکار Fluorosis لێرەدا دەڵێین فلۆرکار دوو چەشنە:

١ . فلۆرکاری ددان tooth Fluorosis

٢ . فلۆرکاری ئێسقان Bone Fluorosis

بەتایبەتی فلۆرکاری پەیکەر skeletal Fluorosis

١ . فلۆرکاری ددان:

---

لەسەرەوە باسی ئەم نەخۆشی یە کراو لەم بەشەدا هەندێك زانیاریی نوێی تر باس دەکەین. دوکتۆر ترێندلی دین H.trendly Dean[illegible] ئەم نەخۆشی یە دابەش دەکاتە پێنج قۆناغ یان پلە:

١ . باری گومان ـ واتە نەخۆشی یەکە لێرەدا دیاری نادات بەڵام گومانی لێ دەکرێت.

٢ . فلۆرکاری ددانی زۆر سووك Very mild

٣ . فلۆرکاری ددانی سووك Mild

٤ . فلۆرکاری ددانی (ناوەندی) Moderate

٥ . فلۆرکاری ددانی (بەرباد؛ قورس Severe

نیشانەکانی نەخۆشی یەکە باس کران لەسەرەوە ئەوەی شایانی باسە لەپلەی چوارو پێنـج دا ددانـەکـان کون کون دەبن و لە خوێـنـەوە دەوەرێن. بێ گـومـان ددانی نەخـۆش بە فلۆرکـار نەك هەر بە دیمـەن ناشیرینە بەڵکو بێ کەڵك و بێ هێزەو بە ئاسـانی دەکەوێت.

٢ . فلۆرکاری پەیکەر:[illegible]

---

بێ گـومـان یەکێـك لە مەتـرسی یـە گەورەکـانی فلۆر بۆ تەندروستی نەخـۆشیی (فلۆرکـاری پەیکـەرە) Skelatal Fluorosis - ئەم نەخـۆشی یـە تووشی مرۆڤ دەبێت بەهۆی کۆمەڵ بوونی فلۆر لەناو ئێسـقانەکان دا. نەخـۆشی یـەکـە سێ قۆنـاغی هەیـە: یەکەم و دووەم قۆناغیان سووکن بەڵام قۆنـاغـی سێ یـەم قورسـەو سەختـە بە جارێـك نەخـۆش پەك دەخات. لە قۆناغی یەکەمی نەخۆشی یەکەدا نەخۆش هەست بە ئێش وئازار لە ئێسـقانەکانی و جمگەکانی[illegible] دەکات، هەروەها هەسـت بە سووتاندنەوی جمگەکان دەکات هەر وەکو دەرزی تێ دا بچەقێنێت وایە، نەخۆش ئارەزوی خواردنی نابێت و توانای هەرس کردنیشی کەم دەبێتەوە.

لە قۆناغی دووەم دا ئازارەکان زیاد دەکەن و جمگەکان رەق دەبن، هەنـدێـك جار پێـویستی بە نەشتـەرگـەری دەکـات بۆ راستکـردنەوەی ئێسقـانـەکـان.لە قۆنـاغی سێ یـەم دا جوولانـەوەی جمگـەکـان زۆر

بەرحمەت دەکرین، و ئیسقانی بربڕەی پشت ئەلقەکنی لەگەڵ یەك دەلكێن بە جۆرێك نەخۆش ئیتر ناتوانێت پشت داچەمێنێتەوە. نەخۆشی‌یەکە لەم قۆناغەدا پێ‌دەڵێن Crippling Skelatal Fluorosis.

پسپۆرەکان و نۆشدارەکان دەڵێن مرۆڤ تووشی ئەم جۆرە نەخۆشی‌یە دەبێت ئەگەر هاتوو رۆژی (٢٠) میلیگرام فلۆری خوارد بۆ ماوەی (٢٠) ساڵ یان زیادتر. بەڵام خواردنی قەبارەیەکی کەمتر وتە (٢ ـ ٥) میلیگرام فلۆر هەموو رۆژێك بۆماوەی (٢٠) ساڵ نابێتە هۆی تووش بوون بە پلەی یەکەم یان دووەمی نەخۆشی‌یەکە. جۆرێکی دی زانا دەڵێن کە گوایە تەنها بە خواردنی فلۆر نەخۆشی (فلورکاری پەیکەر) جێ‌گیر نابێت. بەڵکو تووش بوون بە فلورکاری پەیوەندە بە رادەی خواردەمەنی مرۆڤەوە بەتایبەتی ڤیتامین D و پرۆتین و قەبارەی کالسیوم و مەگنسیوم.

شیانی باسە ژمارەیەکی زۆر لە هاوڵاتەکانی هیندستان و چین و ئەفریقیاو ژاپۆن و خۆرهەڵاتی ناوەراست تووشی نەخۆشی (فلورکاری پەیکەر) دەبن بەبۆنەی بەرزیی رێژەی فلۆر لەناو ئاوی خواردنەوەیان بە شێوەیەکی سروشتی.

## فلورکاری پەیکەر

نەخۆشی (فلورکاری پەیکەر) لە ئەمەریکا دەگمەنە، هەتا ئێستا ژمارەی نەگیشتوە تە (١٥ ـ ٢٠) نەخۆش. دوکتۆر جوزیف کوتروڤۆ Cotruvo Joseph دەڵێت: باشترین بەڵگە بۆ دروستیی رێژەی فلۆر لەناو ئاوی خواردنەوەی هاوڵاتەکان ئەوەیە کە نەخۆشیی فلورکاری پەیکەر دەگمەنە.

لام وایە شتێکی تازە ئاشکرا ناکەین ئەگەر بڵێین ئاسۆی زانیاری نۆشدارەکانی ئەمەریکا دەربارەی نەخۆشیی (فلورکاری پەیکەر) زۆر تەسکەو کەمە. بەرامبەر بەمە دەبینین چل ساڵ زیادترە لێکۆڵینەوە دەکرێت دەربارەی ئەم نەخۆشی‌یە لە ولاتانی تر کە نەخۆشی‌یەکە زۆرە لەناو هاوولاتەکانی وەکو گوتمان لە هیندو چین.. هتد. لەبەرئەوە پزیشکەکانی ئەمەریکا زانیاری‌یەکی تەواویان نی‌یە کە بتوانن نەخۆشی‌یەکە پێ‌ناس بکەن (وتەشخیصی) بکەن.

**پەیوەندی فلۆر بە نەخۆشی‌یەکانی گورچیلەوە:**

لێکۆڵینەوەکانی پسپۆرەکان پەیوەندی‌یەکی بەهێزیان لە نێوان نەخۆشیی (فلورکاری پەیکەر)و نەخۆشی‌یەکانی گورچیلەدا دۆزیوەتەوە. یەکەم ئەو کەسانەی گورچیلەکانیان نەخۆشن زووتر نەخۆشیی فلورکاری پەیکەر دەگرن، دووەم هەندێك لە زاناکان لەو بڕوایەدان کە فلۆر لەوانەیە ئازاری گورچیلەکان بدات. بۆ وێنە دوکتۆر رەجە ریدی Reddy D.Raja لەم خسوسەوە دەڵێت:ـ

«ئەو کەسانەی کۆنە نەخۆشی گورچیلەیان هەیە یان گورچیلەیان گواستوتەوە بە عەمەلیات فلۆریدێکی کەمێك زیادتر لە ئاسایی فڕێ دەردەدەن لەگەڵ میزدا. هەروەها ئەم جۆرە کە سانە زووتر تووشی نەخۆشی‌یەکانی (فلۆرکار) دەبن.

هەروەها راپۆرتێکی ساڵانەی ١٩٨٣ لە ئەمەریکا لەم خسوسەوە دەڵێت:

«کزبون و پەك کەوتنی چالاکیی گورچیلە بەهۆی نەخۆشی یان بەهۆی تەمەن درێژی‌یەوە بێت رێژەی فلۆرید F لەناو ئیسقانەکان و لەناو پلازمەی ئەو کەسە زیاد دەکات»

دیسانەوە دەزگای میلیی ئەمەریکی دەربارەی گورچیلە لە راپۆرتی ساڵی ١٩٨٠ی دا دەڵێت:ـ

«پێویستە ئاگاداری نەخۆشیی گورچیلە بین و قەبارەی فلۆر لەناو ئاوی خواردنەوەیان هەرگیز نابێت بەرزبێت»

شیانی باسە کاری فلۆر بەسەر گورچیلەی نەخۆش دا بەتەواوی ئاشکرا نەبوە، تەنها چەند تاقی‌کردنەوەیەك بەسەر مەیمون دا کراون. (٤٥)

### هەستی‌یاری بە فلۆر

هەروەکو هەموو دەزانین کە گەلێك کەس هەستیاری‌یان هەیە دژی شتی تایبەت وەکو خوری یان تۆز یان هێلکەخواردن.. هتد.. هەروەها گەلێك کەس هەن کە هەستی‌یاری‌یان بە فلۆر هەیە. واتە ئەو کەسانە ئەگەر فلۆریان زۆر خوارد تووشی ئازارو هیلاکی دەبن هەر کەس بە چەشنێك. ئەم جۆرە کەسانە پێویستە ئاوی فلۆراوی نەخۆنەوەو مەعجونی ددانی فلۆراوی بەکارنەهێنن.. دوکتۆر جۆرج والدبۆت George Waldbott [دانەرو سەرۆکی نەخۆشخانەکانی هەستیاری لە دیترۆیت (ئەمەریکا) پێنج سەت (٥٠٠) نەخۆشی هەستیاری تیمارکردوە، هەموویان شکاتیان لە هەستیاری بەفلۆر دەکرد.

نیشانەکانی هەستیاری نەخۆشەکان ئەمانەی خوارەوە بون:ـ

١. بێ‌هێزیی ماسولکەکان.
٢. لاوازیی گشتی هەمیشەیی.
٣ ـ تونی‌بوونێکی هەمیشەیی.
٤. سەرئێشە.
٥. سووربونەوەی پێست.
٦. ئازارو ئێشی جمگەکان.
٧. نارێکی هەرس.
٨. لاوازیی بیرو توانای مێشك بۆ جێ‌بەجێ‌کردنی گیروگرفت.

هەموو نەخۆشەکان واتە (٥٠٠) نەخۆش هەستیاری‌یە کانیان

چاك بووە كەماددەى فلوريان لە ئاوو خواردەمەنيى نەخۆشەكان لادا.
كەچى نەخۆشى‌يەكانيان بە گەرانەوەى فلۆر گەرانەوە.
خشتەى ژمارە ـ ٢ لە خوارەوە ناوى چەند ئاوێتەيەكى [٤٦] كيميايى نيشان دەدات كە بەكاردەهێنرێن بۆ فلۆراوى‌كردنى ئاوى خواردنەوە.

خشتەى ژمارە ـ ٢

| ناوى ئاوێتە | قەبارەى سالانە بە تۆن هەر ساڵێك |
|---|---|
| ترشى هايدرۆفلۆر ـ سيليسيليك | ٨٠٠٠٠ |
| سيليكو فلۆرايدى سۆديۆم | ٦٠٠٠٠ |
| فلۆريدى سۆديۆم | ٣٠٠٠ |

هەروەها چەند لێكۆڵينەوەيەكى هەمان چەشن لە ولايەتى نيوجەرسى [٤٧] تاقى‌كراونەتەوە بەسەر منداڵ و ئافرەتى سك پردا. ئەنجامەكان وا دەگەيەنن كە خواردنى (١ ـ ٢,١) ميلليگرام فلۆر ئێش و ئازار دەگەيەنێ بە كۆئەندامى [٤٨] هەرس و دەمارەكانى لەش.

**كارى فلۆر بەسەر ئەنزيمەكان دا:** [٤٩]

بێ‌گومان ئەنزيم Enzyme ماددەيەكى پرۆتين ژيانى گرنگە. پيشەى ئەوەيە كارلێكى ژيانى نێوان خانەكانى لەش جێ‌بەجێ ئەكات واتە ئەنزيم ياريدەرێكى ژيانى‌يە بۆ پێك هێنانى كارلێكە كيميايى‌يەكانى ژيان.

ئايا فلۆر كارلێك دەكات لەگەڵ ئەنزيمەكان دا؟؟ بۆ وەلام دان دەڵێين بەلێ!! كارلێك دەكات و هەندێك جار پەكى ئەنزيمەكان دەخات و بێ‌كەڵكيان دەكات. ئەوەى زانراوە لە تاقيگەكان دا فلۆريدى سۆديۆم NaF بەكاردەهێنرێت بۆ كەم كردنەوەى چالاكى ئەنزيم يان بۆ پەك خستنى تەواوى لە تاقيگەكان دا. هەروەها بە بەراود دەڵێن كە گوايە ئايۆنى فلۆر چالاكى ئەنزيمەكانى ناو خانەو شانەكانى لەش كەم دەكاتەوە. ئەم كارەش وا ديارە بە ميكانسمێكى [٥٠] تايبەتى جێ‌بەجێ دەبێت. وا زانراوە كە ئايۆنى فلۆر ($F^-$) تواناى دروست كردنى بەندى [٥١] هايدرۆجينى هەيە لەگەڵ ئۆكسجين. بەم جۆرە فلۆر ($F^-$) ئەتوانێ پەيكەرى ئەنزيمەكان وئەو شێوەى وەريان گرتوە بەهۆى بەندى هايدرۆجينى [٥٢] نێوان گەردەكانى تێك بدات.

ئەوەى سەيرەو شيانى باسە هەندێك ئەنزيمى تايبەتى هەن كەوا چالاكى‌يان بە ئامادەبوونى فلۆر زيادەدەكات نەك كەم. بەلام زياد بوونى چالاكى يان كەم بوونى هەردووك هەر زيانە بۆ تەندروستى چونكە سروشتى ئەنزيمەكان تێك دەدات.

ژمارەى هاووڵاتى‌يەكان كە ئاوى فلۆراوى دەخۆنەوە لەساڵى ١٩٤٥ هەتا ساڵى ١٩٨٧

**Population drinking artificially fluoridated water has grown steadily since 1950**




Source: National Institute of Dental Research

سەير ئەوەيە لەگەڵ ئەم هەموو مەترسى‌يانەو بلاوكراوانەى دژ ـ فلۆر دەبينين ژمارەى ئەو شارانەى ئاوى فلۆراوى دەخۆنەوە زياد دەكەن. وێنەى ژمارە ٣ ـ ئەم راستى‌يە دەسەلمێنێت.

**كارى فلۆر بەسەر منداڵى تازە لەدايك بوودا:**

لە ساڵەكانى پەنجاكانەوە هەتا ئێستا ژمارەيەكى زۆر لێكۆڵينەوە كراوە بۆ ئەوەى بزانن ئايا فلۆر كاردەكاتە سەر تەندروستى منداڵ لەناو سكى دايكى‌دا؟ واتە دەبێتە هۆى نوقسانى لەشى يان هۆشى ئەو منداڵە؟

ئەنجامى ئەو هەموو لێكۆڵينەوانە ئاشكراى كردووە كە هيچ جۆرە پەيوەندى‌يەك نى‌يە نێوان فلۆرو كەم وكوڕى و تەواويى منداڵ كە تازە لەدايك دەبێت.

**شێرپەنجەو [١٠] فلۆر.**

لە كۆتايى ئەم باسە پێويستە روونى كەينەوە بۆ خوێنەرانى خۆشەويست ئايا فلۆر خواردن بە هەر جۆرێك دەبێتە هۆى پەيدابوونى شێرپەنجە لە مرۆڤ؟ تاقى‌كردنەوەكان لە پەنجاكانەوە ئاشكراى كردووە كە فلۆر بەو رێژەى ناو ئاوى خواردنەوە نابێت بەهۆى شێرپەنجە.

وێنەی ژمارە - ٤ لەخوارەوە دوو مرۆڤی هیندی نەخۆش نیشان ئەدات. هەردوو پیاوەکان نەخۆشی (فلۆرکاری پەیکەریان هەیە.



*These men in India have developed crippling skeletal fluorosis from fluoride in water*

پەراوێزەکان

(١) زۆربەی زانیاری ئەم وتارە لەسەر چاوەی خوارەوە کراوە بەکوردی لەگەڵ گۆرین دا:

Betle Hilleman, Chemical and Emgineering News, August st, 1988 ,pp-(26 - 42) (1988).

(٢) فلور - یەکێکە لە توخمەکان، هێماکەی لە کیمیادا بریتییە لە (F)

(٣) ئاوی پەتی = الماء النقي.

(٤) دلۆپاو = المقطر.

(٥) نشونەما = نمو

(٦) بەرێوەبەری یەکێتیی هاولاتەکانی ئەمەریکایە. واتە: Consumers Union

(٧) نامەی دوکتوراه = رسالة الدكتوراة

(٨) پرۆژە = مشروع.

(٩) (ADA) Amer.can Dental Assoeiation

(١٠) شێرپەنجە = سرطان

(١١) ناتەواویی لەش یان نوقسانی لەش = التخلف او النقص الخلقي الولادي.

(١٢) وكالة المحافظة على البيئة E nvironmental protection Agency

(١٣) هەڵسەنگاندن = تقييم

(١٤) U nited States public Health survice

(١٥) چینی مینا = طبقة المينا = الطبقة الخارجية الصلبة للأسنان

(١٦) فۆسفاتی کالسیۆم لە ناو ئێسقان دا هەیە.

(١٧) هاوکێشە = معادلة.

(١٨) میکانسم = ميكانيكية = Mechanism هەنگاوە وردەکانی کارلێك بەدرێژی چۆن روودەدەن...

(١٩) لیك = لعاب

(٢٠) مەعجونی ددان = هەویری ددان.

(٢١) PH = چری یان حەستی ئایونەکانی هایدروجین [ H ].

(٢٢) بەکتریا = زیندەوێکی یەك خانەیە، هەندێکیان نەخۆشی دروست دەکەن لە لەشی مرۆڤ پێیان دەڵێن میکرۆب..

(٢٣) رادەی بێ‌لایەنی = درجة التعادل

(٢٤) شیرنی وەکو شەکرو حەڵوا ددان کلۆر دەکات چونکە ئەو شەکرەی لە نێوان پێخی ددانەکان دەمێنێتەوە بەهۆی بەکتریاوە لە (PH) ی تایبەتی (بەرز) شی‌دەبێتەوە بۆ ئاوێتەی ترش. ترشەکەش ددانەکان دەتوێنێتەوەو کلۆری دەکات.

(٢٥) واتە رووی بێ‌کانزا = سطح خال من المعادن.

(٢٦) وراثي.

(٢٧) لە ئامۆژگای (لێکۆڵینەوەی میللی ئەمەریکا) لێکۆڵینەوە دەکات. National I nstitute of DentaL Research

(٢٨) وتارەکەیان لەم گۆڤارە بلاوکراوەتەوە: J. the American DentaL Association.

(٢٩) National I nstitute For Dental Research

(٣٠) دوو نەخۆشی ناسراون:

١) نەرمی ئێسقان = osteoporosis

٢) هەرەرەقی ئێسقان = osteo sclerosis

(٣١) FederaL Drug Adminstrotion = FDA

(٣٢) فلۆرکار = Fluorosis = زۆر بونی فلۆر لە ناوپێکهاتووی ئێسقان وددان دەبێتە هۆی لاوازی‌و بێ‌هێزی ددان. پەڵەی سپی وەکو گەچ

بەسەر ددانەکانەوە دەبینرێت.

(٣٣) توتیا = الخارصين او الزينك Zinn

(٣٤) خوێنبەری گەورە = الشريان الأورطي Orta

(٣٥) نەشتەرگەری بەناوبانگی ددانە لە ئەمەریکا.

(٣٦) فلۆرکاری پەیکەر = مرض الفلور الهيكلي

(٣٧) جمگە = مفصل

(٣٨) العمود الفقري.

(٣٩) Crippling بە مەعنا لەسەر سك دەڕوات بە خشکە.

(٤٠) نۆشدار = طبيب = پزیشك

(٤١) بەڕێوەبەری بەشی دروستی ئاوی خواردنەوەی ئەمەریکایە.

(٤٢) لە دانشگای پزیشکی غاندی (هندستان) کاردەکات

(٤٣) زرع الكلية Kidney transplant

(٤٤) فلۆرکار = Fluorosis

(٤٥) هەستیاری = حساسية.

(٤٦) مرکب.

(٤٧) نیوجەرسی New Jersy یەکێکە لە ولاتە (٥٢) ولایەتەکانی ئەمەریکا نزیك نیویورکە.

(٤٨) کۆ ئەندامی هەرس = الجهاز الهضمي.

(٤٩) بۆ تێگەیشتنێکی باشتری ئەنزیم سەیرێکی کتێبی کیمیای شەشی (ئامادەیی) زانستی بکە: (کیمیا) - گۆڕینی - د. زەنوون پیریادی. د. علي توفيق، جمال عبدون، عبدال مجیدو صدیق محمود، چاپی حەوتەم ساڵی ١٩٨٨ لاپەڕە ٢٧٩.

(٥٠) بەندی هایدرۆجینی= آصرة هايدروجينيه.

# فلورة مياه الشرب ومخاوفها الصحية

الدكتور ذنون محمد پيريادى

## الخلاصة

في بلدة صغيرة اسمها (گراند ريبد) بولاية مشيگان الامريكية ولأول مرة في التاريخ سنة ١٩٤٥ قامت السلطات المحلية باضافة نسبة ضئيلة من مادة الفلور الى مياه الشرب وذلك لأعتقاد المتخصصين بفائدة الفلور في تقليل نسبة نخر الأسنان وبخاصة عند الأطفال. بعد ذلك زاد عدد المدن والقرى التي طلبت اضافة الفلور الى مياه شربها حتى وصلت النسبة الى حوالي ٥٠٪ من سكان الولايات المتحدة وكذلك في اوروبا واليابان وكندا واستراليا.

ألا أن حملة معادية ضد أستخدام الفلور في مياه الشرب بدأت منذ البداية من قبل بعض العلماء والمتخصصين بصحة الأسنان حيث أدعت هذه الجماعة بأن الفلور مضر بصحة الأنسان وان ضرره اكثر من فائدته.

البحث المقدم يدور حول هذا الموضوع بشيء من التفصيل وما وصلت اليه جماعة العلماء المعارضين للفلور من براهين حول ادعاءاتهم.

# بازدانی جین

## عبدالرحمن حمه چاوەش - سلێمانی

### پێشەکی

ئەمەوەی «٣٠»ـی سالی رابووردوودا رەچەلەکزانی بایەخێکی زوری پی‌درا بەتایبەتی لەرووی پەیوەندیی رەچەلەکزانی بە زوربەی نەخوشی‌یەکانەوە، بو دوزینەوەی هوی ئەو نەخوشی‌یانەو چارەسەرکردنیان بەتایبەتی پاش دوزینەوەی ناوکەترشی D.N.A و کاری لە پێکهاتن و دروست کردنی پروتین دا کە رولێکی گرنگیان هەیە لە کارکردنی خانەو رێکخستنی زیندەگورزانەکانی ناوی.

هەر لەو کاتەوە کە زانرا D.N.A ماددەی رەچەلەکە ئەوەش ئاشکرا بوو کە بازدان گورزانێکە لە زنجیرەی نیوکلوتیدەکانی Nucleotides ناو ناوکەترشی D.N.A و لە ئەنجامی زیندەکارە سروشتی‌یەکان یان لە ئەنجامی کارلێکردنی لەگەل شوینەواردا روودەدات، پاشان هەول درا ئەو هویانە بزانرێت کە کار لە رەچەلەکە ماددە دەکەن و دەبنەهوی روودانی بازدان تی‌دا، بە بەکارهێنانی ئەو بزوێنەرانە کە بە گشتی ناودەبرین بە بازی‌دەرەکان Mutagenes وەك هوی کیمیایی یان فیزیایی یان زیندەگی بو زانینی چونیەتی کارکردنیان لەسەر جینەکان، تا بتوانرێت نیان کەم بکرێتەوەو یان بە تەواوی دەستیان بەسەردا بگیرێت.

گشت (گورزانە رەچەلەکی‌یەکان دیار بن یان شاراوە و نادیار، بەرەنجامی رووداوێکن کە پێی دەلێن: (بازدان) Mutation هەرچەندە زوربەی جوری بازدان سروشتین و بەردەوام لە تاکە جوراو جورەکان دا روودەدەن، بەلام بەبارێکی ئاسایی رەچەلەك دانانرێن، چونکە (رەچەلەکە ماددە)، کە هەوێنی رەچەلەکە روخسارەکانەو بەردی بنچینەی ئەم رووداوەیە، کوتوپڕ لە خووە نەهاتوتە کایەوەو شتێکی نوێ‌و نادیاریش نی‌یە لە سروشت دا تا پێویستی بە خوداهێنان بێت لەگەل (شوینەواردا). بەلکو پاش هەمەجور هەلسەنگاندن و تاقی کردنەوەی سەختی شوینەوارو (هەلبژاردنی سروشتی)و گورینکاری وەبەرهەم هێنراوەو بە جورێکی ئەوتو کە هیچ گورینکاری‌یەکی تری تی‌دا بە پەسەند نازانرێت وە ئەگەر هات و گورانێك تی رووی‌دا ئەوا هەرگیز لە بەرژەوەندی خاوەنەکەی نابێت چونکە دووچاری هەمە جور کەم وکوری‌و پەشێوی دەکات سەرەرای زور جورە نەخوشی‌و ئازارو ئەشکەنجەو مردنی رەچەلەکیانە. خو ئەگەر بە بازدانێك وترا بەسوود، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە بێ زیانە چونکە وەك دەرکەوتووە بازدان (فرەروو) ە جا دوور نی‌یە لە روویەکەوە بەسوود بێت بەلام لە هەموو رووەکانی ترەوە نەك هەر بی سوود دەبێت بەلکو زیانیشی دەبێت، چونکە سوودو زیانی بازدان بە رادەی گونجاندن و راهاتنی‌یەتی لەگەل شوینەواردا، کە ئەمەش کارێکی ئاسان نی‌یەو وا زوو نایەتەدی بەلکو ماوەیەکی دوورو درێژی پێ دەچێت کە دوور نی‌یە سەدان یان هەزاران سالی بوێت بوئەوەی لە هەموو روویەکەوە گونجاوو لەبار بێت لە سروشت دا ئەو جورە بازدانانە کە لەژێر بارە سروشتی‌یەکان دا روودەدەن پێیان دەلێن (لەخووە بازدان) Spontaneous Mutation. چونکە باری سروشتی کارا ئاسایی‌یەکانی شوینەواری دەرو ناوی لەش دەگرێتەوە بە (زیندە هوکان)و Biotic Factors (نازیندە هوکانەوە) Abiotic Factors کە بەرەنجامی زیندە گورانەکان و Metabolism خوگونجاندن لەگەل شوینەوارو رەنووسی هایدروجینی (PH) و کاری ڤایروس و ژوورو کیدەکان و Peroxides ترشی نیتروزو Nitrous acid فورمالدهایدو Formaldehyde (هاوتاکانی) پیورین و - purine analogues تیشکە ئاسایی‌یەکانی خور وەك تیشکی ژوور وەنەوشەیی و Ultera Violet Light زوری تر کە بەردەوام کاردەکەنە رەچەلەکە ماددەکان و زور گرنگن لە بازدانیان دا، ئەگەرچی ئەم جورە بازدانە هێواش و لەسەرخویە بەلام رادەی روودانی لە تاکەکانی

(بەرەیەك) یان جۆرێك دا ناگۆڕرێت واتە جێ گیرە، کە ئەمەش زۆر گرنگ و کاریگەرە لە (پەرەسەندنی زنجیرەیی دا). کە بە درێژایی چەرخ لە نەوە بەرودوا هاتووەکان دا بەردەوام ڕوودەدات، بەڵام سست و لەسەرخۆیە، بۆیە هەست پێ کردنی ئاسان نی یەو چاودێری کردنیشی لە وزەی مرۆڤ بەدەرە. دەتوانرێت ڕاددەی لەخۆوە بازدان زۆر بکرێت بە بەکارهێنانی (هاندەران)[١٣] کە پێ یان دەڵێن (بازپێ دەران) Nutagenes کە گشت هۆ کیمیایی و فیزیایی و زیندە هۆیەکان دەگرێتەوە سەرباری هۆ سروشتی یەکان کە بە شێوەیەکی نائاسایی بەکاربهێنرێن، ڕاستەوخۆو کاریگەر کار لە ڕەچەڵەکە ماددەکان دەکەن و دەبنەهۆی جۆرە بازدانێکی تر کە پێی دەڵێن (بازدانی هاندراو) Induced Mutation کە لەوەی پێشوو خێراترو کاریگەرترەو ڕووداوەکانیشی ئاشکراو دیارەو دەتوانێت چاودێری بکرێت، بەڵام دەست نیشان کردنی زۆربەی بازپێدەرەکان و ڕێگەی کارکردنیان لەلایەن زانایانەوە ئەوە دەگەیەنێت کە لە داهاتوودا دەست بەسەر زۆربە، یان هەموویان دابگیرێت و هەر نەهێڵرێت ڕوو بدەن کە ئەمەش بە سوودێکی دروستی گەورە دەگەڕێتەوە بۆسەر مرۆڤایەتی بەسووك کردنی (باری (کۆڵ) ڕەچەڵەك Genetic Load و ئاڵۆزییەکانی و نەهێشتنی ڕەچەڵەکە مردن Genetic death و ڕزگاربوون لە زۆر جۆر نەخۆشی یە ڕەچەڵەك.

بازدان یان جینی دەبێت Gene Mutation یان کرۆموسۆمی Chromosomal Mutation بازدانی جینی تەنها ئەو دەنکۆڵە وردانە دەگرێتەوە کە لە شێوەی خاڵی تەڵخ دا لەسەر کرۆموسۆمەکان دەردەکەون پێ یان دەڵێن «دەنکۆڵەی کرۆماتینی Chromatin Granule یان بۆیەدارەکان chromomers (شێوە «١» ). کە هەر دەنکۆڵەیەك نموونەی جینێك یان چەند



شێوە (١)

جینێکە، هەر لەبەر ئەوەشە بەم جۆرە بازدانە دەوترێت «(پنتە) (خاڵ) بازدان» point Mutation. جینیش Gene کە بەرپرسیاری گواستنەوەی ڕەچەڵەکە (ڕوخسارەکان)و ڕێکخستنی چالاکی یەکانی خانەیە لە ڕووی پێکهاتنەوە لە ناوکە ترشی (D.N.A) بەدەرنی یەو هەر گۆڕانێك لە شێوەو پێکهاتنی ئەم دەنکۆڵانەدا ڕووبدات چەند بچووکیش بێت کاریگەری یەکەی بە شێوەیەکی نائاسایی ڕاستەوخۆ یان لە نەوەکانی داهاتوودا دەدەکەوێت، هۆ زۆرە بۆ ڕوودانی ئەم گۆڕانەو جۆری جیاوازیشیان هەیە، ئەو هۆیانەش وەکو:

١) ـ هۆ ناوخۆیی یەکان: Internal Factors

هەموو ئەو هۆیانە دەگرێتەوە کە شوێنەواری ناوەوەی خانەکان پێك دێنن و پەیوەندی ڕاستەوخۆیان لەگەڵ ڕەچەڵەکە ماددەکان دا هەیە کە جینەکانن. لەبەر ئەوە تێکچوونی ئەو شوێنەوارە بە کەم یان بەزۆر بە گۆڕانی هۆیەك بێت یان چەند هۆیەك، ئەو دەنکۆڵە کرۆماتینانە کاریان تێ دەکرێت و دەگۆڕرێن، جا ئەو گۆڕانە یان لە شێوەکەی دا دەبێت



شێوە (٢)

یان لە پێکهاتنەکەیدا، گۆڕرانی شێوەی ئەو دەنکۆڵانە کارێکی گرنگ دەکاتە سەر تێکچوونی (زیندە ـ گۆڕرانەکانی خانە) Cell Metabolism. چونکە دەنکۆڵە کرۆماتینەکان کە نموونەی جینەکانن بەئاسایی لە دووباردا بە دوو شێوە دەبینرێن (شێوە ـ ٢ ـ) هەر شێوەیەك رۆڵێکی تایبەتی هەیە لە دیاریکردنی چالاکییەکانی خانەدا:

أ ـ کرۆماتینی راستەقینە: Euchromatine

لەم بارەدا لوولپێچە هاوجووتەکەی D.N.A ی ناوی کراوەو خاوو درێژ و رەنگ کاڵ دەبێت، جینیش بە دەستەڵاتەو دەتوانێت دەست بەسەر چالاکییەکانیدا بگرێت و رێکیان بخات.

ب ـ کرۆماتینی (ناچوونیەك) Hetero chromatine

ئەم بارەدا لوولپێچە هاوجووتەکەی D.N.A کرژ و کورت و داخراوو رەنگ تەڵخ دەبێت، جینیش لەم بارەدا سست و بێتوانا دەبێت و ناتوانێت دەست بگرێت بەسەر رێکخستنی چالاکییەکانیدا.

گۆڕرانی ئەم کرۆماتینانە لە شێوەیەکەوە بۆ شێوەیەکی ترو کرژ بوون و خاوبوونەوەی لوولپێچە هاوجووتەکەی D.N.A ی ناویان لەخۆوە نابێت، بەڵکو لەژێر دەسەلاتی دەزگایەکی تایبەتیدایە، کە بە پێی خواست و پێویستی لەش کاردەکات، بۆیە هەندێك جین هەر لە زووەوە لە قۆناغەکانی کۆرپەلەوە کرژدەبن و دەچنە باری سستییەوەو لەکاردەکەون و چالاکییان نامێنێت، هەندێکیشیان بەپێی پێویست کرژ و خاو دەبنەوەو هەندێکیشیان هەمیشە خاون و چالاکی دەنوێنن، جا ئەگەر هاتوو یەکێك لەم جینانە لەژێر باری گۆڕرانی شوێنەوارەکەی دەوروبەریدا کوتوپڕ تێك چوو و گۆڕرا بۆ شێوەکەی تری، ئەوا کارەساتێکی ترسناك دەنێتەوە، کە چارەسەرکردنی ئاسان نییەو هەندێ جار مردنی لەدوایە، وەك هەندێك نەخۆشی رەچەڵەکە شێرپەنجە، کە لە ئەنجامی گۆڕانی دەنکۆلەیەکی کرۆماتینییەوە دەبێت لەبارێکەوە بۆ بارێکی تر، بەتایبەتی گۆڕرانی کرۆماتینی ناچوونیەك بۆ کرۆماتینی راستەقینە واتە گۆڕانی جین لەباری سستییەوە بۆ باری چالاکیو کارکردن، کە بە زۆری لەشێوەی نەخۆشییەك دا سەرهەڵ دەدات پێی دەڵێن: شێرپەنجە. هۆی ئەم گۆڕرانەش بەزۆری ڤایرۆس دەبێت، یان هەندێك جار ئەو هۆیانەی کاردەکەنە ناوەندەکە، کە بەشێك پێك دێنێت لە شوێنەواری ناوەوەدا، دەبنە هۆی گۆڕینی سیفەتەکانی وەك خەستییەکەیو رادەی ماددە پێکهێنەرەکانیو رەنووسی هایدرۆجینی (PH) و زۆری تر.

٢) ترشی نیترۆز: - Nitrous acid - HNO2

گرنگی ئەم ترشە لە بازپێدان دا دەگەڕێتەوە بۆ توانای کارکردنی لە (پیورینەکان) و Purines ( پیریمیدینەکان) Pyrimidines بەگۆڕینی کۆمەڵەی ئەمینی ( NH2 - ) بۆ کیتۆنی (C - O ) کە بەمەش تفتە




شێوە (٣)

نایترۆجینییەکان) لە شێوەیەکەوە دەگۆڕێن بۆ شێوەیەکی تر یان بۆ ئاوێتەیەکی هاوتای ئەم تفتانە، وەك گۆڕینی سایتۆسین Cytosine بۆ یوراسل Uracil بە گۆڕینی کۆمەڵەی « NH2 - » ی سایتۆسینەکە. هەروەها گۆڕینی ئەدینین Adenine بۆ تفتێکی نائاسایی کە پێی دەڵێن هایپۆزانثین Hypoxanthine کە لە رەفتاردا لە گوانین Guanine دەچێت، بۆیە لەگەڵ سایتۆسین دا جووت دەبێت لەجیاتی ثایامین Thymine (شێوە ٣ ـ). کاری ئەم ئاڵوگۆڕە لە داهاتوودا لە ئەنجامی دووهێندە بوون و Duplication (لەبەرگرتنەوە) Transcription ی هەمیشەیی ناوکە ترشەکان لە نەوە دوایەدواکان دا لە شێوەی بازدانێکی رەچەڵەکیدا دەردەکەوێت، بە رێگەیەك کە پێی دەڵێن گواستنەوە Transition واتە گواستنەوەی تفتێکی نایترۆجینیو دانانی جۆرە تفتێکی نایترۆجینی تر لە شوێنی، وەك گواستنەوەی سایتۆسین و دانانی ثایامین لە شوێنی (C T) لەباری




شێوە (٤)

لەباری دووەم دا (شێوە - ٤ -). دووبارەبونەوەی هەمیشەیی ئەم کارە لە ئەنجام دا دەبێتە هۆی تێکدانی تفتە نایترۆجینی یەکانی ناو ناوکە ترشەکە، کە بنچینەی ڕەچەڵەکە زانیاری)و[٢٠] روخسارەکانن، بۆیە لە هەندێك نەوەدا بە شێوەیەکی نائاسایی لە تووش بووەکە دیاری دەدات.

٣) (تیشکی ژوور وەنەوشەیی)[٢١] Ultra Violet light ئەم تیشکە یەکێکە لە پێکهێنە ئاسایی یەکانی دەودوبەر، کە پیورینەکان Purines و پیریمیدینەکان Pyrimidines بەتوندی دەیمژن و بە درێژی شەپۆلێك کە (٢٦٠) نانۆمەترە، جا بە مژینی ئەم تیشکە، تفتە نایترۆجینەکان دەوورۆژێن Excited چونکە ئەلەکترۆنەکانی گەردیلەکانیان وزەیەکی زۆر وەردەگرن و بەو هۆیەوە توانا پەیدادەکەن بۆ جێ گۆرکێ بە ڕێگەی خزاندنی تۆتۆمیری Tautomeric shift بۆ بارێکی تۆتۆمیری تری نائاسایی نەسرەوت کە هۆیەکە بۆ زۆرکردنی ڕاددەی بازدانی جینی. بەردەوام کاری ئەم تیشکە لە ناوکە ترشەکان و بەتایبەتی لە D.N.A بارێکی نائاسایی ڕوودەدات کە پێی دەڵێن: دووانە پیریمیرین Pyrimidine Dimers بە دروست بوونی بەندی کیمیایی لەنێوان تفتە نایترۆجینە هاوسێکان داو بەتایبەتی ثایامینەکانی تەنیشت یەك لە زنجیرەیەکی D.N.A دا، ئەم پێکهاتووە دوو گەردیلەیی یە بە پچراندن و دوورکەوتنەوە لە پیورینەکانی بەرانبەریان لە زنجیرەکەی تری D.N.A دا بەرەو




دەرەوە دەخزێن (شێوە - ٥ -). بەمەش ڕژێمی لوولپێچە هاوجووتەکەی D.N.A تێك دەچێت، لەلایەکی تریشەوە ئەم جووتە پیریمیدانە سست و ناچالاکن و مانەوەشیان کوشندە دەبێت، بەڵام لە زۆربەی باردا ئەم ڕووداوە بەردەوام نامێنێتەوە، بەڵکو دەگێڕرێتەوە سەر دۆخی جاران، ئەویش بەهۆی ئەو ڕژێمە بەرگری یانەوە کە لە لەش دا هەن وەك:

أ/ (ڕژێمی بەتیشك هاندان)[٢٢]

ب/ (ڕژێمی لەبریدانان (گێڕانەوە بە لەبن هێنان) Excision Repair System

أ - دەسەڵاتی ڕژێمی تیشکەهاندان دەگەڕێتەوە بۆ ئەنزیمێك پێی دەڵێن ئەنزیمی بەتیشك هاندان Photoreactivation Enzyme، کە چالاکیو کارکردنی لەگەڵ تیشکی بینراو دایە، لەبەر ئەوە لە تاریکی دا سست و ناچالاکە، چونکە بە مژینی وزەی تیشکی خۆر چالاك دەبێت و توانا پەیدادەکات بۆ جیاکردنەوەی ثایامینەکان Thymines لە دووانە پیریمیدنیەکان داو گەڕانەوەیان بۆ باری ئاسایی و ڕێکخستنەوەی زنجیرەکانی ناو ترشی D.N.A و ڕزگارکردنی لەو زیانە (شێوە - ٦ -). ئەو کەسانەی کە ڕەچەڵەکە نەخۆشی پێستی بی بۆیەیانە Pigmintosum Xero derma ئەنزیمی تیشکە هاندەریان زۆر کەم دەبێت، بۆیە پێستیان تووشی هەستیاری یەکی زۆر دێت کە خۆیان دەدەنە بەر تیشکی خۆری ئاسایی چونکە تیشکی ژوور وەنەوشەیی یەکەی خۆر کاریان لێ دەکات.

ب - دەستەلاتی ڕژێمی «لەبری دانان» واتە (چاککردنەوە بە لابردن)[٢٤] لە هاوکاریی چەند ئەنزیمێك دایە کە دەتوانن لە تاریکیش دا کاربکەن و زۆربەی ئەو هەڵانە ڕاست بکەنەوە کە لە ڕیزبوونی (نیوکلوتیدەکاندا)[٢٥] Nucleotides ڕوودەدات لەکاتی دوو هێندە بوون و لەبەرگرتنەوەی ناوکە ترشەکان، ئەویش بە لێکردنەوەی پارچە چەوتەکەو فڕێدانی و دانانی پارچەیەکی ڕاست لە شوێنی، بە یاریدەی ئەنزیمی «پولیمیریز Polymerase» کە شوێن هەڵەکە دیاری دەکات لە زنجیرەکەداو دوابەدوای ئەم ئەنزیمی ئیندونیوکلیز Endonuclease ئەو پارچەیە لەلایەکەوە کەل دەکات. ئینجا ئەنزیمی (لابردن Exonuclease) دەست دەکات بە هەرس کردنی ئەو پارچە چەوتە لە



شوێنــە کەل کراوەکـەوە، پـاشـان دەوری ئەنـزیمی پولیمـیریـز دیت بەدیاری کردن وریزکردنی نیوکلوتیدی گونجاو لە شوێنی نیوکلونیدە چەوتـە فرێدراوەکـان. پاشـان ئەنـزیمی لایگێـز Ligase ئەم سەرو ئەو سەری پارچە تازەکە چەسپ دەکات بە زنجیرەکەوە لە شوێنی پارچە چەوتە (هەڵە) لابراوەکە (شێوە - ٧ -). بەم شێوەیە دەبینین چەندین دەزگاو ئامێرو رژێم هەن کە بەردەوام کاردەکەن بۆ بەرژەوەندی ئەش بە پاراستنی رەچەڵەکە ماددەو بەردەوامی مانەوەی (گەردوونی رەچـەڵـەك)[31] بە چاك کردنـەوەی زۆربـەی ئەو زیـان و هەڵانـەی کە تووشی ناوکە ترشەکان دێن، لە ئەنجامی کاری سروشتەوە بێت یان بە بەکارهێنانی ماددە بازپێدەرەکان. چونکە مانەوەی ئەو ناوکە ترشانە بەو هەڵانەوە دەبنە هۆی روودانی چەندەها کارەساتی سامناك.

## سەرچاوەکان


1- Gardner E.J. principle of Genetics, 5th edition 1975, John wiley and sons. Inc.

2- Harold A. Harper. phd of physiological chemistry 15th Edition 1975. Los Altos california.

3- ARTHUR H. DouTHWAiTe. M.D.,F.R.C.P,Index of Differential Diagnosis Bristol:John wright and sons LTD.

٤- هـربرت. هينجر. الوجيز في الكيمياء الحياتية، ترجمة الدكتور قصي عبدالقادر الجلبي. ١٩٨٢، وزارة التعليم العالي.

٥- عباس احمد الصالح، د. عبدعلي الحسناني، الوراثةوالسلوك الطبعة الاولى ١٩٨٣، مطابع جامعة الموصل

٦- الدكتور محمد سعيد هاشم، اليات التطور، الطبعة الاولى ١٩٨٦

٧- الدكتور فيصل عبدالقادر السكري. بناء البروتين في الخلية الحية، الطبعة الاولى ١٩٨٦، مطابع وزارة التربية

٨- الدكتور حسن علي الحلمي، الوراثة الخلوية للانسان، الطبعة الاولى

٩- الدكتور عبد العظيم صنضوي، د. علي حامد محمد. اساسيات علم الوراثة، الطبعة الاولى - ١٩٦٣


پەراوێزەکان:

---

١ - گۆرِرانە رەچەڵەکی یەکان: التغیرات الوراثیة: (داوای لێ بوردن لەنـووسـەری ئەم لێکـۆڵینـەوەیـە دەکـەین کە زاراوەی (بـۆمـاوە)مان بە (رەچەڵەك) گۆری چونکە لە زاراوە سازیدا وشەیەك لەرستەیەك باشترە و ئەم وشـەیـەش لە سەلـیـقـەی زمـانـەوەو لە کاکـڵی مەبـەستی زانستی یەوەش هەر لە بۆماوەکە نزیکترە) - روشنبیری نوێ -

٢ - بازدان - الطفرة - Mutation

٣ - رەچەڵەکە ماددە: المادة الوراثیة

٤ - شوێنەوار: البیئة

٥ - هەڵبژاردنی سروشتی: الانتخاب الطبیعي

٦ - فرەروو: متعددة الاوجه

٧ - لەخۆوە بازدان: الطفرة التلقائیة Spontaneous Mutation

٨ - زیندە هۆکان: العوامل الحیاتیة

٩ - نازیندە هۆکان العوامل اللاحیاتیة

١٠ - هاوتاکان: النظائر Analogues

١١ - بەرە: سلالة

١٢ - پەرەسەندنی زنجیرەیی: التطور التسلسلي

١٣ - هاندەر: المحفز - المستحث

١٤ - بازپێدەر: المطفر Mutation

١٥ - بازدانی هاندراو: الطفرة المستحثة Iinduced

١٦ - بار - ئەرك: الحمل

١٧ - پنت: النقطة point

١٨ - رەچەڵەکە روخسار: الصفات الوراثیة

١٩ - D.N.A بریتی یە لە ناوکەترشی رایبی ئۆکسجین کەم Nuclic Acid

٢٠ - زیندە گۆرِرانەکانی خانە: التحولات الحیویة للخلیة

٢١ - ناچوونیەك: المتباین

٢٢ - پیورینەکان purines: جۆرێکن لەتفتی نایترۆجینی دووبازنەیی کە بەشداری دەکەن لەپێکهاتنی ناوکەترشەکان دا وەك ئەدینین Adenine و گوانین Guaninc

٢٣ - پیـریمیـدینـەکان: Pyrimidines: جۆرێکن لەتفتی نایتروجینی یەك بازنەیی کەبەشداری دەکەن لەپێکهاتنی ناوکەترشەکان دا وەك ثایامین Thymine و سایتوسین Cytosine و بوراسل Uracil

٢٤ - تفتە نایترۆجینی یەکان: القواعد النیتروجینیة Nitrogene base

٢٥ - لەبەرگرتنەوە: الاستنساخ

٢٦ - رەچەڵەکە زانیاری: المعلومات الوراثیة

٢٧ - تیشکی ژوور وەنەوشەیی: الاشعة الفوق البنفسجیة Ultra Violit light

٢٨ - رژێـمی بەتیشـك هانـدان: نظـام التحفیـز الضـوئي photo Reactivatio System

٢٩ - چاککردنەوە بەلابردن: الاصلاح بالاستئصال

٣٠ - نیوکلۆتیدەکان Nucleotides: بریتی یەلەیەکەی بنچینەیی پێکهاتنی ناوکـە ترشـەکـان کە لە تفتیکی نایتـروجینی و کۆمـەڵـەیەکی فوسفەیتی وشەکرێکی پێنج کاربۆنی پێك دیت

٣١ - گەردوونی رەچەڵەك: الکون الوراثي

# الملخص العربي

عبدالرحمن حمه چاوەش

# الطفرة الجينيه

الطفـرة الجينيـة او النقطية Cene Mutation Or Point Mutation ان جميع التغيرات الوراثية الظاهرة او الكامنة التي تحدث في الكائن الحي تأتي نتيجة لعملية بايولوجية تسمى بالطفرة Mutation بالرغم من ان اكثرية الطفرات تحدث تلقائياً وبواسطة العوامل الطبيعية.

ولكن تؤدي في الغالب الى امراض جسدية واضطرابات نفسية لحامليها من الكائنات الحية، وقد تؤدي الى الوفاة احياناً.

ان المـادة الـوراثيـة (DNA) التي هي الاساس في نقل الصفات الـوراثيـة من جهـة وتنظيم الفعاليات الحيوية من جهة اخرى، لم تأت الى الـوجـود فجأة بل انهـا مرت بكثيـر من الاختبارات البيئية وتعـرضت لكثيـر من التغيـرات البيئية المختلفة، الى ان اصبحت متكيفة للبيئة.

وان الطفـرات التلقـائيـة التي تحدث نتيجة للعمليات الحيوية الاعتيـاديـة او نتيجـة للتفاعل مع البيئة، تتميز بانها تحدث بمعدل ثابت في السـلالـة الـواحـد او النـوع الواحد من الكائنات الحية. ولكن يمكن زيـادة هذا المعـدل باستعمـال مواد معينـة تسمى بالمطفـراتMutagens وهـذا النـوع من الطفرات تسمى بالطفرات المستحثة او المحفزةInduced Mutation .

ان تشخيص العوامل المسببة للطفرات والاستمرار في دراستها قد تؤدي الى السيطـرة عليهـا ومنـع حدوثهـا مستقبـلاً والذي يعود بفائدة كبيرة على الانسانية جمعاء، والطفرة انواع منها:

١. كروموسومية Chromosomal Mutation

٢. جينية Gene Mutation

والنوع الثاني هو مدار بحثنا حيث يصيب المادة الوراثية D.N.A وبمـا ان الجين هو الجـزء الاساس والفعال من هذه المادة فان اي تغير يحصل في تركيبها او شكلها يؤدي الى حدوث طفرة وراثية قد تظهر على الفرد او تبقى كامناً فيه ويظهر تأثيرها على الافراد في الاجيـال القـادمـة. وهناك عوامل مختلفة تؤثر على المادة الوراثية وتغير الجين وتسبب الطفرات الوراثية، منها:

١. العوامل الداخلية Internal Factors

٢. حامض النتروز Nitrous acid

٣. الاشعة الفوق البنفسجية Ultera Violite light

وهنـاك في داخـل الجسم انظمة وقائية تعمل على التقليل من تأثير هذه العوامل وخطورتها منها:

أ. نظام التحفيز الضوئي Photo Reactivation System

ب. نظام الاصلاح بالاستئصال Excision Revair System

# گرنگیی بۆچوون و کۆی بیروڕا ئابووری یە یۆنانی یەکانی سەدەکانی کۆیلایەتی و ڕەنگدانەوەو پاشماوەی ئەو بیرانە لە قوتابخانە ئابووری یە هاوچەرخەکان دا

دکتور محمد فاضل قەفتان زانکوی سەلاحەدین

## پیشەکی :

هەر کاتێك بینە سەر مێژووی دەست نیشانکردنی هەڵهاتنی «بیری ئابووری» لە تیکڕای کاروانی ئابووری دا، ئەوا یەکسەر قوتابخانەی فیزیوکراتەکان و کلاسیکی یەکان و لەوانە قوتابخانەکەی «ئادەم سمیث»مان دێتەوەیاد.. ئەو قوتابخانانەی کە بە بەردی بناغەی «زانستی ئابووری» دەژمێررین.. بەڵام، ڕاستریش لەمە ئەوەیە کە نەك تەنیا بەو قوتابخانانەوە بوەستینەوە بەڵکو دەبی بگەڕێینەوە بوسەرچاوەی ئەو بیرە ئابووری یانەو لێرەدا دەبی پەنابەرینە بەر ڕاو بیرە ئابووری یە کونەکانی پیش زایین و بەتایبەت بیرە ئابووری یە یونانی یەکان کە لەکەلە فەیلەسوفەکانی - ئیفلاتون و ئورستو ئەکزینفون - دا کوبونەتەوە.. و ئەوەی لێرەدا شایانی باسەو ڕوونە لای هەمووان ئەوەیە کە زوربەی ئەو دیاردە ئابووری یانەی سەدە بەسەرچووەکان، هیشت هەمان دیاردەن لە ژیانمان دا کە بەردەوام دووپات دەبنەوەو، ئەو بیرانەی تەفسیری ئەو دیاردانەیان کردوە، هیشتا ماوون و بەسەرنەچوون و هەردەم کاریگەری یان بەردەوامە بو سەر کومەڵگاکانی ئەم چەرخ و سەدەیەمان..

مەبەست لەم باسەمان، خستنە ڕووی ئەو بیروڕا ئابووری یانەی ئەوانە، کە کاریگەریی خویان بەخشیوە لە پتەوکردنی بیرە ئابووری یەکانی سەدەکانی پاش خویان و ئەو بیروڕایانە لەو کاتەوە تا ڕوژانی ئەمرومان بەردەوام ڕژاونەتە یەك گوم و سەرچاوەو هەموو کومەڵگاکانی ئەو سەدە بە دوای سەدانەدا خوراکی بیرو هوشمەندی یان لەو سەرچاوەو کانیانەوە هەڵ هینجا وە..

کەواتە دان نان بە کاری بیرکەرەوەکانی سەدەکانی پیشوو، هەمیشە کاریکی ڕاستەو نابی لە توژینەوەو کولینەوە لەباری ئابووری یان کومەلایەتی یان هەر بوارو باریك لە بوارو بارەکانی تری ژیان پشت گوی بخەین یان ببین بەجاریك کاریگەری یان لە میژووی کاروانی بیری ئابووری دا پووچ بکەینەوە..

بو ئەم مەبەستە، باسەکە کراوە بە چەند بەشیکەوە:

- بیری ئابووری لەنیو سەدەی ڕژیمە کویلایەتی یەکان دا..
- بیری ئابووری لە باوەشی فەلسەفەدا..
- ئیفلاتون (٤٢٨ - ٣٤٨ پ. ز).
- ئورستو (٣٨٤ - ٣٢٢ پ. ز).

- ئەگزینفون (٤٢٥ - ٣٥٢ پ.ز).
- هەلسەنگاندنێکی بیرە فەلسەفی یە یونانی یەکان کە هەندێ لە ڕا ئابووری یەکانیانمان بۆ بە دەستەوە دەدات..
- ئەنجامی باسەکە..

## (بیری ئابووری) لە نێو سەدەی ڕژێمە کۆیلایەتی یەکان دا..
## - بیرە ئابووری یەکانی پێش سەدەی زانست -

### ١ - گرنگیی بیرە ئابووری یەکانی ئەم قۆناغە مێژوویی یە:

سەبارەت بە گرنگی و بەهای بیری ئابووری لە کوی ئەدەبی ئابووری دا، لەم قۆناغەداو بەتایبەت (سەبارەت بە کۆمەڵگای یونان واتە (گریکەکان) و کاریگەری یان بۆ سەر گەشەکردنی بیری ئابووری پاش خۆیان دوو بۆچوون هەن:

یەکەم: بۆچوونێکی پەسەندنەکراوو دان نەنان بە دەوری ئەو بیرە ئابووریانە کە ئەم ڕایە دووپاتی (نەبوونی) ئەوە دەکات کە گوایە هەرگیز هیچ بیرێکی ئابووری گرنگ و کاریگەر نەبووبێ لەو سەدەیەداو تەنانەت لە نێو یونان خۆیشی دا، بۆ نموونە (جید) و (ریست): [مێژووی مەزاهیبە ئابووری یەکان] هەردوکیان لێکۆڵینەوەکانیان سەبارەت بە (بیری ئابووری) دەست لێکۆڵینەوەکانیان سەبارەت بە (بیری ئابووری) دەست پێ دەکات لە قوتابخانەی فیزیۆکراتەکانەوەو ئەو لێکۆڵینەوانەی هەبوو بن پێش ئەم قوتابخانەیە، هەمیشە پشت گوێیان خستووەو دانیان بە بوونی دا هەرگیز نەناوە، هەروەها هەمان ڕاش سەبارەت بە (کانان Cannan) کە ئەمیش هەمان ڕای ئەو دووانەی پێشو - جیدو ریست - ی هەبووە..

دورنگ هەرگیز دان نانێ بە گرنگی و دەوری (بیری کۆن و ناوەڕاست) دا واتە «بیرە یونانی و ڕۆمانەکان» و بەڵکو پێش ئەوانیش و لەکاروانی زانستی ئابووری دا هیچ بایەخێکیان پێ نادات..

شۆمپیتەریش هەروەك ئەوان پێ شێلی کاریگەری ئەو دوو قۆناغە گرنگە دەکات لە مەسەلەی گەشەکردنی تیوری یە ئابووری یەکان دا[١]

بەڵام، بەپێچەوانەی ڕاکانی ئەو کۆمەڵانەی سەرەوە، چەندین بۆچوون و ڕای کە هەن کە زۆر بە ڕێزەوە دەڕوانن کاریگەری بیرە کۆنەکان و بەتایبەت (بیری یونانی) سەبارەت بە گەشەکردنی بیرە ئابووری یە نوێیەکان و هەمیشە دووپاتی ئەوە دەکەنەوە کە گەر ئەو بیرە کۆنانە نەبوونایە هەرگیز زۆرەها بیری نوێ تر پاش ئەمان نەدەخولقا و نەدەهاتەدی و، لەوانەش بۆ نموونە: هانی کە مامۆستایەکی بیری ئابووری ئەمریکی یە، لە پەڕاوەکەی لەژێر ناوی (مێژووی بیری ئابووری ١٩٤٧) و لە بەشی چوارەمی ئەو پەڕاوەی دا، دەڵێت کە: (بیری یونانی کاریگەری یەکی تەواوی هەبوو بۆ سەر گەشەکردنی مەزاهیبە ئابووری یەکان، هەروەها دەڵێت کە (ئیفلاتون) یەکەم کەس بووە کە تەفسیری ئابووری مێژوی) کردووەو هۆی (بوونی دەوڵەتی) بۆ هەمەجۆرو هەمەچەشنی پێداویستی یەکانی مرۆڤ گەڕاندوتەوە کە هەرگیز مرۆڤ و مرۆڤێکی بە تەنیا ئەو کارە هەرگیز بەئەنجام ناهێنێت..

هەروەك مامۆستا ئیبراهیم کبە لە پەڕاوەکەی لەژێر ناوی (مێژووی لێکۆڵینەوەی ئابووری و بیری ئابووری - ١٩٧٣ لە لاپەڕە ٣٨٦دا سەبارەت بە باسی سەرەوەو لەژێر ناوی «بۆچوونێکی ڕاست»دا دەڵێت: کە تیوری ئابووری زانستی و بە مانایەکی نوێ هەرگیز نەهاتوتەدی تا پاش دانانی «بنەڕەتەکانی ڕژێمی سەرمایەداریی پیشەسازی» واتە پاش سەدەی هەڵهاتنی شێوازێك کە پێی دەوترێ (مانیفەکتورا) ئەوەش لە کۆتایی سەدەی هەڤدەو سەرەتای سەدەی هەژدە، لەبەر ئەوە، ئەو تیوریانە ڕەنگاوی ڕاستی یەکی ماددی ئەو ڕژێمە ناوبراوەن..

بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دەڵێت کە: بیرکەرەوەکانی قۆناغی کۆیلایەتی و بەتایبەت بیرەکانی لای فەیلەسووفە (یونانی و چینی یەکان) کە لە چەند ڕست و واتای ئابووری دا کۆبوبونەوە، ئەوانە تیکڕا ڕەنگاوی هەندێ لە مەرجە ماددی یەکانی ڕژێمی بەرهەمهێنانی شمەکی بچوك - واتە (بەرهەم بۆ بازاڕ) - داوەتەوەو مەبەستیکیان لەوەدا داوە بەدەستەوە.. ئەو دیاردەیەش کاتێ دەرکەوتووە کە (خاوەندارێتی تایبەتی هۆکارەکانی بەرهەم و دابەشبوونی کار..) لای یونانی یەکانی ئەو سەدەیە گەشەیان کردووەو ئاڵوگۆڕو گۆڕینەوەی نێو بازاڕەکان و بەکارهێنانی پارە بۆ ئەو مەبەستانە سەری هەڵداوەو گەشەیان کردوە..

جا ئەو تیوریانەو ڕاستر لەوەش بڵێین، ئەو ڕا ئابووری یە (یونانی) یە یان (چینی) یانە لەڕاستی دا چەندین خاڵی بنەڕەت و بنکەی پشکووتنی تیوری یە ئابووری و کۆمەڵایەتی یە نوێیەکان بووە.. چونکە ئەو ڕایانە هەمیشە یەکەم هەوڵێکی سەرەتایی بووە سەبارەت بە ڕاست بوو نەوەیان - واتە تەقینەوەیان - بە ڕووی گیروگرفتی ئابووری و کۆمەلایەتی یە خولقاوەکانی سەرەتای دروست بوونی ئابووری یەکی (شمەکی) و (نەختی) (×) کە ئەوانە بەش بەحاڵی خۆیان ئەو مەنگی و تەسکی و داخراوی یە کۆمەڵایەتی و ئابووری یەیان شکاندوە...[٢]

واتە، ڕژێمی کۆمەڵگا سەرەتایی یە کۆنەکانی ئەوسایان شکاند کە لەوەوپێش ئەو ڕژێمە گیروگرفتی ئابووری یان نەزانیوە چی یە!! و ئەوەی لێرەدا شایانی باسە، سەبارەت بە گرنگیی دەورو ڕۆڵی بیری بیرکەرەوە کۆنەکان و بەتایبەت فەیلەسووفە یونانی یەکان، وەلامەکەی مارکسە کە

ناردوویەتی بۆ (دورنگ) کە ئەمی دووەمیان بەجارێك دەوری ئەو بیرە کۆنانەی بی‌بایەخ و بی پیز کردووەو بەلام مارکسیش لێرەدا «دووپاتی ئەوە دەکاتەوە کە بیرە کۆنەکانی ئەوانە، لەرووی مێژوویی‌یەوە بنکەیەکی تیوریی زانستی نوێیە..».

هەرچەند کۆمەڵگای سەرەتایی (خێڵەکی) هەندێك بیری تەکنیکی سەبارەت بە پڕکردنەوەی پێداویستی‌یە ئابووری‌یەکانی مرۆڤی هێناوەتە بەرهەم (.. بەپیتی زەوی، گۆڕینی کەژەکان.. هتد) بەلام گیروگرفتێکی ئابووری نەختوتە ڕوو، چونکە کارو کرداری بەرهەم و چارەنووسی دەستکەوتەکانی لەژێر دەستەلاتی بەرهەمهێنەرەکەدا بووە، بۆیە هەرگیز لەم قۆناغەدا بیری ئابووری بە واتایەکی پڕ بە پڕ دەرنەکەوتووە.. بەلام لەکاتی گواستنەوەی کۆمەڵگای سەرەتایی بۆ کۆمەڵگەیەکی چینایەتی کە لە ئەنجامی (دەرکەوتنی خاوەندارێتی تایبەتی هۆکارەکانی بەرهەم دا) و بە دەستهاتنی (ڕژێمی بەرهەم بۆ بازاڕ)و (ڕژێمی ئاڵوگۆڕی) بەرو بووم و بەرهەمەکانیان هاتەکایەوە، هەروەها ون بوونی دەستەلاتی دەوری بەرهەمهێنەر بۆ سەر کرداری بەرهەم و گۆڕینەوە، چەندین بارو دۆخی ماددی پەیدا بوو بۆ ئەوەی چەندین بیری کۆمەلایەتی‌و ئابووریی لەدایك بن کە ڕەنگاوی ئەو بارو زروفە تایبەتی‌یەی خۆیان بدەنەوە، و تەفسیری دروست بوونی ئەو کۆمەڵگایەو بنەڕەتی ئابووری‌یەکان دەرکەوێت.. ئەم دیاردانەش بە شێوەیەکی کارەکی لە کۆمەڵگاکۆنەکان دا ڕوویدا کە لە ناوئاخنی‌دا چەندین بیرو ڕایان تیا خولقا، کە لەمەودوا و لە شوێنی خۆی‌دا باسیان دەکەین

## بیری ئابووری لە باوەشی فەلسەفەدا:

ئەوەی پێش هەموو شتێ سەرنجمان ڕادەکێشێ ئەوەیە کە بیری ئابووری لە سەدە کۆنەکان و سەدەکانی ناوەڕاست دا کە دوو قۆناغی مێژووی دوورو درێژی پێش قۆناغی سەرمایەدارین، هەرگیز ئەو بیرانە بوونێکی سەربەخۆی بەخۆوە نەدیوە، بەڵکو هەردەم لە باوەشی چەند قوتابخانەیەکی بیری تردا خۆیان مەلاس داوە، وەك بیری ئابووری لە (ناوئاخنی فەلسەفەیی یۆنانی)دا یان لە ناوەڕۆك باوەشی (بیری لاهوتی) سەدەکانی ناوەڕاست دا لە ئەوروپا یان لە باوەشی لێکۆڵینەوە (مێژوو فەلسەفەی مێژوو) لای بیرکەرەوە ئیسلامی‌یە عەرەبیەکانی سەدەی چواردەدا [٤]

لە سەدەی یۆنانی‌یەکان دا بەتایبەت لای (ئیفلاتون ٤٣٧ ـ ٣٤٧ پ.ز، ئۆرستو ٣٨٤ ـ ٣٢٢ پ.ز) دەبینین بیری ئابووری لە باوەشی فەلسەفەدا بووەو ڕابەری ئابووری بەشێکی جیانەبووەوە بوە لە کۆی فەلسەفەی گشتی دەوڵەت و کۆمەڵ داو بیرەکانی ئەماز لە سەدەکانی پێنج و چواری پ.ز دا هەمیشە ڕەنگاوی کات و سات و دۆخی تایبەتی وڵاتی یۆنانی بەگشتی‌و ئەثینا بەتایبەتی داوەتەوە.. لەڕووی باری ئابووری‌و چالاکی کشتوکاڵی‌و سەبارەت بە یەکەی بەرهەمهێنان لەو بوارەدا یان چالاکی‌یە پیشەیی‌یەکان و کاری کۆیلە لە کانەکان و دەرهێنانی کانزاکان یان سەبارەت بە تەرکیبی چینایەتی کۆمەڵگای یۆنانی‌و دەوری بێگانەکان لە وڵاتی یۆنانی ئەوسا لە بواری بازرگانی‌دا.. واتە کۆمەڵگای یۆنانی‌و بەتایبەت لە سەدەی پێنجەمی پ:ز.دا کۆمەڵگایەکە بنەڕەت بوە لەسەر کاری کۆیلایەتی‌و لەسەر ئەوان وەستاوە، هەرچەندە کە هەندێ لە مێژوو نووسەکان دەیانەوێت گرنگیی دەوری کۆیلایەتی لە (کۆمەڵگای یۆنانی کۆن)دا کەم کەنەوە، کە گوایە ئەوان بنەڕەت و بناغەیەکی کۆمەلایەتی‌و سەرەکی نەبوو بن..

ئا لەم کۆمەڵگایەدا (بیری ئابووری) لە باوەشی فەلسەفەدا دەبینینەوەو ئەو بیرانە زیاتر سەبارەت بە گیروگرفتی دیاردەکانی تێکرای ژیانی خەڵکانی ئەوسا دواوەو بیری ئابووری ئەوساش هەر لە خزمەتی ڕامیاری‌دا بوە.[٥] ئەمەو سەبارەت بە بیری یۆنانی‌و بنەڕەتی ماددی ئەم بیرە ڕوخاندنی کۆمەڵگای خێڵەکی‌یەکەیەو گواستنەوەی ئەو کۆمەڵگایە بۆ کۆمەڵگایەکی کۆیلایەتی چینایەتی.. کە دەرکەوتنی خاوەندارێتی زەوی‌و دابەشکردنی کارو ئاڵووگۆڕ، بوونە هۆی دەرکەوتنی ڕژێمێکی ئۆروستۆکراتی زەوی‌و بەتایبەت لە دەوڵەتی شارە یۆنانی‌یەکانی سەدەی هەشتی پ.ز. داو لەو کاتەشەوە شێوازی کشتوکاڵ کردنێکی داخراو سەری هەڵدا، کە وردە وردە دەستی بەوە کرد کە پشت ببەستێ بە بازاڕەوەو لە ئەنجامی ئەوەش دا وردە وردە خاوەندارێتی لە کشتارە سەربەستەکان ـ واتە خاوەندارێتی زەوی‌و هۆکارەکانی بەرهەم ـ سەنرایەوەو ئەو دەستەو کۆمەڵە کران بە «کۆیلە».. ئەوەی شایانی باسە.. ئەوەیە کە فەلسەفەی یۆنانی، لەناو ئاخنی‌دا ڕەنگاوی ئەو بارو نارێکی‌یە کۆمەلایەتی‌و ئابووری‌یەی خۆی دەداتەوە کە لە نێو چینەکانی کۆمەڵگا یۆنانی‌یەکەدا ڕووی دەدا، بە تایبەت نارێکی‌و ناکۆکی‌و ملمڵانێ ئەو چینانە، جا بۆ گەیشتن بە بیرە ئابووری‌یەکانی لای یۆنانی‌یەکان دەبێ هەمیشە بگەڕێینەوە بۆ کەڵە فەیلەسوفەکانیان بەتایبەت فەیلەسوف و بیرکەرەوە ڕامیاری‌یەکانیان کە لێرەدا کۆی بیرە ئابووری‌یەکانی ئەم کۆمەڵگایە لە خودی ئەوانەوە هەڵ قوڵاوە بەپێی ئەو ڕاو بۆچوونە فەلسەفی‌و ڕامیاری‌و ڕەوشتی‌یەکانیانەوە[٦] کە پاشان باسی هەر یەکەیان بە جیا دەکەین و پاشماوەی کاریگەریی‌و ڕاو بیرە ئابووری‌یەکانیان لە قوتابخانەکانی پاش خۆیان دا دەبینینەوە.

## ئیفلاتون (٤٢٨ - ٣٤٨ پ.ز): plato

ئیفـلاتـون فەیلەسـوفێکی بەنـاوبـانگی یۆنانی، قوتابیی سۆکرات و مامـۆستـای ئۆرستـۆ بووە ئەنـدامێکی چینی ئۆرۆستـۆکرات بوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا هەرگیز دژی دیموکراسی نەبووەو بەشێوەیەکی ڕەهاو بێ سنـوور دژی حوکمـڕانی بازرگـانـەکـان نەوەستـاوەتەوە لەو کاتەدا، بەڵکوو ئەم دژی زیاڕۆیشتن و فیشاڵ و بە خۆدا هەڵدانی ئەو دەستەو حوکمڕانە بازرگانی‌یانەی ئەو قۆناغ و سەدەیە بووە. .

بەڵام ئیفلاتون کاتێ لەهۆی دروست بوونی کۆمەڵگا ڕامیاری‌یەکان دەکـۆڵێتـەوە هەمیشـە وا دەبینێ کە پێـویستی دابـەش کردنی کارو هەر دیـاردەیـەکی باشی ئەو دابـەشکردنە هەمیشە ئەوانەن کە بوونەتە هۆی ئەوەی کە مرۆڤ ژ یانیان پێکەوە بڕوێنن و شارە ڕامیاری‌یەکان دروست بین. .

ئیفلاتون، (دابەشکردنی کار) وەك دیاردەیەك هەمیشە لە ئەنجامی جیـاوازی‌یـەکی سروشتی (کـارامـەیی نێـو خەڵکی)و (جیـاوازی پێـداویستی‌یـەکانی) ڕۆژانەی ژیانی مرۆڤ دا دەبینێتەوە. . بەڵام ئەم لەم بۆچـوون و شیتـاڵ کردنـەوەی‌دا ڕووە ئابوری‌و کۆمەڵایەتیەکانی ئەو دابەشکردنە ناخاتە ڕوو. .

ئیفلاتون، دانیشتوانی (کۆمار)ی‌یە نموونەیی‌یەکەی دەکات بە دوو چینەوە:

- چینی دەستەڵاتدارە حوکمڕانەکان «The Rulers»
- چینی حوکمکراوەکان. . The Ruled

چینی یەکـەم دابـەش دەکـات بە (پاسەوانەکان و یاریدەدەرەکانیان) بەڵام چینی دووەمیان :. (خاوەن پیشە هەمە جۆرەکان. .) کە هەرگیز مافی نەداوە بەم چینەی دووەم کە شیاوی ئەوە بێ حوکمڕانی وڵاتی بەدەستــەوە بێ‌و هەمیشــە بەچـاوێکی نزم سەیری کردوون. . بەڵام سەبـارەت بە چینی یەکـەم دەڵێت: کە ئەنـدامـانی ئەم چینـە هەردەم دەبێ هەر لە منداڵی‌یەوە جیا لەوانی کە بژین و گرنگیی تەواو بدرێ بە ڕێکـوپێـك خستنیـان و تۆوی فەلسـەفە لە مێشکیان دا بچێنرێ‌و هەمە جۆر مەشقی شـەڕو شۆڕو جەنگیان فێربکرێ، چونکە ئەرکی پاراستنی (دەوڵـەت) لە هەر هێـرشێکی بێگـانـە لەسـەر شانی ئەمانە بە ئازایی‌و هۆشمەندی بەرەنگاری بن و بەرهەڵستی بکەن. .

کاتێ، تەمەنی ئەندامانی ئەم چینە دەگەنە (٣٠) ساڵ پێویستە لە سەریـان کە لە تاقیکـردنـەوەیـەکی تایبـەتی‌دا ئەوانـەی شیـاون ببنـە (فـەیلەسـوفی پادشـایـان)و بۆ ئەو مەبـەستە هەڵبـژێرین و ئەوانەی لەم تاقیکـردنـەوانـەدا سەرنـاکـەون بە یاریـدەدەر دەمێننـەوەو ئەرکی هەڵسـوڕانـدن و کارگێـڕی گشتیـان پێ‌دەسپێـررێ. . کەواتە ئیفلاتون چاوی لە دروستکردنی (میری‌یەکی پوختکراوی بێ‌کەرد) بووە. . واتە دەستەڵاتی دەستەو کۆمەڵەیەکی هەڵبژاردەی پوختە.

ئیفلاتون، لە پرۆژەکەی‌دا - کۆمار - ی قەدەغەی پاسەوانەکان واتە - چینی یەکـەم - دەکـات لە کارکـردنیـان لە هەمـوو ئیش و پیشـەیەکی بەرهـەم هێنـــان و ئەم چینــە دوور دەخـــاتـــەوە لەوەی بە دووی پارە پەیداکردن و سامان کەڵەکە کردن دا بڕۆن، چونکە ئەنجامی ئەوە لای ئەم، نووشوستیان دەبێ، بەڵکو تەنیا فرمانی سەرشانیان هەڵسـوڕاندنی کارو فرمانی کۆمەڵە بەپێی مێشك و بیرو هۆشیان. .

ئیفلاتون، بە بەربڵاوی‌یەکەوە دەڕوانێتە (ماڵ و ئافرەت) لەبەردەم چینی یەکەم داو. . هەر لەو بۆچوونەوەیە کە: (خێزان و خاوەنداریتی تاکە کەسی) پووچ دەکاتەوە کە گۆایە ئەو بەربڵاوی‌و بوونە گشتی‌یەیەو تێـر بوونی ئەو چینـەیـە دەبێتـە هۆی نەهێشتنی ناکـۆکی‌و مرخ لە یەك خۆش کردن. . بەڵام بەپێچەوانەی ئەمەوە ڕێی‌داوە بە چینی دووەم کە (مافی خاوەنداریتی تاکەکەسی) هەبێ‌و خێزان بۆ خۆی دروست بکات. .

بەڵام، سەبـارەت بە پەراوی (یـاسـاکـان) ئیفـلاتـون (ژمـارەی دانیشتـوانی) کۆمـارە نمـونـەیی‌یـەکـەی بە ٥٠٤٠ هاوڵاتی دەست نیشان کردووەو بەپێی ئەم ڕادەیە دەستەڵاتدارەکان واتە پاسەوانەکان بۆ ئەوەی ئەو ڕادە دەست نیشـان کراوە بپـارێـزن مافی ئەوەیـان هەیـە کە تەمەنی ژ ن هێنان یان شووکردن ڕێك‌بخەن و بۆیان هەیە هانی منداڵ بوونیـان بدەن یان بە پێـچـەوانــەوە بەرهـەڵستیـان بکـەن لەڕێی خەڵات کردنیان یان سزا دانیان یان ئەو زیاد بوونە بە زۆرو زۆرەملێ بەنۆپێزی بگوێزنەوە بۆ شوێنەوارێکی‌تر. .

ئۆرستـۆش، هەروەك ئیفـلاتـون لایـەنگـری ڕای زۆربـوونێکی دانیشتـوانیـان کردوە بە شێـوەیـەکی (ئاراستەکراو) هەروەك ئەمڕۆ لەم سەدەیـەی ئەمـڕۆمـان دا دیـاردەیـەکی باوەو هەر بۆ ئەو مەبـەستـەش ئیفـلاتـون وا دەبینێ کە پێـویستـە (پاسەوانەکان) ڕووبکەنە (کوشتن و نەهێشتن)ی لە دایـك بووەکـان بۆ مانـەوەی ئەو ژمـارە دەست نیشـان کراوانە و (ڕێك مانەوە)ی ژمارەکە وەك خۆی. . ئەوەی شایانی باسە هاندەرو مەبەستی دەستنیشان کردنی دانیشتوان بە ژمارەیەك هەرگیز بە مەبـەستێکی ئابـووری نەبـووە، واتـە لە ئەنجـامی ترس و لەرزی هەژاری‌و نەبـوونی‌دا نەبـوە، بەڵکـو مەبەست تەنیا جێ بەجێ‌کردنی (ڕێك وەستاندنەوەیەکی ڕامیاری) بووە. .

ئیفـلاتـون، دەڕوانێتـە(بـازرگـانی) وەك پیشـەیـەکی ناڕەوا و ئەو پیشـەیـەش بەڕەوا لەقـەڵـەم دەدا ئەگـەر بازرگـانـەکـە چاوی لەبەدەست هێنـانی قازانجـەوە نەبێ. . و بەڵکـو تەنیـا داوای (بەهای تێچـوون)ی خزمـەتگـوزاری‌یـەکـەی بکـات کە ئەرکی تیـا کێشـاوەو

سەبارەت بەمە دەڵێت: (لەسەر مرۆڤ پێویستە کە هەوڵی زیادکردنی نرخ نەدا بەڵکو تەنیا داوای بەهای ئەو خزمەتگوزارییەی بکات و بەس..)[٧]

زێڕوزیو لای ئیفلاتون، دوو هۆکاری ناپەسەندو زەربەخشن و هەروەها (سوو)ش لای ئەم نارەوایەو بەوپێیە قەدەغەیە..[٨]

ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە (کۆمارییە نموونەی) یەکی ئیفلاتون کە هێنابویە بەرچاوی خۆی.. هەمیشە (خەیاڵ) بوە و بەڵکو دوور بوە لە جێبەجێ کردنەکەی (بەشێوەیەکی کارەکی..) هەروەك ئیفلاتون خۆی دانی بەوەدا ناوە!! پاشان کۆمۆنیستییەکەی ئیفلاتون بێ شێو دوو لێ کردنی هەمیشە ئەندێشەو خەیاڵ بووە، ئەو کۆمۆنیستییەشی، کۆمۆنیستییەکی ئۆروستوکراتی چینایەتی بوە..[٩]

بۆ ئەوەی زیاتر بچینە بنج و بناوانی (بیرە میسالی)یە ئابورییەکانی ئەم فەیلەسوفە، ئەم چەند سەرنج و خاڵانەی خوارەوە چەند شتێکی روونترمان بۆ دەدات بە دەستەوە.:

١ ـ بنج و بناوان و رەگ و ریشەی کۆمەڵکاو بەو پێیەش بنج وبناوانی (دەولەتیش) درێژ دەبنەوە لە (دابەش کردنی کاری کۆمەڵایەتی)داو ئیفلاتون ئەم دابەشکردنە لە ئەنجامی (جیاوازی نێو تواناو کارامەیی) سروشتی خەڵکانی کۆمەڵ دا دەبینێتەوە بەلایەك و بە لایەکی کەش دا لە ئەنجامی (پێداویستی)یە هەمە جۆرەکانی مرۆڤ..

٢ ـ (تایبەتمەندی)و (دابەشکردنی کار) لەنێو خەڵکانی کۆمەڵ دا دەبێتە هۆی هەڵهاتن و دەرکەوتنی بازرگانی.[١٠]

٣ ـ ئیفلاتون بەدوای تیورییەکەیدا ناکەوێ سەبارەت بە روون کردنەوەی پەیوەندی نێو دابەشکردنی کارو ئاڵوگۆر لە رووبەکەوەو لەنێو دروستبوون و دەرکەوتنی دەولەت لە رویەکی کەوە، ئەوەی کە زانستی کۆمەڵایەتی لە سەدەی نۆزدەیەم دا دۆزییەوەو خستیەروو، ئەوەش بە دەستنیشان کردنی زنجیرەیەك لە پەیوەندی نێو دابەشکردنی کارو خاوەندارێتی هۆکارەکانی بەرهەم دا ئاڵوگۆر، دروست بوونی چینەکان و ویستەمەنی خولقاندنی دەولەت..

٤ ـ ئیفلاتون، (سەرچاوەی کۆمەڵایەتی دابەشکردنی کاری) پشت گوێ خستوەو سەیری ئەم مەسەلەیەی کردوە کە تەنیا (دیاردەیەکی سروشتی) بێو بەڵکو لای ئەو پەیوەندە بە مەسەلەی (تواناو کارامەیی سروشتی مرۆڤەوە..) هەروەك چون لەمەوپێش باسمان کرد..

٥ ـ هەرچەند کە ئیفلاتون باسی (پەیوەندی نێو دابەش کردنی کارو بەر بلاوی بازاری) نەکردوە، ئەو دیاردەو پەیوەندییەی کە لە وێدا (ئادەم سمیث) خستیەروو بەلام لەگەڵ ئەوەش دا ئەو رەخنانەی لە ئیفلاتون گیراوە لەلایەن هەندێ ئابوریناسە ئاکادیمیەکان وەك (روشرو دورنگ) سەبارەت بە دان نەنانی ئیفلاتون بە (بازار)دا وەك هۆکارێکی دابەشکردنی کار هەمیشە رەخنەیەکی رووکەشە، چونکە بازار خۆبەخۆی خۆی لە روویەکی مێژوویەوە دروست بوەو لە ئەنجامی دابەشکردنی کاری کۆمەڵایەتیدا نەك وەك رادەیەکی دەستنیشان کراوی گەشە کردنەکەی..

٦ ـ مەبەست لە تیۆرییەکەی ئیفلاتون، بەکارهێنانی بوە بۆ مەبەست و بەرئەنجامێکی رامیاری ئاشکرا کە لە (شانازیو رێزلێگرتنی رژێمی چینایەتییەکی داخراودا کۆدەبێتەوە کە (Castes) ی پێدەگوترێو کۆمارێتییەکەی لەسەر ئەو بنەرەتە دروست کردبوو..

ئەوەی لە تیورییەکەی ئیفلاتون دا سەرنجمان رادەکێشێ:

نەبوونی ناکۆکیو ململانێی چینایەتییە.. بێگومان ئەم رایەی ئیفلاتونیش هەمیشە، رەنگاوی رق و کینەی خۆی بوو دەیدایەوە سەبارەت بەو ناکۆکییەی هەبوو لەنێو چینە بەیەك دا چووەکان دا کە بەردەوام زیانی بە دیموکراسی یونانی دەبەخشی..

هەروەها نەهێشتنیو تواندنەوەی رژێمی چینایەتی لە دەولەتە نموونەییەکەیدا.. نەك بە پووچ کردنەوەی چینەکان، بەڵکو بەخولقاندنی رژێمی دەستەو چینێکی بەسەرخۆ داخراودا کە بنەرەت دەبێ لەسەر هەڵبژاردنی دەستەیەکیان بۆ حوکمڕانیو پاراستنی وڵات کە بەو پێیە دەبێ ئەم چینە سەربەست بێ لە (وەبەرهێنان و کار)دا ـ ئەمەش ئەو بیرە کۆمونیستییە داتاشراوەیە لە کۆماری ئیفلاتون دا ـ و دەستەو کۆمەڵەکانی تریش

ـ چینی دووەم ـ تایبەتمەند دەبن لە پیشەوکارو بەرهەم دا [١١] واتە ئەگەر پێش ئیفلاتون دابەشکردنی کار لەسەر بنەرەتی (توخمی مرۆڤ) ـ ژن یان پیاو (+) بووبێ یان وەکو لەسەر بنەرەتی (تەمەن) ئەوا ئەم جۆرە دابەشکردنە بەپێی راکەی ئیفلاتون بەرگێکی نوێی وەرگرت کە ئەویش دابەشکردنی کارە بەپێی چینە کۆمەڵایەتییەکان.. کە کۆیلەکان بەکاری بەرهەمهێنان و گوزەرانەوە خەریك دەبن و سەربەستەکانیش بەکاری جەنگ و فەلسەفەو وێژەو هونەرەوە.. هتد. وهەر لەم بارەیەوە ئیفلاتون وتویەتی کە سەربەستەکان واتە چینە دەستەلاتدارەکان، هەڵسوڕێنەرانی کاروباری پاراستن و پارێزگاری دەولەت، هەرگیز ناکرێ خەریکی (پیشە)یەك بن و (کار) بکەن و بەڵکو دەبێ لەو بوارە دوور بن تا بەتەواوی خەریکی مەسەلەی فێر بوون و مەشق کردن بن و شارەزایی تەواو بەدەست بێنن تا مسوگەری خولقاندنی سەربەستی بۆ وڵات بە ئەنجام بێنن..[١٢] کەواتە، ئیفلاتون داوای خولقاندنی دەستەو کۆمەڵەیەکی (هەڵبژاردە)ی پاکو پوختی کردوە دژی دەستەو کۆمەڵەیەکی تری (خاوەن پیشەو

بەرهەم هینەر) کە بەم پێیە. . ڕاستی‌یەکی دەروونی خۆی تۆمار دەکات سەبارەت بە هەر دوو رژێمە باوەکەی یۆنانی خۆی بە رژێمی (ئەثینا)ی دیموکراسی و هەردوکیان لە هەمان کات دا تووشی نووشوستی و ڕوخاندنێکی ناوخۆیی بوبوون. .

ئەم تیوری‌یە ئیفلاتونی‌یە، تەنانەت لە سەدەی ئیفلاتون خۆی‌دا بەکار دەهات بۆ خۆش کردنی (شۆرشێکی دژ وەستانی ئۆرۆستوکراتی دژی دەستەلاتی بازرگانە دیموکراسی‌یەکان. .

لە ئەنجامی شیتاڵ کردنەوەی ئیفلاتون سەبارەت بە سروشتی کرداری (بەهای ئاڵووگۆر) دەکاتە ئەوەی کە بەهای ئەو ئالودگۆرە) ئەنجامی دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتی‌یەو وا لە بەهای ئالوگۆر دەکات کە دیاردەیەکی کۆمەڵایەتی بێ، بە مانای ئەوەی کە ئەو بەهایە خولقاوو ئەنجامی پێداویستی مرۆڤ بێ لە کاری هەڵبانگاندنی شمەکێك بە شمەکێکی تری پێویست لە کۆمەڵگا شمەکی‌یە بچوکەکەدا. . ) کە ئەو کۆمەڵگایە بنەرەتە لەسەر دابەشکردنی کار کە هەموو مرۆڤێك واتە هەموو تاکە کەسێك لە کۆمەڵ دا ناچارە کە (کار) بکات بۆ خەلکانی کەی کۆمەڵ. .

ئیفلاتون ئەوەندەی نەما بوو بگاتە ئەنجامی (تیوری بەهای کار) چونکە ئەو بە ڕوونی و بە ئاشکرایی کارو بەهای ئاڵوگۆڕی بەیەکەوە بەستبوو، بەڵام ئەوەی دەستی ئیفلاتونی گرت وەك هەر بیرکەرەوەیەکی سەدەی کۆیلایەتی ـ کۆمەلگاکانی یۆنانی‌یەکان و چین و ڕۆمان ـ و نەگەیشتنی بۆ ئەو مەبەستە (بوغزاندنی کار) بوو، چونکە لەو سەدەیەدا (کار) پەیوەند بوو بە کۆیلەکان و فرمانی سەر شانی ئەوان بوو نەك چینەکەی کە.[4]

جا گەر ئەمانەی سەرەوە باسمان کردن بەگشتی بریتی بن لە چوارچێوەی بیرەکانی ئیفلاتون وەك یەکێك لە هەرە گەورە بیرکەرەوەکانی سەدەی یۆنانی‌یەکان کە مێژوویەکی بیری ئابووریمان بۆ دەخاتەڕوو. . لێرەدا پرسیار دەکەین و دەڵێین دەبێ بڕیار چی بێ بەسەر ئەو بیروڕایانەدا؟ لە وەڵامی ئەمەدا دەڵێین. . کە سەبارەت بە بنەڕەتی ئابووری بۆ (دروستکردنی دەوڵەت) یان سەبارەت بە (دابەشکردنی کار) ناتوانرێ هەرگیز بەپێت و بەرەکەتی ئەم دوو بیرە سەرەکی‌یەی ئیفلاتون پووچ بکرێتەوە یان لەبیر ببرێنەوە، چونکە شیکردنەوەو بۆچوونی ئیفلاتون سەبارەت بە (دروستبونی دەوڵەت) ئەتوانرێت بەراوردبکرێت بەو تیوری‌یە هاوکاری‌یە کۆمەلایەتی‌یە نوێیانەی پاشان دەرکەوتن: وەك بنج وبناوان بنەڕەتێکی پەیوەندی‌یە کۆمەلایەتی‌یەکانی نێو کۆمەڵ، چونکە پێویستی هەر کەسێك بەوی دەورویشتی جۆرە هاوکاری‌یەك دەخوڵقێنی کە ئەویش لە ئەنجامی جیاوازی‌و لەیەك نەچوونی پێداویستی‌یەکانی مرۆڤە. . بەڵام سەبارەت

بە بیری (دابەشکردنی کار) لای ئیفلاتون، بریتی‌یە لە سەرەتای دەست پێکردنی تەوژمی بیرێك کە پاشان یەکێك لە ئابووری زانە بەناوبانگەکەی سەدەی هەژدە ئادەم سمیث ـ کە گەیشتە ئەوپەڕی. .

بەڵام ئەوەی شایانی باسە جۆرە جیاوازی‌یەك هەیە لەنێو هەردوو جۆرە دابەشکردنەکانی کار چ لای (ئیفلاتون)و چ لای (ئادەم سمیث). .

(ئیفلاتون): داوای تایبەتمەندی هەموو کەسێك دەکات لە کار یان پیشەیەك دا لەسەر بنەڕەتی ئەوەی کە هەر کەسێك جۆرە تواناو کارامەیی و لێهاتنێکی سروشتی خۆی هەیە یارمەتی دەدا کە شیاوی ئەو کارو پیشەیە بێ زیاتر لە یەکێکی تر، بۆ ئەم مەبەستە ددڵێت: کە هەرگیز دوو کەس نین کە بە تەواوی لەڕووی تواناو کارامەیی سروشتیان لەیەك بچن. . . بەڵکو هەر یەکەیان لەوی کە جیاوازە، یەکێکیان باشە بۆ کارێك و ئەوی تریان بو کارێکی کە. . و دەڵێت کە دەگونجێ کە سەرکەوتنێکی باشتر بەدەست بهێنرێت گەر مرۆڤێك بە تەنیا کارێك خۆی خەریك بکات و تواناو کاتی خوی دابەش نەکات بەسەر چەند کارێك دا. لەبەر ئەم هۆیانە بەرهەمهێنانی هەموو شتێك باشترو زۆرترو ڕەخساوتر دەبی گەر هەر کەسێك تەنیا کارێك بکات لەگەل تواناو کارامەیی سروشتی خۆی‌دا بگونجێ، لە کاتێکی گونجاوی‌دا بێ‌ئەوەی دەستی خۆی لە هیچ کارێکی کەدا تێکەلاو بکات، بۆ ئەوەش دەبێ لە شاردا خاوەن پیشەو کارگەیش هەبن لە بەرهەمهێنەرەکان و بازرگانەکان و بازاریش هەبێ‌و پارەیەکیش بو ئالوگۆر کردن. .[5]

بەڵام (ئادەم سمیث) گرنگی داوە بە (دابەشکردنی کرداری بەرهەمهێنانی شمەکێك لە شمەکەکان. . ) بۆ چەندین کرداری تر لە خۆی بچووکتر کە هەر کاروکردارێك لەوان وردکراوەتەوە کەسێك یان چەند کەسێك تایبەتمەندی تێ‌دا پەیدا دەکات، نەك لەسەر بنەڕەتی لێهاتووی‌یەکی خۆیی سروشتی کە لە نێو خودی ئەو مرۆڤە دایە، بەڵکو لەسەر بنەڕەتی ئەوەی کە تایبەتمەندی دەبێتە هۆی (زیادبوونی بەرهەمهێنانی کاری مرۆڤ. . )

بەڵام ئەوەی پەیوەندە، بە ڕێکخستنی ڕامیاری دەوڵەت و دابەشکردنی بۆ ئەو چینانە، ئەوە دەبەخشێ کە ئیفلاتون ئەوەی لەبیردا بوە کە گۆایە بتوانێ شاروچکەیەکی نموونەیی پێك بهێنێ لە ڕوویەکی زانستی‌یەوە و ئەمەش دوور نی‌یە بە شێوەیەکی کارەکی تر بگونجایە لە شارە ئیغریقی‌یە کۆنە بچووکە، کەم دانیشتوانەکان دا. . بەڵام دروستکردنی شارێکی ئیفلاتونی لە واقیعێکی ڕیالیستی پاش گەورەبوونی شارەکان و گەورە بوونی قەوارەی دانیشتوانی هەرگیز کارێکی وا ئاسان نەبوو، بۆیە هەندێك لە نوسەرەکان ناوی ئەم شارەیان نا شاری ئەندیشەو خەیاڵ یاوەکو شاری ئیتۆبیای ئیفلاتونی

جا ئەمەش لێرەدا شوێنی ئەوە نی‌یە باسی‌بکەین، بەڵکو تەنیا ڕووە ئابـووری‌یـەکـەی ئەم شاروچکـەیـە هەڵ سەنگێنن، ئەوە هەرگیـز ڕێکخراوێکی سۆشیالیستی یان کۆمونیستی نی‌یە(١) کەوا هەندێك لە نووسـەرەکـان دەیخـەنـە پاڵ ئیفـلاتـون، چونکـە سۆشیالیستی یاوەکو کۆمـونیستی بنـەڕەتـە لەسەر پووچ کردنەوەی خاوەنداریتی تاکەکەسی‌و شوێـن گرتـنـی خاوەنـداریـتـی گشـتـیـی دەوڵـەت لە شوێـنـی ئەو خاوەنداریتی‌یە تاقەکەسی‌یە، کە ئەمەش هەرگیز لە ڕێکخراوی‌یەکەی ئیفـلاتـون دا بەدی نەدەکـراو هەمیشـە قەدەغـەکـردنی خاوەنـداریتی تاقـەکـەسی تەنیـا سەبـارەت بوو بە چینی (حـوکمرانەکان و سەرکردەو ئەفـسـەرەکـان. . هتـد) ئەمـەش لەلای ئیفـلاتـون لەوەوە نەهـاتبوو کە (خـاوەنـداریتی تاکـە کەسی لەخۆی)دا ئەنجامێکی خراپ بەدەستەوە بدات یاوەکو لە ئارەزووی ئیفلاتونەوە بێ کە هەموو کەس یەکسان بن لەڕووی بوون و خاوەنـداریتی‌یـەوە [19] بەڵکـوو ئەوە دەگـەڕێتـەوە بۆ ئارەزووی ئەو سـەبارەت بە دوورخستنەوەی (چینی حوکمرانەکان. . ) لەچاوبرینە پارەو دەرامەت یان زێڕو زیو، تەنانەت ئیفلاتون نەیویستوە لەو کۆمـارەی خەیـالی لێ‌کـردبـوەوە تەنـانـەت خاوەنی ماڵ و کۆشکی خۆشیان بن. . چونکە ئەم ئەیووت کە ئەم چینە لە بنەڕەت و ڕەسەنی خۆیـانـەوە لەخـودی خۆیـان دا خاوەنی هەمـوو جۆرێکن لە کانـزای دانسقەو دەگمەن کە (خوا) لە دڵ و دەرونیان دا پێی سپاردون. [20]

ئیفـلاتـون، دان دەنێ بە بوونی (هـەژارو دەوڵـەمـەنـدی)دا لەنێـو ئەوانـەی کە ڕێگـایـان پێ‌دراوە کە خاوەنـدار بن، لە هەمان کاتیش دا داوای قەدەغـەکـردنی بوونی هەژاری‌یـەکی کولـەمەرگی مەمرەومەژی‌و دەوڵەمەندی‌یەکی کردوە لەو کاتەی کە تەنیا ئارەزوو، هەرگیز خەڵکی هاوبەش ناکات لە بوون و خاوەنداریتی‌دا، بەڵام ئارەزووی ئیفلاتون لەوەدا بووە کە دەوڵەمەند هەرگیز تەمەڵی نەنوێنی‌و بەجارێك ڕووی لە بەرهـەمهێنـان وەرنـەچـەرخێنی‌و هەژاریش بەرهـەمەکەی بەرەو خراپی نەڕوات، یان منداڵەکانیان باش فێری کارو پیشەکانیان نەکەن. . جا لێـرەدا هانـدەرەکـە بۆ پاراستنی بەرهـەم بووە نەك سەبـارەت بە یەکالا کردن و دابەشکردنی دەرامەت بەسەر خەڵك دا [21]

## ئۆرستۆ (٣٨٤ - ٣٢٢) پێش زایین:

ئۆرستۆ، وەك ئیفلاتون لە بنەماڵەیەکی ئۆرۆستوکراتی نەبووە، بۆیە کەمتـر دژایـەتی پێـوە دیـارە بەرامبـەر حوکمـرانی بازرگـانەکانی شار. ئۆرستـۆ زۆر بنـەڕەتی زانستی نوێی دانـاوەو توێـژەرەوەیـەکی ئابووری چاك بووە، زوربـەی بۆچـوونـە ئابـووری‌یەکانی لە پەڕاوەکەی بەناوی (ڕامیاری)و هەندیکی کەشی لە پەڕاوی «ڕەوشت»دا تۆمار کردوون و ئەم لە چوارچێـوەی بیـری یۆنـانی‌دا بە لێهـاتـویی‌یەکەوە دەچێتە کوڕی شیتـاڵکـردنـەوەی دیـاردە ئابـوری‌یەکـان و ئەو ڕاستی‌یـەکی ئابووری‌و پەیـوەنـدی‌یـەکانی نێوانیان لە ڕۆشنایی ئیدیۆلۆجیەتی پیاوێکی تێکەڵاو بوو بە ژیـانی چینێکی (خـۆشگـوزەرانی کارنـەکـەر)دا دەبینێتـەوە، پیاوێکی ڕۆشنبیری ئەو چینەی کە هەمیشە کارو بازرگانی دەبوغزێنن و کار لایان سووك و ڕسوایە. . شیتاڵ کردنەوە ئابووری‌یەکەی نورستۆ لە (پێداویستی‌یەکانی ژیان و تێرکردنی) مرۆڤ دا کۆدەبوونەوە، لای ئەو ماڵ و دەرامەتیش کە مسوگەریی ئەو تێرکردنە بەدەست دەهێنن لە ڕێ‌و هۆکاری بەدەست هێنانی ئەو دەرامەتە: [کشتوکاڵ و بەخێوکردنی مەڕو ماڵات و ئاژەڵ و ڕاوکـردنـە، بە هەمـوو جۆرەکـانی‌یـەوە - تەنـانـەت چەتـەیی‌و ڕێگـریش، ئەم، ئەو ڕێ‌یـەش هەر بە جۆرە ڕاوکـردنێـك دەداتـەقـەڵـەم - هەروەهـا پیشـەسازی‌و دەرهێنانی کانزاکان. . ] ئەمانە هەموو ڕێ‌و ڕێگاو هۆکارێکی سروشتین بۆ بەدەست هێنانی دەرامـەت [22] لە تەك ئەوانـەش دا (بـازرگـانی)و ئەم لایـەنەش بە ڕای ئۆرستۆ چالاکی‌یەکی سروشتی نی‌یە بۆیە دەبێ بۆژو بکرێت. .

ئۆرستـۆ لە پەڕاوەکـەی بەنـاوی (ڕامیـاری) - لەلاپەڕە (٥٥و ٦٥)دا دەڵێت: کە (. . بازرگـانی هەوێنێکی سروشتی تێ‌دا نی‌یـە، بەڵکـو ئەنجـامی گۆڕینـەوەیـە. ئەوەی شایـانی باسە ئەوەیە کە ئەگەر سەیری زروفی ئەو کات و سـاتـە بکـەین کە بازرگـانی تێ‌دابـوغـزێنـراوە دەبێ ئەوەمـان لەیـادنـەچێ کە بازرگـانی چالاکی‌یـەك بووە لە بنـەڕەتـەوە بێگانەکان کە مافی هاونیشتمانیان نەبووە، بەم کارو پیشەیە هەڵساون و ئەوکارانەش لەسەر دەرامەت و پارەی - سەرمایەی - قەرزو قەرزکاری بەنـدبـووە، ئەمـەو جگـە لەوەی کە دەبێ سەرنجی ڕای ئۆرستۆ بدەین دەرهەق بە پیشەی بازرگانی کە ئۆرستو هەروەك باسمان کرد دەژیا وە بۆ چینێکی ئۆرۆستـۆکـراتی دەنـووسی کە ئەو چینـە بازرگـانی پارەو بەقەرزدانی هەمیشە بوغزاندوە. .

ئۆرستۆ، سەبارەت بەو یەکەیەی هەڵدەسێ بەم جۆرە چالاکیانە، واتە (یـەکـەی بەر هـەمهـدێنـان) ئەو لە یەکە خێزانی‌یەکانەوە بۆ ئەم مەسەلەیە دەچێ کە بەش بە حالـی خۆیـان خۆبـژێنی دەکـەن، بە مانـای ئەو خێـزانـانـەی کە بەرهەم دێنن بۆتێرکردنی پێداویستی‌یەکانی خۆیان واتە - بەرهـەمی سروشتی - وپـاشـان ئۆرستـۆ دەڕوانێتە (دابەشـکردنی کار) وەك بنەڕەتێکی گرنگ بۆ گۆڕینەوە و ئاڵوگۆڕی شتومەکەکان پاشان ئاڵووێری [23] نەختی، واتە ئاڵووێری شمەکەکان بەهۆی پارەوە. [24]

وگـەرئـەم کارە سەبـارەت بێ بە (بەرهەمی گۆڕینەوەیەکی نەختی) بەو (شمەکانەی لە بازاڕ)دا دەگۆڕینەوەو ئاڵووێر دەکرێن، ئەوە دەبێ سەرنجی ئەوە بدرێ کە ئەم شمـەکـانـە لە بازاڕدا دەفـرۆشـرێن بە نرخێکی وا کە پێـویستـە شیتـاڵ بکـرێتـەوەو چۆنیـەتی دەست نیشـان کردنی ئەو نرخانە

بزانرێ، لەم ڕووەوە ئۆرستۆ سەبارەت بە (بەهای شمەکەکان) دەڵێ: [٢٥] بەهـا، خاسیـەتێکی کۆمـەڵایـەتی یـە کە شمـەکـەکـە وا لێ دەکـات شوێنـەوارێکی ئاڵـوگـۆڕی هەبێ [٢٦] جا لێـرەدا سەرنجی جیـاوازی یەك دەدەین لە نێو (بەهای بەکارهێنانی)دا کە خاسیەتێکی (موضوعی) ـ یە لە شمـەکـەکـەدا کە وای لێ دەکـات گونجـاو بێ و شیاوی جێ بەجێ کردن و تێـرکـردنێکی دەستنیشـانکـراوی مرۆڤ بێ، و لە نێو بەهای ئاڵوگۆڕکردن exchange - value کە (فـۆرمێکـە کە بەهاکەی خودی خۆی تێ دا دەردەبڕێ لە کاری ئاڵوگۆڕەکەدا (پەیوەندی یەکە نێو هەردوو بەهاکە)، پاشان ئۆرستو دوو بیـری دژ بە یەکتـر دەخاتە ڕوو، کە واتای یەکەمیان ئەوەیە کە (بەهای ئاڵـو گۆڕ بە شێـوەیـەك یان زیاتر لە بەهای بەکارهێنانەکە هەڵهێنجراو، یان بڵێین وەرگیـراوە، هەروەهـا سەربـاری ئەمـەش دەڵێ: «پێـویستـە کە پێـوەرێکی هاوبـەش هەبێ لەنێـوان شتـومـەکە ئاڵوگۆڕکراوەکان دا»و ئەم پێوەرە هاوبەشەش بێ کەم و زیاد، پێداویستی هەر یەکەمانە بۆ ئەوی ترا! [٢٧]

سەربـاری ئەمـانـەی ڕوونمـان کردنـەوەو بۆ ئەوەی لەوەش زیاتر بچینە ناخی دەروونی ئۆرستـو ـ فەیلەسـوفی ماددی و میسـالی (+) و تیـوری و بۆچـوونـە ئابـووری یـەکـانیـەوە، ئەو ڕایـانـەی ئەو لە سێ خاڵی کۆدا یەك دەخەینەوە کە ئەوانەش [ڕێی بەدەست هێنانی سامانە ـ دەرامەت ـ و مەسەلەی (قەرز بەسوو) و دوایی یەکەیان مەسەلەی بەهایە]:

هەروەك گوتمـان، ئۆرستـۆ، ئەوەنـدە میسـالی نەبووە وەك ئیفلاتون، بەڵکو ئەم هەمیشە دانی ناوە بە هەموو زانینێك دا کە لە ڕێی تاقیکردنەوە بە ئەنجـام هاتبن و ئەوەی پاڵی پێـوەنـاوە کە لەسـەر ئەم ڕێڕەوە فەلسـەفی یە بڕوات سەرنجـدانی بووە سەبـارەت بە کارو کردارە ڕیالیستەکانی ژیان و شیتاڵ کردنەوەیان لەجیاتی پەنابردنە بەر ڕای خەیاڵ و ئەندێشە. .

ئۆرستـۆ، لە پەراوەکـەیدا، ڕامیاری ـ ڕەخنەی گرتوە لە شێوعیەتەکەی ئیفـلاتـون (×) و بۆ ئەم مەبـەستەش (بەڵگەی دەروونی) خستۆنە کارو لەم ڕووەوە ئۆرستـۆ دەبینێ کە هاوبـەشی کـردن لە (مـاڵ و سامان)دا هەمیشە دەبێتـە هۆی کوشتنی عونسـری هانـدەر بۆ کارکردن و خەڵك سـست و بێ بەرهـەم دەکـات و دەڵێت کە بێ گـومـان خاوەنـداریتی و خاوەن سامـان و دەرامـەت شتێکی خۆشـە لای خەڵکی و سروشتیشە کە خاوەن بن و بیـشی بەخشن بە خەڵکـانی ترو. . سەربـاری ئەمـەش دەڵێ کە گرنگی دان بە (خـاوەنـداریتی گشتی) هەرگیـز ئەو گرنگی یەی نابێ لەچاو گرنگی دان بە خاوەنـداریتی یـە خۆیی یـەکـە. [٢٨] بەڵام، لەگـەڵ ئەمـانەش دا پێویستە سەبـارەت بە جیـاکـاری لەنێـو ئەم دوو فەیلەسـووفـەدا دوورو قووڵتر بۆی بچین، چونکە هەردووکیان دوو قوتابی سۆکرات بوون و ڕاستیش نی یە کە ئۆرستو بە پشتگیرو پاڵپشتی ئەو ڕایە لە قەڵەم بدەین کە ئەمڕۆ بە (مەزهەبی خاوەنـداریتی تاکـەکـەسی ـ خاوەنـداریتی خۆیی تایبـەتی ـ ناو دەبرێ،

بەڵکو ئۆرستۆش چاو لە ئیفلاتون دەکات سەبارەت بە مەسەلەی (دابەش بوونی چینـەکـان) و شارەکـەی لەسـەر دابـەشکـردنـەکـەی ئیفـلاتـون دابەش دەکات بە دوو چینەوە [دەستەڵاتدارو بێ دەستە حوکمکراوەکان. .

**چینی یەکـەم:** لە دەستـەو کۆمەڵە خواپێداوەکانن: پیاوانی سپاو سەرکردەو جەنگاوەرەکان و پیاوانی ڕامیاری و داد پەروەری و پیاوانی ئایین دروست دەبن و

**چینی دووەم:** لە (جووتیارو کشتیارو وەستاو خاوەن پیشەکان و کارکەران) پێك دێن. .

لە هەمـان کات دا، ئۆرستـو پشتگیـری خاوەنـداریتی گشتی کۆمـەڵە زەوی و زارێـکـی کردوە، ئەوەو سەربـاری ئەوەش ئۆرستـۆ هانـی ئەو هاونیشتمـانـانـەی دەدا کە بە کاری چاکە هەڵەستن. . کە خێرو کەڵك لە ڕێی سامـانـەکـانیـان ببـەخشن لە ڕێڕەوێکی هاوبەشیەوە ئۆرستۆ، وەك ئیفـلاتـون ئەوەنـدە دوور نەدەڕۆیشت، چونکـە ئەم زیاتر مرۆڤی ناسیوە، بەڵام لە هەمان کات دا بەهەمان ڕێڕەوەکەی ئیفلاتون دا ڕۆیشتوە. .

بەڵام، ئەوەی لە بیـرەکـانی ئۆرستـۆدا سەرنـج دەدرێ و ئەمـرۆ شوێنی سەرسـووڕنـەرە، ئەوەیـە کە ئەم دانی بە ڕژێمی کۆیـلایـەتی دا ناوەو ئەو مەسـەلـەیـەی بە دیـاردەیـەکی سروشتی زانیوە هەروەك چۆن ئیفلاتونیش لەسـەر هەمـان باوەڕ بوە، بەڵام ئەم دووپـاتی ئەوەی کردۆتـەوە کە دەبێ (کۆیلە) لەوانەبن کە ڕەسەنیان یۆنانی نی یە. .

ئۆرستـۆ، دان بەوەدا دەنێ کە (کـۆیلەکـان) بنـاغـەی کۆمەڵن، بەڵام لەگـەڵ ئەمـەش دا پێی لەوە داگـرتـوە کە کۆیـلایـەتی لە ناخی سروشتی مرۆڤایەتی دایە وکۆیلەش زیاتر نی یە لە هۆکارێك ـ ئامرازێك ـ ی زیندوو هەرگیـز ـ جیـاکـار ـ یان بڵێین جیاوازی نی یە لە ئامرازە بێ گیانەکانی تری کارکـردن و تەنیـا فرمـانی سەرشانیشی ـ کە بۆ ئەوە لەدایك بووە ـ هەمیشـە هەر خزمـەتی گەورەکـانێتی. و هونەری و لیهاتووی گەورەکانیش لە چاك وبـەرهێنـانی کۆیلەکـانـەوە دەردەکـەون، بەڵام هەروەك ووتمـان ئۆرستو بەرەنگـاری ئەوە بووە کە هاوڵاتی یـە یۆنـانی یـەکـان لەنێـو ئەو ڕژێمی کویـلایـەتی یـەدا بن، بەڵکـو کۆیـلایـەتی سەپـاوە بەسـەر خەڵکی وڵاتە بێگانەکان نەك هاوڵاتیانی خۆیان. .

## ڕێکانی بەدەست هێنانی سامان لای ئۆرستۆ:

ئۆرستـۆ، سەبـارەت بە ڕێـکـانـی بەدەسـت هێنـانی سامـان. جیـاکاری یەکی تایبەتی خۆی نواندوە لەنێو دوو ڕێی پەیداکردن دا. . ئەم جیـاکـاری یـەش بە بنەڕەتێکی بیرە ئابووری یەکانی ئۆرستو دەژمێرریت، لای ئەو ڕێگـای یەکـەمی بەدەست هێنـانی سامان ڕێگایەکی سروشتی یە

که ئەوەش هەروەك لە شوێنێکی کەدا دەست نیشانمان کردووە بریتین لە (کشتوکاڵ و راوی وشکانی و ئاوی یەکان و رێگری و چەتەگری، جەنگیش؛ هۆو رێگایەکە بۆ بەدەست هێنانی (کۆیلە).

لێرەدا، مرۆڤ لە حاڵەتی بەدەستهێنانێکی سروشتی دا بە دووی پێویستی یە راستەوخۆیی یەکانی خێزان دا دەگەڕێ بەواتایەکی کە (بەرهەم بۆ مەبەستی بەکاربردن)ە هەروەها گۆڕینەوەیەکی راستەوخۆش، جار بەجارێك خۆی دەخنێتە نێو ئەم جۆرەوە..

رێگای دووەم: رێگاو هۆیەکی دەستکردی ناسروشتی یە سەبارەت بە بەدەستهێنانی سامان، کە ئەویش لە رێی (ئاڵوگۆڕەوە) بەدەست دێت، ئەم هۆ دروستکراوە ناسروشتی یە لای ئۆرستۆ دەکرێ بە دوو جورەوە:

- جۆری یەکەمیان، پێویستە کە ئاڵوگۆڕ بە پلەی یەکەم لە خۆبگری، واتە بە مەرجی (فرۆشتنە) کە لەلایەن بەرهەمهێنەرەکەوە بێ و (کڕینە) کەش بۆ مەبەستی (بەکاربردن) بێ...

- جۆری دووەمیش: بازرگانی بە مانایەکی ورد لەخۆ دەگرێ، واتە (کڕین) بە مەبەستی فرۆشتنەوەی..

جا لێرەدا، لای ئۆرستۆ، ئاڵوێرکردنەکەی جۆری یەکەمیان هەرگیز لادەر نی یە و لای ئەو هەرگیز پێچەوانەی سروشتی نی یە، بەڵکو ئۆرستۆ ئەمەیان بە کەلێنێك بەخش دەبینێ بۆ پڕکردنەوەی پێداویستی یە سروشتی یەکانی مرۆڤ..

ئۆرستۆ، جۆری دووەمیان واتە (بازرگانی وردە): بە پێچەوانەی سروشت و بە لادان لە قەڵەم دەدات و تەخسیری [2] ئەم بۆچوونەشی دەگەڕێتەوە بۆ:

١) کە ئەو بە دەستهاتوانەی کە ئۆرستۆ بە سروشتی ناویان دەبات سنوور دارە بەپێی هێزو بە پێت و بەرەکەتی زەوی لە بەرهەمهێنانی داو بە وزەی خەڵك سەبارەت بەکارکردن، لێرەدا سنوورێکی ماددی هەیە لەو دەستکەوتانەدا، لەو کاتەی کە بازرگانی بە مانایەکی ورد، رێگا خۆش دەکات بۆ خەڵك کە مزەو قازانجێکی بێ سنوور بەدەست بهێنن..

ئەمەش بەرەنگاری (بیرە مام وەندی یە باوەکەی لای ئۆرستۆ) و چەندین نووسەر و فەیلەسووفەکانی تر دەبێ لەو سەدەیەی ئەوەوە تاوەکو سەرەتای قۆناغ و سەدەی هەڵدانی قوتابخانە بازرگانی یەکان...

٢) هۆیەکی تر کەوای لە ئۆرستۆ کرد کە بازرگانی - بازرگانی وردە - بە ناسروشتی لەقەڵەم بدات، ئەوەبوو کە گوایە بازرگانی وا نە (پارە) دەکات کە خەڵك چەند لای شیرین بێ و ئارەزووی لاخستنی بدات، و بەم شێوەیە، بازرگانی (پارە) دەکاتە هۆکارێکی (پەیداکردن) کە ئەمەش لای ئۆرستۆ سەرپێچی و لادانە لە فرمانی سەرەکی و سروشتی پارە

ئەوەی شایانی باسە ئۆرستۆ سەبارەت بە دابەشکردنی سامان، هەمیشە مخالیفی شیوعی یەتەکەی ئەفلاتون بووە و هەرگیز ئەم دژ ی بوونی جیاوازی یەکی گونجاو نەبووە سەبارەت بە مەسەلەی (بوون و دەوڵەمەندی). بەڵام لەگەڵ ئەوەش دا دژ ی بوونی دەوڵەمەندی بووە، ئەوەش لەبەر چەند اعتباراتێکی رامیاری و رەوشتی، چونکە بە پێویستی نازانێ کە سامانێکی زۆر کۆبکرێتەوەو بەکاربیرێت و بە بێ مەشروعی لە بەرد بدرێ..

بەڵام ئۆرستۆ سەبارەت بە هەژاری سەرنجی ئەوەی داوە کە هەژاری باوکی شۆڕش و تاوانە. [1]

**قەرز بە سوو:**

لای ئۆستو وایە کە قەرزکردن بە سوو وا لە خودی پارەکە دەکات کە لە خۆی دا بەرهەمهێنەر بێ و بەم پێیە (پارە) لێرەدا لە مەبەستە سەرەکی یە سروشتی یەکەی خۆی لا دەدا کە بریتی یە لە ئاسانکردنی ئاڵوویرکردن.. سوو، پارە لە توخمی خۆی زیاد دەکات (وەك سەرنج دەدرێ لە زمانی یۆنانی دا کە وشەی سوو- لەو زمانەدا - بە (کوڕ) یان (بێچوو) ناو دەبرێ و لەو کاتەی پارە هەرگیز نازێ، واتە کوڕ یان بێچووی نابێ، بۆیە (قەرز بە سوو) بە ناپەسەندترین هۆی دەوڵەمەند بوون لە قەڵەم دەدرێ و سەرپێچی کردنی سروشتەو لەم دیاردەیەیە کە ئۆرستۆ ئەوە هەڵ دەهێنجی کە هەمیشە (سوو ناپەسەندە)..

ئۆرستۆ بە درێژی باسی (گەشەکردنی ئاڵوێری) کردووە لە شێوە سروشتی یەکەیەوە کە بۆ (بەدی هێنانی پێداویستی یەکانە) بۆ شێوە ناسروشتی یەکەی کە تەنیا بە (مەبەستی قازانجە) و ئەو گەشەکردنە هەمیشە دەبەستێ بە (گەشەکردنی پارە خۆیەوە لە شەمەکێکی ئاسایی بۆ دراوە نەختی یەکان)

ئۆرستۆ، دەڵێ: کە نارەواترین بەکارهێنانی پارە (سووە) واتە (بەکارهێنانی خودی پارە خۆی وەك هۆکارێك بۆ کەڵەکەکردنی پارەو ئەم هێرشی خۆی دەباتە سەر ئەم شێوازە لە روانگەی ئەوەی کە گوایە (پارە) هەروەك لە سەرەوە باسمان کرد وەجاغ کوێرە (عقیمة). ئەم رایەی ئۆرستۆ لەوەدەچێ کە رەنگاوی ئارەزووی خۆی بداتەوە لەدەستنیشانکردنی مەودای بازرگانی و پەنگیان پێ بخواتەوە لەسەر تەنیا چەند بوارێکی دیاری کراو کە لەسەر بنەمایەکی رەوشتی یەوە پێك بێن و ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەوەیە کە ئەم رایەی ئەمیش تەشەنەی کردە نێو راو و نوسراوەکانی (قوتابخانەیی یەکان) لە سەدەکانی ناوەڕاست دا.. ئەم را گرنگە، ئۆرستۆ دەخاتە سەر لوتکەیەکی بڵندو بە یەکەم دۆزەرەوە لە قەڵەم دەدرێ لە مێژ وودا سەبارەت بە جیاکاری یەکەی ئۆرستۆ لە نێو (فرمانی پارە) وەك (هۆکارێك) بۆ ئاڵوێر و لە نێو (فرمانی پارە) وەك سەرمایە..

ئەمەو ئۆرستۆ ئەڵێ: کە بناغەی پارە لە سیفاتە سروشتی یەکانیەوە کۆنابێتەوە بەڵکو لە (عورف و عادەت)دا، واتە تەنیا بە رێکەوتنی لەسەر بەکارهێنانی لە بازاردا..

زور لە (ئـابـووری‌نـاسـە نوێ‌یەکان) بە هەڵەدا چوون لە لێکدانەوەی وشـەی یۆنـانی (Nomosd) کە مانـای (عـورف)ە بە وشـەی لاتینی (Lex) کە مانای (یاسای دانراوە) ـ القانون الوضعي ـ دەبەخشێ . .

ئۆرستـۆ، دانـراوە بە سەر قافلەی تیـوری یاسای پارە ئەو تیوری‌یەی کە دەڵێ : بنـاغـەی دراوە ـ پارە ـ لە یاسـا دانانی تەنیا دەوڵەت دا کو دەبێتەوەو پەیرەوی کردنی خەڵکی بە بەکارهێنانی کە ناوی براوە . [٣١]

جا ڕاکـەی ئۆرستـۆ سەبـارەت بە (سـوو) کاریگـەری‌یـەکی گەورەی بەخشیـوەو جێی لێکۆڵینەوەیەکی دووردرێژی نێو سەدەکانی ناوەڕاست و تەنـانـەت تا ڕۆژانی ئەمروشـمان و ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە (پارە) لە زەمانی کۆن دا بە قەرز نەدراوە بۆ مەبەستێکی بەرهەمهێنەر بە قەدەر ئەوەی کە (پارە) قەرزکراوە بۆ مەبەستی ڕزگار بوون لە تەنگوچەڵەمەو دەستکورتی‌یەك [٣٢]

بەلام، تیوری نوێ، سەبارەت بە سوو ئەوەیە کە قەرز کردن زیاتری بۆ مەبەستی بەرهەم و بەرهەمهێنانە

بەها :

ـــــــــــ ئەو خاڵانـەی کە وتـوویـژ یکی دوورودرێـژ ی لەسەر کراوە لەنێـو ئابـووری‌نـاسـەکـان دا . . ڕای (ئـۆرستـۆ)یـە سەبـارەت بە مەسـەلـەیـەکی گرنـگ کە (بـەها)یە و ئەو بناغەیەی کە ئەوپشتی پێ قایم کردوە

ئۆرستـۆ، باسی تیـوری (بـەهـا)ی کردوە لەنێـو دووتـوێ مەسـەلەی (داد پەروەری)داو بەپێی ڕای ئەم دادپەروەری لە ئاڵوویردا بە یەکسـانی شمەکە ئاڵـوویـر پێ کـراوەکـان جێ بـەجێ دەبێ ، بەلام چون ئەو یەکسـانی‌یـە دەپێـوری‌و چون تەرازووی بەهـای ئەو دوو شـمـەکـە دەکرێ؟! بێ گومان ئێرەدا دەوترێ، لە ڕێی (پارە)وە، بەلام ئۆرستۆ بە سەرنجێکی بێ گومانەوە ـ ئەوە دەچێ کە پارە جار بەجار بەهاکەی وەك هەر شتێکی کە دەگۆڕرێ، هەرچـەنـدە ئەم لە هەمـوو شتـەکـانی تر زیاتر چەسپاوترە ئەمە مانای ئەوە دەبەخشێ کە پێوەرێکی بەها هەیە ڕاستترە لە پارە، ئەو پێوەرەش (پێویستی ـ ویستـەمـەنی)یە کە باڵی خۆی دەکێشێ بەسەر هەموو ئاڵوویر کراوەکانی ژ یـان دا ـ پێـویستی (فرۆشیار)و (کریار)ە بە شمەکە ئاڵوویر پێ کراوەکان کە ئاڵـوویـر کردنەکە و نرخی ئاڵوویر کردنەکە دەستنیشان دەکات . . (گەر خەڵکی پێویستی نەبوایە، ئاڵوویرکردن نە دەبوو . . )[٣٣]

هەروەك لە پەرەکـانی پێشـوودا باسی هەردوو جۆری بەکـارهێنـانی شـمەکمان کرد لە تیوری‌یەکەی ئۆرستۆدا کە ئەو سەبارەت بە بەکارهێنانی شمـەك لە دوو جۆر بەکـارهێنـان دا کۆیـان دەکـاتـەوە کە یەکـەمیـان بەکـارهێنـانێتی بۆ (بـەکـارهێنـانێکی خۆیی)وجێ بـەجێ کـردنی پێداویستی‌یەکانی‌و دووەمیان بەکارهێنانی ئەو شمەکەیە وەك (هۆکارێکی ئاڵوویرکردن) .

ئۆرستـۆ، لێـرەدا ڕاستی‌یـەکی خستـۆتە ڕوو و پەردەیەکی تاریکی لەسـەر نهێنی‌یـەکی ئابـووری هەڵـداوەتـەوە کە بریتی‌یـە لە گرنگتـرین دۆزینەوەی ئابووری کە لە (جیاکاری‌یە) بەناوبانگەکەی‌دا کۆدەبێتەوە لەنێو (بەهای بەکارهێنان)و (بەهای ئاڵوویر)دا [٣٤]

مامـوستـا ئیبـراهیم کبە، لە پەراوەکەی‌دا لەژ ێر ناوی «تاريخ الاقتصاد والفكر الاقتصـادي» دەڵێ کە ئۆرستـۆ، لە ڕاستی‌دا پێشـەوای قوتابخانە مەوزوعی‌یـەکـانـە لە بەهادا، چونکە ئەو بە ڕوونی (بەها)و (نرخ) ئەیەك جیـادەکـاتـەوەو دەڵێ کە یەکـەمیـان دروست دەبێ پێش ئەوەی شمەکەکە بخـرێتـە بازارەوە واتـە پێش ئەوەی نرخ دروست بێ و ئەمەش جەوهەری تیوری مەوزوعی بەهایە . .

لە دۆزراوە گرنگەکانی تری ئۆرستۆ، پەی‌بردنی ئۆرستۆیە سەبارەت بە فرمـانی پارە ـ نەخت ـ وەك پێـوەرێـك بۆ بەهـای ئاڵـوویـر، واتـە بۆ دەستنیشـانکـردنی نرخەکان هەرچەندە کە ئۆرستۆ جەوهەری ئەم فرمانەی ناو نەبـردوە، بەلام پەنجـەی بۆ هۆی بوونـەکـەی ڕاکێشـاوە، کە ئەویش خواستێکی هاوبـەشـە لەسـەر شـمـەکـە ئاڵوویر پێکراوەکان . . سەرباری ئەمانەش ئۆرستۆ دەربارەی فرمانی نەخت (پارە) دوواوە وەك پێوەرێك یان بڵێن یەکە یەکی ژمێرەو فرمانی پارە وەك گەنجینەیەکی بەهاکان (هۆکاری پاشەکەوت . . ) واتە بۆ کرینی شمەکێکی پاشەڕۆژ . .

ئۆرستـۆ، تیـوری‌یـەکی نەفسی ـ دەروونی دەدات بەدەستـەوە ئەڕێی (بـەهـا)وە و (بـەها)ش لای ئەو لەنێو خودی شتومەکەکانەوە نی‌یە، بەڵکو دەربـراوە لەلایـەن ئەوانـەی کە ئارەزوویـان لەسـەر ئەو شتـومـەکـانـەیـەو ئاڵـوویـرەکـە پەسـەنـدە گەر پێـداویستی‌یـەکانی ئەو دوولا ئاڵوویرکەرە بە (یـەکسـانی) بەجێ بێن . . لەگـەل ئەوەی کە ئۆرستـۆ بەم شیکردنەوەیەی خۆی مەسـەلەی (بەهای ئاڵوویر)کردنی کردوتەوە «Exchange - Vallu» . .

جا لەو سەدەیـەوە تا سەدەی هەژدەی زایینی دەبـوایـە چاوەڕێ بکـرایـە تا ڕۆژانی دەرکـەوتنی قوتـابخـانـەی (ئـابـووری ڕامیـاری کلاسیکی)و تیـوری‌یـەکەیان سەبارەت بە مەسەلەی (بەها) تا دەهاتە ڕوو . . [٣٥] لە دوو توێی ئەم باسـەدا ئەوەمـان بۆ دەردەکـەوێت کە (هـەرچـەنـدە کە ئۆرستۆ لە چەنـد پەرەیـەکی (کـەم)دا بەرەو پیـری شیکـردنـەوەی هەنـدێ لە واقیعە ئابـووری‌یـەکـانەوە چووەو یەکالای کردونەتەوە، بەلام هەمیشـە ئەو کارەی ئەو لەو ڕووەوە هێندە بەپێت و پڕ بووە کە تای تەرازووی ئەم زۆر قورستر بوە لەنێو هەموو نووسەرو فەیلەسوفە کۆنەکان دا

## ئەگزینفۆن Xenophon (٤٢٥ ـ ٣٥٢ پ . ز)

ئەگـزینفۆن قوتابیی سۆکرات بووەو پاشان بۆتە سەرکردەیەکی ناوداری چینی ئۆروستۆکراتی ئەثینا . .

له هەرە پاشماوە گرنگەکانی کە لێرەدا مەبەستمان بێ، چەند باسێکیتی سەبارەت بە (دارایی گشتی) و لە هەموویان گرنگتر باسەکەیەتی لەژێر ناوی (ئابووریی ماڵ ـ ماڵداری) و یەکێکی تریان لەژێر ناوی (دەرامەتی ئەثینا) ـ یان لە زۆر شوێن دا بە (هۆکاری زیادکردنی دەرامەتی ئەثینا) ناودەبرێ، وئەوەی شایانی باسە، لە سەرجەمی ڕاکانی دا وا دەردەکەوێت کە ئەو ڕایانە نزیك بن لە ڕای قوتابخانەیی مارکانتیلی ـ مارکانتیلیزم کە لێرەدا دەرفەتی باسکردنمان نی یە..

.. بەکورتی گرنگترین بیرەکانی ئەگزینفون لە باسەکەی ـ ماڵداری ـ دا لەم خاڵانەدا کۆ دەبنەوە:

١ ـ جیاکاری یەکی ئەم سەبارەت بە (واتای سامان)، بەلکو ئەم پێناسەی سامان دەکات بەوەی کە زیادەیەك بێ لە خاوەنداریتی و بوونێك زیاد لە پێویستی، واتە ئەم وای لە (پێویستی) کردوە کە هەمیشە پێوەرێکی سامان واتە (دەرامەت) بێ و بەو پێ یە، ئەگزینفون وا بۆ مەسەلەکە دەچوو کە.. پیاوێکی هەژار، هەمیشە دەوڵەمەندترە لە پیاوێکی دەوڵەمەند ئەگەر پێداویستی یەکانی یەکەم کەمتر بێ و ئەو پێداویستی یانەیان هەمیشە بەئاسانی بۆ بێتە دەست.

٢ ـ هەڵسەنگاندنی پیشە هەمەجۆرەکان لەنێویەك دا وئەم پیشەی کشتوکاڵ هەمیشە بە مەزنترین و گرنگترین پیشە زانیوە لەچاو پیشەکانی تردا: (بازرگانی و پیشەسازی یە دەستی یەکان) و کە گوایە کە پیشەی کشتوکاڵ هەردەم کشتارو کارکەرەکانی پتەوو بەهێزدەکات، بەلام پیشەکانی تر خاوەنەکانی لاواز دەکات..

٣ ـ (ئەگزینفون)یش دانی ناوە بە شەرعیەت و ڕوخساری ڕژێمی کۆیلایەتی دا، هەرچەندە لەو کاتەی کە هەمیشە داوای کردوە کە مامەڵەیەکی مرۆڤایەتیان لەگەڵ دا بکرێت..

بیرە ئابووری یە سەرەکیەکانی ئەگزینفون لە باسە بەناوبانگەکەی دا: هۆکارەکانی زۆرکردنی دەرامەتی ئەثینا..) دەر دەکەوێت..

لەم باسەدا، بیری مارکانتیلی لە بیروڕای ئەگزینفون دا زۆر بە ڕوونی دیارە، لەوانە:

١ ـ بازرگانیی دەرەکی بە سەرەکی و گرنگترین سەرچاوەی دەرامەتی دەوڵەت دادەنێ، بۆیە داوای ڕێپێدان و ڕێخوشکردنی بۆ بازرگانە بیگانەکان کردوەو کە هەرگیز نابێ تەنگیان پێ هەڵ بچنن و سەرشانیان بە ڕێگرو کۆسپ دانان لە ڕێیان دا قورس بکرێت..

٢ ـ بەڕوونی لەو باسەی دا دەستنیشانی (یاسای کەم بوونی بەروو بومی) کردوە.

٣ ـ دووپاتی گۆڕانی بەهای (زیر ـ ئاڵتون)ی کردوە بەپێی زیادبوونی قەوارەکەی.. بەلام سەیر لەوە دایە کە ئەم سەرنجەی خۆی سەبارەت بە (زیو) نەخستوتە ڕوو بە بەڵگەی ئەوەی کە داخوازی لەسەر ئەمیان کەمە..

٤ ـ دەستنیشانی (یاسای خستنەڕووو خواست) وەك هۆکارێکی چەسپێندر سەبارەت بە مەسەلەی ڕادەی بەرزو نزمی نرخ..

٥ ـ هەرگیز لەگەڵ ئەوەدا نەبووە کە باج و خەراجێکی زۆر بخرێنە سەر خەڵك و هەمیشە داوای کەم کردنەوەی کردوون چەند بتوانرێ..

**ـ هەڵسەنگاندنێکی بیرە فەیلەسوفی یە یونانی یەکان کە هەندێ لە ڕا ئابووری یەکانیانمان بۆ ئەدات بە دەستەوە..**

ئەگەر سەرنج بدەینە پەراوەکەی مامۆستا هانی لەژێر ناوی (تاریخ الفکر الاقتصادي ١٩٤٧) سەبارەت بەبیری یونانی، لە بەشی چوارەمی ئەو پەراوەدا دەستنیشانی بۆچوونەکانی خۆی کردوون سەبارەت بەو بیرە و ئەم بارەیە دەڵێ کە:[٣٩]

١) بیری یونانی (یەکەم) بیرکردنەوە بووە سەبارەت بە تەفسیری ئابووری بۆ مێژوو، بەلام لەگەڵ ئەوەش دا دەڵێت کە ئەو تەفسیرەی ئەوان ماددی نەبوە، چونکە ئەوان پێویستی (دەوڵە)تیان لە هەمەجۆریی پێداویستی یەکانی مرۆڤ دا دیوەتەوە کە هەرگیز مرۆڤ بە تەنیا ئەو پێویستیانەی بۆ ئەنجام نایەت.. و لە هەمان کاتیش دا دەڵێن کە هەرگیز ناتوانرێ کە مانای تەفسیری ئابووری سەبارەت بە مێژوو بەو ڕا ساکارو سادەیەی ئەوان دەربڕێ کە پڕ بە پڕی خۆی ماناکەی ئەمڕۆی بێ..

٢) تەفسیری یونانی یەکان سەبارەت بە دەوڵەت، تەفسیرێکی عوضوی یە، واتە ئەوان دەوڵەتیان بە (کۆ) داناوەو (تاقە کەسێك) لە کۆمەڵ و بەتەنیا (بەشێك) لەو دەوڵەتە. واتە گرنگیی زیاتر دراوە بە دەوڵەت وەك لە مرۆڤ و (دەوڵەت) پێش مرۆڤ خراوەو تەنانەت (تاقە کەسێك)یکیان بەبێ دەوڵەت بە مرۆڤ دانەناوە..

هانی؛ دەڵێت ئەم ڕایەش سەبارەت بە دەوڵەت، بۆ مەبەستی دەستخستنی دەوڵەتی یونانی ئەوسا بوو بۆ نیوزورەها کاروبارو فرمانی ئابووری و کۆمەلایەتی خەڵکی.. وەك چاودێری و سەرپەرشتی کردنی پێوان و کێشان و دەستنیشانکردنی هەندێك یان زۆربەی کەرەستەو شمەکەکان و سەرپەرشتی جوڵاندنەوە و هاتووچۆ کردنی گوێ بەندەرەکان و یارمەتی لیقەوماوانی شەڕو شۆڕو جەنگ.. هتد. وئەم واتا عوزوی یە کە زۆر بلاو بوو لە هەشت سەدەی پێش زایین دا.. هەروەك چۆن بۆچوونەکانی (ئەکریپای ڕومانی ـ سەدەی چواری پ. ز ـ و مەنشیوسی چینی ـ ٣٨٠ ـ ٢٩٠ پ: ز ـ و هەندێ لە هیندی یەکان وەك لە گۆرانی یەکەی (پروشا)دا دووپاتی دەکەنەوە.

ئەمە بە شێوەیەکی ڕوون سەرەتای گۆڕانکاری یەکی دەبەخشی بەرەو دابەشکردنی کاری کۆمەلایەتی کە پەیوەند بوو بە کەرت بوونی ـ دابەش بوونی ـ چینایەتی یەکەم لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتی دا و بەتایبەت

جیابوونەوەی (کاری بیر) لە (کاری دەستی) کە ئەمیان بەسترا بوو بە کۆیلەوە.

٣) بانگـەوازی بیـری یۆنـانی سـەبـارەت بە ڕێکخستنی دانیشتـوان لەلایـەن دەولـەتـەوە، ئیفلاتون لە هەرە گەورە بیرکەرەوەکانی یۆنانی یەکان بووە لەم ڕووەوە، هانی دەڵێ: کە ئەم ڕایە ڕایەکی وشك و وەستاوە چونکە لەسـەر بنەڕەتی دەستنیشانکردنی ژمارەی دانیشتوانی دەولەتە و دەولەت بە فرمانی سەر شانی خۆی دەزانێ کە دەست بخاتە پیاچوونەوەی بە ژمارەی دانیشتوانی دا لە کاتی کەم بوون یان زیادبوونی دا و (لەکاتی زۆر بوونی دا ئیفـلاتـون پێش نیـاری ئەوەی کردووە کە خەلکـەکـە ڕوو بکـەنـە موستعمـەراتـەکـان و لە کاتی کەم بوونـەوەی دا پێش نیـاری هانـدانی ژن هێنـان و شووکـردن و تێکـەلاوبـوونـە بە جۆرەهـا هوو هۆکـار بۆ بەجێ هێنانی ئەو مەبەستە).

٤) تێـڕوانینی یۆنـانی یـەکـان سـەبـارەت بە خاوەنـداریتی تایبـەتی - تاکـەکەسی - تێڕوانینێکی مام ناوەندی بووەو ئەوان تەو خاوەنداریتی یەیان بە شتێکی سروشتی و شیـاو زانیـوە بۆ سروشتی مرۆڤ، چونکـە دەبێتـە هانـدەرێـك و پاڵ پێـوەنـەرێـك بۆ کارکـردن و ناکـۆکی لەنیـو خەلـك دا دووردەخـاتـەوەو ئەو نایـەکسـانی یـەی - بەڕای ئەوان - لە بەربـلاوی و کۆمـونیستی خاوەنـداریتی دا دروست دەبێ نایهێلی، بەلام لەگـەل ئەم ڕایـەشیـان دا لە هەنـدێ ناوچـەو خاوەنـداریتی یـەدا ڕێگـای بوونی ئەو خاوەنداریتی یە کۆمونە هاوبەشیەیان داوە گەر بەرژەوەندی گشتی پێویستی کردبێ، بۆ ئەمە ئیفلاتون بۆ نموونە دەهێنیتەوە..

٥) هانـی سەرنـجـی ئەوەی داوە کە هۆی (قـەدەغـەکـردنـی سوو سوخـواردن) لای بیـرکـەرەوە یۆنـانی یەکان لە ئەنجامی ئەوەدا بووە کە ئەو کارە بەرهـەمهێنـەر نەبـووە، بەلکـو بەگشتی بۆ (بـەکـاربـردن) بووە و ئەو قەرزدانەش دراوە بە دەست کورت و هەژارەکان..

٦) یۆنـانی یـەکـان، هەمیشە دژی زیاد ڕۆیشتن (التطرف) بوون، چ سەبـارەت بە مەسـەلـەی زۆر دەولـەمـەنـد بوون و چ سەبـارەت بە زۆر هەژاری و دەسـت کورتـی، ئۆرستـو لەم ڕووەوە دەبینێ کە (هـەژاری) هەمـیـشـە باوکـی ڕوودانـی تاوان کردن و تەقـینـەوەی شۆرشـەو دەولـەمـەنـدی یـەکی زۆریش هەمیشـە لای ئەو کارامـەیی و بەرهـەمهێنان کەم دەکاتەوە و ڕێ لە بەختیاری و خۆشگوزەرانی گشتی دەبەستێتەوە..

٧) هەروەهـا هانی.. سـەبـارەت بە فەلسـەفـەی یۆنـانی، دەڵێ کە واتـاکەی سـەبارەت بە (یاسای سروشتی) کاریگەری یەکی گەورەی خۆی بەخـشیـوە بۆ سەر (یـاسـای ئابـووری) و هەمیشـە لە زۆر واتـای دا ڕوونبینی یـەکی مەزنی داوە بە دەستـەوە کە پاش خۆیـان شوێن پێی ئەو ڕوونبینی یەیان لە تەفسـیراتەکانی قوتابخانە ئابووری یە کلاسیکی یەکان دا دیارکەوتووە ڕەنگاوی خۆیان داوەتەوەو ئەو بیرەیان نواندوە..

٨) هانی، پەنجـەی ڕادەکێشی بۆ (فـەلسـەفـەی یونانی ئیبیکورۆس - ئیبیکوری) و سـەرنجی ئەوەی داوە کە واتاکانی ئەو فەلسەفەیە سەبارەت بەوەی کە (هـەستـەکـان) سـەرچـاوەی زانیین و ئەم واتـایـە بنـاغـەی مەتهـەجیەتێکی ڕیالیستی یە لە ئابووری هاوچەرخ دا، هەروەها واتاکانی ئەو فەلسەفەیە سەبارەت بە خۆشی و ناخۆشی یان بلێین (تام و چێژ و ئازار و تالی) بنـاغـەی (قـوتابخانە نەفعی یەکان) بوون کە لە سەدەی نۆزدەیەم دا مەزهەبێکی باو بوون..

٩) لە سەرنجـەکـانی تری هانی سەبارەت بە بیرلای یونانی دەڵی: کە واتـای ئەو بیـرە لە مەسـەلـەی ئابـووری بە شێـوەیەکی گشتی، واتایەکی (وجـوبی) یـە (بـەتـایبەتی ڕەوشتی) و گوایە ئەو بیرە زانستی (ئابووری) لە (پراکتك) جیانەکردۆتەوەو سـەرنجی ئەوەش دەدا کە تەنیا هۆکارێك بێ بۆ ژیانێکی باش و بەرزکردنەوەی پلەو ڕادەی (خوو ڕەوشت) لەنیو ئەندامانی کۆمـەل دا. ئەمـە لەگـەل ئەوەی کە (بیـری یونانی) هەرگیز (ئابووری) لە (ڕامیاری) جیانەکردوتەوە..

١٠) لەگـەل ئەمـانـەش دا هانی، فەلسـەفەی یونانی بە فەلسـەفەیەکی میثـالی دادەنێ، لەبـەر ئەوەی ئەم فەلسـەفـەیـە دەیەوێت سلوکی ئابوری بەپێی نەریتێکی بەرز بخـولقێنێ و پێـداویستی یەکانی کۆمەڵیش بەپێی ئەو نەریتە دەسنیشان بکات.

١١) بیـری یۆنـانی، مرۆڤ مل کەچی دەولـەت دەکـات، بەمـانـای ئەوەی کە واتـای دەولـەت، واتـایـەکی کۆ و دەستەلاتدارێکی فەشەنگ و مەزنـە (Totalitarism) نەك واتـایـەکی پەیمـانگـەری، بەپێچـەوانـەی ئەو تیـوری یـانـەی کە باو بوون بەسـەر بیـری ڕامیـاری دا لە سەرەتای ڕژێمی سەرمـایـەداری دا (هـۆبـز) و (لـوك) و (ڕۆسو). ئەو بیرەش ئەنجامی واتای عضوی دەولەتە هەروەك باسیان کرد..

## ئەنجامی باس:

ئەوەی لە دووتوێی ئەم باسـەدا دەمـان گەیێنیتـە ئەنجام، ئەوەیە کە ئەم خالانـەی خوارەوەی لێ هەل دەهێنجین و ئەوەمان بۆ دەسەلمیت کە (بیرە ئابـووری یـەکانی هەریەك لە (ئیفلاتون و ئۆرستۆ و ئەکزینفۆن) لە شوێنی خۆیان دا هەرگیز کت ومت نەماونەتەوە، بەلکو هەر یەکەیان و هەریەك بە پێ خۆی بەتـایبـەت (ئیفـلاتون و ئۆرستۆ) کاریگەری خۆیان بەخشیوە لە بنیـات نانی قوتابخانە ئابووری یەکانی چەرخەکانی پاش خۆیان و ئەو ڕاو بۆچـوونـە ئابووری یەی ئەوانیان کردوە بە هەوێنی قوتابخانەکانیان و بۆ ئەم ئەنجامەش و ئەو ڕ یـەی هەر یەکەیان بە جیا دەخەینە ڕوو، تا واتەکەمان لەم بارەیـەوە بـسـەلمێنین و پەرەیـەکی نهێنی مێژوویی ئابووری لەسەر ئەو بۆ رە دیـری کـر وەند هەل بدەینەوە..

یەکەم : واتای بوغزاندنی بازرگانیی دەرەکی لە تیوری یەکەی ئیفلاتون دا بە زەقی دیارە لە هەمان راو بۆچوونی قوتابخانە ئابووری یە (رۆمانتیکی یە ئەلمانی )یەکان دا وەك بیرێکی سەرەکی . .

دووەم : تی روانینە ئابوری ناسەکان وەك چاککەرەوەیەکی کۆمەلایەتی : ئەم بۆچوونەش تائیستاش سۆشیالیستی یە نازانستی یەکان، سوورن لەسەر ئەم بۆچوونەو ئەوانەش دەروانە هۆکارەکانی گەشەکردنی کومەلگاکان بە لێیچراوی یەك لە یاساکانی ئابووری زانستی . .

سی یەم : واتای دەستەلاتداریی (هەلبژاراوان)و ئەم واتایە، یا ئەم بۆچوونەی ئیفلاتون کشاونەتە نێو زوربەی زۆری تیوری یە کۆمەلایەتیەکان و رامیاری یە هاوچەرخەکان بۆ نموونە (باریتو ـ کە یەکێکە لە رابەرەکانی قوتابخانە ریاضی یەکانی ئابووری) بە دووی ئەم رایەدا رویشتووەو بانگەوازی ئەو بیرەی داوە بەنێو کۆمەل داو بە هێزێکی پالپێوەنەرو بە پر نەوژمی داناوە سەبارەت بە گەشەکردنی کۆمەلایەتی . . هەروەها (ویبز) لە هەندێ لە نووسراوە رۆمانەکانی دا چۆکی بۆ ئەم رایەی ئیفلاتون داداوە . .

چوارەم : دەستەلاتداریی مێشك و هۆشمەندی : ئەم رایەی ئیفلاتون لای هەموو فەیلەسووفە (هۆشمەندی یەکانی (سەدەی نوێ) پەسەند بووە و هاواری ئەو را پەسەند بوویەیان کردوە . .

پێنجەم : واتا یان بیری (سەدەی ئالتونی پێشوو)ی ئیفلاتون هەردەم لای قوتابخانە رۆمانتیکیەکان لە ئابووریی دا دەرکەوتووە هەروەها لای رومانتیکیەکانی ئەلمان لە سەدەی پێشوودا . . وەك (فیختەو مولەر) ئەم دوانەی کە سەدەکانی ناوەراستیان هەمیشە بە (سەدەی ئالتونی) لە قەلەم داوە . .

شەشەم : سەبارەت بە پاشماوە ئابووری یەکانی کەلە فەیلەسوفی یونان ئورستو و بەتایبەت دەربارەی بەها، هەروەك گوتمان ئەم بەراستی تیوری بەهای لە شوێنی خۆیدا داناوە، هەرچەندە ئەم تەواو گەشەی پێ نەکردوە، وەك چون قوتابخانە ئابووری یە کلاسیکی یەکان گەشەیان پی کردووە بەتایبەت (ریکاردو . . ) .

حەوتەم : دارشتنی ئورستو سەبارەت بە تیوری یە ئابووری یەکانی لەسەر شێوەو فورمیکی (رەوشتی) هەمیشە بەردی بناغەی تەقینەوەی (قوتابخانەیی یەکان . . واتە سوکولایی یەکانی) سەدەی ناوەراست بووە . . بونموونە (تیوری نرخێکی دادپەروەری)و (کرێ یەکی دادپەروەریانە) و (تیوری سوو و سروشتی ئالوگۆر . . وئالووێرو فرمانەکانی پارە . . هتد .

ئەمانەی ئورستو هەموو ئەو بیرانە بوون کە دەورێکی گەورەیان دی لە دارشتنی بیرە ئابوورییە سکولایەکان ـ قوتابخانەیی یەکان ـ ١٢٢٥ ـ ١٢٧٤ی زایینی ، کە بریتی بوو لە تیکەلاوێکی ئورستوتالیسی بە بیری مەسیحی و بۆ ئەم مەبەستە کەلکێکی زۆریان لە بیرەکانی ئورستو وەرگرت تا ئەو بیرە گونجاوانەی لێی پێك بهێنن و بگونجێ لەگەل بارو زروفی کۆمەلگا دەرەبەگایەتی یەکەیان دا . .

هەشتەم : ئورستو، یەکەم کەس بوو کە بۆچوون و روانێکی دانراو لە روانگەی رەوشتی یەوە جیابکاتەوە سەبارەت بە کرداری ئابووری ، پاشان ئەم خۆی هات و سەرلەنوێ لەسەر رێوشوێن و روانگەیەکی رەوشتی یەوە هەردووکیانی یەك خست . .

نۆیەم : سەبارەت بە شیتالکردنەوەی گەشەکردنی کۆمەل و گۆستنەوەی لە کشتوکالێکی بەسەر خۆ داخراودا بۆ بواری بازرگانی ، هیچ کەسێك پێش ئورستو نەکەوتووەو تەنانەت تا پاش چەند سەدەیەکیش کەس لەم رووەوە پاش ئەم دەرنەکەوتووە . .

دەیەم : بەلام رای ئورستو سەبارەت بە دان نانی بەبوونی کۆیلایەتی داو بە شێوەیەکی کوێرانە هەمیشە خالێکی لاوازی لەسەر تۆمار دەکرێت ، لەو کاتەی کە رووخاندن و هەرەس هێنانی شارستانێتی یونانی یەکان و رۆمانەکان بەهۆی ئەم رژێمەوە بەئەنجام هات و بەلگەی ئورستو بەبوونی کوێلەو کۆیلایەتی ئەوە بوو کە گوایە (نایەکسانی یەکی سروشتی) هەیە لەنێو خەلکانی کۆمەل دا . .

کەواتە لەم باسەدا ، ئەوەمان بۆ دەسەلمێ کە بیرەکانی کەلە فەیلەسووفەکانی یونان و لێرەدا مەبەستمان لە (ئیفلاتون و بەتایبەت ئورستو)یە ، بوونەتە کەرەسەیەکی بنچینەیی تێکرای بیری ئابووری لە جیهان دا و لەتایبەت کاروانی بیری ئابووری لە ئەورووپادا کە کاریگەری یەکی مەزن و رەنگاوی تەواوی خۆیان داوەتەوەو بوونەتە هەوێنی قوتابخانە ئابووری یەکانی پاش خۆیان و بەتایبەت قوتابخانە هاوچە رخەکان .

جگە لەمەش گەرانەوەمان بۆ ئەم سەرچاوەیە ئەوەمان بۆدەسەلمێنێ کە بیرە ئابووری یە یونانی یەکان بە سەرچاوەی یەکەمی مێژ ووی کاروانی ئابووری دەژمێررێت و هەرگیز ناکرێت کە کاریگەری و دەوری ئەوان لە مێژ ووی ئابووری دا پێشێل بکرێت . .

سەرباری ئەمانەی سەرەوەش ، لەم باسەمان دا گەیشتینە ئەنجامی ئەوەی کە مێژ ووی بیری ئابووری و قوتابخانەکانی لەنیوەی دووەمی سەدەی چوارەمی پێش زایینەوە دەستی پێ کردوە و درێژ یی ئەو کاروانەشمان بە (بیست و چوار سەدە) بۆ دەژمێررێت . .

## سەرچاوەکان :


١ ـ أرك رول/ تأريخ الفكر الاقتصادي/ ترجمة د. راشد البراوي/ القاهرة/ ١٩٦٨ .

٢ ـ ابراهيم كبه/ تأريخ الاقتصاد والفكر الاقتصادي/ الجزء الأول مطبعة العاني/ بغداد ١٩٧٣ .

٣ ـ د. محمد عزيز/ تأريخ الافكار الاقتصادية/ مطبعة المعارف بغداد ١٩٥٦ .

٤ ـ د. لبيب شقير/ تأريخ الفكر الاقتصادي/ دار نهضة مصر للطبع والنشر/ القاهرة (بدون تأريخ) .

٥ ـ د. عدنان عباس علي/ تأريخ الفكر الاقتصادي/ الجامعة المستنصرية/ بغداد ١٩٧٩ .

٦ ـ د. باسل البستاني/ الفكر الاقتصادي من التناقض الى النضوج/ وزارة الثافة والاعلام/ بغداد ١٩٨٦

٧ ـ د. عبدالرسول سلمان/ معالم الفكر الاقتصادي/ الكتاب الأول/ جامعة بغداد/ الطبعة الأولى ١٩٦٦ .

٨ ـ جورج سول/ المذاهب الاقتصادية الكبرى/ ترجمة الدكتور راشد البراوي/ مكتبة النهضة/ القاهرة ١٩٦٥

٩ ـ د. طارق العزاوي/ الفكر والتأريخ الاقتصادي/ جامعة بغداد ١٩٧٥ .

١٠ ـ نطلة الحكيم ومحمد مظهر سعيد/ جمهورية افلاطون/ دار المعارف / القاهرة ١٩٦٣ .

١١ ـ الدكتور رفعت المحجوب/ النظم الاقتصادية١ مكتبة النهضة/ القاهرة ١٩٥٦


پەراوێز:

(١) ابراهيم كبه/ تأريخ الاقتصاد والفكر الاقتصادي/ جامعة بغداد/ ١٩٧٣

(*) نەختی : نەقدی.

(٢) هەمان سەرچاوە لاپەڕە ٣٨٦ـ ٣٨٧ .

(٣) بوزیاتر سەیری : د. لبيب شقير/ تأريخ الفكر الاقتصادي/ دار النهضة القاهرة.

(٤) د. محمد دويدار/ تأريخ الفكر الاقتصادي/ جامعة الاسكندرية/ دار الجامعات المصرية/ بدرن تأريخ لاپەڕە٧

(٥) ابراهيم كبه/ تأريخ الاقتصاد والفكر الاقتصادي/ چاپی ١ بغداد ١٩٧٣ لاپەڕە ٣٨٨

(٦) د. محمد عزيز/ تأريخ الأفكار الاقتصادية بغداد واسماعيل صبري/ دروس في الاقتصاد السياسي چاپی١ لاپەڕە/ ٢٩٧ کردبوو، پاڵی پێوەنا کە لەگەڵ دەستەیەك لە قوتابیانی سوکرات پێکەوە بەرەو شاخ هەڵ بێن . . ئیفلاتون پاش گەشتەکەی بۆ خوارووی ئیتالیا ساڵی ٣٨٧ پ . ز هاتەوە بۆ (ئەثینا) پاش ئەوەی هەستی کرد کە بارو دۆخەکەی ئەوێ هێمن ولەسەرخۆ بوّتەوە . . ئینجا قوتابخانەیەکی لەنێو بوستانێکی دەم شاردا کردەوە بەناوی (ئەکادیمیا) بەناوی ئەو بستانەوە کە بە (ئەکادیموّس)یان ناودەبرد . . (سەیری عدنان عباس علی/ الفكر الاقتصادی/ ١٩٧٩ بکە .

(٧) The Lows, BK. XI p. 921.

(٨) The Lows, BK.V p. 721, 742

هەروەها سەیری د. محمد عزيز/ تأريخ الافكار الاقتصادية/ بغداد ١٩٥٦ لاپەڕە ١٥

(٩) هەمان سەرچاوەی پێشو لاپەڕە ١٦ .

(١٠) ابراهيم كبه/ سەرچاوەیەکی پێشو لاپەڕە ٣٩٠ .

(١١) سەرچاوەی پێشو لاپەڕە ٣٩١

(١٢) سەرچاوەی پێشو لاپەڕە ٣٩١ .

(١٣) د. طارق العزاوي/ الفكر والتأريخ الاقتصادي بغداد ط٢/ ١٩٧٥ لاپەڕە ٢٤ ـ ٢٥

(*) ئیفلاتون جیاوازی پیاوو ژنی نەکردووەو هەردوکیانی وەك یەك سەیرکردوە، وهەریەکەیانی بەپێی شیاوی بۆ ئەوچینە داناوە . .

(١٤) ابراهيم كبه/ لاپەڕە ٣٩٣ .

(١٥) الدكتور لبيب شقير/ تأريخ الفكر الاقتصادي/ دار النهضة/ القاهرة لاپە رە ٣٦

(١٦) دكتور شقير/ سەرچاوەی پێشو.

(١٧) نطلة الحكيم ومحمد مظهر سعيد/ جمهورية افلاطون/ دار المعارف/ القاهرة ١٩٦٣ ص٤٥ود. طارق العزاوي/ جامعة بغداد ١٩٧٥ لاپەڕە ٢٥

(١٨) د. لبيب شقير/ تأريخ الفكر الاقتصادي/ دار نهضة مصر/ القاهرة لاپەڕە ٣٧

(١٩) سەرچاوەی پێشو لاپەڕە ٣٨ .

(٢٠) د. طارق العزاوي/ الفكر والتأريخ الاقتصادي/ جامعة بغداد/ ١٩٧٥ لاپەڕە ٢٥

(٢١) د. لبيب شقير/ لاپەڕە (٣٩) هەروەها بنداره پەراوەکەی أريك رول/ گۆرینی د. راشد بەراوی/ لاپەڕە ٢١ ـ ٢٦

(٢) أرسطو/ السياسة : بەشی یەکەم ـ پەراوی یەکەم باسی هەشتەم .

(٢٣) کارو کرداری گۆڕینەوە ـ ئاڵوویرکردنی شتومەکەکان لەنێو خودی نێو کۆمەڵە سەرەتاییەکانی ئەوسادا هەرگیز رووی نەداوە، بەڵکو ئەو کارە لە (سنووری دەرەکی) ئەو کۆمەڵانەدا پێك هاتووە سەبارەت بە نەبوونی

جۆرێـك لەو شـتـومـەك و پێداویستیانە لەو شوێنانەی بە یەكتر دەگەیشتن، كەواتـە ئەو گۆڕینـەوەیـە لەنێـو دەسـتـەو كۆمەڵە سـەرەتایی یە جیاجیاكان دا ڕوویداوە كە باروزروفی سـروشتیـان جیـاواز بوە كە لە ژێـر سێبـەری ئەو بارەدا بەرهەمی خۆییان بەدەست هێناوە، نەك ئەو گۆڕینەوەو ئاڵوگۆڕكردنە لە ناوئـاختنی كۆمـەڵـەكـان دا ڕوویدابێ . . لێـرەدا (گـۆڕینـەوە) دەستی پێكـردوە كە زۆری پێ نـاچی كاریگـەری یـەكـەی تەشـەنـە دەكـاتە سەر ناوخۆی ئەو كومەڵە سەرەتاییانەش و دەبێتە هۆی پارچەپارچە بوونیان لەناو خۆیان دا بەو پێ یەی ئۆرستۆ كە دەڵێ : (كە هەموو ئەندامانی ـ خەڵكانی ـ كۆمـەڵگا سـەرەتایی یەكان (خاوەنداریێتی یەكی گشتی ئەو شتومەكانەیان) هەبـووو پاشـان كە پارچـە دەبن لەنێـو خۆیـان دا، خاوەنداریێتی هەندێك لەوشتـومـەكـانـە بە (خـاوەنـداریێتی یەكی گشتی دەمێنێتەوە لەنێوانیان دا) وشتـەكـانی تریش كە (روخســارێكی پێـداویـستی) تێدا بووەو (شیـاوی گۆڕینەوە) بوە لە نیوانیان دا و، دەگۆڕایەوە بەپێ ی پێویستیان . .

(٢٤) ئەوەی شایـانی باســە ئەوەیـە، كە پێنـج بەشی یەكـەمی پەڕاوەكەی (ئـادەم سمیـث) كە پاشـان لە سەدەی هەژدەیەمی زایینیدا دەردەكەون لە وڵاتی ئینگلستـــان دا، بە گەشـــەكـــردنێكی ئەم بۆچـــوونـــەی ئۆرستـــۆ دەژمێـرریت و بۆ ئەوەی لێـرەدا زیـاترلەوەی سەرەوە نزیك بینەوە باشتروایە ئەو عونـسـوورانـەی هەر (مـامەلەیەكی نەختی) لێ دروست دەبێ بیخەینە بەرچـاوان، و فرۆشتنی خانـویەك بۆنموونە دەهێنینەوە : لێرەدا دووگۆڕەوە هەیـە (فـرۆشیـارو كریـار) كە پەیـوەندییەكی كۆمەلایەتی هەیە بەو پێ یە (فـــرۆشیـــار) واز لە قەوارەی شـمـــەكێـك دەهێنێ بۆ (كـریـار) كە لێـرەدا (خـانـوو)یكە، كە بە (دەرپەڕینی شمەكیێ) «real flow» ناودەبرێ، كە لە بری ئەوە (كریار) واز لە برێك لەپارە دەهێنێ بۆ (فرۆشیار) واتە «ژمارەیەك لە یەكـەی نەختی» كە بە دەرپـەڕینی نەختی ناودەبرێ : «monetary flow». پەیـوەنـدی نێـو (بـری دەرپـەڕینی شمـەكی یـەكـە) (یـەكەیەكە كە لێرەدا (خـانـو)مـان بە نمـوونـە هێنـایـەوەو نێو (بری دەرپەڕینی نەختی) كە ئەو یەكـەیـەش یەكـەیـەكی نەختی یـە كە لێـرەدا بە دینـار ناویدەبـەین ٣٠٠ دینارە . . ئەم بری پارەیە (نرخی) یەكە شمەكییەكە دەگەینێ كە شوێنی گۆڕینەوەكەیە كە ٣٠٠ دینارە (أرسطو ـ السیاسة لاپەڕە ٥٧ . . )

(٢٥) لەو كاتـەی كە مەبـەست لە چالاكی ئابـوری بریتی یـە لە تێركردنی مرۆڤ لە پێـداویـستی یـەكـانی ژیانی دا، ئەو بەروبومانەی بەرهەم دێن لە ئەنجـامی ئەو چالاكی یـەدا هەردەم (بەهایەكی بەكاربردنیان) تیادا هەیە، واتـە توانیـاو شیاویی ئەم بەرهەم هاتوانە سەبارەت بە تێركردنی پێداویستی دەست نیشـانكـراو . . كەواتـە ئەو بەرهـەمـانە بەكەڵكن و ئەو گونجاویی و شیاویایەی ئەو بەرهەمانە دەگەڕێتەوە بۆ (سروشت و خصائصی سروشتی) ئەو كەرەسـەو ماددانـەی لەو بەرهـەمـەدا بەكاردێن و هەروەها (خصائصی كار)ی ئەو تاقە كەسی یە یا ئەو چەند كەسانەی بەرهەمەكەی پێ بە ئەنجام دێن . ئەم خصـائصـانە تێكرا پێكیانەوە وا لە بەرهەمەكە دەكەن كە شیاوی بەكـاربـردن بن لەلایـەن مرۆڤـەوە بۆ جێبـەجێ كردنی پێـداویـستی

دەستنیشـانكراو لێرەدا شمەكێكی كە یان بەرهەمێكی كە ئەو پێداویـستی یە

دەستنیشانكراوە هەرگیز مرۆڤی پێ نەهێنرێتە دی . . بۆ نموونە (خامەیەكی نوسینی ڕەش شیـاوی بەكـارهێنانە سەبارەت بە نوسین، چونكە لە ماددەو كەرەســەیــەك دروســت دەكــرێــت كە لە سروشـتـیدا پاشمــاوەیــەك بەجێ دەهێڵی لەسەر كاغەزەكەو هەروەها چونكە بە جۆرە كارێك پێك دێ كە خصـائصی تایبـەتی دەداتێ كە وای لێدەكات كە بە ئاسانی بەدەست بگیـرێت بە مەبـەستی نووسین. بەروبـووم و بەرهـەمـەكان (بەهایەكی) بەكـارهێـنـانیـان هەیـە لەژێـر سێبـەری هەمـوو شێـوەكانی بەرهەمهێنان : (بەرهەمی سروشتی)و (بەرهەمی گۆڕینـەوە) . . بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە كە هەر لە دەستـپێكردنی گۆڕینەوەكە بەرهەمهاتوەكان دەبنە شمەك) یان بڵێین بە شمـەك ناودەبـرێن . . واتـە جگـە لە بەهـایـەكی بەكارهێنانی (بـەهـایـەكی) تر دەبێ، واتـە شمـەكـەكە شیاوی ئەوە دەبێ كە (شوێنی پەیـوەنـدی گۆڕینـەوەی هەبێ) لەنێـو ئەنـدامـانی كۆمەڵ دا . . جا لێرەدا بەهـای بەكارهێـنانی شمەكەكە مەرجێكی بەهایە : واتە بۆئەوەی شمەكەكە شیـــاوو شوێنی كاری گۆڕینـــەوە بێ، دەبێ بەهـایـەكی (بـەكـارهێنـانی كۆمـەلایـەتی) هەبێ، كە دەبێ كەڵـك بەخشێكی كۆمـەلایەتی بێ، واتە دەبێ و مەرجیش دایە كە كەڵك بەخش بێ بۆ خەڵكانی تر.

لە ئابووریی گۆڕینەوەدا، شمەكەكە، دەبێ (بەهای خۆی) هەبێ و لە هەمـان كات دا (بـەهـای بەكـارهێنـانی . . ) بەڵام یەكێكیـان پێچەوانەی ئەوی كەیــە، یان بڵێـن ئەویـــان ئەوی تر نەفـی دەكـــات : واتـــە گەر تۆ شمـەكـەكـەت وەك (بـەهایەكی بەكارهێنان) بەكارهێنا لە (بەكاربردنێكی تایبـەتیدا) یا گەر خەڵـوزت لە گەرم كردنەوەی ماڵەكەت دا بەكارهێنا یان لە بەرهەم دا، یان گەر خەڵوزەكەت بەكارهێنا لە بە ئەنجام هێنانی وزەیەك لە بەرهـــەمهێنـــان لە كارگـەیـەك دا بەوە تۆ توانـای بەكـارهێنـانـەكـەیت دوورخستـەوە وەك بەهـایـەك، واتـە هەڵسیت بەدەوری گۆڕینەوەی ئەمەر لەلاو ڕوویەكی ترەوە گەر تۆ شمەكەكەت لە گۆڕینەوە بەكاربێنی ڕاستـەوخۆ لە كردارێكی ئاڵوگۆڕكردن دا یاوەكو بەشێـوەیەكی ناڕاستـەوخۆ (واتە بەهۆی پارەوە) ئەوە لێـرەدا تۆ خۆت بێ بەش كردووە لە بەكـارهێـنـانی شمـەكەكەدا وەك (بەهای بەكارهێنان) ( . . ارك رول ـ ترجمة راشد البراوي)

(٢٦) د. محمد دویدار ـ الفكر الاقتصادي / دار الجامعات المصرية .

(٢٧) د. محمد دویدار/ تأریخ الفكر الاقتصادي / جامعة الاسكندرية / دار الجـامعـات المصـريـة . بدون تأریخ . هەروەها د. باسل البستاني / الفكر الاقتصادي من التناقض الى النضوج/ وزارة الاعلام/ بغداد ١٩٨٦ .

(*) بۆ ئەوەی چوارچێـوەی گشتی بیـری ئابـووری یۆنـانی زیـاتـر لامـان ڕوون تر بێ، ئەو بیـرە فەلســەفی یــە باوەی ئەوســـای ئەو كۆمـەڵـەلگـا كۆیلایەتی یە دەخەینە بەرچاو و لەبەر ئەوەی مەسەلەی پەیوەندی نێو (ماددە و بیر) گرنگی و بنەڕەتیەكی گەلێك سەرەكیان هەیە لە فەلسەفەدا، واتە لەنێو (بـوون و هۆش) دا، واتـە لەنێـو مەسـەلـەی ماددیـەت و میـسالیەت دا لە

فەلسـەفەی یۆنانیدا کە بەش بەحاڵی خۆی لە دوو فەلسەفەدا کۆدەبنەوە: فەلسـەفـەی ماددیو فەلسـەفـەی میسـالی کە ئۆرستۆ بەش بە حاڵی خۆی ناوەنـدێکی ئەم دوو بیـرەیە. . دەستەو کۆمەڵەی یەکەمیان ـ ماددییەکان ـ لەچـەنـد هێلێـك پێـك دێن لەوانـە (قوتابخانەی ئەیۆنییەکان: کە رایان لەسـەر ماددیـەتی کەونـە لە (طـالیـس ئەنیکسـامـاندەرو ئەنگـسیمینس دا کۆبـوتـەوە، لە سەدەی حەوتـەمی پێش زایین سەری هەڵـداوە. وهێڵی دووەم: رێ رەوی هیـراقلیتس، رابـەری ماددی دایلێکیکییـە (بیـرە بنـەرەتییـە سەرەکیـەکـانی لە دەوری جوولـەو ماددەو یەکـەی دژەکان دا دەسووڕێتەوە، مێژووی سەرهەڵدانی سەدەی شەشەمی پێش زایینە.

هێڵی سێیـەم: رێرەوی دیمـوکـریتس، گرنگتـرین راکانی زۆرییەتی کەونـەو ئەزەلیی و نەمری ماددەیە، مێژوویەکەی سەدەی پێنجەمی پ. ز. و پاشـان قوتـابخانەی ئیبکوری (٣٤١ ـ ٢٧٠ پ. ز) زۆرییەتی کەون، بیـری پەیمـانی کۆمەڵایەتی. مەزهەبی بەختیاری و خۆشگوزەرانی، واتە تام و چێـژ و تاڵی، بیـری هۆش و هۆشمـەنـدیو بیـری هەڵبـژێـراوەکان بانگـەوازە تونـدو تیـژەکـەی ئیپکور سەبارەت بە ئلحاد. بەڵام فەلسـەفەی میسـالییـەکان لە چوار هێڵ دا کۆدەبوونەوە (هێڵی ڤیـساغۆرس: سەدەی شەش، پ. ز، بیـرە سەرەکییـەکـەی (ژمـارەیییـەو روخسـارەکـەشی سۆفیەت). سۆفستائییەکان سەدەی شەش. پ. ز، گرنگترین بیری ئەم قوتـابخـانـەیـە (نسبیـەت و زاتیـەتی زانینیـە، واتـە نامەرزوعیو دوور لە موضوعیەتە، مەزهەبی فەردی، واتە بەرژەوەندی تاکەکەسی، زیاتەوژمی روونـاکبیری. هێڵی سێیەمیان سۆکرات ٤٧٠ ـ ٣٩٩ پ. ز.: رابەری میسـالییـەتی زاتییـە بیـری ئەم بەنـدو وەسـتاوە لەسەر ئەوەی کە جیهان رەنگـاوی بیـرو هۆشی مرۆڤـە. هێڵی چوارەمیان ئیفلاتون (٤٢٨ ـ ٣٤٨ پ. ز) رابـەری میسـالیـەتی مەوزوعییـەو واتای میسالیەتەکەی ئەو بەندو وەستـاوە لەسـەر ئەوەی کە (بیـری رەها) لەدەوری کەون و مرۆڤە ـ ئەوە کە جیهـانی خولقـانـدوە. . بەڵام سەبارەت بە ئۆرستۆ کە سەرکردە و رابەری (قـوتـابخـانەی ناوەندییەکی بیرە، ماددیو میسـالییەکانی یۆنانی کۆنە، فەلسـەفەکەی ئەم کۆیەکی نێو هەر دو هێڵە ماددیو میسالییەکەیە، ئەوەش بە جۆراوجـۆر شێـوەو پێی بوارەکانی زانست و زانیین نواندویەتی، ئۆرستۆ لەم رووەوە ماددی بووە، لە تیوری (بوون)دا ـ ئەنتۆلۆجی ـ مەوزوعییەتی جیهـان. . ومیسـالی بووە لە تیـوری زانیین ـ ئیپسـتـومـۆلـوجی: دەروون سەرچـاوەی زانینـە. . و لە هەمـان کاتیش دا فەلسـەفـەی (سـتـویکس ـ الفسلفـة الـرواقیـة ـ هەر لە نێـو فەلسـەفـەی ئەم قوتـابخـانـە ناوەراستەدا دەژمێـررێ، چونکـە رابـەرەکانی ئەم فەلسـەفەیەش هەر کۆیەکی هەر دوو فەلســەفـەکـە بوون: گرنگتـرین بیرەکانی ئەم قوتابخانەیەی دوایی (بیری هۆش ـ هۆشمـەنـدی ـ وبیری هاوجیهانی ـ کۆسمۆپۆلوتن و بیری ئازادی کردنی کویلەوبیـری یاسـای سروشتی، ئەمـەوهەروەهـا هەنـدێ لە فەیلەسووفە بەگومانەکان ـ الشکوکیـن ـ ەکانیش لەنێو کۆی ئەم قوتابخانە ناوەندییەدا دەژمێرری. (سەیری ابراهیم کبە/ سەرچاوەیەکی پێشوە. .

(*) ئۆرستـۆ دەڵێت کە ئەو بۆچـوونـەی ئیفـلاتـون واتـە مشـاعیـەتی خاوەنـدارێتیو ئافـرەت لای چینی حوکمـدارەکـان سەرپێچەکەر هەرگیز نەگـونجـاوە لەگەڵ سروشتی مرۆڤ دا و سەرباری ئەوەی کە زەرەرەومەندە بە بەرژەوەنـدی کۆمـەڵ. . واتە لێرەدا ئۆرستۆ پشتگیری خاوەندارێتی تاکەکەسی دەکات بە بەڵگەی ئەوەی کە (خاوەندارێتی) هەمیشە پێویسـتە وەك هاندەرێك بۆ (کار)و ئەوەی لێرەدا شایانی باسە ئەم بەڵگەیەی ئۆرستۆ بوو پشتـاوپشـت گوێـزرایـەوە بۆ تیـۆرییـەکـانی خاوەنـدارێتییـە نوێیەکان بەتـایبـەت لەرێی فەیلەسـوفی ئینگلیـزی (جۆن لوك)ەوە (ئیبراهیم کبە ـ تأریخ الفكر الاقتصادي بغداد ١٩٧٣.).

(٢٨) د. محمد عزیز/ تأریخ الافکار الاقتصادیة/ جامعة بغداد ١٩٥٦.

(٢٩) د. محمـد عزیز/ تأریخ الأفکار الاقتصادیة/ جامعة بغداد ١٩٥٦ لاپەرە ١٩

(٣٠) هەمان سەرچاوەی پێشو لاپەرە ٢١.

(٣١) ابراهیم کبة/ تأریخ الاقتصاد والفکر الاقتصادي/ لاپەرە

(٣٢) د. محمد عزیز. سەرچاوەیەکی پێشوو لاپەرە ٢٠ ـ ٢١

(٣٣) هەمان سەرچاوە.

(٣٤) گەورە زانـای سۆشیـالیستی لە وەڵامـدانـەوەکـەی بۆ دورنـگ. . سەبـارەت بە دانـان بە گرنگی ئەو دۆزینـەوە ئۆرستۆتالیسیدایە بە توندی هێرشی خۆی بردۆتە سەر (دورنگ) چونکە ئەمی دواییان نکوری کردوە لەو دۆزینەوەیەی ئۆرستۆ ـ ئیبراهیم کبە لاپەرە ٣٩٦.

(*) (پـرۆفیسـور مانـدل)، لەم رووەوە وا دەبینێ کە نووسـەرە چینییـە کۆنـەکـان (جیـاکـاری نێـو هەردوو بەهـاکـەیـان) کردوە، لە هەمـان ئەو ئابـوورییـە بە ئەنجـام هاتـووەکـانی دروستبـوونی (ئـابووری شـمەکەی بچـوك و سەر هەڵـدانی ئابـوری نەختی، وا سەرنـج دەدرێ کە گۆایـە چینییـەکـان زیـاتـر لە یۆنـانییـەکـان گرنگیان داوە بە کێشەو گیروگرفتی (هـەڵگـەرانـەوەی نرخ)و مامـۆستای ناوبراو چەندین ناو و پەراو نووسراوە چینییـەکـان بۆ نمـوونـە دەهێنێتـەوە کە دووپـاتی پەیبردنی چینییەکان دەکـاتـەوە سەبـارەت بە ئاگـاییـان لەو مەسـەلەیە (تیوری چەندێتی پارە)و رامیاری رێکخـستنی نرخەکان. . هەمان سەرچاوەی پێشوو ل٣٩٦.

(٣٥) سەبـارەت بە بنچینـەی بەهـاو جۆرەکـانی. . بۆزیـاتـر باش وایـە سەیـری پەراوی پێنجـەم بکـرێ لە پەراوی (رەوشـت)ەکـەی ئۆرسـتۆ کە گۆراوەتـە سەر زمانە ئەوروپاییەکان. . بەڵام ئەوەی شایانی باسە ئەوەیە کە ئەم جیـاکـارییـەی نێـو (بـەهـای بەکـارهێنـان و بەهـای ئاڵـوێر) لە سەدەکـانی ناوەراست دا گەیشتـوتـە نێـو فیقهی ئیـسلامیو بەتـایبـەت سەبـارەت بە دەسـنیشـانکـردنی پلەی باج و خەراج و جۆرەکـانیو پێـوەرەکـانی. . چونکـە جیـاکـاری ماددی باجـەکـان کراوە (بـەهـای بەکارهێنان) لەگەڵ پێوەری بەهاکان (بەهای ئاڵوێری نەختی) ئەو کارەی کۆمـەڵگـایـەکی دوولایی دەردەبڕێ: مەشـاعی یان ئابـوورییـەکی

سەرەتـايى سروشتى ئەگـەيێنێ لە (دێ)وشـمـەكـيـەكى بچوك لە شاردا . .
(أكنيدس: النظريات الاسلامية في المالية ١٩١٦ لاپەرە ٢٦٢ .
(٣٦) د. محمد عزيز/ تاريخ الافكار الاقتصادية ١٩٥٦ لاپەرە: ٢١ :
(٣٧) د. محمد عزيز/ تأريخ الافكار الاقتصادية/ بغداد ١٩٥٦ لاپەرە ٩٢
(٣٨) ابراهيم كبه/١ تأريخ الاقتصاد والفكر الاقتصادي/ بغداد ١٩٧٣ لاپەرە ٣٩٩ .
(*) هانى: مامۆستايەكى بيرى ئابوورى ئەمريكى يە . .
(٣٩) سەيرى ئيبراهيم كبە/ دراسات في تأريخ الفكر الاقتصادي بەشى يەكەم ٩٧٣ .

(٤٠) سەيرى: ماندل/ النظرية الاقتصادية/ بەشى دووەم ١٩٦٨ لاپەرە ٩١
(*) ئيپيكـورى ـ الابيقـوريـة Epicurus بەناوى فەيلەسوف ئيپكور ٣٤١ ـ ٢٧٠ پ. ز، گرنگتـرين بيـرە بنـەرەتى و سەرەكيـەكانى ئەم فەسلەسوفە : (زوورىيـەتى كەون) ـ (بيرى پەيمانى كۆمەلآيەتى و مەزهەبى بەختيارى ـ ئاســودەگى ـ «Rationalism» )و (بيـرى هەڵبـژليـراوان: Elite) ئەمـانـەو سەربـاريشيـان گەرمـە بانگـەوازەكـەى ئيپكورى فەيلەسوف سەبارەت بە مەسـەلـەى ئيلحـاد Atheism و لە هەرە پشتيگيـرەكانى (ئيفيميرى خاوەنى يۆتۆبياى بەناوبانگە .

## خلاصة البحث

# أهميـة الآراء والافكـار الاقتصـاديـة اليـونـانيـة وآثـارها وبقاياها في المدارس الاقتصادية المعاصرة .

د. محمد فاضل قفطان
جامعة صلاح الدين

دراسـة تحليليـة للأراء والجـوانب الاقتصـاديـة التي احتضنتها الفلسفـة اليـونـانيـة المتمثلة في فلاسفتهـا المعـروفين (افلاطون وأرسطـو واكـزنيفـون) وبـالاخص افـلاطـون وأرسطو، تلك الآراء والجـوانب الاقتصادية التي لم تكن بحد ذاتها نظرية مستقلة وانما كانت في احضان تلك الفلسفة باكملها.

يتطـرق هذا البحث الى الأهميـة التأريخيـة لافكـار هؤلاء الفلاسفة الاقتصادية التي تعتبر المنابع الأولى للفكر الاقتصادي، ذلك لاننا لو أردنا أن نأتي لنحدد تأريخ الاقتصاد تخطر على البال مباشـرة المـدرسـة الفيـزيوقراطية والمدارس الكلاسيكية وخاصة مدرسـة آدم سميـث الـتي نعتبـرهـا كحجـر أسـاس لـ (علم الاقتصاد). . ولكن هنا يجب أن نرجع الى المنابع الاصيلة للفكر الاقتصـادي وهي الأفكـار الاقتصـاديـة لفـلاسفـة اليـونـان وآثارها الاقتصـاديـة المـوروثـة التي أثـرت بدورهـا على بنـاء المـدارس الاقتصـاديـة في القـرون الـوسطى ـ العصـر الـوسيط ـ والمدارس الاقتصادية المعاصرة كنواة لها . .

خلاصـة بحثنا هي . . ان تلك الأفكار الاقتصادية القيمة لتعتبر اولى المنـابـع لتأريـخ الفكـر الاقتصادي والتي بدأت منذ النصف الثاني للقرن الرابع قبل الميلاد، تلك الفترة التي تقاس لنا باربعة وعشرين قرناً اذا لم تكن تأريخاً للفكر الاقتصادي العالمي، فهي تأريخ للفكر الاقتصادي في اوربا على الأقل.

ونستنتـج من ذلـك بانـه لايمكن نكـران دور تلك الافكـار الاقتصادية اليونانية وآثارها على المدارس الاقتصادية المعاصرة . .

# بنچینەکانی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری - هونەری بۆ پرۆژەکان

صلاح الدين عبدالمسيح كاكۆ

خوێندنی دکتۆرا - بەشی ئابووری
زانکۆی بەغدا

## سەرەتا

بابەتی لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری - هونەری لە پێویستە زانستی یەکان دادەنرێت بۆبەدیهێنانی ئامانجەکانی گەشەپێدانی نەتەوەیی ، ئەویش بە هۆی دۆزینەوەی بیانوی ڕەوا بۆخەرج کردن لەو پرۆژانەی بایەخ دان لە ڕووی قازانجەوە و لێ تەریك بوون لەوانەی ژێر کەوتەن .

چەمکی لێکۆڵینەوەی بایەخیش ئەوە دەگەیەنێت کە بریتی یە لە «لێکۆڵینەوەیەکی ئابووری نەخشەکێشانی هونەری بەربلاو، ئامانجی بلوورکردنی «دەرفەتەکانی وەبەرهێنانە» و دیاری کردنی لایەنە باشەکانی یەتی بە هۆی دەرخستنی خراپی یەکان و کەم و کوری یەکانی و سەلماندنی پێویستی چاککردنەوەیان یاخود دەستکاری کردنی هەڵە هەڵبژێردراوەکان یاخود ڕەت کردنەوەیان یان دواخستنیان» . [1]

ئەم لێکۆڵینەوەیەش بە دوو لێکۆڵینەوەی لە یەکتر جیا دابەش دەکرێت، یەکەمیان پێی دەووترێت لێکۆڵینەوەی بایەخی یەکەمی (سەرەتایی) - pre» «Feasibility Study وە دووەمیان پێی دەووترێت لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری - هونەری (Techno - economic Feasibility Study)

لێرەدا دەبێ پەنجە بۆئەوە رابکێشرێت کەوا ناوەرۆك و رێگای ئامادەکردنی ئەم دوو لێکۆڵینەوەیە جیاواز دەبێت بە جیاوازی قەبارەو جۆرو چوار چێوەی ئەوپرۆژەیەی دەوێسترێت لێکۆڵینەوەی دەربارە بکرێت، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کەوا نموونەیەکی پێوانەیی بێ پایان نی یە بۆ پەیرەوکردن لە کاتی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی بایەخ بە هەردوو بەشەکانی پێشووەوە)، بەڵکو کۆمەڵێك رای گشتی تاوکۆ هەن کە دەبێ پەیرەو بکرێن لە کاتی ئامادەکردنی ئەم لێکۆڵینەوانەدا، بە جۆرێك کەوا گرنگی بدرێت بە سروشتی هەر پرۆژەیەك و ئەوکێشەو ئەنجام دانانە بەکاربهێنرێن کە لەگەڵ سروشتی پرۆژەی ناوبراودا بگونجێن .

### بەستەی یەکەم : لێکۆڵینەوەی بایەخ یەکەمی (سەرەتایی)

لێکۆڵینەوەی بایەخی یەکەمی بە دووەمین قوناغ دادەنرێت لە قۆناغەکانی ئامادەکردنی پرۆژەکان، کە لەم چوار قۆناغانەی خوارەوە پێك هاتوون : [2]

١ - دۆزینەوەی هەڵەی وەبەرهێنان یاخود لێکۆڵینەوەی یەکەمی .
٢ - لێکۆڵینەوەی بایەخی یەکەمی .
٣ - لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری - هونەری .
٤ - هەڵسەنگاندن و بریارە کۆتایی یەکان .

وەلەسەر رۆشنایی ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە ئەوا بریاری لەبار دەدرێت دەربارەی بەردەوام بوونی پرۆژە یاخود وازلێ هێنانی .

ئەم لێکۆڵینەوەیە پێویستی بە کۆمەڵەیەکی تەواو و تێك ئاڵاوی زانیاری هەیە، کە لەدوایی دا لێکۆڵینەوەو تۆژینەوەیان لەسەر دەکرێت بە شێوەیەکی نزیکەیی ، پاشانیش راپۆرتێك دەربارەیان ئامادە دەکرێت و تێی دا بە شێوەیەکی یەکەمی بایەخی بەردەوام بوون لە خۆئامادەکردن بۆپرۆژەکە یاخود وازلێ هێنانی دەستنیشان دەکرێت .

ئەم زانیاری یانەش ئەم لایەنانەی خوارەوە دەگرنەوە :

١ - لێکۆڵینەوەی بازارو خەمڵ کردنی (قەبلاندنەکانی) خواست بۆئەو

شمەکە یا شمەکانەی چاوەڕوان دەکرێت بەرهەم بهێنرێن، هەروەها خەمڵ کردنەکانی چەندەکانی بەرهەم و بەهاکانیان و دیاریکردنی ئامانجی بەرهەم هێنانیان ئایا بۆ تێرکردنی خواستی خۆمالین یان بۆ ناردنە دەرەوەن. ئەم لێکۆڵینەوەیەش بە پێویستی یەکی بنەڕەت دادەنرێت کە ناتوانرێت وازلە بەجێ هێنانی بهێنرێت، بە تایبەتی بۆ ئەو پرۆژانەی ئەو شمەکانە بەرهەم دەهێنن کە وڵات لەوەوپێش بەرهەمی نەهێناون یاخود نەی خستوونەتە بازار.

٢ ـ خەمڵ کردنی تێچوونی سەرمایەی پێویست بۆ بنیات نانی پرۆژەکەو کارپێکردنی و ئەو پارانەی پێویستن بۆ کرینی مەکینەو ئامێرو کەلوپەل و بیناکردنی خانووەکان، جا چ بە پارەی خۆماڵی بێت یاخود بە پارەی بیانی هەروەها سوود وەرگرتن لەم بارە لەو لێکۆڵینەوانەی ئامادەکراون بۆ پرۆژەکانی هەمان شێوە لە وڵاتانی تر بە هیوای وەدەست هێنانی زانین «Know - How» لەگەڵ دەستکاری کردنی لەبار دەربارەی نرخەکان.

٣ ـ پێداویستە هونەری یەکانی پرۆژە کە بریتین لە کەرەستەی خاو و تەواوکەرو وزەو سووتەمەنی و ئاوو هێزی کارکردەی هونەری و شارەزایی تەکنولوجی و دیاریکردنی وزەکانی بەرهەم هێنان و شێوازی بەرهەم هێنان.

٤ ـ هەڵبژاردنی شوێنە بریتی یەکان بۆ پرۆژەکە لەسەر ڕۆشنایی پێویستی یەکانی لەکەرەستەی خاو و کارکردەکان و بارودۆخی گواستنەوەو (عەمبارکردن) و خستنە بازار.

٥ ـ دیاری کردنی قەبارەی ئەو کارپێکردنەی پرۆژەکە بەدی دەهێنێت و لێکۆڵینەوەی لق وپۆکانی (پەیوەستەکانی پێشەوەو دواوە (الروابط الامامیة والخلفیة) و ماوەی کاتی پێویست بۆ جێ بەجێ کردنی سەرچاوە جۆراوجۆرەکانی پارەدنی.

٦ ـ دیاری کردنی تێچوونی بەرهەم هێنان و تێچوونی کارپێکردن و پاراستنی، سەرەڕای ئەو کەڵکانەی لێی چاوەڕوان دکرێن وەکو دابین کردنی پێویستی یەکانی بازاری خۆماڵی یاخود ناردنە دەرەوەی سەرریژ (الفائض) و پاشەکەوت کردنی پارەی بیانی.

لە دوایی بەجێ هێنانی ئەم لێکۆڵینەوەیە لەسەر ڕۆشنایی ئەم چەندە زانیاری یە، ئەوا هەڵدەسەنگێنرێت بە کۆمەڵێك کێشە، بە مەبەستی بریاردانی بیانوی چوونە ناو قۆناغی لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری - هونەری یەوە، کە بریتی یە لە بەجێ هێنانی تۆژینەوەیەکی درێژ ی فراوان دەربارەی کۆمەڵەیەکی گەورە لە زانیاری، هەتا ئەو زانیاری یانەش دەگرێتەوە کە لە قۆناغی لێکۆڵینەوەی بایەخی یەکەمی دا کۆکران و وەدەست خراون.

ئەمانەی خوارەوە بریتین لە گرنگ ترینی ئەم کێشانە:

١ ـ شی کردنەوەی تێچوون ـ کەڵك Cost benefit anaLysis

٢ ـ شی کردنەوەی قازانجێتی بازرگانی و قازانجێتی نەتەوەیی

Co mercial profitabiLityamd NatıonaL profitabiLity anaLysis

٣ ـ دەرامەتەکانی دراوی بیانی Revenues of Foreign money

٤ ـ دابەشکردنی داهاتەکان و ئاکاردکردنی هەڵەی کارکردن

Income distribution and creating labour opportuhities

٥ ـ بەهای دراوە پاڵ value - added

## بەستەی دووەم: لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری ـ هونەری درێژە پێدراو:

---

لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری ـ هونەری درێژە پێدراو بە پاشگری لێکۆڵینەوەی بایەخی یەکەمی و لەمیش بەربلاوتر دادەنرێت، وەئەم لێکۆڵینەوەیە ئەو کاتە جێ بەجێ دەکرێت کە پێویستی یەکانی بە دەست هێنانی رازی بوونە بنچینەیی یەکان بە پرۆژەی پێشنیار کراو تەواو دەبن و بوونی پێویستی یەکانی وەکو هی بەرهەم هێنان و بریتی یەکانی تر ساغ دەکرێتەوە بۆ ئەوەی بزانرێت ئایا پرۆژەی تر هەیە کە لە پرۆژەی پێشنیار کراو باشتر بتوانێت هەمان چەندی لە شمەك بەرهەم بهێنێت بە تێچوونی کەمتر یاخود چەندی زیاتر لەشمەك بەرهەم بهێنێت بە هەمان تێچوون؟

ئەم لێکۆڵینەوەیەش زۆربەی برگەکانی لێکۆڵینەوەی یەکەمی دەگرێتەوە بەڵام بەشێوەیەکی درێژە پێدراوو وردترو بەربلاوتر.

ئەم برگانەش لە ژێر ئەم ناوونیشانانەی خوارەوە دێن.

أ ـ لێکۆڵینەوەی بازار

ب ـ لێکۆڵینەوەی بایەخی هونەری

جـ ـ لێکۆڵینەوەی شوێن (جێگا)

د ـ لێکۆڵینەوەی قەبارەی بەرهەم هێنان

هـ ـ لێکۆڵینەوەی لایەنەکانی ڕێکخستن و کارگێری (بەڕێوەبردن)

و ـ لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری

**أ ـ لێکۆڵینەوەی بازار:** سەرچاوەی پەیداکردنی شمەك یان لە ڕێگای بەرهەم هێنانی خۆماڵی یەوە دەبێت یان لە هاووردنی لە دەرەوە، شمەکیش لە دەرەوە دەهاوردرێت یان لە بەرئەوەی ناتوانرێت لە ناوخۆ بەرهەم بهێنرێت لەبەر چەند کۆسپ و تەگەرەی پەیوەست بە بارودۆخی بەرهەم هێنانی یاخود تێچوونی بەرهەم هێنانی لە ناوەوەدا بەرزترە لە تێچوونی هاووردنی لە دەرەوە. وەبیانوی ئابووری بۆ دامەزراندنی پرۆژەیەك بۆ بەرهەم هێنانی شمەکێکی دیاری کراو دەکەوێتە سەر ساغ کردنەوەی دوو شتی گرنگ، یەکەمیان هەبوونی بازار بۆ شمەکی هەڵبژێردراو، دووەمیشیان توانای پرۆژەی پێشنیارکراو لە پێشبرکێ کردن لە

بازارەکانی ناوخۆو دەرەوەدا بە هەمان ئاست. ئەمە لەلایەك، لەلایەکی ترەوە، ئەوا لەسەر رۆشنایی لێکۆڵینەوەی بازار جۆری بەکاربردە (consumer) و جۆرو باشیەتی وچەندو نرخەکانی ئەو شمەکەی گەرەکە بەرهەم بهێنرێت دیاری دەکرێت، لە دواییش دا قەبارەی وزەی بەرهەم هێنانی پرۆژەکە دیاری دەکرێت، بەم جۆرەش ئەو تێچوونانەی بە لێکۆڵینەوەی ئابووری بەرهەم هێنان و فرۆشتنەوە بەندن دیاری دەکرێن بە ئامانجی گەیشتن بە قازانجێتی پرۆژەی پێشنیار کراو. [٣]

بەوەش روون دەبێتەوە کەوا لێکۆڵینەوەی بازار گرنگییەکی زۆری هەیە سەبارەت بەو برگانەی دەیان گرێتەوە کە بریتین لە ناساندنی ئەو شمەکەی گەرەکە بەرهەم بهێنرێت و دەرخستنی سیماکانی و جۆرەکانی و بەکارهێنانەکانی و سوودەکانی و ئەو کەرەستە خاوانەی لە دروست کردنی دادەبن، سەرەرای ئەوەش لێکۆڵینەوەی بازارەکەی لەسەر بنچینەی بلاونامە مێژووییەکان دەربارەی بەرهەم هێنانی ناوخۆیی و شوێنەکەی لە بازرگانی دەولەتی دا (هاووردەکان و ناردەکان) و دیاری کردنی خواستی مێژوویی لەسەری و بەجێ هێنانی لێکۆڵینەوەیەك دەربارەی پێش زانینەکانی (رابینینەکانی) خواست لەسەری دەگرێتەوە ئەمەش پێویستی بە هەبوونی بلاونامەی جۆراوجۆر هەیە دەربارەی قەبارەی دانیشتوان و گەشەسەندنی، ئاستی داهاتی کەسی، نرخی شمەکی بریتی و تەواوکەر، ئارەزووی بەکاربردەکان، نەرمییەکانی خواستی نرخ و داهات، و خەمڵ کردنەکانی پایەندنی بەکاربردن.

دەتوانرێت پێش زانی دەربارەی خواستی چاوەروان کراو بۆ بەرهەمەکانی پرۆژەکە بەرێگای جیاواز جێبەجێ بکرێت، ئەم رێگایانەش دەتوانرێت بە سێ بەش دابەش بکرێن: ١ ـ ئەم مۆدێلانەی (نموونانەی) (Models) پشت بە شارەزایی خەمڵ کردنی کەسی دەبەستن.

٢ ـ مۆدێلەکانی پشکنین (نماذج الاستقصاء)

٣ ـ مۆدێلە بیرکارییەکان ـ وەکو زنجیرەکاتییەکان و شی کردنەوەی لێژی و پەیوەستی و Regression and correlation analysis هی تر.

وەرێگای مۆدێلە بیرکارییەکان لە هەموو رێگا بەکارهێنراوەکان بە ورد تر دادەنرێت، بە تایبەتیش ئەگەر بێت و بهێنرێتە بەر پشکنین و دووبارە وردبوونەوەی بەردەوام لە بلاونامەکان بە درێژایی ماوەی کاتی یەك لە دوای یەك دا.

ب ـ لێکۆڵینەوەی بایەخی هونەری: ئەمیش بریتییە لە هەڵسەنگاندنی توانای نەخشەکێشان و پەرەپێدان و دروست کردنی بەرهەم بەو توانایی یە هونەری و تەکنولوجیانەی لە ژینگەی بەرهەم هێنان دا، هەن گرنگی ئەم لێکۆڵینەوەیەش لەوەوە دەردەکەوێت کەوا تاوەکو چاکی پرۆژەکە لەلایەنی هونەرییەوە بەرێگایەکی روون و ئاشکرا نەسەلمێنرێت، ئەوا دەبێ چاوپۆشی لێبکرێت هەتا ئەگەر هەموو ئەو هۆکارانەش زۆربن کە چاکی پرۆژەکە لە لایەنەکانی ئابووری زامن دەکەن. [٤]

لێکۆڵینەوەی بایەخی هونەری، باسکردنێکی کرداری دروست کردن و بریتییە هونەرییەکان و هەروەها باسکردنی تەواوی پێویستییەکانی بەکارهێنانی کەرەستەی خاوو رەگەزەکانی و پارچەکانی و لێکۆڵینەوەی مەسەلەکانی وزەو سووتەمەنی و گواستنەوەو ئاوو هێزی کارکردەو کادری هونەری مەشق کراوو خزمەت گوزارییە گشتییەکان و سەرکردە کارگێرییەکان و شارەزایی راوێژکاری و ئەندازەیی، سەرەرای دیاری کردنی پێداویستە هونەرییەکان بۆ بنیات نانی پرۆژەو کارپێکردنی لە زەوی و خانووبەرەو ئامێرو مەکینەو هی تر دەگرێتەوە. [٥] ولێکۆڵینەوەی بایەخی هونەری بە کلیلی پێویست دادەنرێت بۆ ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی ئابووری و هەڵسەنگاندنی دواخر، سەرەرای دیاری کردنی سەراپای تێچوونی سەرمایەیی.

لەم جۆرە لێکۆڵینەوەیەش دا دەبێ گرنگی بەم خالە بنەرەتییانەی خوارەوە بدرێت: [٦]

١ ـ جۆری ئەو تەکنولۆجیایەی پرۆژەکە پەیرەوی دەکات

٢ ـ شوێنی پرۆژەکە.

٣ ـ وزەی بەرهەم هێنانی پرۆژەکە.

ئەمەش راڤەکردنێکی خستە بۆ ناوەرۆکی ئەم سێ خاڵانەی سەرەوە:

١ ـ تەکنولوجیا: دەبێ هەڵسەنگێنەر شی کردنەوەی پەلوپۆدار بۆ هەموو لایەنە هونەرییەکانی تایبەت بە پرۆژەکە بەجێبهێنێت، وەکو: (شێوازەکانی بەرهەم هێنان، یارمەتیدانی هونەری زانینی هونەری، ئامێرەکان، دام و دەزگاکان، ئامرازو مەکینەکان، هێزی کارکردەی هونەری، ئامادەکردنی نەخشەو وێنەو خشتەی هەمەرەنگ)، هەروەها لێکۆڵینەوەی ئەو رێگا پێشەسازییانەی هەن و بەراوردکردنیان لەگەڵ یەکتری و هەلبژاردنی ئەو رێگایەی پێویستی بە کەمترین تێچوون هەیە. لەگەڵ گرنگی دان بە تێچوونەکانی پاراستن و مەودای وەدەست کەوتنی ئامرازی سوپێر (ادوات احتیاطیة) و خزمەتە هونەرییەکانی تر. سەرەرای گرنگی دان بە مەسەلەی بە سالاچوونی تەکنولوجی (التقادم التکنولوجی)، بە مەبەستی سوود وەرگرتن لەو باشیانەی داهێنانە تەکنولوجیەکان بەدی دەهێنن و، هەروەها تەریك بوون لە بەکارهێنانی شێوازە تەکنولوجی یە کۆنەکان.

٢ ـ شوێن: هەڵبژاردنی شوێن دەبێ لەسەر بنچینەی لێکۆڵینەوەیەکی بەربلاو دابمەزرێت، کە هەموو ئەو هۆکارانەی پەیوەستن بەم بابەتە بگرێتەوە، ئەوانیش بریتین لە (رووبەری زەوی، کەرەستەی خاو، بازارەکان، ئاو، ئاوو هەوا، وزەو سووتەمەنی، هێزی کارکردە، سەرچاوەی سازو ئامادەکردن، دام و دەزگای گشتی، مەودای وەدەست کەوتنی هۆیەکانی گواستنەوە، تواناییەکانی بارکردن و

داگـرتن، پارێـزگـاری ئاسـایش وخۆپاراستن، سەلامەتیی پیشەیی وهی تر). وە لەدوایی دا پەسـەنـدکـردنی شوێنێك لە شوێنە بریتی یەکان لەسەر رۆشنـایی زانیـاریو بلاونـامـەکـانی سەرەوەو پەنـابردن بە گوێرەی توانا بۆ شێـوازە چەنـدی یـەکـان و دوورکـەوتنـەوە لە بەکـارهێنانی هەسـت وزمان رەوانیی کەسی لە هەلبژاردنی شوێنی پێشنیار کراودا.

**٣ ـ ووزەی بەرهـــەم هێنـان**: گرنگیی ووزەی بەرهـەم هێنـانی پرۆژە لەو کارتێکـردنـە گەورەیـەی بەجێ دەهێڵێت لە بایـەخی ئابـووری ـ هونـەری پرۆژەکانەوە هاتووە، هەر بۆیەش ناتوانرێت واز لە لێکۆڵینەوەی بهێنرێت، سـەرەرای لایـەنـە زۆرەکـانی کە بەسـتـراون بە (بازارو خواسـت، قەبارەی نمـوونـەیی پرۆژە، تێچـوونی سەرمایەیی و کارپێکردن وتێچوونی بەرهەم هێنـان). وەلـەم بارەیـەشـەوە بە پێویست دەزانرێت لە کاتی ئامادەکردنی لێکۆڵینەوەی ووزەی بەرهەم هێنان تێچوونی سەرمایەیی و مەودای گونجانی بۆ قەبـارەکـانی هاوتـا لە دەولـەتـە پیشـە سازی یـەکـان دیـاری بکرێت، وتێچـوونی فراوان کردنی دوا رۆژ بکـۆڵـرێت لەگەڵ لێکۆڵینەوەی خواستی دابین کراو لەسـەر شمـەك و بە خواستێکی جوولـەر بە تێپـەڕبـوونی کات رەچاو بکرێت.

سـەرەرای ئەوەش پێـویستـە پەیـوەنـدی نێـوان وزە دیـاری کراوەکـان و تێچـوونـەکـانی بەرهـەم هێنـان و کارکـردەی ویستـراو و وەبـەرهێنانەکانی پێـویسـت و توانـایی فراوان بوون لە هێـزە نەخشکـراوەکـان (الطـاقـات التصـمـیمیـة) بە ئامـانجی کەم کردنـەوەی تێچـوونی یەك یەکـە لەبەرهەم هێنان (الوحدة الواحدة من الانتاج) شی بکرێنەوە.

وەئـەبێ سـەرنـج بۆ ئەوە رابکێشـرێت کە وا بەباشتـر دەزانـرێت کاتی ئامـادەکـردنی ئەم لێکۆڵینەوەیە، متمانە بکرێت بەو شارەزاو راوێژکەرانەی پەیـوەنـدیی یـان بە فرۆشیـاری ئەو ئامێـر و مەکینـانـە نەبێت کە پرۆژەکـە پێـویستی یـان پێ یـەتی بە مەبەستی لێ تەریك بوون لە وەدەست کەوتنی لێکۆڵینەوەی گومان لێ کراو (دراسات مضللە)، چونکە ئەم جۆرە کەسانە بەرژەوەندی یان لە وەدایە کەوا بگەنە ئەنجامی پۆزەتیڤی (نتائج ایجابیة) بۆ برەو پێدانی (ترویج) ئامێرەکانیان کاتی جێ بەجێ کردنی پرۆژەکە.

**حـ ـ لێکــۆڵینــەوەی شوێنی**: ئامــانجی ئەم لێکــۆڵینــەوەیـە بریتیـە لە دیـاری کـردنی گونجـاوتـرین شوێن بۆ پرۆژەی پێشنیـار کراو، وە ئەمـەش دەکەوێتە سـەر وەدەسـت کەوتنی ئەم بلاو نامانەی خوارەوە:[٧]

ـ بریتی یـە جۆراو جۆرەکـانی شوێن و هۆی هەلبـژاردنی سەرەکیـان ئەبێ رەچـاوکـردنەکانی بازار (اعتبارات السوق)، ئاوو هەوا، سروشتی خاك و خۆڵ، ئاو، هێزی کارکردە.

ـ تێچوونەکانی گواستنەوە لە شوێنەکەو بۆ شوێنەکە.

ـ کۆلکەکانی نیشتەجێ بوونی پیشە سازی (معاملات التوطین للصناعة).

ـ تێچوونەکانی یەکەی بەرهەم هێنان و بۆ هەرشوێنی بریتی بە جیا.

ـ سەرەرای رەچـاوکـردنـە بریتی یـەکـانی تر وەکو رەچاو کردنە کۆمەلایەتی و سیاسی یەکان و سیاسەتی دەولەت لە بواری چەق بەستنی پرۆژەکان (ترکز المشروعات) ولق و پۆکانی پێشەوەو دواوە.

**د ـ لێکـۆڵینـەوەی قەبـارەی بەرهـەم هێنان**: وەتیایدا (قەبارەی نموونەیی) پرۆژەکـە دیـاری دەکـرێت، ئەویش ئەو قەبـارەیەیە کە کەمترین تێچوونی ناوەنـدی بۆ یەکـەی یەك بەدی دەهێنێت، وەقـەبـارە نمـوونـەیی یـەکـانی پرۆژەکان جیاوازن لە یەکتری لە پیشە سازی یەکەوە بۆ ئەوی تر، هەتا لەناو یەك پیشـە سازیش دا بەهـۆی جیـاوازی سروشتی شمـەکەکەو سـروشتی کردەکانی بەرهەم هێنان و جیـاوازی لێ هاتنی هەر پرۆژەیەك.

هەروەهـــا لەم لێکــۆڵینــەوەیــەدا شێــوازی بەرهـەم هێنـان و وزەی کارپێکــردن و نەخشکــراو دیــاری دەکـرێت، سەرەرای دیـاری کـردنی تێچـوونی بەرهـەم هێنـان و بەراوردکردنی بەو یەکانەی کە دەفرۆشرێن بە مەبەستی زانینی خالی هاوسەنگ بوون «Break. even Point».

**هـ ـ لێکـۆڵینـەوەی لایـەنـەکـانی رێکخـستن و کارگێری**: گرنگی دان بە لایەنەکانی رێکخـستن و کارگێری پرۆژەی پێشنیار کراو لە گرنگی توخمی کارگێـری (بـەڕێوەبردن) لەسەرکەوتنی پرۆژەکە دوای جێ بەجێ کردنیەوە هاتووە. چونکە هەر چۆنێك بێت رابینینەکانی بازارو سەلامەتی پەیکەری دارایی و هونـەری پرۆژەکـە، ئەوا لە کۆتایی دا سـەرکەوتنی پرۆژەکە یاخود ژێـرکـەوتنی (سـەرنـەکـەوتنی) دەکـەوێتـە سەر پتـەوی کارگێری و چاکی رێکخـستنی کارەکـەی. هەر بۆیـەش بە پێـویست ئەزانرێت لە پێداویستە کارگێری یەکان بکۆڵرێتەوە کە بریتین لە پەیکەرەکانی رێکخـستن و شارەزایی راوێــژکـەران و سوود وەرگـرتن لە رێبـازەکـانی کارگێـری و رێکخـستن بە جۆرێــك رەوانی دەستــەلات و زانیــاری زامن بکــات بە شێــوەیــەك مەڵبـەنـدەکـانی لێپـرسراو دەستەبر بکات لەگەڵ ئەو شتانەی پەیوەندی یان بەرامیـاری یـەکـان و رژێمـەکـانی مەشق پێ کـردن و مووچـەو پالنەرەکان (الحوافز) و هی تر هەیە.[٨]

وەتــاقی کـردنـەوەی زۆر لەو دامـەزراوانـەی لە کۆری گەشـەپێـدان و پارەپێـدانی کار دەکـەن سەلمـانـدویـەتی کەوا هەلســەنگاندنی ئابووری پرۆژەکـــان بە تەنهـــا سەرکـەوتنی پرۆژەو ئەوکـەڵـك و سوودانـەی لێ ی چاوەروان دەکــرێن زامن ناکـــات. بەڵـکـو چاکی جێ بـەجێ کـردنی ئەو پرۆژانـەی دەرامـەتی ئابووریـیان نزمە زۆر جار باشترو بەبایەخ تر دەبێت لە جێ بەجێ کردنی ئەو پرۆژانەی دەرامەتی ئابووریان بەرزە.[٩]

**و ـ لێکـۆڵینەوەی بایەخی ئابووری**: لێکۆڵینەوەی بایەخی ئابووری بریتیە لە دووبــارە دارشتنی ئەو بلاونـامـەو زانیـاری یـانـەی ئامـادە کرابـوون لە لێکـۆڵینـەوەکـانی پێشوو بە شێوەیەکی نەختی نرخاندراو بەو نرخانەی کەوا هەلســەنگێنەر بە لەبار (گونجاو) یان دەزانێـت و،[*] بەراوردکردنیان لەگەڵ

کەلکەوابین کراوەکان لە پرۆژەی پێشنیار کراوو دەرکردنی بریاری لەبار دەربارەی جێ بەجێ کردنی پرۆژە یاخود دواخستنی یارەفز کردنی، بە پشت بەستن بەو ریازە ئابووری‌یانەی رەوتی کردەی هەلسەنگاندن حوکم دەکەن. بەمەش بەراوردکردنی توانــاو دەرامەتە ئابووری‌یەکان لەگەڵ پێویست و پێداویستەکان بۆ بەدی هێنانی ئامانجە ئابووری‌یە بنەرەتیەکانی پرۆژەی پێشنیارکراو دەگرێتەوە.

وەبە شێوەیەکی گشتی دەتوانین بەندەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەم شێوەیەی خوارەوە بخەینە روو:[10]

١ ـ دیاری‌کردنی تێچوونی سەرمایەی چەسپاو (نەگۆر)، ئەمیش ئەم لایەنانەی خوارەوە دەگرێتەوە:

أ ـ تێچوونەکانی بنیات نان کە تایبەتن بە لێکۆڵینەوە یەکەمەکان و، ماندووبونەکانی نووسینگە راوێژکەرەکان و تێچوونە کارگێری‌یەکان لە قۆناغی پێش جێ‌بەجێ کردن.

ب ـ بەهای زەوی (لە حالەتی کرینی) وتێچوونەکانی پەیوەست پێ‌ی وەکو خەرجەکانی یاسایی و باجەکانی مافی مولکداریتی و دروست کردنی بەربەستەکان و کردنەوەی رێگاوبان و هەر جۆرە چاککردنەوەیەکی تر.

جـ ـ ئامێرو مەکینەو ئامراز، هەروەها خەرجی دامەزراندنەکانی ئاوو کارەباو تەلەفۆن و هاتوچۆی تەل و تەرو تفاقی نووسینگەیی (التجهيزات المكتبية) لە ژمێرەرەکان و ئامێری چاپکردن و ئامرازی فۆتۆکۆپی و هی تر.

د ـ خەرجی نەبینراو (هەست پێ نەکراو) (مصاريف غير منظورة): وەك تێچوونەکانی مافی داهێنان و، ماوەدانەکان (التراخيص) وزانینی هونەری و ناوو هیماکانی بازرگانی.

هـ ـ تەرو تفاقەکان و کەل و پەل و ئامرازەکانی گونجاندنی هەوا (سارکردن و گەرم کردن) و هۆیە جۆراوجۆرەکانی گواستنەوە.

و ـ تێچوونەکانی ئامرازی ناوێنە بۆ ساڵی یەکەمی کارپێکردنی پرۆژەکە.

ز ـ تێچوونی سەربار، کە بە شێوەی رێژەی سەدی لە سەراپای تێچوونی بەندەکانی پێشوو دیاری دەکرێت بۆ روو بەروو بونەوەی (مواجهة) هەڵەو سەهوەکان، بەرزبوونەوەی، نرخەکان وخستنە سەرەکان (الاضافات)، ئەم رێژەیەش مابەینی (٥ ـ ٢٥٪) دەبێت بە گوێرەی جیاوازیی سروشتی پرۆژەکان.

٢ ـ تێچوونی سەرمایەیی کارپێکردن (كلفة رأس المال التشغيلي (العامل): ئەمەش ئەو پارانە دەگرێتەوە کە تەرخان کراون بۆ بەدی هێنانی بەرهەم، کە بریتین لە بەهای کەرەستەی خاو و مادەی نیمچە دروست کراو کە کۆدەکرێتەوەو دەئاخنرێت (ئەمبار دەکرێت) تا کاتی دروست کردنی بە شێوەی کۆتایی و لە دوایی دا فرۆشتنی بۆ بە کار بردن، لە کاتێکدا بە هاکانی بە شێوەی نەخت دەدرێن و وەردە گیرێن و لە کۆتایی دا دەخرێنە پاڵ سەراپای تێچوونی پرۆژە لە مایە وەبەرهێنراوەکان (الاموال الاستثمارية)، وەئەم پارانەش بێجگە لە وانەی باسکران، کرێ‌ی کارکردەکان و خەرجی پروپاگاندەو راگەیاندن و خەرجی بڵاوی تر دەگرێتەوە بۆ داپۆشینی (تغطية) کردەکانی فرۆشتن و کەرەستەکانی پرکردن و بەرگ تێگرتن و خەرجەکانی پاراستنی ئامێرو مەکینەو هی تر.

٣ ـ تێچوونەکانی بەرهەم هێنان: بە زۆری ئەم تێچوونانە لە دوو جۆر پێك دێن، چەسپاو (نەگۆر) و نە چەسپاو (گۆراو)

یەکەمیان بری سووانەکانی (اند ثارات) سالانە لەسەر بونە وەرەکانی چەسپاو وخەرجەکانی کارگێری و کرێی کارکردە هەمیشەیی‌یەکان و تەئمین و (سوود) لەسەر سەرمایەی وەبەرهێنراو دەگرێتەوە.

کەچی دووەمیان ئەو تێچوونانە دەگرێتەوە کە بەندن بە قەبارەی بەرهەمەوە، لەوانەش، کەرەستەی خاو، کەرەستەی پرکردن و بەرگ تێگرتن (مواد التعبئة والتغليف) وسووتەمەنی و رۆنی و هێزی جووڵێنەرو ئاوو کلوباو تێچونی پاراستن و کرێی کارکردە کاتی‌یەکان.

٤ ـ **دیاری‌کردنی بەهای دەرامەتەکان**: بەهای دەرامەتەکان لە بەهای فرۆشراوی ئەو شمەکانەی پرۆژەکە بەرهەمیان دێنێت پێك دێت، دوای دیاری‌کردنی نرخی بەرهەمەکان بە یەکێ لە رێگاکانی نرخاندنی پەیرەو کراو (ئەویش یان بە پشت بەستن بە تیوریی ئابووری‌یەوە دەبێت یاخود بە متمانەکردن بە سەراپای تێچوون یان نرخاندن بە رێگای تێچوونی رادەیی).

## کورتەی لێکۆڵینەوەکە

لە کۆتایی ئەم لێکۆڵینەوەیەدا دەبێ پەنجە بۆ ئەوە رابکێشرێت کەوا ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە تەنها بۆ پرۆژە پێشنیار کراوەکان ئامادە دەکرێن بە مەبەستی پەسند کردنی باشترینیان یان رێك کردنیان بە پێی پلەی باشیان لە رووی ئابووری و هونەری‌یەوە. هەروەها گرنگی و وردیی ئەنجامەکانی ئەم لێکۆڵینەوەیە بەندە بە مەودای وەدەست کەوتنی زانیاری ب بەربلاو لەسەرچاوەی باوەرپێکراو و بەشێوەیەکی راست و دروست کە لە دوایی دا دەبێتە بەردی بناغە بۆ لێکۆڵینەوەی درێژە پێدراوی تر کە بریتین لە هەڵسەنگاندنی ئابووریانەی پرۆژەکان و هەلسەنگاندنی توانایی کارنواندن کە بۆ ئەو پرۆژەو دام ودەزگایانە بەجێ دەهێنرێن کە لە بواری کاردان بە مەبەستی دیاری‌کردنی لایەنە باش وخرابەکانیان و دەست نیشان کردنی کۆسپ و تەگەرە یان و چاککردنی کەم و کووری‌یان و لەدوایی دا پەرەپێدانیان بۆ بەشداری‌کردنی زیاترو باشتر لە کردەی گەشەسەندن و پەرەپێدان لە وڵات دا.

بۆیە ئەو لایەنانەی سوود لەم لێکۆڵینەوەیە وەردەگرن بریتین لە هەموو کەرتە ئابووری‌یەکان جا چ کەرتی کشتوکاڵ بێت یان پیشە سازی یاخود

خزمەت گوزاری‌یەکان کە ناوەرۆك وبناغەیان بریتی‌یە لە پرۆژەی جۆراوجۆر کە جێ‌بەجێ کردنیان وخستنە ناوپلانەکانیان پێویستی بە ئامادەکردنی ئەم جۆرە لێکۆڵینەوانە هەیە .

## پەراوێز:

(١) د. سمیح مسعود، اسس اعداد دراسة الجدوى الاقتصادية ـ الفنية للمشروعات النفطية، (منظمة الاقطار العربية المصدرة للبترول، الكويت، شباط آذار ١٩٨١)، ص١ .

(٢) د. سميح مسعود، بعض الجوانب المهمة في اعداد المشاريع الصناعية، مجلة النفط والتعاون العربي، (منظمة الاقطار العربية المصدرة للبترول، المجلد الثالث العدد الثاني، ١٩٧٧)، ص٨١ .

(٣) المنظمة العربية للعلوم الادارية، تقرير عن الدورة التدريبية لدراسات الجدوى، (الجزء الاول، الاسكندرية، شباط ـ آذار ١٩٧٨)، ص٢٣ .

(٤) محمود سلامة عبدالقادر، دراسات الجدوى وتقييم المشروعات الصناعية، (وكالة المطبوعات، الكويت، ١٩٧٩)، صص ٢٩ ـ ٤٢ .

(٥) د. قاسم ناجي كاظم، اسس اعداد دراسة الجدوى الفنية والاقتصادية وطرق التقييم الاقتصادي للمشاريع الانتاجية، مجلة النفط والتنمية، (السنة التاسعة، العدد الرابع، تموز ـ آب، ١٩٨٤)، ص ص ٦٣ ـ ٨٥ .

(٦) ضياء باقر، دراسات الجدوى مقوماتها وكيفية اعدادها، مجلة الصناعي، (اتحاد الصناعات العراقي، العدد الثاني، السنة السادسة عشرة، ١٩٧٦)، ص٦٩ .

(٧) د. شريف باشا، دراسة وتقييم المشروعات الاقتصادية ـ محاضرات مطبوعة ومحوية بالرونيو لطلبة الصفوف الرابعة قسم الاقتصاد بكلية الادارة والاقتصاد/ جامعة بغداد (مكتب نينوى للطباعة، بغداد، بدون سنة طبع)، ص٧٢ .

(٨) خالد هادى چاوشلي، اثر السياسات المالية في كفاءة الاداء (دراسة تطبيقية في المنشأة العامة لصناعة الطابوق، (رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد ـ جامعة بغداد، حزيران ١٩٨٦)، ص ٢٢٩ .

(٩) محمد توفيق الخجا، بعض الجوانب النظرية والعملية في التقييم الاقتصادي للمشروعات، مجلة النفط والتعاون العربي، (المجلد الثالث، العدو الثالث، ١٩٧٧)، ص٢٩ .

(*) ئەوئابووری زانانەی بەکرداری هەڵسەنگاندنی پرۆژەکان هەڵدەستن، داوای بەکارهێنانی نرخەکانی سێبەر Shadow Prices یاخود وەکو ناو ئەبرێن بە نرخەکانی ژمێریاری (الاسعار المحاسبية) دەکەن، چونکە بە نرخی راستەقینە رەچاوەدەکرێن کە رەنگی کەمی رێژەی دەرامەتەکان لە روانگەی کۆمەل دەدەنەوە، بەڵام ئەم نرخانە پێویستیان بە چەند مەرجێکە کە زۆر بەئاسانی ناتوانرێت بەدی بهێنرێن لە هەلکەوتا وەکو پێشبرکێی تەواو (perfect competitation) وگەیشتنی ئابووری بۆ باری هاوسەنگی (Equilibrium state). وەلەسەر ئەم بنچینەیە هەندێك لە ئابووری زانانی تر نرخەکانی بازار (Market Prices) بە باشتر دەزانن، چونکە لەگەڵ هەموو کەم و کوری‌یەکانیان، ئەوا هەر نەبێ رەنگی هەلکەوتی ئابووری ئەو ژینگە ئابووری‌یەی پرۆژەکە کاری تیا دەکا دەدەنەوە .

وەبۆ درێژە پێدانی زیاتر بڕوانە :

(١) المنظمة العربية للتنمية الصناعية، دليل التقييم والمفاضلة بين المشروعات الصناعية للدول العربية، (تونس، ١٩٨٠)، ص ص ٥٠ ـ ٥٣ .

(٢) سالم توفيق النجفي، مقدمة في الاسس النظرية لتقييم مشاريع الانتاج الحيواني، مجلة الاقتصادي العربي، (العدد الاول، السنة الرابعة، نيسان ١٩٨٠، دار الحرية للطباعة، بغداد، ١٩٨٠)، ص ص ١٥٦ ـ ١٥٧ .

(١٠) دەربارەی ئەمە بڕوانە :

أ ـ د. سميح مسعود، اسس اعداد دراسة الجدوى الاقتصادية ـ الفنية للمشروعات الصناعية، سەرچاوەی پێشوو، ل ل ٢٥ ـ ٣٣ .

ب ـ د. قاسم ناجي كاظم، سەرچاوەیەکە لەمەوپێش ووتراوە، ل ل ٥٦ ـ ٨٥ .

سەرچاوەکان :

(١) مسعود، د. سميح، اسس اعداد دراسة الجدوى الاقتصادية ـ الفنية للمشروعات الصناعية، (منظمة الاقطار العربية المصدرة للبترول، الكويت، ١٩٨١).

(٢) مسعود، د. سميح، بعض الجوانب المهمة في اعداد المشاريع الصناعية، مجلة النفط والتعاون العربي، منظمة الاقطار العربية المصدرة للبترول، المجلد الثالث، العدد الثاني، ١٩٧٧ .

(٣) المنظمة العربية للعلوم الادارية، تقرير عن الدورة التدريبية لدراسات الجدوى، (الجز الاول، الاسكندرية، ١٩٧٨).

(٤) عبدالقادر، محمود سلامة، دراسات الجدوى وتقييم المشروعات الصناعية، (وكالة المطبوعات، الكويت، ١٩٧٩).

(٥) كاظم، د. قاسم ناجي، اسس اعداد دراسة الجدوى الفنية والاقتصادية وطرق التقييم الاقتصادي للمشاريع الانتاجية، مجلة النفط

والتنمية، (السنة التاسعة، العدد الرابع، تموز ـ آب، ١٩٨٤).
(٦) باقر، ضياء، دراسات الجدوى مقوماتها وكيفية اعدادها، مجلة الصناعي، (اتحاد الصناعات العراقي، العدد الثاني، السنة السادسة عشرة، ١٩٧٦).
(٧) باشا، د. شريف، دراسة وتقييم المشروعات الاقتصادية - محاضرات مطبوعة ومسحوبة بالرونيو لطلبة الصفوف الرابعة قسم الاقتصاد بكلية الادارة والاقتصاد - جامعة بغداد، (مكتب نينوى للطباعة، بغداد، ؟)
(٨) جاوشلي، خالد هادي، اثر السياسات المالية في كفاءة الاداء (دراسة تطبيقية في المنشأة العامة لصناعة الطابوق (رسالة ماجستير غير منشورة، كلية الادارة والاقتصاد - جامعة بغداد، حزيران ١٩٨٦).
(٩) الخجا، محمد توفيق، بعض الجوانب النظرية والعملية في التقييم الاقتصادي للمشروعات، مجلة النفط والتعاون العربي، (المجلد الثالث، العدد الثالث، ١٩٧٧).
(١٠) المنظمة العربية للتنمية الصناعية، دليل التقييم والمفاضلة بين المشروعات الصناعية للدول العربية، (تونس، ١٩٨٠).
(١١) النجفي، د. سالم توفيق، مقدمة في الاسس النظرية لتقييم مشاريع الانتاج الحيواني، مجلة الاقتصادي العربي، (العدد الاول، السنة الرابعة، نيسان ١٩٨٠، دار الحرية للطباعة، بغداد).

## ملخص البحث

صلاح الدين عبدالمسيح كاكو

# اسس اعداد دراسة الجدوى الاقتصادية - الفنية للمشروعات

يهدف هذا البحث الى تبيان اهمية دراسة الجدوى الاقتصادية - الفنية للمشروعات وتوضيح أسس اعدادها.

حيث يعتبر هذا الموضوع من الضروريات العملية لتحقيق اهداف التنمية القومية وذلك باعطاء المبرر الواقعي للانفاق على المشروعات ذات الجدوى المربحة وتجنب الفاشلة منها.

ومفهوم دراسة الجدوى يعني انها «دراسة اقتصادية تخطيطية فنية شاملة، تستهدف بلورة «الفرص الاستثمارية» وتحديد صلاحيتها من خلال اظهار عيوبها ومساوئها، واثبات ضرورة اصلاحها او تعديل الفرص المنتقاة او الغائها او تأجيلها».

وتقسم هذه الدراسة الى دراستين منفصلتين، الاولى منها تسمى دراسة الجدوى الاولية والثانية دراسة الجدوى الاقتصادية - الفنية المفصلة.

وتعتبر دراسة الجدوى الاولية المرحلة الثانية من مراحل اعداد المشروعات المكونة من المراحل الاربعة التالية:

١ - اكتشاف الفرص الاستثمارية او الدراسة الاولية
٢ - دراسة الجدوى الاولية
٣ - دراسة الجدوى الاقتصادية - الفنية
٤ - التقويم والقرارات النهائية.

وعلى ضوء نتائج هذه الدراسة يتم اتخاذ القرار المناسب بمواصلة المشروع او التخلي عنه. وتحتاج هذه الدراسة الى مجموعة كاملة ومتشابكة من المعلومات تتضمن الامور التالية:

- دراسة السوق
- تقدير كلفة رأس المال اللازم لانشاء المشروع وتشغيله
- اختيار المواقع البديلة للمشروع
- تحديد تكاليف الانتاج والتشغيل والصيانة والمنافع المتوقعة.

وبعد ذلك يتم تقويم هذه الدراسة بجملة معايير لاقرار تبرير الدخول في مرحلة دراسة الجدوى الاقتصادية - الفنية، ومن هذه المعايير:

١ - تحليل الكلفة - المنفعة
٢ - تحليل الربحية التجارية والربحية القومية
٣ - ايرادات النقد الاجنبي
٤ - توزيع الدخول وخلق فرص العمالة
٥ - القيمة المضافة.

وتعتبر دراسة الجدوى الاقتصادية - الفنية المفصلة دراسة لاحقة لدراسة الجدوى الاولية واكثر شمولا منها، وتشمل هذه الدراسة على معظم فقرات الدراسة الاولية ولكن بشكل تفصيلي واكثر دقة وشمولا. وهذه الفقرات تندرج تحت العناوين التالية:

أ - دراسة السوق
ب - دراسة الجدوى الفنية
جـ - الدراسة المكانية
د - دراسة حجم الانتاج
هـ - دراسة الجوانب التنظيمية والادارية
و - دراسة الجدوى الاقتصادية.

# مەقام

وریا ئەحمەد

## مەقام چی دەگەیەنێت

مەقام وشەیەکی عەرەبی یە بەرامبەرەکەی لە فارسی دا «گاه»ە. (جاجی هاشیم رجەب) بۆ مانای مەقام گوتوویەتی :- (مەقام واتە شوێن پێ، یاخود جێگەی ڕاوەستان، خوای گەورە لە قورئانا فەرموویەتی - مقام إبراهیم ومن دخله کان آمناً - واتە ئەوشوێنەی ئیبراهیم لەسەری ڕاوەستابوو، مەقام بە واتای ئەوجێگەیەش دێت کە شاعیر یا گۆرانی بێژ لەکاتی شیعر خوێندنەوە، یا گۆرانی گوتن دا، لەسەری ڕادەوەستن، وشەی (مەقام) بۆ خوتبەکانیش چ شیعر بووبن یا وتار، بەکارهاتووە وەك :- (مقامات الحریری، مقامات الهمداني) واتە ئەوجێگەیەی ئەوشیعرە یا وتارەی لێوە خوێنراوەتەوە.[١]

مامۆستا (حسین قدوری)یش، هەر بۆ مەقام گوتوویەتی :- (مەقام بریتی یە لە کۆمەڵێك نەغمەی یەك بەدوای یەك دا هاتوو، هەر پەیژەیەکی مۆسیقای ڕۆژهەلاتیش شی بکەینەوە، دەبینین لە چەند «تیتراکورد»یك[٢] پێکهاتووە)[٣]

(حبیب ظاهر العباس)یش هەر لەبارەی مەقامەوە گوتوویەتی :- [مەقام ئەو (بنچینە - بناغە)یە کە ئاوازەکانی لەسەر بینادەکرێت و لەیەك بەدوای یەك دا هاتنی هەر حەفت دەنگی مۆسیقا پێك دێت، لەگەڵ دەنگی هەشتەم دا، کە دووبارەی دەنگی یەکەمەو دەبێتە دەنگی بەرزبۆی، ئەم هەشت دەنگە لەعەرەبی دا (دیوان)و لەکوردیش دا (چینی دەنگ)و[٤] لای زۆربەی میللەتانیش (ئۆکتاف - octave)ی دەبێژنێ.

هەر مەقامێکیش ڕیزکردنی تایبەتی خۆی هەیە، ئەمە لەلایەنی ئەو میانانەوە کە دەکەونە نێوان دەنگێك و ئەوی پێش یان دوای خۆیەوە، کە بەهۆیانەوە لە مەقامەکانی دیکەی جیادەکەینەوە، ئەو نۆتە یاخوش دەنگەش کە مەقامەکەی لەسەر دەوەستێت و ئەو گرێ و ڕەگەزانەی لەناو مەقامەکەدان، هەموویان سیماو جۆرو دواتر ناوی مەقامەکەش دەردەخەن.

هەرچەندە لە هەندێ وڵاتی عەرەبی دیکەدا وشەی (نەغەم)و هەندیکی[٥] دی وشەی (تەبع)و ئی دیکە وشەی (دەور) لە جیاتی وشەی (مەقام) بەکاردێنن. . . . لە کوردی‌یش دا لەزۆر جێگا وشەی (هەوا) بەکاردەهێنن بۆنموونە (هەوای بەیات) لە جیاتی (مەقامی بەیات)و (هەوای حیجاز) لە جیاتی (مەقامی حیجاز. . .) تاد بەکاردێنن.[٧]

زاراوەی مەقام

---

مەقام پەیژەیەکە، میانی دەنگەکانی بەشێوەیەکی یەك لە دوای‌یەکی دیاری کراودا دێن، هەر گۆڕانێکیش بەسەر ماوەی میانی ئەو نۆتانەدا بێت، ئەوە مەقامێکی دیکەی سەربەخۆی لێ دروست دەبێت.

## مەقام لەلایەن زاناو فەیلەسووف و مۆسیقازانە ڕۆژهەلاتی‌یە ناودارەکانەوە چۆن باسکراوە

زاناو فەیلەسووفی ڕۆژهەلاتی بەناوودەنگ «ئیبن سینا» گوتەیەکی لەم بارەیەوە هەیە کە «جۆرج هێنری فارمەر» بۆمانی نووسیوە تیایدا گوتوویەتی :-

(هەندێ مەقام - کە ئیبن سینا بە نەغمە ناوی بردوونە - لەکاتی تایبەتی دا، جا بە ڕۆژ بێت یا بە شەو دەخوێنرێن، بۆنموونە :- [نەغمەی - مەقامی] ڕاهەوی و حوسەینی لەبەرەبەیانداو مەقامی ڕاست و بۆسەلیك لەچێشتەنگاوداو مەقامی زەنگولە لە نزیك نیوەڕۆداو مەقامی عوششاق لە نێوان هەردوو نوێژی نیوەڕۆ وعەسرداو مەقامی نیوەشەو لە عەسرداو مەقامی ئەسفەهان لەگەڵ خۆرئاوابووندا و مەقامی نەوا لەگەڵ بانگی شێوانداو مەقامی زیرئەفکەندیش لەپێش خەوتندا دەگوترێن.)[٩]

هەروەها زانای بە ناوودەنگ «سەفی‌یەلدین ئەرمەوی»یش، کە ساڵی (١٢٩٤)ی زایین کۆچی کردووە، گوتوویەتی :- (مەقام - کە ئەو بە - شەد

- ناوی بردووە ـ هەریەکە بە جۆرێك كار لەناخ و دەروونی مرۆڤ دەكات ، بۆ نموونە گوێ لە مەقامی (بۆسەلیك و نەواو عوششاق) گرتن تواناو گەرم و گوڕی بە گوێگر دەبەخشێت، کەچی گوێ لە مەقامی (راست و نەوروزو عێـراق) گرتن ، دەبێتـە مایـەی دڵخۆشی و گوێ لە مەقـامی (بـزورگ و راهـوی و زیـرئـەفكـەنـدو زەنگـوڵـەو حوسەینی) گرتنیش جۆرە دڵتەنگی و خەمناکی یەك لای گوێگر دروست دەكات . ) .(١١)

مەقامە رۆژ ئاوایی یەکان

---

لە مۆسیقای رۆژئاوایی دا پەیژەی (دیاتۆنی ـ بەدوایەك هاتوو) و پەیژەی (كـرۆمـاتی ـ رەنگـاورەنـگ) هەیـەو هەردوو پەیـژەی، بەدوایـەك هاتـوو ورەنگاورەنگیش بۆ دوو بەشی سەرەکی دابەش دەکرێن :ـ

١ ـ پەیژەی گەورە ـ السلم الكبیر ـ Major ScaLe

٢ ـ پەیژەی گچکە ـ السلم الصغیر ـ Mimor Scale

زاراوەی پەیژە

---

پەیـژە ریـزە دەنگێکـە ، لە حەفت دەنگی یەك لەدوای یەك داهـاتـوو پێکهـاتـووە ، ماوەی نێـوان هەمـوو دەنگـەکانی لەگەڵ دەنگی هەشتەم دا (کـە دەنگی بەرزی دەنگی یەکـەمـەو دووبـارە دەبێتـەوە) ، دەگـاتە شەش دەنگی تەواو (Tone) یاخود دوازدە نیوە دەنگ = (Semi tone) وەك نموونەی خوارەوە :ـ




وەك لە نمـوونـەی ژمـارە (١) یەك دا دیـارە ، پەیژە لە ریزکردن و یەك بەدوای یەك دا هاتـنی حەفت دەنـگ پێـك دێت و دەنگی هەشتـەم کە دەنگی یەکـەمی پەیـژەکـەیـەو دووبـارە دەبێتـەوە «ئۆکتاف» پێك دێنێت . (تیتراکۆرد ـ چواردەنگ)ی یەکەم دەنگی خوارەوە یاخود دەنگی گرو نزمی پەیـژەنـەو (تیتـراکۆرد ـ چواردەنگی) دووەمیش چواردەنگی سەرەوە یاخود بەرزی پەیـژەکـەنـە لەوپـەیـژەی سەرەوەدا کە بە (پـەیژەی دۆی گەورەی سـروشتی ـ NaturaL Do Major ScaLe) ناو دەبـرێت ، ماوەی میـانی نۆتەکانی وەك لە نموونەی یەك دا دیارە ، نێوان دەنگی

(دۆ ← بۆ ― رێ) یەك پلە

واتە تۆنێکەو هەروەها دەنگی (رێ ← بۆ ― می) (یەك پلە ـ تۆن) یکەو

نێوان (می ← بۆ ― فا)

نێوان (فا ← بۆ ― سـوڵ) یەك پلە .

(سۆل ← بۆ ― لا)ش هەریەك پلەو نێوان (لا بۆ سی)یش

هەروەهـایـەك پلەو، بەڵام نێـوان (سی ← بۆ ― دۆ) نیـوپلەیە .

لە نموونەکەدا

هێمای (T.) بۆ تۆن Tone واتە یەك پلە)م داناوو هێمای (S.) یشم بۆ (نیوتۆن ـ Semi Tone) داناوە .

وا لەخوارەوەش ناوی هەر حەفت دەنگەکانی ئەم پەیژەیەتان (مەبەستم پەیژەی (دۆی گەورەی سروشتی‌یە)، لەگەڵ دەنگی هەشتەم دا بۆ دەنووسم :ـ

١ ـ ا دۆ ـ Tonic ـ الأساس ـ بۆ نۆتەکانی زۆرووی خۆی دەبێتە بناغەو بنچینە .

٢ ـ II ڕێ ـ Supertonic ـ فوق الأساس ـ سەر بناغە .
٣ ـ III می Mediant ـ الوسط ـ ناوەند .
٤ ـ IV فا Sibdominant ـ تحت المتسلط ـ بن یاخود ژێر زاڵ .
٥ ـ V سۆڵ Dominant ـ التسلط ـ زاڵ
٦ ـ VI لا Submediant ـ تحت الوسط ـ ژێر یاخود بن ناوەند
٧ ـ VII سی Leading note ـ الحساس ـ بەهەست .
٨ ـ VIII دۆ Tonic ـ جواب الأساس ـ وەلامی بەرزی نۆتەی یەکەمە ، بەمەش (ئۆکتاف) واتە هەشت دەنگەکەی مەقام تەواو بوو. [١٢]

## مەقامەکانی ڕۆژهەلات

لەمۆسیقای ڕۆژهەلات دا ، سەرەڕای بەکارهێنانی هەردوو جۆرە مەقامە ڕۆژئاواییەکە و لقەکانی ، گەلێ جۆر مەقامی دیکە هەیە لە هەندێ پەرتووك دا نووسراوە ، ژمارەی ئەو مەقامانە لە سەدان زیاترە ، دەگێڕنەوە «فارابی» نزیکەی هەزار مەقامی کۆکردۆتەوە.[١٣]

گرنگترین و سەرەکی ترین جیاوازییەکانی نێوان مەقامی ڕۆژئاوا و ڕۆژهەلات لەوەدایە :ـ لە مەقامەکانی ئەوان دا تەنیا تۆن واتە یەك پلەو سیمی تۆن واتە نیو پلە هەیە وەك لە نموونەی ژمارەیەك دا دیارە ، کەچی لە مەقامەکانی ئێمەدا سەرەڕای (تۆن و نیوتۆن ـ پلەو نیوپلە) چارەگە تۆن یاخود چارەگە پلەش هەیە . ئەوەی لێرەدا شایانی گوتن بێ ئەوەیە :ـ مەقامە سەرەکییەکانی ڕۆژهەلات لە دە پازدە مەقام تێناپەڕێت وا لەخوارەوە سەرەکی ترین و ناودارترین مەقامی ڕۆژهەلات کە مەقامی (ڕاست)ە ، شی دەکەینەوە .

وەك گوتمان مەقامەکانی سەرەکی ڕۆژهەلات لەدەوروبەری (١٠ ـ ١٥) مەقام دایەو ئەوانی دیکە بریتینە لە لق و جێ گۆڕکێ بۆ نموونە :ـ

مەقامی (حیجازکار)ی ئەسلی لەسەر نیشانەی (دۆ) وەردەگیرێ یاخود دەست پێدەکرێت ، ئەگەر ئەم مەقامە ڕۆژهەلاتییەمان خستە سەر نیشانەی (سۆڵ) ، مەقامی (شت عربان)ی پێ دەڵێن ، هەر ئەو مەقامە بخەینە سەر نیشانەی (لا) مەقامی (سۆزدل)ی دەبێژنێ و گەر بخرێتە سەر نیشانەی (سی) ئەوە مەقامی (ئەوچ ئارا) ناودەبرێت و گەر بیخەینە سەر (نیشانە) ـ نۆتە)ی (ڕێ)یش ئەمجارە مەقامی (شاهناز)ی دەبێژنێ . . .

ئەمەی سەرەوە نموونەیەکە ، هەر مەقامێکی ڕۆژهەلاتی دیکەیش ، بەپێی گۆڕینی جێگای دەست پێکردنی ، ناوەکەیشی دەگۆڕێت . . . .

وا لە خوارەوە ناوی دەنگەکانی مەقامی (ڕاست)تان بۆ دەنووسم :ـ

١ ـ نۆتەی (دۆ) کە بە (ڕاست) ناودەبرێت .
٢ ـ نۆتەی (ڕێ) کە بە (دووگاه) ناودەبرێت .
٣ ـ نۆتەی (می ـ کاربیمول) کە بە (سیگاه) ناودەبرێت .
٤ ـ نۆتەی (فا) کە بە (چارگاه) ناودەبرێت .
٥ ـ نۆتەی (سۆڵ کە بە (نەوا) ناودەبرێت .
٦ ـ نۆتەی (لا) کە بە (حوسەینی) ناودەبرێت .
٧ ـ نۆتەی (سی ـ کاربیمول) کە بە (ئەوچ) ناودەبرێت .
٨ ـ نۆتەی (دۆ) کە بە (گەردان) ناودەبرێت .

ئەمەی سەرەوە لە سەرکەوتن دا ، مەبەستم لە نۆتەی (ڕاست)ەوە واتە لە دەنگی (دۆ)وە بە زنجیرە بەم شێوەیەی سەرەوە بەرەو دۆی بەرز واتە دەنگی هەشتەم (گەردان) سەردەکەوین . کەچی لە گەڕانەوەدا بەرەو خوار (واتە دابەزین لەبەرزەوە بۆ نزم) گۆڕانێك ڕوودەدات ئەویش لە دەنگی (ئەوچ ـ واتە سی کاربیمول (چارەگە) کە چارەگە پلەیەو دەبێتە سی بیمۆل واتە سی نیوپلەو لەڕۆژهەلاتیش بەم (سی نیوپلە ـ سی بیمۆل)ە دەڵێن (عەجەم)) ، بڕوانە بۆ نموونەی ژمارە (٢)

نموونەی دووەم (شیکردنەوەی پەیژەی مەقامی ڕاست)




تزایکۆرد = واتە (جنس یا مود ڕەگەز) تێکی (٣) دەنگی .

## رۆشنبیرانی کورد بو مەقام چی‌یان نووسیوە :-

* ماموستا «مەسعوود محەمەد» دەلێ :- (لە کتێبخانەی جەلی زادان کتێبێکی دەستنووس هەیە بە ناوی «الأذکار- للأمام النواوي» بە خامەیێکی رەنگین و هونەرکار نووسراوەتەوە، لەکوتایی کتێبەکە مێژووی نووسینەوەی هەیەو سالی (٧٧٦ - بەرامبەر ١٣٧٤)ی. ز. تۆماردەکا، بەم پێیە ئەمرو «٦٠٠» سال زیاترە نووسراوەتەوە، خاوەنی[١٤] نووسینەوەکە خوش بەختانە، تەواوی ناوی خوی و شوێنی لەدایك بوونی دەنووسێ «خضر بن عمر الکویسنجقلي موطناً» ). دوای ئەوە ماموستا مەسعوود دەلێ :- (بە «صدفە» لەو سالانەی دوایی - مەبەستی حەفتاکانە - لەپاشکویەکی روژنامەی «الثورة»ی بەغدادا، گوتارێکی خوالێخوشبوو «د. مستەفا جەواد»م خوێندەوە، بەر لە مەرگی بەچەن مانگێك لەسەر (مەقامی عیراقی) دەدوا، بێ ئەوەی ئەو ئاگادار بێ یامەتلەبی بێ، نرخێکی زلی دا بەو کتێبەو خاوەنەکەی، چونکە باسی دوو (موسیقاری) گەورە دەکات لەرێی وانەوە زاراوەی فارسی ناوی مەقامەکان بەرەو روژئاوای ولاتی عەرەب بلاوبووە. دەخلێکم بەسەر یەکەمیانەوە نیە، بەلام بەنیسبەت دووەمەوە دەلێ «الجمال المشرقي - خضر بن عمر الکردي - بێ گومان ئەم موسیقارە هەمان خەت خوشەکەی نووسەرەوەی کتێبی «نواوی»یە، ناوبراو موسیقارێکی زل بوو- زانایەکی زل بوو- خەت خوشێکی زل بوو. . . . تاد[١٦]

* هونەرمەندی بەناوودەنگ «قادر دیلان» سالەکانی پەنجا لە روژنامەی ژین دەربارەی مەقامە کوردی‌یەکان، چەندین نووسینی بلاوکردوتەوە، هەندێ جار بەپێی توانا و دەسەلاتی ئەوسای هەولی شیکردنەوەی هەندێ لەو مەقامانەیشی داوە بو نموونە :- بوشی کردنەوەی مەقامی «ئەللاوەیسی» بەدرێژ ی نووسینێکی بلاوکردوتەوە ئەمەی خوارەوە کورتەکەیەتی : (ئەم مەقامە پەیژەیەکی موسیقای کوردی‌یەو لەحەوت پلە دروست بووەو بەسێ ووچان سەردەکەوێتە سەرەوەو لە گەرانەوەشدا دێتەوە خوارەوە بوشوێنی دەست پێ کردنی. [١٧]

* دکتور (نورالدین الصالحي)یش، کە سالی (١٩٣٨) لە کەرکوك لەدایك بووە، سالی (١٩٧٢) بروانامەی (ماستەر)و سالی (١٩٨٠)یش بروانامەی دکتورای لە بابەتی :- [أثر محمد عبدالوهاب في الموسیقی المصریة]دا، لە زانکوی (کارل مارکس)ی شاری (لایبزك)دا لە ئەلمانیای روژهەلات دا وەرگرتووە. دکتور نورەدین لەبارەی مەقامەوە گوتوویەتی :- [لاوك لە هەموو ناوچەکانی کوردستانی عێراق وئێرانیش زوربلاوە. . . . ] دوای ئەوە گوتوویەتی [لاوك وەك قالب لە مەقامە عیراقی‌یەکان نزیك دەبێتەوە. ][١٨]

منیش بو ئەوراو بوچوونەی دکتور نورین دەلێم :-

راستە (لاوك) لە هەموو شارودێهات و ناوچەکانی کوردستان دا هەیە وزوریش بەرگوێ‌یە، بەلام دوای گەرانی مەیدانی درێژ خایەنی خوم، دوای ئەوەی ورد سەرنجم دا دیتم :- لاوك لە کوردستانی تورکیاو سوفیەت و سوریا، لە بەشەکانی دیکەی کوردستان زیاتر باوە، هەرچەندە بەداخەوە ئەمرو لە کوردستانی تورکیادا، گورانی بێژانی ئەوێ، بەو لاوکە کوردیانە خەنی بوونەو پەیتا پەیتا خەریکن لێیان هەلدێنجن و بە هونراوەی تورکی دەیان خوێنن و بە توماریان دەگەیەنن. لە کوردستانی خژ وشمان (لاوك) زورتر لە دەڤەرێ بادینان باوە، ئەوانەی لەلای خوشمان لاوك دەخوێنن، گەر بە وردی لێیان بتوژ ینەوە، یا بە رەچەلەك ئی ئەوبەر (زێ)نە، واتە هی دەڤەری بادینانن، یا ماوەیەك لەوێ نیشتەجێ بوونە یان لەولاك خوێنی فێری بوونە.

بو برگەی دووەمی قسەکەی (د. نورەدین)یش کە گوتوویەتی (لاوك) وەك قالب لە مەقامە عیراقی‌یەکان نزیك دەبێتەوە) دەلێم :- مەقامەکانی ناوچەی گەرمیانی وەك «قەتار، ئەللاوەیسی، خورشیدی، نیوەشەو، ئای ئای، . . . تاد» تارادەیەك - جازوربێت یاکەم - بەرای من لەو گوتنانەی ئەمرو بە (مەقامی عیراقی) ناودەبرێن لە شێوەدا (نەك لە جورو شێوەی گوتن و ناوەروك و مورکی تایبەتی دا) بەرای من تارادەیەك، لەو گوتنانە نزیکن.

موسیقاژەنی عیراقی بەناوودەنگ خوالێخوشبوو «جەمیل بەشیر» کە لە قەزای «تلکیف»ی دەورووبەری مووسل لە دایك بووە، هەر لەمندالی یەوەیش گوێی بە (لاوك) ئاودرابووە، ئەوەتانێ لەم بارەیەوە گوتوویەتی :- (بقومان هەیە موسیقاو گورانی کوردی بکەین بە دوو (لون - رەنگ)ەوە، یەکەمیان شعیوە گوتن و موسیقای کوردەکانی روژئاوای عیراق و کوردەکانی تورکیاو سووریەو تا دەگاتە کوردستانی سوڤیەت. . . . زوربەی ئەو مەقامانەی کە لەلاي کوردەکانی ئەو ناوچەوە بەکاردێن بریتین لە - بەیات - حوسەینی - موحەیەر- (نیوەشەو- حیجاز)و ئی دیکەش. . . . وەبەدەنگی گورانی بێژانی وەك :-
(سەعید ئاغای جزیری و حەسەنێ جزیری و محەمەد عارفێ جزیری و مریەم خان و. . . تاد) گوتراون هاتینە تومارکرن.

رەنگی دووەمیش ئی کوردەکانی سەرووی روژهەلانی عیراق و کوردەکانی کوردستانی ئێرانن. . . . مەقامی کوردەکانی ئەو ناوچانە دیارە مەبەستی مەقامەکانی (نیوەشەوو ئەللاوەیسی و ئای ئای و خورشیدی و. . . تاد)یە لەگەل مەقامە روژ هەلاتی‌یەکانی میللەتانی دیکەی دەورووبەری وەك - عەرەب و فارس و تورك - نزیکن و تێکەلاون. جەمیل بەشیر لە قسەکانی بەردەوام دەبێت و دەلێت :- (ئەو مەقامانەی کە بە دەنگی «عەلی مەردان»و «تایەر توفیق» گوتراون، گەر بەدیقەت و بەوردی گوێیان بوشل

کرێت بەئاسانی هەست بە جیاوازی نێوان گوتنی ئەوانەو گوتنی بۆنموونە «حەسەنی جزیری» دەکرێت) لە کۆتایی‌دا جەمیل بەشیر نووسیویەتی :- (بەڕای من ڕەنگی یەکەم «مەبەستی [لاوك]ە» مۆرك وتام وبۆو ڕەسەنایەتی کوردی لە باوك و باپیران بە جێماوی بە تەواوی‌و بە ئاشکرایی پێوەدیارەو بەهیچ جۆرێك بەلای مۆسیقاو گوتنی میللەتانی دیکەدا نەچووەو نزیکش نەکەوتۆتەوە.[١٩]

هیوادارم ئەوڕاوبۆچوونەی مۆسیقاژەنی بلیمەتی نەمر (جەمیل) بۆ ڕاوبۆچوونەکەی (د. نورەدین) وەلامێکی باش بێت.

کورد مەقام

---

بەوپێیەی میللەتی کورد یەکێکە لە میللەتە کۆن وناودارەکانی ئەم ناوچەیە، زۆربەی مەقامەکانی ناوچەکەی بە ئوستادی بەکارهێناوەو گوتووە، بۆنموونە مەقامی (عەجەم) لەسەر نۆتەی (دۆ) کە بەرامبەر مەقامی (بۆ)ی گەورەی سروشتی ڕۆژئاوایە، تا ئێستا وەکو مەقامێکی نزیك دەست وگوێی گەلەکەمان، ناونەبراوە، کەچی دەبیستین خوالێخۆشبوو (سێوە) ساڵەکانی پەنجا ئەم مەقامی عەجەمەی گوتووە، بەلام چۆن گوتنێك، جگە لە لێهاتوویی و ئوستادی سێوە لە مەقام خێندن داو جگە لە دەنگی بەسۆزی، پێمانی سەلماندووە کە گوتنی ئەوبۆئەم مەقامی (عەجەم)ەو ئەوانی دیکەش، بەهیچ جۆروشێوەیەك، بە گوتنی هەمان ئەومەقامانە لای میللەتانی دەوروبەر نەچووەو نزیکیش نەکەوتۆتەوە، هەر ئەوەندە دەتوانم بڵێم :- (گوتنەکانی سێوە نەك هەر تەنیا لە مەقامی (عەجەم)دا بەڵکو لە هەموو ئەومەقامانەی بە تۆماری گەیاندوون، تام و بۆی کوردی‌و ڕەسیەنایەتی‌یان لێ دەتکێ. . . . )

باوەڕناکەم (سێوە)ی نەمریش هەموو ئەو گوتنانەی لە خۆیەوە داهێنابێت، چونکە وەك لە گەڕانی مەیدانی‌دا بۆم دەرکەوت پێش سێوەش بلیمەتانی وەك« مەڕبین و حەنیلەخەرەو مەلا ئەسعەدوزۆری دیکە) هەبوونەو هەمان ئەوشێوە گوتنانەیان بە ئوستادی خوێندووە، ئەمە لەلایەك ولەلایەکی دیکەش شێوە گوتنێك لە کوردستانی ئێراندا باوەو کاتی خۆی لە گۆرانی بێژی میللی (ڕەسوولی نادری)یەوە گوێم لێ‌بووەو بە کاسێت تۆمارم کردووە، «گەلۆەی پێ دەڵێن، گەلێ لە شێوەی گوتنی «سەحەر»دا کە لەلایەن سێیوەوە لەسەر مەقامی عەجەم گوتراوە، لەیەك نزیکن و دیسانەوە زۆر کوتن و خوێندنی مەقامی عەجەم هەند کەم نازۆر تام وبۆی سەحەر دەدەن بۆنموونە :- (مستەفا حەسەن)ی بەیت خوان هەندێ لە بەیتەکانی بە هەمان شێوە گوتن و لەسەر هەمان مەقامی عەجەم خوێندووە، ئەوەندە هەیە ڕەنگە سێوە ووردەکاری‌ولەرانەوەی قورگ و سۆزی زیاتری لەوانەی پێش خۆی بەو مەقامانە بەخشی بێت.[٢٠]

هونەرمەند «قادر دیلان»یش لە بارەی ئەم بابەتەوە گوتوویەتی :-

(گۆرانی بێژی بلیمەت خوالێخۆشبوو «سەید عەلی ئەسغەری کوردستانی» مەقامی تری هێناوە جگە لە مەقامە کوردی‌یەکان و بە خۆی‌دا هەندێ کەس ئەمەیان بەدڵ نەبووە، بەلام ئێمە لەگەڵ گۆرانی بێژی ناوبراوداین.[٢١]

گۆرانی بێژی خوالێخۆشبوو «مەلا کەریم»یش مەقامی (هەمایۆن)ی بەشێوەیەك گوتووەکە بە هیچ جۆرێك لە گوتنی ئەو مەقامە لای میللەتانی دەورو بەرو دراوسێ ناچێت. . . . دوای ئەویش گۆرانی بێژی دیکەی کورد مەقامی (هەمایۆن) یان بەهەمان شێوە گوتووە، بۆ نموونە گۆرانی بێژ :-

«خەلیل وەندی» کە ئەو مەقامەی بە لێهاتوویی‌و تام بۆیەکی کوردی خوێندووە.

کەچی مەقامی هەمایۆنیش وەك مەقامی عەجەم تا ئەمڕۆ وەك مەقامێکی نزیك وئاشنای نێودەست وگوێچکەی کوردان ناوی نەهاتووەو باس نەکراوە، جا من کە دەڵێم :- لێرەودوا مەقامی (عەجەم و هەمایۆن)و گەلێ مەقامی دیکەش کە لەلایەن ئێمەوە گوتراون وبەکارهێنراون و ئاوازی گۆرانی‌و مۆسیقایان لەسەردانراوە، با لە تەك مەقامەکانی دیکەی ڕەسەنی خۆمان، (وەك لاوك، ئەڵلاوەیسی، قەتار، ئای ئای ـ وزۆری دیکەش، ) دابنرێن. لەخۆڕا ئەوە ناڵێم، ئێمە وەك گوتم بەسەدان بەستەو گۆرانی فۆلکلۆریمان هەیە، کە لەسەرمەقامی عەجەم ئاوازیان بۆدانراوە، گۆرانی‌و بەستەی فۆلکلۆریشمان هەیە (باکەمیش بن) لەسەرمەقامی هەمایۆن ئاوازیان بۆدانراوە، لێرەدا دەپرسم و دەڵێم :- کێ دەتوانێ بڵێ کورد لە بەرهەم هێنانی ئەم دوومەقامەی سەرەوە بەشداری نەکردووە؟ یا هەر خۆی خاوەنی یەکەمجاری بەرهەم هێنانی ئەودوومەقامەو زۆرەها مەقام و شێوە گوتنی دیکەش نیە؟

چونکە ئەگەر کورد هەر لەدێرزەمانەوە ئەومەقامانەو گەلێکی دیکەشی نەناسیبێ‌و نەگوتبێ. . . چۆن بۆی کراوە ئاوازی بەستەو گۆرانی‌یان لەسەردابنێت؟

(عەلی مەردان)ی نەمر کە بەشایەدی زۆر لا میراتگری گەلێ مەقامی ڕەسەنی کوردان بوو، ئەوە جگە لە ئوستادی لە مەقام گوتن دا لەلایەك و لەلایەکی دی نەغمەخوانی و سۆزو چریکەی دەنگی‌و لاوانەوە لەمەقام گوتن دا، ئەو نەمرە بست بە بست هەردوو کوردستانەکەی تورکیاو ئێران گەڕابوو وگەلێ بە سەرهاتی سەیرو دڵتەزێنیشی دیتبوو، بۆیە شارەزاییەکی چاکی لە شێوە زمانەکانی کوردی‌و لەئاوازە جۆر بەجۆرەکانی، هەموو ئەو شوێنانەشدا پەیداکردبوو.

جا با بزانین ئەو ئوستادو مەقام زانە لەبارەی ڕەسەنایەتی مەقامی کوردەوە لە نێومەقامی شەرقی‌دا چی گوتووە :-

(هـەرچـەنـدە ئەم مەسەلەیە، وردبوونەوەیەکی قووڵ و زانستیانەی پێ دەوێ. . . . . . بەڵام ناوو نازنــاوی مەقـام و هەروەهـا بە جۆری گوتن، دەتــوانم بڵێم :ـ کە زۆربــەی زۆری مەقـامی شەرقی کوردین و خاوەنـە ئەسڵیەکەی کوردە هەر بۆ نموونە :ـ گوێ لەیەك مەقامی هینی دوو گۆرانی بێـژ ی کورد و [فـارسێـك یا تورکێـك یا عەرەب]ێك بگرە، زۆر باشت بۆ روون ئەبێتـەوە کامـەیان ڕاسـتر و ڕەسەن ترن . . . . . بەڵام چی بکەین، کە زۆر لە شوێنـەواری هونـەر ئاوازو گۆرانیمـان شتی ترمـان تاڵان کراوەو خەڵکی تر بەهێنی خۆی ئەزانێ . . . . . بەڕاستی لێــدوان لەم بابــەتــە هەرەگرینگ و بایەخدارە ئەکەوێتە سەر ئەستۆی هونەرمەندانی کوردو هەر ئەشبێ ئەوان بە کارامەیی و بەگیانێکی زانستانەوە وەڵامی ئەم پرسیارە قووڵە بدەنەوە.)[22]

ناوی ئەو مەقامانەی هەر لەسەرەتاوە بەکوردی ڕەسەن هاتوون :ـ

---

١ ـ لاوك :ـ شایـانی باسـە لاوك زۆرچـەشنی هەیـە بۆ نموونە :ـ کوردۆ، مەترانۆ. عەبدالێ، خەلیلۆ، زۆری دیکەش بەومەقامانەش گوتراون :ـ

أ ـ بەیات. ب ـ حوسەینی. حـ ـ موحەییەر. ، د ـ حیجاز. . . .

٢ ـ حەیران.

٣ ـ هۆرە

٤ ـ ئەڵلاوەیسی.

٥ ـ فەتر.

٦ ـ خورشیدی.

٧ ـ ئای ئای.

٨ ـ نیوەشەو.

٩ ـ ئورفە.

١٠ ـ ئەلوەن

١١ ـ مەنــووری.

١٢ ـ حەکیمی.

ئەمە جگە لەشێوە گوتنی جۆراو جۆری وەك :ـ

(سـەفـەر، ئای ئای باجـەڵانی، هیجران، خاڵە موختار، سوارۆ، گەلۆ، بەهار) و زۆری دیکەش.

وەك گوتمان «مەقام» پەیژەیەکیء مۆسیقایەو لە یەك بەدوا یەك داهاتنی نەپســاوەی حەفت دەنـگ پێك دێت، بۆ نموونە مەقامی (بەیات) لەلایەن زۆربەی میللەتانی دەوروبەرو بەشێکی زۆریش لە میللەتانی ڕۆژهەڵات بەکـاردێت. بڕوانـە نمـوونـەی ژمـارە (٣)، ماوەی نێـوانی دەنگـەکـانی ئەومـەقـامـە وەك نمـوونـەکەیەو ناگۆڕێت، بەڵام ئەوەی ئەو مەقامە یا هەر مەقـامێکی دیکـەی (ڕۆژ هەڵاتی بێت یا ڕۆژ ئاوایی) دەکات بە کوردی یا عەرەبی یاتـورکی . . . . جۆری گوتن واتـە (أداء)ی ئەو مەقـامەیە، هەر میللەتە (مۆرك ـ طابع)ی خۆی پێوە دەلکێنێت، کە لەگەڵ مۆرکی هەمان مەقام لای میللەتیکی دی جیایە.



## شیکردنەوەی مەقامی ئەڵلاوەیسی

ئێستاش وا لە خوارەوە شی کردنەوەی مەقامێکی ڕەسەنی کوردی کەلەپووری باوك و باپیرانتان بۆ دەنووسم، مەقامی ئەڵلاوەیسی ئەو (ئەڵلاوەیسی)یەی من لێرەدا شی دەکەمەوە بەدەنگی گۆرانی بێژ «حەسەن گەرمیانی»ی تۆمارکراوەو من و هونەرمەندان ئەنوەر قەرەداخی و سەردار ئەحمەد بە ئامێرەکانی مۆسیقای (جومبوش)و (کەمان)و (شمشاڵ) مۆسیقاکەمان بۆ ژەنیوە، ئەم مەقامە ساڵی (١٩٧٤) لە شاری (قەسری شیرین) تۆمارکراوە. شیکردنەوەی ئەم مەقامی «ئەڵلاوەیسی) یەم بە یارمەتی هونەرمەندی عیراقی خواڵێخۆشبوو (جەمیل سەلیم) ئەنجام داوە، ناوبراو لە پەیمانگەی هونەرەجوانەکانی بەغدادا مامۆستای ئامێری «عوود» بوو، لە خوێندنەوەو نووسینی نۆتەو ئاوازدا هاوتای کەم بوو، خاوەنی دەیان بەهرەی هونەری دیکە بوو، بەو پێ یەی کە من ماوەیەك وانەی تایبەتیم لە نووسینی نۆتەدا لێ وەرگرتووە، بۆماوەی چەن ساڵێکیش تێکەڵی خێزان و هاتووچۆ لە نێوانماندا بەردەوام بوو، یەك دوو جار لەبارەی ئەو مەقامەوە بەتایبەتی لەگەڵ مامۆستا «جەمیل سەلیم» دانیشتوومەو گفتووگۆمان لەسەری بووە، پێکەوە گوێمان لە گوتنەکەی «گەرمیانی» گرتووە، بۆیە دوای ئەوەی «بەڕای خۆم» گەیشتمە ئەنجام، بڕیارم دا، بەو شێوەیەی خوارەوەی شی بکەمەوەو بڵاوی بکەمەوە. بۆیە دەڵێم :- مەرج نی یە ئەو مەقامی «ئەڵلاوەیسی»یەی لەلایەن ئێمەوە شی کراوەتەوە «ئایەت» بێت و بەهیچ جۆرێك قابیلی گفتووگۆیا گۆڕین یا دەسکاری نەبێت. جا هیوادارم کە هونەرمەندەکانمان هەر تێبینی یەکی لەم بارەیەوە لایان دروست دەبێت، بیخەنە بەرچاو، تاوەکو ئەو مەقامە ڕەسەنە کوردی یە بەڕاسترین شێوە بپارێزرێت.

١ - پێشەکی مۆسیقاکە مەقامی (ڕاست)ە، لەسەر نۆتە یاخود دەنگی (لا - La ) مۆسیقای گۆرانی «ئەری ڕاستەی خیابان»ە، دوای تەواوبوونی مۆسیقای پێشەکی ئامێری کەمان بە تەنیا دەڕوات و لە مەقامی «موستەعار» لەسەر دەنگی (فا - Fa ) «کاردێز - چارەگە» بۆ مەقامی «نەهاوەند» لە سەر نۆتەی (لا - La ) دەچێت. گۆرانی بێژ یش هەر بەم شێوەیە واتە لە مەقامی «موستەعار»ەوە بۆ مەقامی «نەهاوەند» لەسەر دەنگی (لا - La دەڕوات و گرانایی زۆریش دەخاتە سەر نۆتەی (لا - La ).
ئامێر (جومبوش) بە هەمان شێوەی سەرەوە دەڕوات.
ئامێری (شمشاڵ)یش بە هەمان شێوە دەڕوات.

(نموونەی چوارەم) پارچەی یاخود ووچانی یەکەمی مەقامی (ئەڵلاوەیسی)




نموونەی پێنجەم (ووچانی دووەمی ئەڵلاوەیسی)






٢ ـ ئەم جارە ئامێـری (کـەمان) لە نێوان مەقامی (ڕاست)و (چارگا) دایەو هەر لە سەر نۆتـەی (لا ـ La)و لەدواییش دا بۆ نەهـاوەنـد لەسـەر (لا ـ La) دەگـەڕێتـەوە گۆرانـی دوای ئامێـری کـەمـان (ڕاست)ە. ئامێـری (جـومبـوش)ەکـەی دوای ئەو پارچـەیـەش هەر مەقـامی (ڕاست)ە لەسەر دەنگی (لا ـ La).

ئامێری شمشاڵ وەکو ڕۆیشتنی یەکەمجاری ئامێری کەمانەکەیە.

جومبوش دوای ئەو پارچەیە بەهەمان شێوە دەیژەنێ.

٣ ـ ئەم جارە ئامێـری کـەمـان (بـەیات) لەسەر نۆتەی (سی ـ Si) دەڕوات و دەژەنێت، گۆرانی دوای ئامێری کەمان هەمان شێوەیە، ئامێری جومبوش ئەم جارە بە مەقامی (ڕاست) لەسـەر نۆتـەی (لا ـ La) دەڕوات و کۆتایی مەقـامـەکـەش واتـە کۆتـایی مەقـامی «ئـەڵـلاوەیسی»یش هەر بەمەقامی (ڕاسـت) لەسەر نۆتەی (لا ـ La) دێت.

بە پێی ئەم باسەی سەرەوە دەنگەکانی مەقامی ئەڵلاوەیسی وەك خوارەوەی لێ دێت

:ـ

١ ـ دەنگی حوسەینی ـ نۆتەی لا ـ
٢ ـ دەنگی ماهوور ـ نۆتەی سی ـ
٣ ـ دەنگی گەردان ـ نۆتەی (دۆ)ی سروشتی یاخود دەنگی (نیم شاهنار ـ دۆکاردێز).
٤ ـ دەنگی موحەییەر ـ نۆتەی (ڕێ).
٥ ـ دەنگی بەرزی بۆسەلیك ـ نۆتەی (می).
٦ ـ دەنگی ماهـوران ـ نۆتـەی (فا)ی سروشتی یاخود دەنگی بەرزی (نیم حیجاز ـ فاکاردێز)
٧ ـ دەنگی ڕەمل تووتی ـ نۆتەی (سۆڵ)

هونـەرمـەنـد «قـادر دیـلان» وەختی خۆی باشی بۆچـووە کە مەقـامی «ئـەڵـلاوەیـسی» بە سێ وچـان دابـەشکـردووە. منیش لەخـوارەوە وچانەکان نیشان دەدەم :ـ

١ ـ وچانی یەکەم :ـ

مەقـامی ئەڵـلاوەیسی وەك خوالێخـۆشبـوو «جـەمیـل سەلیم» دەست نیشانی کردو گوتی ـ یەکەمجار دەست پێ کردنی مەقامەکە لەسەر «مەقامی موستەعار»ی تورکی یە لەسەر نۆتەی (فاکاردێز ـ فای چارەگە) ودوای ئەوە دەبێتـە مەقـامی (نـەهـاوەنـد) لەسـەر نۆتـەی یاخـود دەنگی (لا). بڕوانە نموونەی ژمارە (٤).

٢ ـ وچانی دووەم :ـ

گوتنـەکـە لە نێـوان هەردوو مەقـامی (ڕاست)و (چـارگـا)دایە، لەسەر نۆتـەی (لا) دوای ئەوە بۆ مەقـامی (نـەهاوەند) لەسەر (لا) دەگەڕێتەوە. بڕوانە نموونەی ژمارە (٥).

٣ ـ وچانی سێیەم :ـ

لەم وچانەدا یەکەم جار مۆسیقای کەمان دەبێتە مەقامی (بەیات) لەسەر دەنگی (سی)، لەدوایـیـدا گوتن و مۆسیقـا دەبێتـە مەقامی (ڕاست) لەسەر دەنگی (لا)و هەر بەومەقامەش کۆتایی دێت. بڕوانە بۆوێنەی ژمارە (٦).

## کۆتایی و ئەنجام

بەوپێـیـەی کە میللەتـەکـەمان هەر لەدێر زەمانەوە لەم ناوچەیەدا ژیانی بەسـەربـردووە دیـارە کەم تا زۆر لەولقە گرنگەی سەر بە جیهانی هونەری سازو ئاوازوگوتن واتە (مەقام) دەبێ دەوری هەبووبێ.

ئەوەتـانێ بێگـانەیەکی وەك «تۆمابوا» گوتوویەتی: (کورد لە سەردەمی (ساسانی)دا مۆسیقایەکی یەکجار پێشکەوتوو و بەرزیان هەبووە.)[٣٣]

مامـۆستا «مەسعود محەمەد»یش هەر بەرێکەوت مەقام زانێکی کوردی بۆدەست نیشان کردین، کە پێش سەدان ساڵ دەوری سەرەکی هەبووە لە بڵاوکردنەوەی زاراوەی مەقامەکان بە ناوگەلی عەرەب دا.

هەروەها وەك خوێندتانەوە دامەزرێنەری ئەو قوتابخانەیەی ئەمڕۆ «مەقامی عێراقی» پێ دەڵێن، پیاوێکە بە ناوی (رەحمەتوڵلای کوری سوڵتان)و بە (شڵتاغ) ناوی دەرکردووە، ئەو پیاوە لە (کفری) لەدایك بووە.

جگە لەو مەقام خوێنە بلیمەتەی سەرەوە، لەنێومان دا بە دەیان بلیمەتی مەقام خوێن وهەم مەقام زان هەڵکەوتوونە وەك نموونە:- حەمە پیرە، محەمەد خەلیل ئاغا، مەلا سابیر، مەلا تەها، حەسەنێ جزیری‌وسەیدێ جوو و گەلێکی دیکەش.[24]

مەقام زان یاخود مەقام ناسی ئەوتۆشمان هەبووە، مەقام خوێن و دەنگە خۆشانی میللەتانی دراوسێ فێربوونە، بۆنموونە (مەلا وەلی) کە ناوی (عەبدولرەحمان) بووەو لە (کفری) ساڵی (١٢٤٦)ی کۆچی لە دایك بووە، کاتێ کە بۆ(بەغدا) چووە گەلێ مەقام خوێن لێ یان وەرگرتووەو لێ ی فێربوونە وەك (علي بن صَفو) کە بە (وەستای - شێخی) مەقام خوێنانی شاری (مووسڵ) ناسراوە.[25]

جگە لە دەیان مەقام خوێنی کوردی دیکەی وەك:-

خدر بارام چاوش، حاجی عەبۆی دەفەزەن، سمایل سەرما بردوو، سەعید ئاغای جزیری، حەمەد مەندۆ، شەهابەی هەولێری.........

پەراوێزو سەرچاوەکان:

---

١ - حاجی هاشیم رجب - کتێبی (المقام العراقي) بەغدا چاپخانەی (الأرشاد) ١٩٨٣.

٢ - تیتراکۆرد:- لە ئەسڵدا وشەیەکی یۆنانی یەو لە درو برگە پێکهاتووە، (تیترا) واتە (چوار)و (کۆردیش) واتە دەنگەکان، کەواتە (تیتراکۆرد - چواردەنگ) یان چواردەنگەکان دەگەیەنێت.

٣ - حسین قدوری - کتێبی - الموسوعة الموسیقیة. ل. (٨٣) ول. (١٠٢).

٤ - بەبۆچوونی هونەرمەند «ئەنوەر قەرەداخی» پسپۆری ئەم بابەتە بووە، هەندێ راوتێبینی وردو زیرەکانەی نیشان داوە، لەجێگای خۆی‌دا ئاماژەی بۆدەکەین، وەك لێرەدا «چینی دەنگ» لەجیاتی (octava) بەکاربێت بە جوانتر دەزانێت.

٥ - حبیب ظاهر العباس. کتێبی - نظریات الموسیقی العربیة. ل. (٢٩).

٦ - توفیق الصباغ. کتێبی - الدلیل الموسیقي العام. ل. (٣٦).

٧ - ئەم تێبینی یەش واتە بەکارهێنانی (هەوا) لە جیاتی (مەقام) لە هەندێ ناوچەی کوردستان، دیسانەوە رای هونەرمەند «ئەنوەرقەرەداخی»یە.

٨ - (پەیژە) لە ئینگلیزی‌دا (Scale) و لە عەرەبیش دا (سلم)ی بەرامبەرە.

٩ - جۆرج هێنری فارمەر - کتێبی - مێژووی مۆسیقای عەرەبی - دکتۆر (حسین النصار) بۆ زمانی عەرەبی وەرگێراوە. ل. (٢٣٢).

١٠ - هەمان سەرچاوەو هەمان لاپەرە

١١ - عباس العزاوي - کتێبی - مۆسیقای عیراق لەسەردەمی مەغۆل و تورکومانەکاندا - لە کۆتایی ئەو کتێبە واتە لە (ملحق)ەکەی‌دا باسکراوە.

١٢ - دلێر ئیبراهیم - بلاوکراوەی تیوریێ مۆسیقا - ساڵی ١٩٧٧ - مەڵبەندی چالاکی قوتابخانەکانی سلێمانی بەچاپی گەیاندووە.

١٣ - کۆرێك لەژێر ناونیشانی (هەندێ نموونە لە مەقامە کوردی‌یەکان) ساڵی ١٩٧٩ لە هەولێر لە لایەن هونەرمەند (رزگار خۆشناو)ەوە پێشکەش کراوە.

١٤ - هونەرمەند «ئەنوەر قەرەداخی» لە جیاتی زاراوەکانی (کاربیمۆڵ)و (کاردێز) دەڵێ:- باشتراوایە (چارەگە) دابنرێت، چونکە هەر مانای چارەگە پلە دەگەیەنن.

١٥ - مامۆستا (مەسعود) دەڵێ ساڵی نووسینەوەی ئەو دەستنووسەی (نواوی) (١٣٧٤)ی.ز. بەم پێیە ئەمڕۆ (٦٠٠) ساڵ زیاترە نووسراوەتەوە.

١٦ - مەسعوود محەمەد - حاجی قادری کۆیی - بەشی یەکەم - بەغدا (١٩٧٣) ل. (٣٦٠).

١٧ - رۆژنامەی ژین ژمارە (١٥٢٣)ی ساڵی (١٩٦٠).

١٨ - گۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارە (٦٦)ی ئاداری ساڵی (١٩٨٤) ل. (١٩ - ٢٤)

١٩ - گۆڤاری نۆتونۆمی - ژمارە (٢)ی ساڵی نۆیەم (١٩٨٥) ل. (٩٥ - ٩٩).

٢٠ - پاشکۆی رۆژنامەی عیراق ژمارە (٣١) لە (١٣/٤/١٩٨٨) دا.

٢١ - رۆژنامەی ژین ژمارە (١٣٣٣)ی (١٤/٢/١٩٥٧)دا.

٢٢ - گۆڤاری رۆژی کوردستان ژمارە (٦٣)ی ١٩٨١) ل. (٧٨ - ٨٣)

٢٣ - تۆماسوا - ژیانی کوردەواری - حەمەسەعید حەمە کەریم - لەعەرەبی‌یەوە وەری گێراوەتە سەر زمانی کوردی. ل. (١٨٠).

٢٤ - گۆڤاری کاروان - ژمارە (٦٠)ی ساڵی (١٩٨٧) ل. (٨٠ - ٨٤).

٢٥ کمال لطیف سالم - کتێبی - أعلام المقام العراقي ورواده - بەغدا ساڵی ١٩٨٥.

هەروەها سوودلەم سەرچاوانەی خوارەوەش وەرگیراوە:-

١ - ئەدۆڵف دان هاوزر - نظریات الموسیقی الغربیة.

٢ - شعوبي إبراهیم خلیل - کتێب - دلیل الأنغام لطلاب المقام.

٣ - بلاوکراوەی (القیثارة) ژمارەکانی (٩)ی ساڵی (١٩٧٦)وژمارە (٢)ی ساڵی (١٩٨٠).

٤ - گۆڤاری نوروز العراق ژمارە (١) - بەغداد، وتارێکی هەمان بابەتی نووسەر.

ملخص البحث

# المقام

وريا أحمد

بحث في مفهوم المقام الموسيقى ومصطلحه اللغوي ومدلوله كما يراه بعض العلماء والفلاسفة. ويتطرق البحث كذلك الى هيكل المقام الموسيقى وتفاصيل تكوينه وعناصره فيميّز المقامات الغربية عن المقامات الشرقية ويذكر أهم أوجه الاختلاف بينها. وتنسب للشعب الكردي حاله حال الشعوب الشرقية المجاورة له مقامات خاصة تحتل مكانة مرموقة في تراثه الفني وقد أشار بعض الموسيقين والكتاب الكورد والعرب في دراساتهم الى هذه المقامات والى خصوصياتها المحلية، وهناك مقامات أصلية قديمة لا تزال متداولة بين المطربين الكورد ومنها: لاوك، حيران، هوره، الله ويسى، قتار، خورشيدي. اى‌اى. نيوه شو، اورفه، آلوه‌ن، منصوری وحكيمی. . . هذا بالاضافة الى تداول المقامات الاخرى المعروفة لدى الشعوب الاخرى بين المطربين وإستتفادتهم منها في بناء الأغاني الكردية المتنوعة.

وفي البحث تحليل لمقام (الله ويسى) الخاص بالغناء الكوردي ومؤداه أن مقدمته الموسيقية تبدأ بمقام راست على نوطة (لا) وينفرد الكمان بعد المقدمة مواصلا من مقام (مستعار) على نوطة (فا) كارديز الى مقام نهاوند على نوطة (لا). وبفعل المطرب نفس الشي أي يبدأ من مقام (مستعار) ويتجول الى مقام (نهاوند) على نوطة(لا).

وفي الخطوة الثانية تتحول آلة الكمان بين مقامي (رست) و (جارگاه) وعلى نوطة (لا) عائدة الى الغناء في مقام (نهاوند) على نوطة (لا) ايضا. وفي الخطوة الثالثة تعزف الكمان (البيات) على نوطة (سی) ويتبعها صوت المطرب على نفس الشاكلة وينتهي المقام بال (رست) على نوطة (لا).

# هونەری مینیاتووری کوردی

أ. پەرویزی



هونەری مینیاتوور Miniatur جورە وینەکیشان یا هیلکاری‌یەکی بچووکی رەنگورەنگە، لە سەدەکانی ناوەراست دا لەسەر پەرەی دەستنووس و کتیبەکان کراوە. ئەم جورە وینەیە سەرەتای دەستنووس و کەناری لاپەرەکانی پی‌دەرازاندن و بو روون کردنەوەو بەرچەوخستنی هەندی رووداوو کەسان و لایەنی گرنگی کتیبی پی رازینراوەتەوە. ئەم هونەرە لە جیهانی ئیسلامیش دا و بەتایبەتی لە قوتابخانەکانی بەغدای سەدەی ١٢دا گەیشتووەتە پوپەکی بلندی گەشەکردن و بەرەو پیشەوەچوون. لە سەدەی ١٤یش دا، لەژیر کارتی‌کردنی هونەری وینەکیشانی چینی‌دا، لە سەمەرقەندو پاشان لە هیرات و تەوریزو ئەسفەهان زور پەرەی‌سەند. لە سەرەتای دەسەلاتی پادشا مەنگولەکانیش دا لە سەدەی ١٦دا لە هیندستانیش زور بەرەوپیشەوە چوو.

ئەم هونەرە هەروا لە کوردستانیش دا باو بووە. بەلام مایەی داخە هیچ نووسین و لیکولینەوەیەك لەم بارەوە لە بەردەست دا نی‌یەو تەنها چەند کەسیك بە شیوەیەکی سەرپی‌یی پەنجەیان بو راکیشاوە. یەکیکی وەکوو ئەولیا چەلەبی پاش داگیرکردنی قەلای بەتلیس، بەم شیوەیە باسی کتیبە مینیاتوورکاری کراوەکانی کتیبخانەکەی عەبدال خان دەکات: «دە دانە کتیبی بەنرخ و بایەخداری تیدابوو کە لەلایەن خوشنووسە بەناوبانگەکانەوە نووسرابوونەوەو بە چەشنیك رازابوونەوە کە هەریەکەیان کرابووە پارچە ئەنتیکەیەکی بی‌وینە...» «بەلی هەزاران بەرهەمی هونەرکارە بەرزەکانی دنیا لیرە خرابووە هەراجەوە». لە شوینیکی کەش دا باسی شانامەیەك دەکات کە چون کابرایەك بە چەقو تیی‌نیشتووەو لەتوپەتی کردووە.

پیش داهاتنی چاپخانە، خوشنووس و هونەرمەندەکانی ئەو سەردەمە، بو نووسینەوەی کتیبیك هەزارویەك هونەریان بەکارهیناوە. میرو پیاوە دەست رویشتووەکانی ئەو زەمانە خەلاتی چاکیان بەوکەسانە داوە کە کتیبیکیان بو بنووسنەوە.

داخەکەم تا ئەمرو لەلایەن نووسەرو هونەرمەندو رووناکبیرەکانەوە هیچ بایەخیکی ئەوتو بەم هونەرە نەدراوە. ئەوکەسانەی دەسنووسە کونەکانیشیان بلاوکردوتەوە تەنیا بایەخیان بە شیعرەکان داوە. شیوەی خەت و وینەو نەخشەکان **بەتەواوی** پشت گوی خراون. بی‌گومان ئەم جورە خەتو وینەو نەخشانە بایەخیکی یەکجار گەورەیان بو هونەری تەشکیلی و زانستی میژوو و سوسیولوگی و ئیتنولوگی و دیکوراسیون و زانستی جوانناسی (ئیستاتیکا) تاد هەیە. ئەمە ئەبیتە بناغەیەکی باش بو گەشەپیدانی هونەری تەشکیلی نوی بە هەموو روویەکەوە.

ماوەیەك لەمەوپێش هەندێك لە هونەرمەندە لاوەكان بۆئەوەی سەرچاوەیەك بدۆزنەوە مۆركی تایبەتیی هونەری كوردیی پێوەبێ، پەنایان دەبردە بەر ئەو بەرهەمە دەستی یانەی لە كوردەواریدا باون و نەخش و ڕەنگیان تێدا بەكاردەهێنرێ وەكوو جۆلایی و مافوور دروست كردن. پێویستە هونەرمەندانی كوردیش، وەكوو هونەرمەندانی گەلانی تر، بۆ پەرەپێدانی بەرهەمەكانیان بگەڕێنەوە بۆ كۆشی هونەری میناتوور.



لە بواری ئیتنۆلۆگیشدا، ئەم هونەرە یارمەتیمان دەدا بۆ تێگەیشتنی هەندێ گرێ كوێرەی كۆمەلایەتی كە ڕەنگە كەس توانای دەربڕینی بە نووسین نەبووبێ. زۆر لە مێژووونووسە ئەوروپاییەكان سوودێكی گەورەیان لە میناتوورەكانی سەدە ناوەڕاستەكان وەرگرتووە بۆ تێگەیشتن و ڕوونكردنەوەی ژیانی ئەو سەردەمە وەك شێوەی ئالای دەولەت و ئیمارەتەكان، جل و بەرگ، زۆرانبازیی سوارەكان، شوێن و جێگای ژن.. تاد.

ئەم میناتوورانەی لێرەدا بلاویان دەكەینەوە، هەموویان لەناو ئەو دەستنووسانەدان كە لە كتێبخانەی دەولەتیدا لە بەرلین پارێزراون. من بەهۆی هەندێ دۆست و ناسیاوەوە زانیم لەناو ئەو دەستنووسانەدا هەندێ میناتووریش هەن، هەرچەند تائێستا كەسی ئیشارەتی بۆ ئەم مەسەلەیە نەكردووە.

كاتی سەردانی ئەو كتێبخانەیە، داوام لێ كردن لە هەر میناتورێك سلایدێكم بۆ بگرن و بۆم بنێرن.

وەنەبێ ئەم وێنەو نەخشانەی لەم وتارەدا بلاوكراونەتەوە تاقە بەرهەمی هونەرمەندە كوردەكانی سەدە پێشووەكان بن. جوان و نایاب بدۆزرێتەوە. كە لە ولات بووم سەری ماموستا (ص.ص)م دا بۆ بینینی ئەو دەستنووسە كۆنانەی كۆی كردوونەتەوە. بەرێكەوت چاوم بە «خوسرەوو شیرین»ەكەی خاتای قوبادی كەوت كە زۆر بەجوانیو ڕێكوپێكی نووسراوەتەوەو چەندین وێنەی ڕەنگاورەنگی تێدایە. ئەو وێنانەی لەوێ بەرچاوم كەوتن، لە ڕووی هونەریو ڕەنگ كردن و دەربڕینی هەست و نەست و جوولەوە، بە هیچ چەشنێك لەگەل ئەم وێنانەی لێرە بلاوكراونەتەوە - بەراورد ناكرێن.

### خوسرەوو شیرین:

---

میناتوورەكانی ئەم دەستنووسە كە ژمارەی Petermann II N.13, SB Marburg Berlin پێوەیە، هەرچەند ناوی دانەری لەسەر نییە، وەكوو دەستنووسی ژمارە MS. or. ost. 1165, SB Marburg Berlin كە نوسخەیەكی تری (خوسرەوو شیرین)ە، بەگوێرەی بۆچوونی (ئۆسكار مان) دەبێ دانەرەكەیان ئەلماس خان بێت.

میناتوورەكانی ئەم دەستنووسە بریتین لە ڕازاندنەوەی هەندێ لاپەرە بە نەخشی ڕەنگاورەنگ. لاپەرەی (14 1b, 2a) لە ناوەڕاستی لاپەرەكاندا شیعر نووسراوەو چوارچێوەكەشیان بە نەخشی ڕەنگاورەنگ نەخشێنراوە (بڕوانە وێنەی ژمارە ٧). كەچی لەسەر لاپەرەی (1b/ 59b, 6oa, 142a) تەنیا نەخشی ڕەنگاورەنگ كراوە، بە بێ هیچ جۆرە نووسینێك (بڕوانە وێنەی ژمارە ٨). لەسەر لاپەرەی 142b وێنەیەك بە مرەكەبی ڕەش كراوە، گوایە ئەمە دەبێ وێنەی شیرین بێ (بڕوانە وێنەی ژمارە ٩). لە پەنای ئەم وێنەیەدا وێنەیەكی تریش بەدیدەكرێ كە بە ناتەواوی بەجێ هێلراوە.

ئەم نەخشانە سالی ١٢٤١ی كۆچی كە بەرانبەر سالی 1825 - 26 ی زایینییە لەلایەن عەبدولرەحمانی كوڕی مەلا ڕوستەمەوە كراون. هەر لەسەر ل 14lb نووسراوە: «تمت الكتاب بعون الملك الوهاب كتاب خسرو شيرين على يد الحقير عبدالرحمن ابن ملا رستم غفر الله لهما سنة ١٢٤١».

مینیاتوورەکانی خورشیدو خاوەر:

مینیاتوورەکانی دەسنووسی (خورشیدو خاوەر) (ژمارە 6 - 1) کە لە کتێبخانەی دەوڵەتی‌دا لە بەرلین ئەم ژمارەیەی پێوەیە (Ms. or. ost. 117 1sp Marburg/ Berlin) لە رۆژی ١ی ئابی ١٩٠٢ لەلایەن حاجی ئاغای کرماشانی‌یەوە کراوە. لە بن هەندێکیان دا نووسراوە (عمل حاجی آقا). بەڵام دەربارەی ئەم حاجی ئاغایە کە ئەم هەموو مینیاتوورەی بو بەجێ هێشتووین. هیچ زانیاری‌یەکی ئەوتۆ نازانرێ بەگوێرەی وێنەکان ئەوە دەچێ هونەرمەند یەکەمجار وێنەکانی بە قەڵەمی خەڵووز کردبێت، پاشان بە مرەکەبی رەنگاورەنگ (وەنەوشەیی، سوور، شین، سەوز) رەنگیان کردبێت. لە کۆتایی ئەم دەسنووسەدا نووسراوە: «تمام شد کتاب خورشید خرامان گفتەء ملا نور علی کندولەء بجناب مستطاب آقای دکتر المن (دکتر مان) بسعی اهتمام پذیرفت. حاجی آقای کرمانشهانی در روز یك شنبه بیست و ششم شهی جمادی اول سنه ١٣٢٠».

ئەم مینیاتوورانەی لێرەدا بلاوکراونەتەوە، لە هەموو روویەکەوە پێویستیان بە هەڵسەنگاندن و لێکدانەوە هەیە. هونەرمەند لە دەربڕینی مەبەست و بۆچوونی شاعیردا سەرکەوتوو بووە؟ لەرووی هونەریشەوە هونەرمەند چەند کارامەو بەتوانا بووە لە وێنەکێشان و رەنگ کردن دا؟ وەلام دانەوەی پرسیاری یەکەم پێویستی بە تێگەیشتن و شارەزایی‌یەکی تەواوی تێکستەکان هەیە، لەگەڵ چێژێکی باشی هونەری تەشکیلی بو دەسنیشان کردنی لایەنی لاوازو بەهێزی تەکنیکی هونەرمەندەکە. وەلام دانەوەی پرسیاری دووەمیش پێویستی بە زانیاری تیووری‌و هەست و چێژی هونەری تەشکیلی‌یە. بێ‌گومان ئەم کارە نە لە کێشی وتارێکی‌وا کورت و نە لە توانای کابرایەکی وەکوو من دا هەیە.(٦)

تێبینی:

مینیاتووری ژمارە (١٠) ساڵی ١٩٢٤ دروست کراوە. ناوی هونەرمەند نەنووسراوەو شیعرەکانیش جیاجیان، هی تاقە شاعیرێك نین.



پەراوێز:

(١) Brockhaui Enzyklopadie, Bd 12,s. 590

(٢) ئەولیا چەلەبی، کورد لە مێژووی دراوسێکانیدا، وەرگێڕانی سەعید ناکام، چاپخانەی کۆڕی زانیاری کورد، بەغدا، ١٩٧٩، ل ٢٧٨.

(٣) ئەولیا چەلەبی، هەمان سەرچاوە، ل٢٨٤.

(٤) ئەولیا چەلەبی، هەمان سەرچاوە، ل٢٨٥.

(٥) Kamal Fuad, Kurdische Hand schriftpn, Wiesbaden, 1975
بەپێی زانیاریی من نووسەری ئەم کتێبە یەکەم کەسە هەندێ وێنەو دەس وخەتی بلاوکردوتەوە.

(٦) زۆر تکام لەم برایە کرد کە وێنەکان بخاتە سەر سلایدو بۆم رەوانە کات. دیارە تا ئیستا هەر بۆی رێنەکەوتووە. ئەم برایە وەکوو زۆربەی نووسەرانی کورد، ئەو هەموو دەسنووسە گرنگ و



کۆنانەی هەروا لەسەر رەفە دانابوو. هەر ئەو رۆژە باسی ئەوەم بۆ کرد کە چۆن لە کتێبخانەکانی ئورووپا دەستنووس لەناو شووشە قایم دەکرێ کە جیهازی ئینزاریان پێوەیە. لەگەڵ ئەوەش دا فەرمانبەر دانراوە بۆ پاسەوانی کردنی.

(٧) سەرچاوەی پێشوو، ل٣٠، ١٢٩. نووسەری ئەم کتێبە خۆشی هەمان بۆچوونی هەیە.

(٨) ئەم دەقەم بە بێدەسکاری هەروەکوو خۆی نووسیوەتەوە.

(٩) ئەم نووسینە پێش خوێندنەوەی دوو بەرهەمی مامۆستا عبدالرقیب یوسف نووسراوە: کتێبی (بانگەوازێك بۆ رووناکبیرانی کورد)و لێکۆڵینەوەی تابلۆ هونەرییەکانی «شەرەفنامە»ی دەسخەتی شەرەفخان، رۆشنبیری نوێ، ژمارە ١١٥، ئەیلوولی ١٩٨٧.

بێگومان ئەم نووسینەی من هیچ نرخێکی ئەوتۆی لەچاو نووسینەکانی مامۆستا عبدالرقیب دا نییەو، ئەگەر مەسەلەی رووناکی خستنە سەر لایەنێکی تری هونەری میناتووری کوردی نەبوایە، ئەم نووسینەی من شایانی بلاوکردنەوە نەدەبوو.

ناونیشان:

Tamili Ahmad

ALbreert. Thuir - Weg 24

3400 Gottingen

W est Germany

---

ملخص البحث

# فن المنمنمات الكردية

أ. برويزى

ان فن المنمنمات أو المينياتور فن تزويق الكتب والمخطوطات القديمة وتزيينها بتخطيطات وصور دقيقة ملونة ازدهر في القرون الوسطى. وانه وصل في القرن الثاني قمة ازدهاره في العالم الاسلامي ولاسيما لدى مدرسة بغداد الفنية، وفي القرن الرابع عشر وبتأثير من فن التصوير الصيني فقد ازدهر في مدن سمرقند وهيرات ومدن أخرى، حتى وصل الى القرن السادس عشر فقد ازدهر في الهند ايام الأباطرة المغول.

اما عندنا، فرغم عدم وجود دراسات حول هذا الفن الا انه ثمة إشارات الى وجوده في بعض المؤلفات، فمثلاً يذكره السائح التركي أوليا چلبي في حديثه عن مكتبة (عبدال خان) أمير بدنيس. وهناك مخطوطات عديدة تمثل دواوين شعر وقصص منظومة نجد في ثناياها آثار هذا الفن الجميل.

وقد تناول الباحث منمنمات تخص مخطوطتي (خسروشيرين) و(خورشيد وخاور) القصتين المنظومتين الشهيرتين وجدهما ضمن مخطوطات كردية محفوظة في مكتبة برلين الحكومية، ونشر مع المقال بعض صور المنمنمات التي تشكل مصدراً مهماً للفن الكردي المينيتوري.

# کوردو باوەرێن ئەفسونی
# لسەر دارو باری

**نزار محمد سعید**

## پێشەهی

دچارچوڤێ ژیانا گیانیدا یا جڤاکێن مروڤا، ب درێژیا هزارەها سالا باوەری مشە ل ناڤ خەلکی سەرهلدانەوبەلاڤ بوینە، ئەمازە ئەوباوەرێن زانایێن فولکلوریوئەنثروپولوجی دبێژنێ: «باوەرێن ئەفسونیێن مللی». بوجارا یەکێ ئیدیەمێ «باوەریا مللی» ژلایێ نڤیسەرەکێ جیرمەنی یێ کو دبێژنێ «هەردر» ل سالا ١٧٧٨ تێ بکارهینان دپەرتوکا ویدا ئەوا کو ل ژێر ناڤنیشانێ «دەنگێن مللەتا دسترانێ دا»[١]

ماندلا ناهێت کرن کو ئەڤ بیروباوەرێن دەستپێکی دگەرینە قوناغ و سەردەمێن ئێکجار کەڤن کەڤنیا مێژ ووێ، بەلکو وان قوناغێن کو جڤاکا دبارێ پاشکەفتن ولاوازیێ دا ژیانا خوە رادبوراند، ئەڤ قوناغا کو ژلایێ هژمارەکا زاناڤە هاتیە ناڤکرن بـ «قوناغا بەری لوجیکی ـ منطق ـ» «prelogical Stage»[٢] ئەگەرچی مەبەست ژێ ئەوە کو مێشکێ دەستپێکی تنێ باوەرێن ئەفسونی وەردگرن لێ باوەرێن لوجیکی هەبون و دبەلاڤبون، هەرچەندە یێن نە لوجیکی پتر دبەلاڤبون و زویتر ب مێشکی وان ڤاناغاڤە دنویسیان و ل دوی دچون و پێ کار دکرن.

پر زاناو بسپوروشارەزایێن زانیاریا ئەنثروپولوجی و زانیاریا فولکلوری گرنگیەکا بێ ڤام مەزن ددەنە باوەرێن مللی، ئەم دکارین پشت راست بێژین پتر ژچڤێن دن یێن فولکلوری، ئەگەرا ڤێ گرنگی و پویتەپێکرنا زێدە بەری هەرتشتەکی دگەریتە هەڤبەندیا ڤان باوەرا ب ژیانا مروڤا، ژبەرکو ئەڤ باوەریە لگەل وان دژین هەرژ روژا هەی ژخوە بویێ وهەتا دادهێلانە گوری، د هەردوو حالەتادا چ باوەری بموکومی پێ دئانین، یان ژبنی پێ نە دئانین. ئەنثروپولوجیێن چارەسەریێ ئەریشی ڤان باوەرێن دەستپێکی کرین «بو هندێ دچن کو توخمێن ڤان بیروباوەرا توڤێ بیروباوەرێن نویوهەڤچەرخن، ژبەرکو زانیاریا نوی ژەن ئێکسەر نە هەلاتیە نولا هەلاتنا روژێ، بەلکو هێدی هێدی هزارەها سالا ژبیرو باوەرێن ساکارو دلنزم «متواضع» هاتینە».[٣]

هەر کەسێن ژمە هویر هزرێن خوە دجیهانا باوەرێن ئەفسونی یێن مللیدا بکەت، دێ بینیت چەند جیهانەکا بەرفرەهە، فرە تشت دخورستیداو دیاردێن خورستی بوینە کەرەستێ سەرەکی یێن ڤان باوەرا نولا:

جانەوەرا، داروبارا، خانی و ئاڤاهیا، چیا، شکەفت، پرتێن دارا، ئانکو زوربەی تشتێن ل ژینگەهەودوربەری جڤاکا، ژ دیاردێن خورستی ژی: عەرد لەرزین، باران، ستێر رشتن، هەیڤ غەوارەبون، روژ غەیرین... هتد.

دڤی بابەتیدا تنێ مە باوەرێن ئەفسونی یێن مللی ئەڤێن هەڤبەندی ب دراو باری و روەکاڤە هەین گرتینە، ل پێشیێ هژمارەکا نمونێن ڤان باوەرا ژ جڤاکێ عەرەبی و جڤاکێن ئەوروپی و ئەفریقی و روژهەلاتیا ژێری ئاسیا.

دجیهانا باوەرێن مللیدا ل با جڤاکێن دەستپێکی نەتنێ ئەوتشتێن پیروزن ئەوێن سەخلەتێن کەسوکی هەین، نولا خوداوەنداوگیاناو ئاڤەریدا بەلکی ژ چارچوڤێ وان دەرکەتینە تشتێن بێ سەخلەتێن کەسوکی، نولا: بەرا، دارا، کانیێن ئاڤێ، بەرەشیشکا، پرتێن دارا، خانیا، ئەمازە کاڤلا، هەروەکی [دورکایم] دبێژیت.[٤]

ئەڤ پیروزیە زانایەکێ کودبێژنی [تیلور] بوجارا یەکێ تلا خوە دانا

سەرو ئەڤ ناڤێن ژێری دانانە سەر: پاشمایلك، گیانیات، ئەنیمزم.[-]

ئەفسون «خرافە» «Mythos»، یان باوەریا ئەفسوونی چیە؟ ویبستر «Webster» دفەرهەنگا خوە یا ناڤدارا «فەرهەنگا جیهانا نوی» بەرسڤا ڤێ پرسیارێ ددەت و دبێژیت:

«رامان ژێ هەر باوەرەك، یان هەلویستەكا لگەل یاسایێن بەلاڤ یێن زانینێ نەگونجیت، یان ل گەل وان تشتێن جڤاكەك ژ جڤاكێن دورهێلی و ب هوش بو دچن و باوەریێ پێ تینن»[٦]

بو مە ئاشكرابو كو ئەڤ باوەریە هژمارەكا بینینێن ئەفسوونینە د مێشكی مروڤی دەستپێكیدا هاتینە ڤەهاندن، ل قوناغێن مێژوویێن كەڤن دا، ل دوی بارو زروڤێن تێگەهەشتنێ و مێشكی خەلكی وان سەردەماو پلا تێگەهەشتناوان.

هاتە نوكە ژی كتەكا خەلكی ماینە بدورستی توزا ڤان باوەرا ژخوە نە داقوتاینە.

ئەگەر چی ئەڤ باوەرە د سینگێ وان دا دڤەشارتینە لێ بەلێ ب هەلكەفتن و بێ هەلكەفتن دێبینین كارپێدكەن وئەڤ كارە د ئاشكرانەو پێش چاڤن و نە دڤەشارتی و بەرزەنە، سەرنجا مروڤێ رادكێشن نەمازە مروڤی بیانی ژ جڤاكێ كار بڤان باوەرا دكەت.

باوەرێن مللی وەكو تایەك ژ فولكلوری بسەخلەتێن خوە ڤە ژتایێن دن یێن فولكلوری دباشقەو جودانە، بوپتر رونكرنا ڤێ مەخسەدێ، هەكە زمانی بگرین دێ بینین كوخەلك پێ دئاخڤن، دوخینن وپێ دنڤیسن دبسان زمانی گەرەكە مروڤەك بەرامبەر مروڤی هەبیت لگەل باخڤیت، دان وستاندنێ بكەت، ژ لایەكێ دن ڤە دڤێت جڤاكەك هەبیت ل سەر رەمزو هێمایێن ڤی زمانی رێك بكەڤن. هەكە جل وبەرگ وزێرو خەمل و كەل وپەلێن مللی بگرین، دێ بومە دیاربیت كوبو خەلكی تێنە درەپێش كرن، ئانكوپێش چاڤ كرن، هەروەكو هندەك رەوشتێن مللی، مروڤی بڤێت نەڤێت دێ نیشا خەلكی ددەت، یان بێژین خەلك دێ ب ساناهی بینن.

باوەریێن مللی پێچەوانی، بەروڤاژی ڤان تایێن ڤولكلوری و ڤان رەوشتانە، دكویراتیا دەرونێ مروڤیدا دژین وهەمی دەما دەرناكەڤن و دەرپێش نابن.

ژ بەر گرنگیا ڤان باوەرا كوپەژن و رامان ورموزێن تێدا هەین روناهیێ بسەر پر لایێن ژیانا كەڤن دا بەرددەن، ژ راوەستان و هەلویستێن مێشكی و هەڤبەندی و تێكەلیێن مروڤایەتی، تەڤدا دبنە كەرەستەكێ زانیاری سەرنجا خوەیی بسپورا راكێشا ل پێشیا وان فولكلوریست و ئەثنولوجی و ئەنثروبولوجی و زانایێن دەرونی و زانایێن جڤاكی.

بارێ بیری و هەستی یێ كوب قوناغێن مێژوویی ڤە گرێدای، ب قوناغێن كەڤن ڤە، ب رێكا ڤان باوەریا ژڤان زانارا رون و ئاشكرا دبیت.

یان بێژین دەرونێ مللەتی و پاشمایێن سەردەمێن مێژوویی یێن كەڤن و مەبەست ژڤان پاشماییا ب ساناهی ژلایێ ڤان زاناڤە تێنە خاندن و رون كرن.

چاخێ بەرپەرێن وان ژێدەرێن بیانی و عەرەبی وەرگێرین ئەڤێن ل سەر باوەرێن مللی ئاخفتێن دێ مشە بابەت و ڤەكولینا ل سەر دارو روەكا بینین، بابەتێ ڤێ ڤەكولینامە. ژڤان ژێدەرا بومە خویا دبیت كو هنەك ژڤان باوەرا ل با پر مللەتا ئەگەر چی تخویبێن وان ژهەڤ ددویرن لێ بەلێ ئەڤ باوەرێن وان جارنا نێزیكی هەڤن و جارنا ژی دیەك باوەریدا دپشكدارن.

هژمارەكا بیروباوەرێن جڤاكێ كوردی یێ كەڤن ل سەر روەك و داروبارا لگەل هەمان بیروباوەرا ل با هنەك مللەتا وەك هەڤن. ژ ژێدەرێن عەرەبی و بیانی و كوردی یێن بەحسێ باوەرێن مللی سەبارا زوەك و داروبارا كرین هەتا نوكە دێ ئەڤێن ژێری بینین

أ) ژێدەرێن عەرەبی:

١ - دراسة في المعتقدات الشعبية - د. محمد الجوهری

٢ - احياء التراث الشعبي - نمر سرحان

٣ - الاساطير وعلم الاجناس - د. قيس النوري

٤ - الفولكلور والاساطير العربية - شوقي عبدالحكيم

ب) ژێدەرێن بیانی:

١ - فولكلورو روەك یا: [ T.F ThiseLton Dyer ]

٢ - روەك و ئەفسوون و سترانێن هوزانی یا: [ R. FoLkard ]

٣ - میثولوجیا روەكا یا: [ A. De Gubenatis ]

٤ - ئەفسوونێن گولا یا: [ M. Skinner ]

٥ - چیروكێن روەكێن جێرمەنی یا: [ A. Ritter V. perger ]

٦ - فولكلور لسەر دەقێن كەڤن یا: [ Jemes Frezer ]

٧ - زانیاریا فولكلوری یا: [ H.Grab ]

حـ) ژ ژێدەرێن بیانیا ل سەر ڤی لای ل با كوردا نڤیسین:

١ - ل گەل كوردا - توما بوا.

٢ - ژیانی ئافرەتی كورد - هینی هارولد هانسن.

د ڤەكولینا خوەدا دێ هژمارەكا ڤان بیرو باوەرا ل با جڤاكێ عەرەبی و جڤاكێن بیانی پێش چاڤ كەین، پاشی دێ ل سەر هەمان بیرو باوەرا ئاخفین ل با كوردا.

ل دوماهیێ ژی چەند ئەنجامەك لسەر ڤێ دویڤ چونێ مە دەست نیشان كرینە، ب هزرا من مەبەست و نێت و مەرەمێن سەرەكی ژڤان ل قەلەم ددەن و روناهیێ بسەردا بەر ددەن.

## ● چەند باوەرێن بیانیو عەرەبی ●

دهنەك ئولێن كەڤن دا، ئولێن نەئاسمانی دەمێ بەرهەمێ كشتوكالی كوم دكرن، رەوشتەك هەبوو گیسكەك دئانین ودشیرێ ماكا وی‌دا دكەلاندن، پاش ئەو شیر ل دارو بارێ فیقی درەشاند، ب هەزرا هندێ كو سالا پاشتر ئەو داروبار دێ بەرەكێ پر باش دەت[٧]

ل با مللەتەكێ دەستپێكی ل ژاپونێ یێ كو دبێژنێ «ئینو» هەكە دارەك بسەر یەكیدا كەت وكوشت، دڤیا ب هەڤرا رابن وێ داری قەد بكەن و هویر بكەن پاش ب دەنە بای ژ بەركو ل وێ باوەرێ بون كو برەكا شەیتانا دقورم وچق و بەلگێن وێ‌دارێدا دژین، كوشتنا وی كەسی بناسێن وان بو.[٨]

دئەفسوونێن ئەفریقی و هندوسی‌دا مشەباوەری ل سەر جەهی هەنە وەكو سومبەلەك دپەریست.

جەهی و گەنموكی دئەفسوونێن هژمارەكا مللەتێن ئەوروپی یێن نوی نولا: جێرمەناو چیكوسلوڤاكیاو فرەنسا اسكوتلەندا دەورێ خوە هەبو، كو دیسان چەند مللەتێن دن ژی وەكو ئەندونیسیاو ئەمریكاو پیرو، رێزا ڤان هەردوو جورێن روەكا دباوەرێن وان دا دخویا بون.

هەتا نوكە ژی ل ئەندونیسیا چاخێ دبەر زەڤیێن برنجارا دبون، نابیت تەقە بیتەكرن، یان ب دەنگەكێ بلند باخڤن، ژ بەركو دا گیانێن روەكا نەخوەشیا خوە ژێ نەبینن وهشك نەبن، ل وێ باوەرێ بون كو برنجی نولا مروڤا گیان هەیە.[٩]

دفولكلورێ مصری یێ كەڤن دا مشە چیڤانوك هەنە دارو بارو روەك دەورەكی بلند تێدا دبینن، دیەكێ ژوان دا، دوو برا هەبون دلێ یەكی دگولەكا رویلێ‌دا بو، روژەكێ ئەو ئو ژنكا خوە بشەر دچن، ژنك رادبیت وێ گولا رویلێ دكەت، لەگەل كرنێ مێرك دكەڤیت ودمریت برایێ وی ژنشكەكێڤە گولێ دبینیت، دكەتە دئاڤێ‌دا، دلێ برایێ وی گەش دبیت وگیانێ وی لێ دزڤریت وساخ دبیتە ڤە.[١٠]

مروڤێ دەستپێكی ل با پر مللەتا ل وێ باوەرێ بو كو گیانێ هەر كەسەكی یێ ل دەرڤەی لەشێ وی، یێ دتشتەكی‌دا ل دوربەری وی، تشتێ بگیان، نولا: جانەوەرا، یان بێ گیان نولا: روەك وداروباری، بەر، چیا، كانی، رویبار... هتد.

لەورا ئەفسوونێن مللی یێن وان مللەتا ژیانا مروڤا بڤان تشتاڤە گرێددا، نەمازە ب داروباری ڤە بو نمونە دێ بینین: هژمارەكا جڤاكێن ئەفریقی، هەكە زارووەك ژنوی هاتبا دنێ دا دارەكێ چینن، ل وێ هزرێ بون كو وەرارا وی زاروی یا ب وەرارا وێ دارێڤە گرێدایە، هەر گاڤا دار هشك بو، یان هاتە برین، مانا وێ ئێدی نانێ وی زاروی نەما ل دنێ، دێ مریت.

سەرا ڤێ چەندێ ل ناڤ هنەك جڤاتێن ئەفریقی خوین هاتە رێتن، كوشتن چێبو چاخێ وەلاتێن ئەوروپی دەڤەرێن وان داگیركرین هژمارەك ژڤان دارا برین دا كو خیڤەتێن لەشكەرێ خوە لێ ڤەدەن.[١١]

شێوەكێ دن ژی یێ گرێدانا ژیانا زاروكا ب داروباریڤە مەلبا هژمارەكا هوزا دیت ل هنەك دەڤەرێن ژێك جودا ل جیهانێ ڤان جڤاكا:

«ژیانا زاروێن خوە برێكا بەرەكی ل گەل قورمێ دارێ گرێددان، دا ئینن بەرەكێ تیژ دقورمێ دارێ قوتن، هەتا بەرزە دكر، ئانكو دقورمی‌دا ئاڤا دكر، ب هزرا وان هولێ دێ‌ژیانا زارویێ خوە ژنەمانێ پارێزن هندی دار بژیت، لەورا سەخبێری ژدارێ دكرن، چاڤێ خوە ددانێ، پێژان دكرن، ئاڤ ددان، چقێن هشك ژی دبرین ونە دهێلان، نەمروڤ، نەجانەوەر نێزیكی وێ داری ببن.

ئەڤ رەوشتە تا نوكە ل با هنەك خێزانا ل ئنگستانێ وئیتالیاوجێرمەنێ وفرەنسا وروسیا وسكوتلەندا مایە».[١٢]

## ● چەند باوەرێن كوردا ل سەر داروباری ●

كوردا دگوت:

● هەكە یەكی گویزەك چاند، مەزن بو، چی‌گاڤا قورمێ وێ هندی حەفكا وی مروڤی ستویر بو دێ مریت.

● هندەك ژ وان مروڤێن بالویلك لێ تاتن، داچنە با یەكێ چاك داكو بو ب جەهی ڤە ب خوینیت، پاشی‌دا وی جەهی چینن، هەر گاڤا بسەركەفت وشین بو، ئەو بالیلك دگەل شینبونی دێ چن نامینن.

● دارێ كنێری پاڤێژنە درێكا ماری‌دا، مار دێ راوستیت، ژجهـ نا لڤیت، لەورا شڤانا ئەڤ جورێ داری دكرنە گوپال هەكو دنڤستن ددانا بن سەرێ خوە ل وێ باوەرێ بون كو مار نا چنێ.

دیسان ئەڤ دارە ڤ زكێ ژنكا لبەر بچویكی‌را تینان داكو بساناهی بچویك ببیت، جارنا ژی ڤ زكێ دەوارێن نەساخ را تینان، ب هیڤیا ساخبونا دەوارێن وان.

● شڤكا هنارێ كوردا ب جهێ پێڤەدانا ماری‌را تیناودبر زوی ساخ دبو.

● كوردا ژكەڤن وەرە قەرەنفل وپرتێن داركا ب زاروا ڤەدكرن ب هزرا هندێ كو دێ ژیانەكا بەختەوەر رابورینن.

دیسان ژ بەر چاڤاو داكو یاریا بو خوە پێ بكەن، مازی ب لاندكا ڤەدكرن.

● دارا خەندەكوكێ ـ خەندخەندوكێ ـ:

ل مزكەفتا شێخ مەنسوری ل ئامێدیێ قورمەكێ دار توێ هەیە، خەلكی ژخوەرا پرتكێن بچویك ژێڤە دكرن، دكرنە ستكورا بچویكێن خەندەكوك لێ داژی بچیت وساخ ببن.

● كوردا بەندكەكێ رەش ب لەڤەنەكی‌ڤە دكرن دەمێ سەرێ ئێكی

دئیشا دا بسەرە دەرا خانیڤە کەن و چەند جارەکا دا دبن را هێت وچیت، ژئیشان وژانەسەرێ قورتال بیت .

● گیـایـەك هەیـە دبێژنێ گیا «بەنوك» بشەڤێ دتەیسیت، کوردا دگوت : هەر کەسێ ڤی گیای بکەت دێ مریت، لەورا جارنا دابینی هنەك جحێلا گیـسکـەك ئینـاو بەنـدکـەك کرە ستـویی وبوی گیای‌ڤە گرێداوداناگیسکی ب بەرا داکو ب بیتە سەدەقە، سەرێ خوە ب دەتە بەر سەرێ مروڤا .

ل هنـەك دەڤـەرا زەلامی ئەڤ گیـایـە ل با خوە دهەلگرت دا ژنکا وی لێ ب بانیت، ئانکو روینیتە خارێ .

ژلایەکێ دن ڤە جارنا خورتێن . بێ ژ ن ئەڤ گیایە دکرنە دپاخلا خوەدا دا کچکێن وان دڤێن حەژ ێ بکەن .

● ناڤێ سێڤێ مشـــە دچیـروك و چیڤـانـوکێن کورددادا هاتیـە سەیـدایێ «حجی جعفر» ئەفسونا سێڤێ ل سەر خالێن ژێری پارڤە دکەت :

١ ـ سێڤ دچیڤانوکا «ئەحمەد چەلەبی»دا :

پیرا لاو دکەت، نەساخا، ساخ دکەت .

٢ ـ بو ژ ن هینان و شویکرنێ بکار هاتیە .

کورێن میــرا کچێن باژێــری خردکـرن ول ناف دگـەریـا یا دلێ وی چوبایێ دا سێڤا خوە ل سینگی دەت . دیسان بو ڤێ مەبەستێ کچێن میرا ژ ی خورتێن باژێری خردکرن .

٣ ـ سێڤ وخفس «المسخ» :

دچیڤانوکا «شرکاك و کوترێدا» :

کچا حاکمی سێڤێ دخوت دبیتە هێـــتر، کورێ وی دخوت دبیتە دەوار .

٤ ـ بو نەهشی و تویلبەندی‌یێ «تخدیر» :

سێڤ دچیروکا «سیرنیاس»دا دبیتە مورکا خەوێ .

٥ ـ سێڤ بویـە دەرمـانی بچـویـك بونێ، هەر وەکی دچیڤانوکا «حاکمێ خودانێ سێ ژنا»دا خویا دبیت» .[13]

● کوردا هزر دکـر کوگیـانێ هەر مروڤـەکی یێ دبەلکەکی‌دا، هەمی یێ ب دارەکێ‌ڤە، لەورا چاخێ کەسەك دمر دا بێژ ن «بەلگێ وی ژداری وەریا» .

● ل گونـدێن کوردا ژنکـا جوانتـرین جل وبـەرگێ دکـرنێ و بر بـرە ڤەستا دارکێن پیروز دکرن ب هیڤیا باران بارینێ .

● دارا تویێ و زەیتون و دارهژ یر ل باکوردا دپیروزن، دیسان دارێن لناڤ مناسباو دارکێن نێزیکی توربێن ڤەنج وچاکا، ئەڤ دارە نابیت بێن برین .

ئەڤ دارکە هەر دەڤەرەکێ، هەر باژێرەکی، هەر گوندەکی لێ هەنە .

● ل ئەنـدونیسیـا و ژاپـونێ رەوشـتـەکێ تایبـەتی ب دار و بارێ ڤیڤی ڤـە هەیــە، ئەڤ داروبــارێ خرش، یێ بەری نەدەت . ب «طــەقســەکی» رادبــون دائیــنن دوومروڤ چنـــە نك دارێ، یەك ژ وان بڤــرەکی، یان داســـەکێ دا راکـــەت و خوە گیـف کەت و راکـێشیتــە دارێ لێ دن دا گازی‌کەتی : نەبرە . . نەبرە . . سالابێت دێ بەری دەت . ل با کوردا ژ ی دوو داچـن، یەك دا ب داسـێ، یان بڤـری خوە راکـێشیتــە قورمێ دارا خرش، گەفـا لێ کـەت «دێ تەبـرم ئەرد بگـەهیتـە ئەسمانا توژلەپێن من قورتال نابی»! یێ دن دا بێژ یت : نە . . نە . . نە . . ڤێ جارێ ژ ی نەبرە سالا بێت دێ بەرەکێ باش دەت . کودیســان چاخێ بیــتــانێن باجـان سۆرکــا کەرك نەدابــان، خودان دا چویــڤـــەکی راکــەت و مرێ خوە نەخـــوەش کەت و سەرێـن بنــا فرینیت، ب هزرا هنــدێ کوهولێ دێ باجـانکـا دەن . هنـەك هەبون بەرەك دکرنە ددوکەلا دارێدا، دگوتن ئەڤە ژ بەر هندێیە داکوگران ببیت و بەری ب دەت .

## ● دارکێن ب کنجر ●

پرانیـا مللەتـا کنجـر ب داراڤـە دهەلاویستن، زوربەی شارو گوندێن کوردا دار هەنە ب کنجرا نەمازە کنجرێن رەنگێ وان کەسك دخەملاندینە .

ل ڤەلستینێ ژ ی دار بەرویـــەکـا نافـدار هەیـە دبێـژنێ «دار بەرویـا برەهیمی»، دبێژ ن گیان لێ دئاکنجینە، جوتیار کنجرا پێڤە دهەلاویسن .[14]

پرسیارەك ل ڤر خوە تاڤێتە مەیدانێ، ئەرێ مەرەما خەلکی بڤان کنجرا چیە؟ چما بداراڤە دهەلاویسن؟ .

[دبێژنەڤێ رەوشتێ مللی «السحر الأتصالي» یێ کوبوهندێ دچیت کو هەرتشتی هەبیت یێ گرێدایە بکەسەکیڤە، یان هەڤبەندیەك نگەک هەیە، ئەو کنجر وێ هەڤبەندیێ پەیدا دکەت و قایم دکەت] .[15]

دیسـان برێکـا کنجـرا مرازو هیڤیێن خوه دگـههینهچاکا، خوه دئاڤێنه بهختێ وان کوئهومرازوهیڤی وداخــارب جهـ بێن، ههنـه ژی هزرا وان بوهنـدێ دچیت کو برێکـا کنجـری هنـهك ژهێزا جاکا دێ گههیته خودان ئارێشێ کنجـری ب دارێڤـه دهـهلاویسیت. ژئـالـهکێ دن ڤه ههنهژی ل وێ باوهرێ ژی کوگیـانێن خراب دڤـان دارادا دژین، ئهڤجا برێکا ڤان کنجرا بهلکی دڤێن خوه ژڤان گیانا دویر بێخن وب پارێزن. ههبون ژی خهلــك ل وێ باوهرێ بون کوڤان دارا هێــزهکــا نهێنی یا تێدا کارین و پێڤـههاتنهکا وهلێ ههیه نهساخا ساخ دکهت، خهلکی دگههینیته مرازێ، هیڤی وخوهزیێن وان بجهـ تینیت.

دڤێ بوارێدا «درایڤــهر» «Driver» دبینیت کوپهرێستن تێ ئاراستـهی دارێـــه ب خوه، نهچ گیـــانـێن ئاکنجی ددارێدا،[٢٠] بهلێ ئهم دبینین رایهکا لاوازه، ئهڤ رایێن ل سهری مهدیارکرن ب هزرا من پتر دجهێ خوهدانه.

ستی «هــانسن» «Hanisin» یا کوههیـامهکا خوهش مایه ل کوردستانێو گهریــای نهمــازه ل دهڤـهرا باژێـرێ سلێمـانـێ «دیت کوئهڤ کنجـرێن ب دارڤـا دهـهلاویسن دیـاردهکا جودایه ژوان کنجرێن ب دارهکێ درێژو زراڤ ڤهدکـهن نـێـزیکی توربێ زهلامـهکێ پیـروز، یا ئیکێ پاشماێێن بهد پهرێستنێ نهو یا دن نه وهلێ یه ژێ جودایه».[٢١]

ڤێ دیاردێ وئهڤ دیاردێن ههڤبهندی ب «سحر»ێ ڤه ههین دهوره بلند دژیانا جڤاکێن کهڤن دا ددیت، نهمازه ژلایێ دهرونی وڕهوشهنبیری وزانینا دهستپیکی وئیکجــارکهڤن، سهبـــارا ڤی گرنگیێ «مـالنفسکی» خودانێ مهســهبی «شروڤهکرنا وهزیفی» «التفسیر الوظیفی» بورهفتارو بیرو باوهرێن گیـانی. «ئـهوئوزوربـهی ڤهکـولـهرێن ئهنثـروپـولوجی دبینن کو«سحر» دجـڤــاکـێـن دهسـتـپـێـکی دا، وێ دهوری دبینن، ئهودهورێ کوزانین دجڤاکێن نوی وپێشکهفتی دا دبینیت».[١١]

ستی «هێنێ هارولد هانس» یا کومه بهری نوکه رایهکا وێ دیارکری، دپـهرتـوکا خوهدا «ژیانی ئافرهتی کورد» بهحسێ دارچاك وقوربانی کرنێ کریه ڤان دارکا ددانیت که یهك له «پاشماوهی کونی ئاینی له کوردستاندا»[٩] پرزاناوشارهزا بهحسێ ڤان دارا ل با کوردا کریه ژوان: «دونــا لدســون» «بــاسی» درهختی مرازدهکــا کهوا دهبێ لهسـهر هیـچ گورێکیش نهبێ دهلێ:

«بویه ههیه روژێ له روژان پیاوچاکی، سهیدی، لای دابێته ژێر ئهم داره. . جا بویـه درهختـهکـه پیـروز بووه. . ساویلکـهکان پهرووی داوی بهجلهکـانـهوه دهکـهن وله ههمان کاتیش دا مرازی لێ دهخوازن لهخوێان دهگـرن ئهگـهر مرازیان هاته دی خێری بوبکهن.»[٢١] دیوارا ڤی رهوشتی دا «نیکیتین» نفیسیه دبێژیت: «تا پهروکه بهوێوه بێ، دوعای شێخهکهکا دهکا»[٢١] ل کوردستانێ مشه ژڤان دارا ههنه بونمونه:

- دارکـا ب کـنجـرل دومـاهیـا تاخێ بهروشکی ل باژێـرێ دهـوکێ نوکه نهمایه ڤ بهر جههدێ کهت، دار بهروی بو.

- شێخکی کنجرا ل باژێرێ ئامێدیێ، دووگهویشکن.

- دارا شێخ حهلیمی ل ئامێدیێ، کهزانهکا مهزنه
- دارکێن زهمبیل فروشی ل رێکا باتیفێ ل زاخو.

- «لـهنـزیـك سلێمـانی گورێـك ههبـوودرهختێکی بهپهرویی لهسهر بوو دهیـانگـوت ژنی دووگیـان ونهخوش که دهچنه سهر ئهوگوره چاك دهبنهوه وهك نیشـانـهی به ئهمـهکی».[٢٢] ژئالهکی دن ڤه هژمارهکا دارا ههیه وهکو نوژدار هنهك نهساخ قهست دکهنێ بهلکی لێ ببنه دهرمان نولا:

- دارکێن پشـت ئێشا، ل تاخێ بهروشکێ ل باژێرێ دهوکێ، ههر وهکی ژناڤێ وان دیار ئهوکهسێن پشتا وان ئێشـان قهست دکرنێ.
- دارکێن بهروشکی، نوکه ژی مانیه، لێ هشك بوینه، دوودار بهرویێن مهزنن رهێن وان بسـهرئاخێ ڤهنـه، ئهڤ زاروێن خهندهکوك لێ دبن وان رهارا دبرن دا ژڤێ نهخوشیێ رزگاربین.
ل بهیـروتـا کهڤن دار بهرویـهك ههیـه ل دویف سالوخدانا نولا دارکێن بهروشـکێـنـه، کهسێن «رومــاتیــز» لێ وژنکێن ئافس دبن رهێن وێ را دچـون، ل [٢١]ێ ئیلونێ ژهـهمی سالا خهلکی ههتـا سپێـدێ گوڤهندو سهمـا ل نك ڤێ دارێ گرێـددان، ئهڤ داره هنـدا پیـروز بول با خهلکێ بهیـروتێ ههتـا وێ چهنـدێ دگوتن: ههر کهسێ جورعهت کهت تایهکی ژێ بکهت دێ دهستێ وێ ئیفلیج «شلل» گریت.[٢٣]

هنەك روەكێن بێهنەكا ب هێز هەی وەكی : سیرێ‌و پیڤازێ دژ ی ئەجنا ب كار تینان، ددانانە بن بالگەهێ زارویێ ساڤا دا ئەجنە ژێ ب رەڤن و نەدارەسنێ، هەتا نوكە ژ ی ئەڤ رەوشتە ل با ژنكێن كوردا مایە ئەگەر چی هنەك دارو روەكا ناڤێن چریسەت لینە، لێ بەلێ ئەم ناگەهینە چ ئەنجاما، كا ئەڤ ناڤە ژكیڤە هاتینەو چ باوەری ل سەر هەنە، نولا : پیڤازێن كافرا ـ گیا زاڤاك ـ حاجی باهیڤك ـ كەربەشك ـ هژ یرێن مارا .

دچیروكێن كوردیدا دێ بینین جارنا دوو بەردلكێن هەڤ، دوو ئەڤیندار نەگەهەشتینە یەك دوماهیا چیروكێ، كارەساتەك ب سەری هاتیە، كور بویە دارەك و كچ بویە دارئالینك خوە دداری ئالاندیە، یان ژ ی هەردوو بوینە دوو دارێن بلند برەخئێكڤە بو نمونە چیروكا «خەج و سیابەندی» ئەڤ چەندە تێدا خویایە .

ژڤێ ڤەكولینی ل دوماهیێ چەند ئەنجامەك بومە ژ ی دیاربون ژ وان :

١ ـ كورد نولا ئەڤ مللەتا باوەریێ ب هەبونا ئاڤەریدێن ئەفسوونی تینن، ژ بەر هندێ ب هنەك «طقوس»و رەوشتا رادبن، خوە نێزیكی وان ئاڤەریدا بكەن، هیڤیا بو خوە ژ ی بكەن و جهێ رزامەندیا وان بن .

٢ ـ وەكو رێكەكا چارەسەریا دەرونی، جارنا ڤان رەوشتا خزمەتا جڤاكی دكر، مەبەست ژ ی ب جهـ تاتن نەمازە دحالەتێ نەساخیادا .

٣ ـ ڤان رەوشتا جارنا پێدڤیێن هەستی یێن مروڤێ كورد هەتا رادەكێ تێر دكرن و تەناهیەك ل نك پەیدا دكر .

٤ ـ زوربەی ڤان باوەرێن ئەفسوونی ل سەر طابعەكێ ئیجابی هاتینە ئاڤاكرن ژ چارچوڤێ : «پاراستن و هاریكاری‌و لشت و مفا» دەرناكەڤن .

٥ ـ تەڤ مروڤ دژ یانا خوەدا، دكاریێ خوەدا بەرهنگاری كەفتنا دبن، لەورا پێدڤی چارەسەرینە بو ڤان كەفتنا، هنەك ژڤان باوەرا وەكو ئامرازێن دەرونی‌و بیری‌و باوەری دەوری خوە دڤێ چارەسەریێ دادبینن .

## ● پەراوێز ●

١ ـ احیاء التراث الشعبي ـ نمر سرحان ـ منشورات دار فیلادلیفیا ـ عمان ـ الاردن ـ بدون تاریخ ل١٦ .

٢ ـ الأساطیر وعلم الأجناس ـ د. قیس النوري ـ الموصل ١٩٨٠ ل١٣ .

٣ ـ هەمان ژێدەر ل٣٦ .

٤ ـ هەمان ژێدەر ل٢٠٦ .

٥ ـ الفولكلور والأساطیر العربیة ـ شوقي عبدالحكیم ـ بیروت ١٩٧٨ ل١٧١ .

٦ ـ الأساطیر وعلم الاجناس ـ د. قیس النوري ل٢٢ .

٧ ـ الفولكلور في العهد القدیم ـ جیمس فریزر ـ ترجمة د. نبیلة ابراهیم ـ الجزء الثاني ـ القاهرة ١٩٧٤ ل١٥٨ .

٨ ـ هەمان ژێدەر ل٢٢ .

٩ ـ الاساطیر وعلم الاجناس ل٥٠ .

١٠ ـ هەمان ژێدەر ل٦٥ .

١١ ـ هەمان ژێدەر ل٦٨ .

١٢ ـ هەمان ژێدەر ل٦٨ .

١٣ ـ حجی جعفر ـ سحرا سێڤی دچیڤانوكا كوردیدا . كوڤارا رەنگین ـ ژمارە ١٠ سالا ١٩٨٨ .

١٤ ـ الفولكلور في العهد القدیم ـ جیمس فریزر ـ الجزء الثاني ل٩٤ .

١٥ ـ احیاء التراث الشعبي ـ نمر سرحان ل٩٦ .

١٦ ـ مع الاكراد ـ نومابوا ـ ترجمة ـ آواز زەنگەنە ل١٢٩ .

١٧ ـ هەمان ژێدەر ل١٣٠ .

١٨ ـ الاساطیر وعلم الاجناس ل١٧٢ .

١٩ ـ ژیانی ئافرەتی كورد ـ هێنی هارولد هانسن ـ ترجمة ـ عزیز گەردی ـ بغداد ـ ١٩٨٣ ل٣٥٩ .

٢٠ ـ هەمان ژێدەر ل٣٦٣ .

٢١ ـ هەمان ژێدەر ل٣٦٤ .

٢٢ ـ هەمان ژێدەر ل٣٦٣ .

٢٣ ـ الفولكلور في العهد القدیم ـ جیمس فریزر ل٩٤ .

ملخص بحث

# «العقــائــد الكــرديــة الخــرافيــة حول الأشجار والنباتات»

نزار محمد سعيد

استأثـر موضـوع العقـائـد القـديمـة إهتمـام علمـاء الفـولكلور والأختصاصيين في حقول العلوم الانسانية لما له من أهمية في الأحاطة بجـوانب السلوك البشـري في عهـود سيادة الخـرافـة والفكـر الغيبي والتفسيـرات اللامنطقيـة للظـواهـر والكـائنـات والجمـاد الموجودة في المحيط الذي يعيش فيه انسان تلك العصور.

يتنـاول موضـوع البحث العقـائـد الخـرافيـة الشعبيـة حول الاشجار والنبات لدى الشعب الكردي.

ويتضمن مقـدمتـه تعـريفاً بهذه العقائد ونبذه عن جهود إختصاصيين عرب وأجانب على هذا الطريق.

مشيراً الى البحوث والدراسات التي قدمت في هذا المجال. وتم تحديد الهدف من البحث في النقاط التالية:

١ ـ ربـط المـاضي بالحاضر والمستقبل من خلال محاولة معرفة جزء من ثقـافـة الشعب البـدائيـة التي هي بمثابة بذور للعلوم والمعارف فيما بعد والتي نمت وتطـورت وأخـذت طابعـاً واقعيـاً وعقـلانيـاً وبـالتـالي وضع مسارات صحيحة لآفاق المستقبل على ضوء هذا الربط.

٢ ـ إزاء شحـة المصـادر والمعلومـات الاستـدلاليـة في متنـاول العلماء والبـاحثين المعنيين، يمكن الاستفـادة من هذه العقائد في التوصل الى حلقات منسية أو مفقودة من الآراء والافكار التي كانت سائدة في مرحلة من المـراحـل التـاريخيـة والتي كانت تتسـايـر مع حيـاة طبقـات وفئات إجتماعية وتسيرها.

٣ ـ من خلال دراسة المـوضـوع يمكن الـوصـول الى أبـرز السبل التي وجـدهـا الانسـان لنفسـه بالارتبـاط مع تفكيـر العصر السـائد، لمعالجة الفشل والأحباط في ظل ظروف التخلف والحرمان.

ويتضمن المـوضـوع أمثلة مختـارة للعقائد الخرافية الشعبية لشعوب من بلدان مختلفـة عربيـة وعالمية. وفي سياق الموضوع اشرنا الى تلك العقائد التي تعد قاسماً مشتركاً بين هذه الشعوب والشعب الكردي. من ثم دخلنـا موضـوع البحث «العقـائـد الكـرديـة الخـرافية حول الاشجار والنباتات». وأوردنا امثلة متفرقة مع تفسيراتها ومناقشة آراء الباحثين ممن سبق وان أشـار الى عدد من هذه العقـائـد ومنهم السيـدة هِنِي هارولـد هانسن التي وضعت كتـابـاً عن المـرأة الكردية بعد جولة لها في محافظة السليمانية، «وتوما بوا» الذي وضع كتابه الموسوم «مع الاكراد» ونيكيتين وآخرين غيرهم. وأخيراً وعلى ضوء الأمثلة المتوفرة حول هذه العقائد تم التوصل الى بمجموعة من الاستنتاجات ومنها:

١ ـ كان للكـرد شأنهم شأن المجتمعـات البشرية الاخرى إعتقاداً سائداً بوجـود الكـائنـات الغيبيـة، كائنـات خيـرة واخرى شريرة، وكانت تؤدى طقـوس فرديـة وأحيـانـاً جماعية على سبيل التقرب من الخيرة منها ونيل رضاها واستعطافها، وتجنب نقمة الشريرة منها والابتعاد عن أذاها.

٢ ـ وجـد الشعب من بعض هذه العقـائـد متنفساً وسبيلاً لمعالجة بعض الامـراض، سيما تلك الامراض التي يسـاعد التوازن والاستقرار النفسي والسكينـة في التخفيف عن وطأتهـا وعليـه فأن هذه العقائد لعبت دورها كأدوات نفسيه في المعالجة من الأمراض.

٣ ـ استجابت هذه العقائد أحياناً للاحتياجات العاطفية للانسان الكردي وبعثت في نفسه الطمأنينة والهدوء.

٤ ـ توصلنا من خلال البحث بأن جل هذه العقائد تكاد لاتخلو من جانب ايجابي يهدف الحماية والأستعطاف والفائدة.

# هەندێك دابونەریتی باران بارین و وەستاندنی لە لای میللەتان

کریم مصطفی شارەزا

## پێشەکی :

باران لە سەردەمێکی یەگجار کۆنەوە دەورێکی گرنگی لە ژیانی ئادەمیزادو گیانداررو ڕووەك دا بووە، بەتایبەتی لەو شوێنانەی کە دوورە دەریاو ڕووبارو دەریاچە بوون و، خەڵکەکە بۆ خواردنەوەی خۆیان و ئاودانی ئاژەڵ و کشتوکاڵیان ڕاستەوخۆ پشتیان بە ئاوی باران بەستووە.

هەر بۆیەش بووە کۆمەڵگای ئادەمیزاد لەو شوێنانەدا گەشەی کردووەو بە چاکی پەرەی سەندوە کە بارانێکی باشیان لێ باریوەو تووشی وشکەتی و نەهاتی نەبوون و، بارانەکەش بووەتە مایەی دروست بوونی کانی و جۆگەو ڕووبارو دەریاچەو، ئەمانەش باشترین سەرچاوەی ئاوو ئاوەدانی بوون و، بۆ ئادەمیزادو گیاندارو ڕووەك مایەی ژیان و زیندەگانی بوون.

ئەوەی شیاوی باسە، ڕووەك لە دوای ئاو و هەوا سەرچاوەیەکی سەرەکی خۆراك و ژیانی ئادەمیزادو داودەرمانی بووەو، خەڵکەکە لەو باوەڕەدا بوون کە هەر نەخۆشی یەکیان بە جۆرە ڕووەکێك چارەسەر دەکرێ و،[1] هەر لەم گۆشەیەوە بە وردی چاودێری باران بارین و ڕووان و گەشەکردنی دارو درەخت و هەموو جۆرە ڕووەکێکی یان کردووەو، هەر کاتێکی باران نەباریبایە، یاخود لە ماوەی دیاریکراوی خۆیدا دواکەوتبایە، ئەوا خەڵکەکە تەنگاو دەبون و مەترسی یەکی زۆر یەخەگیریان دەبوو، بۆیە بیریان لە هۆیەك دەکردەوە تاکو وا بکات بارانەکەیان بۆ ببارێنێ و، پەنایان دەبردە بەر گەلێك کرداری سەیرو پشتیان بە هەندێ کەسی تایبەتی و سیحرباز دەبەست و، لەمەوە هەر میللەتە جۆرە دابونەریتێکی پێکەوەناو، لە پشتیکەوە بۆ نەوەی نوێ گوێزرایەوەو، لە کاتی پێویست دا ئەو کەسە دیاریکراوانە دەیان کرد بەڵکو خوداوەند بارانیان بۆ دەبارێنێ و خۆیان و مەڕو ماڵات و کشتوکاڵیان لە مەترسی تینوەتی و قات و قڕی ڕزگار بکات.

ئەو میللەتانە بە بیرو باوەڕێکی سەرەتایی ی دوور لە زانست و لێکدانەوە سەیری بارانیان دەکردو نەیان دەزانی لە چی یەوە پەیدادەبێ و چۆن دەبارێ؟! هەر هەندەیان دەزانی کە هێزێکی نهێنی و نەدیو مایەی پەیدابوونی هەورو باران بارینەو، لەوانەیە هەندێ کردارو جووڵەی تایبەتی، یان هەندێ دوعاو نزای کەسێکی دوعاگۆ یان سیحرباز ببنە هۆی باران بارین، بۆیە لە ناو هەر میللەتە جۆرە کەسێك خۆیان هێنابوە پێشەوەو بە هۆی سیحر بە دوای ئاودا دەگەڕان و،[2] بە دوعاو هەندێ جووڵەی سەیر داوای بارانیان دەکردو، لە ئەنجامی هەڵس و کەوت و کرداری ئەو جۆرە کەسانە، لە ناو هەر میللەتە جۆرە دابونەریتێکی تایبەتی خوڵقاو لە کاتی پێویستی بە ئاوی باران، جێ بەجێ دەکراو، زۆر جار وا ڕێك دەکەوت مرازی خەڵکەکە دەهاتەدی و، بارانێکی باش دەباری و خێرو بێرێکی چاکی لەگەڵ خۆیدا دەهێنا.

## دابونەریتی کۆنی میللەتان بۆ باران بارین :

ئێمە دەبێ ئەو ڕاستی یە بڵێین کە زۆر جار وادەبێ کۆمەڵگای مرۆڤایەتی لە جێیەك دا دەگاتە پلەیەکی باش لە پێشکەوتن و شارستانێتی کەچی لە هەندێ جێ ی دیکەدا دابونەریتی کۆنی ژیانی ڕابوردووی هەر لەناودا دەمێنێ و شان بە شانی دابو دەستووری نوێ ی دەڕوات، بەتایبەتی ئەو دابو نەریتانەی کە پەیوەندییان بە ئاوو هەواو باو باران و کشتوکاڵەوە هەیەو، ئەمەش لە کۆمەڵگای لادێی پتر پاراستراوە، لەوەی لە کۆمەڵگای شارستانێتی باوی بێ.[3] چونکە ئێستاکەش لە هەندێ لادێ ی وڵاتی پێشکەوتوودا کۆمەڵی وەها ماون کە لە ئاودان و سازگاریی ئاوو هەوای

کشتوکاڵەکەیان هێشتا باوەڕیان بە سیحری سیحربازانە بۆ ڕزگار کردنیان لە چنگ وشکەتی و بێ بارانی، هەروەك هەندێ لە جوتیارەکانی وڵاتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکای سەر بە چەند خێڵێکی هیندییە سوورەکان باوەڕیان بە سیحری سیحربازان بۆ باران باراندن و ڕزگاربوونیان لە تینوەتی و قات و قڕی هەر ماوە و پەنای دەبەنەبەر.[٤]

ئەگەر لە سەرچاوەی هەمە جۆری کەلەپووری نەتەوایەتی میللەتان دا بە دوای دابونەریتی کۆنی خەڵکەکەدا بگەڕێین کە داواکردنی باران و داهاتنی کژ ی خۆشی ژیان کردوویانە، بێ گومان چاومان بە گەلێك جۆرە نموونەی ئەو دابونەریتانە دەکەوێ و، گەلێك زانای پسپۆڕ لێیەوە دواون و، زانیاری وردو بەکەڵکیان پێشکەش کردووین. یەکێك لەو زانایانەی کە لەم جۆرە دابونەریتە کۆنانەی میللەتانەوە بە شێوەیەکی قووڵ و فراوان دواین، زانای ئەنثروپۆلۆژ ی «سیر جیمس فریزەر» بووەو[٥] لە کتێبە بە نرخەکەی «چڵی زێرین: The goldn bough»دا بە دوورو درێژ ی لەوجۆرە دابونەریتانە دواوەو گەلێك نموونەی سەیرو خۆشی بۆ تۆمار کردووین و لە بەشێکی بەرگی یەکەمی ئەو کتێبەیدا دەڵێ: «لە کۆمەڵگای بەرایی ی گەلێك لە میللەتان دا، دەستەیەك کاریان لەمەسەلەی باران کردووەو، جاری وا بووە، کە ماوەیەك باران نە باریوەو خەڵکەکە زۆر پێویستیان پێ ی هەبوو، هەندێك لەو کەسانە چوون لاسایی باران بارینیان کردۆتەوەو هەندێك ئاویان بە سەر زەوی دا ڕژاندووە، بەڵکو هەوری ئاسمان کۆدەبێتەوە سەر یەك و دایدەکاتە باران و ئەگەر بارانیش زۆر باریبایەو ویستبایان بیوەستێنن، ئەوا ماوەیەك خۆیان تەڕ نەدەکردو ئاگریان دەکردەوە تاکو تەڕیەتی کەم ببێتەوەو، بارانەکە بوەستێ و چی تر نەبارێ!!»[٦]

## جیمس فریزەرو هەندێ نموونەی دابونەریتی باران بارین:-

جیمس فریزەری زانای ئەنثروپۆلۆژ ی ئوسکۆتلەندی گەلێك نموونەی لەو دابونەریتە سەیرانەی میللەتانی جیهانی بۆ تۆمار کردووین کە بۆ باران بارین بەکاردەهێنرێن وەکو ئەمانەی خوارەوە:-

* . لەو کاتەی کە یەکێك لە گوندەکانی دەوروبەری [دۆرپات = Dorpat] لە وڵاتی ڕووسیادا پێویستی یان بە باران بوایە، ئەوا ئەم دابونەریتەیان پەیڕەو دەکرد کە بریتی بوو لەم کردارە: سێ پیاو دەچوونە سەر درەختێکی بڵندو یەکێکیان بە کوتەکێك لە مەسینەیەك یا سندووقێکی دەدا تاکو گرمەی وەکو گرمەی هەور بێت و ئەوی دیکەشیان دوو پارچە تەختەی لە یەکتری دەخشاند تاکو برووسکەی ئاگریان لێ بەرز دەبووەوەو ئەمەش لاسایی کردنەوەی برووسکەی هەور بوو، سێیەمیشیان عەردەکەی دەوروپشتی ئاوڕشێن دەکرد، ئەمەش لاسایی کردنەوەی باران بارینەکە بوو، بەم جۆرە داوای بارانیان دەکرد.[٧]

(*). ئێستاکەش لە دوورگەی گیلۆلۆ: Giloio دا کە کەوتووەتە ڕۆژئاوای دوورگەی «گینای نوێ» لە سەرووی ئوسترالیاوە. سیحربازێك چڵە دارێکی تایبەتی لەناو ئاو هەڵدەکێشێ و عەردەکەی دەوروپشتی خۆی پێ ئاوڕشێن دەکات تاکو باران ببارێت و، لە نەهاتی ڕزگاریان ببێت.[٨] چونکە کشتوکاڵ بڕبڕەی پشتی ژیانی ئابووری یانەو نەهاتی و کەم بوونی بەروبوومی شیناوەردی وەکو دەردو بەلاییکی گەورەیەو یەخەگیریان دەبێ، بۆ خەڵکە سادەو ساکارەکە ناچارن پەنا ببەنە بەر سیحر بەڵکو بارانیان بۆ دەبارێنێ و ڕزگاریان دەبێ لە قات و قڕی و نەهاتی.[٩]

(*). کاتێك کە هیندییە سوورەکانی ئەمەریکای سەروو دەخڵ و دانیان لەبەر بێ بارانی زەرد هەڵدەگەڕێ، ئەندامانی کۆمەڵەی گامێشی پیرۆز: Buffalo Society قاپێکی گەورە پڕ لەئاو دەکەن و چوار جاران بەسەماکردن لە دەوری دا دەسووڕێنەوەو ئنجا یەکێکیان هەندێ ئاو لە دەمی دەکات و وەکو باران بە هەوادا دەیپرژێنێ و لە دوایی دا قاپەکە وەردەگێرێ و ئاوەکەی ناوی دەڕژێ و سەماکەرەکان خۆیان بە زەوی دا دەدەن و ئاوە ڕژاوەکە دەخۆنەوەو ڕووی خۆیان لە قوڕ وەردەدەن و بەم جۆرە گەنمەکەیان لە وشك بوون و فەوتان ڕزگار دەکەن.[١٠]

(*). خێڵەکانی ناتچیز: Natchez لە ئەمەریکا هەموویان لە وەرزی بەهاردا بەشداریی لە باران کرین و کەشی گونجاو بو کشتوکاڵیان لە سیحربازەکان دەکەن، ئەگەر پێویستی یان بە باران بوایە، ئەوا سیحربازەکە بە زمانی بە ڕۆژ وو سەمای دەکردو بۆرییەکی سەر کون کونی پڕ لە ئاو دەکردو دەیخستە ناو دەمی و وەکو باران ئاوەکەی ناوی دەپرژاند، بەتایبەتی بەرەو ئەوو لایەی ئاسمان کە هەوری پترە، تاکو باران ببارێ.[١١]

(*). لە ئەنگۆنیلاندی ناوەڕاست: Central Angoniland ئەگەر باران نەبارێ ئەوا خەلکەکە دەچنە پەرستگایەك پێ ی دەڵێن: پەرستگای باران»و عاردەکەی پاك دەکەنەوەو، سەرۆکەکەیان لە بەر خوداوەند چاوتا: Chauta دەپارێتەوەو دەڵێ: [ئەی خوداوەند دڵت بەرانبەرمان ڕەق بووەو چیت لێمان دەوێ تاکو بیکەین و، ئێمە گۆرانی دەڵێین و تۆش باران بدە ڕۆڵەکانت!][١٢]

(*). لە ناو خێڵەکانی کارۆ: Garo ی وولاتی ئاسام دا، لە کاتی نەهاتی و بێ بارانی دا، بزنێکی ڕەش دەکەنە قوربانی و دەچن لەسەر لووتکەی چیایەك سەری دەبڕن و ڕەنگی قوربانی یەکە بەشێکی گرنگە لە دابونەریتەکە، چونکە ڕەنگی ڕەش یارمەتی کۆبوونەوەی هەوری ڕەشی بە باران لە ئاسمان دەدات، تاکو بیکاتە باران و لە تینوەتی و

نەهاتی ڕزگاریان بێ.[13]

(*). لە زۆر ناوچەی جیهان دا خەڵکەکە لەو باوەڕەدان کە [بەرد] توانای باران باراندنی هەیە، بەمەرجێك بخرێتە ناو ئاو و تێیدا نقوم بکرێت، بۆیە لە یەکێك لە گوندەکانی دورگەکانی ساموا: Samoa [14]

خەڵکەکە جۆرە بەردێکی دیاریکراو لە لای خۆیان هەڵدەگرن و بە ڕەمزی (خوداوەندی باران)ی دادەنێن و پیاوە ئایینییەکان لە کاتی وشکەتیو نەهاتی بە کۆمەڵ دەیبەن بۆ ڕووبارێك و دەیخەنە ناو ئاوەکەی، بەڵکو بارانیان بۆ ببارێ.[15]

(*). لە ناوچەی ساجامی وولاتی ژاپۆن دا بەردێك هەیە خەڵکەکە پێی دەڵێن: «بەرد بارانە»و، لەو باوەڕەدان کە توانای هەیە باران لە ئاسمانەوە ڕابکێشێ بە تایبەتی ئەگەر نەختێك ئاوی پێدابکرێت.[16]

(*). هەندێ نەتەوە لەو باوەڕەدان کە «ئافرەت» توانای باران باراندیان هەیە!! بەتایبەتی لە کاتی جێبەجێکردنی دابونەریتێکی تایبەتی کە پێیدەڵێن «باران کێڵان» ئەم دابونەریتەش لەلای خێڵەکانی [پشو: Pshau]و [چووسوو: Cheusu] لە قەفقاسیادا هەیەو، لە کاتی بێبارانیو وشکەتیدا ئاهەنگێك سازدەکەن، جۆرە کردارێك دەکەن و پێی دەڵێن «باران کێلان»و، بەم جۆرە دەکرێ: [دوو ئافرەت خۆیان بە هەوجارێکی جوتەوە دەبەستنەوەو دەچنە ناو ڕووبارێك تاکو ئاوەکەی دەگاتە ناو قەدیان و، ئینجا وەکو کرداری کێلانی زەوی هەوجارەکە بە ناو ئاوەکەدا دێنن و دەبەن، بەڵکو باران ببارێ!][17] و، لە وولاتی ئەرمینیاش کچان هەمان دابونەریت جێبەجێ دەکەن و گەورەترین ئافرەت جل و بەرگی قەشە ئەبەردەکات و ئافرەتەکانی تریش جلی پیاوان لەبەردەکەن و هەوجار بە ناو ئاو و لە دژی تەوژمی ئاوەکە ڕادەکێشن![18]

(*). جاران لە خوارووی ڕۆژ ئاوای ڕووسیادا ئەو دابونەریتە باوبوو کە هەر کاتێك باران نەبارییایەو دەخڵ و دانیان تێنوو بوایە، ئەوا قەشەی کڵێسای گوندەکەیان بە هەموو جل و بەرگێکییەوە دەخستە ناو ئاوو نقومیان دەکرد، ئەم دابونەریتە لە ناو ئەرمەنییەکانیش دا باوبووە، بەڵام لە جیاتی قەشە، ژنان دەچوون ژنە قەشەیەکیان دەخستە ناو ئاو تاکو باران[19]ببارێ.

(*) عەرەبەکانی سەرووی ئەفەریقاش ئەگەر تووشی بێ بارانیو نەهاتی بووبان، ئەوا دەچوون بە خۆشی یا بە ناخۆشی پیاوێکی ئایینییان دەگرت و بە هەمو بەرگێکییەوە دەیان خستە کانیاوێك تاکو هەمو لەشی تەڕ دەبوو، ئنجا دەیان هێنایەدەر، ئەمەشیان بۆیە دەکرد تاکو خوا بارانیان بۆ ببارێنیو،[20] لە ناو کوردیش دا ئەم جۆرە دابونەریتە هەیەو زۆر مەلای مزگەوتیان فڕێداوەتە ناو حەوزی ئاوی دەست نوێژ هەڵگرتن، بەڵکو خوا بارانیان بۆ ببارێنێو لە دواییدا دەگەڕێننەوە سەری.

(*) تاکو ئێستاکە جۆرە دابونەریتێك لە ناو خەڵکی سادەی ناوچەی (تسالیا)و (مەکدۆنیا)دا باوەو، هەر کاتێك باران نەبارێو وولات تووشی بێئاویو نەهاتی بێ، ئەوا کۆمەڵێك منداڵ ڕێك دەخەن، تاکو لە دەوری کانیاوو بیرەکانی دەورو بەری گوندەکانیان بسووڕێنەوەو، لە پێشەوەیان کچێکی بچکۆلە دەڕوات و هەموو لەشی بە گوڵ داپۆشراوەو، لە هەر شوێنێك بوەستن خەڵکەکەی دەورو بەریان ئەو کچە بچکۆلەیە ئاوڕشێن دەکەن و پێیدەڵێن [بەر بەریا]و، هەموو منداڵەکان ئەم دوعایە دەڵێن:-

بەربەریا! ئەی سەوزی تەڕو ئاودار
هەموو ناوچەکانی دەورو پشتمان ببوژێنەوە
کە بە ڕێگەی دارستان دا ڕەت بووی.
نوێژ بۆ خوای دلۆڤان بکە!
ئەی خوایە بارانێکی نەرم و لەسەرەخۆ
بۆ دەشت و دەرەکانمان بنێرە
تاکو کێڵگەکانمان بەرهەمێکی باش بدەن و
دار مێوەکانمان گەشە بکەن و بەر بدەن!
ئەی خوایە دانەوێڵەکانمان پڕ زادبکە
خۆمان و خەڵکی دەورو پشتمان تێرو دەوڵەمەندبکە!![21]

(*). ئەمە لە وولاتی یۆنان، بەڵام لە وولاتی (سربیا)[22]دا، لە کاتی بێبارانیو نەهاتیدا، لادێییەکان، کچێکی بچکۆلە ڕووت دەکەنەوەو دێنن بەرگێکی سەوزی لە گیاو گوڵ دروست کراوی لەبەردەکەن و دەم وچاوی بە ڕووپۆشێکی لە گیا چنراو دادەپۆشن و بەو کچۆڵەیە دەڵێن «دۆدۆلا: Dodola» و ئەمەش لە ناوەڕاستی کۆمەڵە کچێك بەناو شەقام و کۆڵانەکانی گوندەکەیان دا سەمادەکات و بە دەوری خۆیدا دەسووڕێتەوەو کچەکانیش بە شێوەیەکی بازنەیی لە دەوری دەڕۆن و گۆرانی «دۆ دۆلا» دەڵێن و هەر کە دەگەنە بەردەم هەر ماڵێکی گوندەکەیان کابانی ماڵەکە سەتڵە ئاوێك بە «دۆ دۆلا» کە دا دەکات و، ئەم گۆرانییە دەڵێن:-

ئێمە لە ناو گوندەکەمان دا دەڕۆین و
هەورەکانیش بە ئاسمان دا دەڕۆن
ئێمە بە خێرایی هەنگاو دەنێین
هەورەکانیش لە ئاسمان بە پەلە دەڕۆن
هەورەکان بە ئێمە گەیشتن!
گەنم و مێوەکانیان بە باران ئاوداین!![23]

(*). بە شێوەیەکی نزیك لەم دابونەریتەش لە گوندەکانی

دەوروبەری شاری [پوونا: Poona ]ی هندستان، [٢٤] لە کاتی بێ بارانیدا، جۆرە دابونەریتێکی کۆن پەیرەو دەکەن و، منداڵێك دێنن و:

جلێکی لە گەڵا دروست کراوی لەبەردەکەن و پێوی ی

دەڵێن «شای باران»و لەناو کومەڵە منداڵێکی رادەگرن و داوایان لێ دەکەن بە کۆمەڵ بە ناو شەقام و کۆڵانەکانی گوندا برۆن و گۆرانییەکی تایبەتی بڵێن و لەبەردەم دەرگای هەموو ماڵێك بوەستن، خاوەنی ئەو ماڵە یا ژنەکەی (شای باران) ئاورشێن دەکات و هەندێك خۆراك بە منداڵەکان دەدات و کاتێك کە هەموو گوندەکە دەگەڕێن، لە ئاوایی دوور دەکەونەوەو دێنن بەرگە سەوزەکەی لەبەر منداڵەکە دادەکەنن، ئنجا دەکەونە سەر خواردنی ئەو خواردەمەنییانەی کە لە ماڵەکانیان کۆکردوتەوە. [٢٥]

(*). لە وولاتی چین دا، لادێییەکان ئەم دابونەریتەی داواکردنی بارانیان لە ناودا باوبووەو، ئەگەر ساڵێك باران لە کژی خۆیدا دواکەوتبایە، یاخود ماوەیەکی زۆر نەباریبایە، ئەوا خەڵکەکە دەچوون ئەژدەهایێکی گەورەیان لە دارو کاغەز دروست دەکردو پێیان دەگوت «خوداوەندی باران»و، کۆمەڵە منداڵێك بەناو شەقام و کۆڵانان دا دەیان گێراو جۆرە گۆرانییەکی تایبەتییان دەگوت و داوای بارانیان دەکرد، بەڵکو خوداوەند بۆیان بیارێنیو، خۆ ئەگەر دوای ئەم کارەیان باران هەر نەباریبایە، ئەوا هەموو خەڵکەکە تاویان دەدایە سەر ئەژدەهاکەو ونجرونجریان دەکرد!! [٢٦]

خوێنەری بەڕێز، ئەوەی خوێندتەوە بەشێك بوو لە دابونەریتی هەمە جۆری میللەتانی جیهان بۆ داواکردنی باران و، ئەو میللەتانە بە شێوەیەکی سادە جۆرە سیحرێکی (هومیوپاتی) واتە: (هاوتایی) یان ئەنجام داوە بە وەی کە ئاویان بەکارهێناوە بۆ داواکردنی ئاوی باران و، [٢٧] ئیستاش با بزانین لە ناو کوردەواری خۆمان دا تا چ رادەیەك ئەو دابونەریتانە هەنەو چۆن جێ بەجێ دەکرێن؟

## کوردو دابونەریتی باران داواکردن:

کاتێك کە لە سەرنجدانی ئەم دابونەریتەی میللەتانی جیهان دەبینەوەو ڕوو دەکەینە دابونەریتی کورد بۆ باران بارین، دەبینین لە کوردستان دا چەند دابونەریتێکی میللی هەیە بۆ داواکردنی باران لە کاتی بێبارانیو نەهاتیداو، تاکو ئێستاکەش لە دێهاتەکان و لەو شوێنانەی کە لە کشتوکاڵ دا پشت بە ئاوی باران دەبەستن هەر باوەو پەیرەو دەکرێت و هەر کاتێك باران دواکەوت و نەباری، ئەوا خەڵکەکە بەتایبەتی منداڵ و مێرد منداڵان دەوکەنە خۆیان و [بووکە بە بارانە] لە دارو پەڕۆ دروست دەکەن و، یەکێك لە منداڵەکان هەڵی دەگرێو

ئەوانی تر دەکەونە شوێنیو زۆرتر ئەمە لە نێوانی عەسرو کاتی ڕۆژئاوا دەیکەن و بە ماڵان دا دەگەڕێن و [٢٨] دەڵێن:-

هەیاران و مەیاران    یاخوا داکاتە باران،
بۆ فەقیرو هەژاران    بۆ گوڵ و لالەزاران،
بۆ سەیرانگای دلداران    لە دەشت و لە کوساران [٢٩]

ئەم شیعرانە لە ناوچەی گەرمیانی کوردستانی عیراق دا باون، بەلام لە هەندێ ناوچەی تری کوردستان دا بەم دەقەی خوارەوە دەگوترێ:-

هەناران و مەناران    یا خوا داکاتە باران
باران باران بۆ منالان    بۆ باخچەکەی ناو ماڵان
بۆ بەرخ و کارو دایکیان    بۆ زەوی‌و زار بۆ پاکیان
هەناران و مەناران    یاخوا داکاتە باران! [٣٠]

لە هەندێ ناوچەی دیکەی وەکو دەشتی هەولێر ئەم دەقەی خوارەوەی بۆ بەکاردێو دەگوترێ:

هەیاران و مەیاران    یا خوا بباری باران
لۆ فەقیرو هەژاران    گەنم شین بن لە چاران

بە کارتێکردنی ئایینی ئیسلام لەم دابونەریتەدا لە هەندێ ناوچەی وەکو دەشتی کۆیەو هەندێ شوێنی دیکەش ئەم دوو بیوە دێرە شیعرەیشی لەگەڵ دا دەگوترێ:

گەنمی حەسەن و حوسێنان
هەمووی قڕبوون لە تێنان!!

لە هەندێ ناوچەی وەکو (سلیمانی)یش بەم جۆرە بە بووکە بە بارانەکە هەڵدەڵێن و دەگوترێ:-

بووکە بە بارانە    ئاوی بن دەغلانە
سەعاتی جارانە
هەیاران و مەیاران    یاخوا داکاتە باران
بۆ فەقیرو هەژاران

لە ناوچەی بادینانیش دا ئەم دێرە شیعرە فۆلکلۆرییانە لەگەڵ بووکە بە بارانەکە دەڵێن و لە جیاتی ئەم ناوە ناوی «لوپك» دەگوترێو دەڵێن:-

لوپك
لوپکێ مە باران بارا
مەژ خودێ ئیمان دڤێ
مە ئاڤیەك باران دڤێ
لوپ... لوپ... لوپ [٣١]

لە ناوچەی «یۆنان» ئەم دەقە بۆ بووکە بە بارانە بە کاردێ‌و دەگوترێ:

| | |
|---|---|
| قەرنکێ قەردۆش | ستیل و بەرۆش |
| مەعمە رەشا | برەشینە |
| یایە قەردك | ڤیر دەبینە |
| سەری سالێ | بنی سالێ |
| خودێ کورەکی بدە | کەڤانیا ڤێ مالێ |
| بارانێ ببار ببار | چیڤکا گەنمێ تەخار |
| تالیا مایی | ڤتکا بژات!![٣٠] |

ئەم دابونەریتە هی یەزیدیەکانی ناوچەی شەنگارە، بەڵام موسلمانەکانیش جێ‌بەجێی دەکەن و داوا دەکەن باران ببارێ چونکە هەموو ئەو گەنمەی کە تۆودراوە (چۆلەکە) دەیخۆن و ئەوی دەمێنێتەوەش دەبێتە خۆراکی (قەتێ)یان.

لە زۆر شوێنی تری کوردستان دا بووکە بە بارانەکە دەبێت بە «کۆسە بارانە»، هەروەك لە دەشتی گەرمیان ناودەبرێ‌و لە ناوچەی هەولێریش پێی‌دەگوترێ «کۆسە بەبە»و، یەکێکیان دەکرد بە کۆسەو کۆمەڵە منداڵێکی بەدوا دەکەوت و بە ناو ئاواییدا دەرۆیشتن و لەبەر دەرگای هەر ماڵێك بوەستن ئاویان پێدادەکەن و هەموویان ئەم گۆرانیە دەڵێن:-

| | | |
|---|---|---|
| | بووکە بە بارانمان دەوێ | رەحمەتی جارانمان دەوێ |
| یان: | کۆسە بە بارانمان دەوێ | رەحمەتی جارانمان دەوێ |
| یان: | باران خێرو خێراتە، | دەغڵ و دانی پێ هاتە! |

لە هەندێ ناوچەی تری کوردستان بە بووکە بارانە دەڵێن (شەمولە)و منداڵان ئەم گۆرانیەی بۆ دەڵێن:-

شەمولە! ئاوی دەوێ    شەمولە! دانی دەوێ
شەمولە! شەکری لە شارانی دەوێ
شەمولە! مێوژی عەمبارانی دەوێ
شەمولە! ئاوی بەهارانی دەوێ![٣١]

جگە لە دابونەریتی (بووکە بە بارانە)و (لویك)و (کۆسە)و (شەمولە) لە کوردستان دا گەلێك دابونەریتی دیکەش هەیە بۆ داواکردنی باران جێ‌بەجێ‌دەکرێن وەکو ئەمانەی خوارەوە:

(١). کێل و بەردی گۆڕی پیاوچاك خستنە ناو ئاو تاکو باران ببارێ.

(٢). پیاوی ئایینی خستنە ناو ئاو: زۆر جاری وا دەبێ کە باران نابارێ‌و دەغڵ و دانیان تینوو دەبێ‌و مەترسیی نەهاتی‌و قڕو قاتی کشتوکاڵ پەیدا دەبێ، هەندێ کەس دەچن پیاوێکی ئایینی لە غافڵەت فڕێ دەدەنە ناو ئاوی حەوزی مزگەوت، جا ئەو پیاوە چ مەلا بێ‌و چ شێخ و سەید بێ ئەم کارەی دەرحەق دەکەن، بەڵکو خوا بارانیان بۆ ببارێنێ.

(٣). نوێژی بارانە:- لەو کاتەی کە باران نابارێ‌و دەغڵ ودان تووشی مەترسیی ووشك بوون دەبێ، ئەوا مەلای مزگەوت و خەڵکێکی زۆر دەچنە دەرەوەی شار یاخود گوند، لە شوێنێکی بەرز بەرەو قیبلە دەوەستن و «نوێژەبارانە» دەکەن و گەلێك دوعا دەکەن و لەبەر خوا دەپاڕێنەوە تاکو بارانیان بۆ ببارێنێ‌و، ئەم دابونەریتە ئایینی ئیسلام دایهێناوە، یاخود هەبووە و لە دواییدا ئایینی ئیسلام لە باوەشی کردووەو کردوویەتی بە نوێژ و دوعاو پاڕانەوە لەبەر خودای تاك و تەنیا تاکو لە نەهاتی رزگاریان بکات.

ئەگەر ئێمە لە دابونەریتی میللەتانی جیهان وردببینەوە کە بۆ باران بارین بە کاریان هێناوەو ئاوڕێکیش لە دابونەریتی میللەتی کوردمان بدەینەوە کە بۆ هەمان مەبەست جێ‌بەجێیان کردووەو تاکو ئێستاش لە هەندێ شوێنیدا پەیرەوی دەکەن، دەبینین لە هەندێ رووەوە وێکچوون و نزیك بوونەوەیەکی زۆر بەدی دەکەین و، ئەم دابونەریتەی رێکخستنی (بووکە بە بارانە) یان «شەمولە»ی کوردو «دۆ دۆلا»ی سرب دەکەین بە نموونەی بەراوردیی‌و وێکچوونی دابونەریتی هەردوو نەتەوەکە.

## بەراوردییەك لە نێوانی «شەمولە»ی کوردو «دۆ دۆلا»ی سرب:-

کاتێك کە لە (شەمولە)ی کوردو (بەربەریا)ی یۆنان و (دۆ دۆلا)ی سرب و (شای باران)ی هندستان و (ئەژدەهای خوداوەندی باران)ی چین ورد دەبینەوە، هەست دەکەین لە بارەی بنیاتی دابو نەریتەکەو کەسی قارەمان و کەسە یارمەتی دەرەکانی‌و ئاهەنگ و بەزم گێڕانەکەیان هەموویان دەچنەوە سەر یەك سەرچاوەو یەك هەیکەل و یەك گیانیان هەیە، بەڵام ئەوەتا هەر وڵات و هەر نەتەوەیەی بەپێی خاك و ئاووهەوای وڵاتەکەی‌و هەست و نەستی میللەتەکەی، جۆرە تایبەتمەندییێکی هەیەو، هەرچەندە کەسی قارەمان لە چین ئەژدەهایە، چونکە رەمزی نەتەوەیی خۆیانەو، لە هندستان و کوردستان کوڕەو لە یۆنان و سربیاش کچە، بەڵام لە هەر چوار جێیان هەمان دەوری قارەمانی بەزمەکە دەبینن و، لە هەر چوار لایان دەستەیەك منداڵ دەوری کەسی یاریدەدەری قارەمان دەبینن و، لە هەر چوار دابونەریت دا منداڵەکان گۆرانی دەڵێن و داوای باران و خێرو خۆشی بۆ خۆیان و بۆ خەڵکەکە دەکەن.

بەڵام ئەوەی پتر سەرنجمان رادەکێشێ ناوی «دۆ دۆلا» یا «دۆ

دۆلەی سربیاو «شەموولە»ی کوردە، کە نەك هەر لە قارەمان و بنیات و کەسی یاریدەدەری قارەمان و بەزم و ئاهەنگەکە زۆر لە یەکەوە نزیکن، بەڵکو لە ناوی قارەمانەکەشیان دا زۆر لەیەکەوە نزیك بوونەتەوە و، دوور نی‌یە وشەکانی [دۆ دۆلە]و [شەموولە] لە یەك سەرچاوەوە هاتبن و رۆژیك لە رۆژان کوردو سرب بە یەکتری گەیشت بن و دابونەریتیان لە یەکتری وەرگرت بێ، خۆ هەر دووکیان بۆ ماوەیەکی دوورو درێژ لەبەر دەستی عوسمانلی بوون و فەرمانبەرو سەربازو بازرگانیان بەسەریەکەوە چوون.

لە سەرێکی تریشەوە وەك لە دۆستێکم بیستووە کە خوێندنی لە یوگوسلاڤیا تەواوکردوە، بە زمانی سربی بە بووکەشووشە یا بە کەسێکی وردیلەی بستە بالا دەگوترێ [دۆ دۆلا]و، لە زمانی ئینگلیزیش کە زمانێکی ئەوروپایی‌یە بە بووکەشووشە دەگوترێ «دۆل: Doll و لە کوردیش دا [شەموولە] هەمان مانای هەیەو بە کەسی [بستەبالا] دەڵێن، هەر کەسێکی کورتە بالای وردیلە بێ پێی‌دەڵێن ئەوەندە بچکۆلەیە هەر دەڵێی [شەموولە] یە.

## دابونەریتی وەستاندنی باران:-

خوێنەری بەرێز، هەروەکو دابو نەریتی باران داواکردن لە ناو کۆمەڵی میللەتان دا هەیەو، هەر یەکەیان جۆرە دابودەستوورێك بۆ ئەم مەبەستە بەکاردێنن و داوای باران و خێرو خۆشی دەکەن، دەبینین لە هەمان کاتیش دا ئەو دابونەریتەش هەیە کە بۆ باران وەستاندن بە کاردێ، هەروەك ئەم نموونانەی خوارەوە:-

(*). مێژوو نووسی ناوداری عەرەب «ئەلمەقریزی»[35] لە کتێبێکی مێژووی‌دا باسی جۆرە رێگایەك دەکات بۆ وەستاندنی باران و دەڵێ:- «وا دەگێرنەوە کە لە ناو خێڵی «ئەلقەمەر»ی ولاتی «حەزرەمۆت»دا رێگایەك باوبووە بۆ وەستاندنی باران، بە تایبەتی کە زۆر باری‌بوایەو بووایە مایەی مەترسی‌یەکی زۆرو، بەم جۆرە ئەنجامیان دەدا. خەڵکەکە هەندێ لقە داری درەختێکی دیاری‌کراویان دەبری‌و ئاگریان تێ‌بەردەداو لە دوایی‌دا ئاویان بە سەردا دەکرد، تاکو دەکوژایەوە».[36] بەمە دەوروبەری خۆیان گەرم دەکردو ئەو گەرمایەش دەبووە مایەی وەستانی بارانەکە.

(*). جگە لە عەرەبەکان گەلێك نەتەوەی دیکە ئاگریان بۆ وەستاندنی بەفرو باران و تەرو تووشی بەکارهێناوە، لەوانە: خێڵەکانی [سولکا: Sulka ]ی [بەریتانیای نوێ]یە کە تاکو ئێستاکە ئەو دابو نەریتەیان لەناودا باوەو، ئەگەر بارانێکی زۆر باری‌و تووشی مەترسی کردن و ویستیان بوەستێ، هەڵدەستان هەندێ چەوو وردە بەردیان دەخستە ناو ئاگر تاکو سوور دەبوونەوە ئنجا لەگەڵ هەندێك خۆڵەمێشی گەرم بەرەو ئاسمان و بارانە هەڵیان دەدان تاکو ئەو بارانە زۆرە بوەستێ.[37]

(*). هەندێ سیحربازی شاری «پۆرت ستیفنز: Port stephens » لە هەرێمی [نیو ساوث ویلز]ی ئوسترالیادا بارانیان لە رێگەی فڕێدانی داری سەر بە ئاگر بەرەو ئاسمان دەوەستاند.[38]

(*). لە ناو خێڵی [ئەنوولا: Anula ]ی سەرووی ئوسترالیا ئەو باوەڕە هەبووە کە هەموو کەسێك بۆی هەیە باران بوەستێنی بە مەرجێك لقە دارێکی سەوز لە ناو ئاگر بنێ تاکو هەندێکی لێ دەسووتێ، ئنجا ئەو دارە بە داگیرساوی لە هەوا بدات، بەم جۆرە بارانەکە دەوەستێ.[39]

(*). خەڵکی دوورگەی «جاوە» لە ولاتی ئەندونیسیادا کە بارانیان زۆرەو گەلێك جار لە رادە بەدەر دەبارێت و شیناوەردی‌یان لێ تێك دەدات، بۆیە لەو دوور گەیەدا هەڵدەستن چرایێکی زۆر پێ‌دەکەن و، ئاگردەکەنەوە، بۆ ئەوەی ئەو بارانە زۆرەیان بوەستێ.[40]

(*). لە ناو خەڵکە سادەو ساکارەکەی ولاتی چین تاکو ئەم دوایی‌یەش دابونەریتێکی کۆن پەیرەو دەکرا بۆ باران وەستاندن و ئەگەر هاتبایە باران بۆ ماوەیەکی دوورگو درێژ باریبایەو بەروبوومی کشتوکاڵی خستبایە مەترسی‌ی وشکی‌و فەوتان، ئەو وەختە خەڵکەکە لەبەر [خوداوەندی باران = لۆنگ ونگ: Long Wong ] دەپارانەوە و نوێژە بارانەیان بۆ دەکرد تاکو بارانەکە بوەستێ‌و، لە مەترسی رزگاریان بێ.[41]

## بەراوردی‌یەك لە نێوانی نوێژە بارانەی چین و نوێژە بارانەی کورد:-

وەك زانیمان چینی‌یەکان تاکو ئەم دوایی‌یە لە گوندو دیهاتەکانیان دا، ئەگەر باران زۆر باریبایەو ژیانی خۆیان و مەڕو ماڵات و کشتوکاڵیانی خستبایە مەترسی‌یەوە، ئەوا دەچوون نوێژە بارانەیان دەکردو لە خوداوەندی باران دەپارانەوە تاکو بارانەکەیان بۆ بوەستێنێ‌و، لە لافاو و تەڕو تووشی‌یەکی زۆریان رزگار بکات. کاتێکیش ئاوڕ لە دابونەریتی نەتەوەی کورد دەدەینەوە، دەبینین لە ژێر سایەی ئایینی ئیسلام نوێژە بارانەی کردووە لەبەر خودا پاڕاوەتەوە، نەك بۆ باران وەستاندن بەڵکو بۆ باران بارین و لە دەرەوەی شار خەڵکێکی زۆر کۆبوونەتەوە و مەلایێکی دیارو ناوداری ئەو شارە پێش نوێژی کردوون هەروەك لەمەوبەر باسمان لێوەکرد. کەواتە: دابو نەریتی نوێژە

بارانــە لە لای چین و لە لای کورد هەیــە، بەڵام ئەو مەبــەسـتــەی کە نوێـژەکـەی بۆ دەکـەن پێچـەوانـەی یەکتـرن، یەکەمیان نوێژە بارانەی کردووە بۆ باران وەستاندن و دووەمیشیان بۆ باران بارین.

خوێنـەرە بەرێـزەکـانم، ئەمـە بوو هەندێ دابونەریتی باران بارین و وەستاندنی لەلای میللەتان و لەلای نەتەوەی کورد، هیوادارم توانیبێتم رووناکی یـەك بخـەمـە سەر لایـەنـەکـانی و ئێوەی ئازیز بە هەندێ لەو دابونەریتانە ئاشنابکەم.

## پەراوێزو سەرچاوەکان:


(١). الکسـزانـدر هجـرتی کراب - علم الفـولکلور - ترجمـة رشـدي صالح، القاهرة ١٩٦٧ ص٣٧١

(٢). الـدکتـور محمـد الجـوهـری - علم الفـولکلور - ط١، القاهرة ١٩٧٥، ص١٢٣

(٣). الکسـزانـدر هجـرتی کراب - علم الفـولکلور - ترجمـة رشـدی صالح، القاهرة ١٩٦٧ ص٢١

(٤). الـدکتـور محمـد الجـوهـری - علم الفولکلور - ط(١) القاهرة ١٩٧٥، ص١٢٣

(٥). سیر جێمس فریزەر (١٨٥٤ - ١٩٤١) زانایێکی ئەنترۆ پۆلۆژی ئوسکوتلەندی بووەو خاوەنی ١٢ بەرگ لە کتێبی [چڵی زێرین]ە، کە لێکۆڵینەوەیەکی فراوان و باشە لەسەر کەلەپووری میللەتانی جیهان.

(٦). سیر جیمس فریزر - الغصن الذهبي - ج(١) ترجم باشراف أحمد أبو زید، القاهرة ١٩٧١، ص٢٥١.

(٧). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٥٢.

(٨). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٥٢.

(٩). الکزاندر هجرتی کراب - علم الفولکلور - ص٤٣١.

(١٠). جیمس فریزر - الغصن الذهبي - ج(١)، ص٢٥٢.

(١١). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٥٢.

(١٢). هەر ئەو سەرچاوە ل: ٢٥٣.

(١٣). هەر ئەو سەرچاوە ل: ٢٧٦.

(١٤). سامـوا: somoa کۆمـەڵـە دوورگـەیـەکـە کەوتـووەتـە خواورووی ئوقیانووسی هێمن

(١٥). جیمس فریزر، الغصن الذهبي - ج(١)، ص٢٨٤.

(١٦). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٨٥.

(١٧). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٧٠.

(١٨). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٧٠.

(١٩). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٦٩.

(٢٠). هەمان سەرچاوە، ل: ٢٧٠

(٢١). هەمان سەرچاوە، ل: ٢٦٧، ٢٦٨

(٢٢). سربیا: وولاتێکە لە ئەوروپاو ئێستاکە بەشێکە لە یوگوسلافیای یەکگرتوو.

(٢٣). جیمس فریزر - الغصن الذهبي - ج(١)، ص٢٦٨

(٢٤). پوونا: شارێکی بازرگانی‌یە لە ناوەراستی هەرێمی بۆمبای لە ولاتی هنـدسـتـان لە سەدەی هەژدەهـەم دا پـایتـەختی ئیمپراتوریەتی (ماهراتا) بووە.

(٢٥). جیمس فریزر - الغصن الذهبي - ج(١)، ص٢٦٩

(٢٦). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٧٩.

(٢٧). الکزاندر هجرتی کراب - علم الفولکلور - ص٤٣٨

(٢٨). عەلا ئەدین سەجادی - کوردەواری - بەغدا ١٩٧٤، ل: ٢٨١

(٢٩). هەردەویـل کاکـەیـی - هاوکـاری - ژمـارە (١٠٤٨) لە (١٩٨٩/٢/٦)، ل: ٧

(٣٠). عەلا ئەدیـن سەجـادی - کوردەواری - بەغـدا ١٩٧٤، ل: ٢٨١، ٢٨٢

(٣١). ئەم دەقەم لە کاك سەگڤان مستەفا یوسفی وەرگرتوە.

(٣٢). ئەم دەقەم لە کاك محەمەد حوسێن‌عەلی شەنگاری وەرگرتوە.

(٣٣). هەردەویل کاکەیی - هاوکاری ژمارە (١٠٤٨) لە ١٩٨٩/٢/٦.

(٣٤). گۆرانی شەمـولـەو دابـونـەریتی جێ‌بەجێ کردنی لە ناوچەی کۆیەدا باوە.

(٣٥). ئەملەقـریـزی: ناوی تەواوی [تـاجـەدین ئەحمـەد کوری عەلی]یـەو لە نێـوانی ساڵانی (١٣٦٤ - ١٤٤٢)دا ژیـاوەو لە میسـر لەدایك بووەو گەلێك لە ولاتە ئیسلامی‌یەکان گەراوەو مێژو نووسێکی باش بووە.

(٣٦). جیمس فریزر - الغصن الذهبي - ج(١) ص٢٥٤.

(٣٧). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٥٥.

(٣٨). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٥٥.

(٣٩). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٥٥.

(٤٠). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٦٤.

(٤١). هەر ئەو سەرچاوە، ل: ٢٧٩.

ملخص البحث

## عادات وطقوس الشعوب لانزال المطر وايقافه

كريم مصطفى شارزا


يتناول البحث دور المطر في حياة الانسان والحيوان والنبات في الأقاليم التي تعتمد على مياه الأمطار في الشرب وسقي المواشي والمزروعات. لذا كانت الشعوب التي تقطن تلك البقاع تفكر دوماً في المطر والتحكم في هطوله أو ايقافه وفقاً لحاجتها اليه فنشأت لديها عادات وطقوس معينة تؤدى عند الحاجة والضرورة.

**عادات وطقوس الشعوب في طلب المطر:**

**اذا ما بحثنا في تراث الأمم والشعوب المختلفة عن عادات وطقوس تؤدى من أوقات الجدب ومواسم احتجاب المطر، حيث تتعرض النفوس والضرع والزرع الى الهلاك، نجد طقوساً غريبة تقام لدى شعوب مختلفة من أجل التحكم في المطر وقد تناول باحثون وعلماء كثيرون هذه الطقوس فاشبعوها درساً وتحليلاً وأن الأنثروبولوجي الاسكتلندي (السير جيمس فريزر ١٨٥٤ ـ ١٩٤١) هو أحد هؤلاء العلماء الذي عنوا بتلك الطقوس فتناولها في مجلدات (الغصن الذهبي) الاثني عشر باطناب.**

**جيمس فريزر وعادات وطقوس التحكم في هطول المطر:**

لقد سجل السيرجيمس فريزر في كتابه (الغصن الذهبي) نماذج كثيرة من تلك الطقوس التي كانت تؤدى لدى الشعوب البدائية والقبائل في انحاء متفرقة من العالم للتحكم فيه وتأمين طقس ملائم لمزروعاتها. فقد تناول نماذج منها لدى القبائل والشعوب القاطنة في استراليا وجزرها المجاورة وفي الامريكتين الشمالية والجنوبية ولدى القبائل الافريقية وفي بعض مناطق اسيا واوربا. فدرس فريزر كنه الاعمال التي تؤدى في تلك الطقوس وعلاقتها بالسحر التشاكلي فضرب أمثلة عديدة حول تلك الطقوس لدى قبائل وشعوب مختلف أنحاء العالم ومن اهمها التي تقام في اليونان والعرب والهند والصين والقفقاس.

الكرد وطقس طلب المطر:

يتناول البحث في هذا القسم الطقوس التي تتقدم في أنحاء مختلفة من كردستان من أجل طلب المطر. فيبحث عن طقس «لعبة المطر» و«كوسه بارانه» و«شمولة» و«لوبك» الذي يقوم به الأطفال أوقات الجدب وانحباس المطر فيجوبون شوارع وأزقة المدن أو القرى حاملين لعبتهم وقد يقومٌ أحد اليافعين بدور طالب المطر فيهزج الأطفال من حوله منشدين اغنية خاصة ويقفون أمام عتبة كل بيت ليسكب رب البيت أو ربته الماء على اللعبة أو طالب المطر. يعتقد الأهلون أن هذا الطقس قد يساعد على هطول المطر وخلاص الناس من الجدب والقحط.

طقوس ايقاف المطر:

يتناول البحث الطقوس الشعبية التي تقام لدى الشعوب المختلفة من أجل ايقاف المطر عندما يهطل اكثر من الحاجة اليه. فيطرق الى أمثلة عديدة منها والتي تقام من أجل ايقافه، فكانوا يوظفون النار في طلب حرارة الجو وايقاف المطر الغزير الذي يحدث فيضانات وسيول عارمة تتلف المزروعات وتغرق الممتلكات والمواشي.

# کوردو فرندە
# دباوەرێن چیڤانوکیدا و هەڤبەرکرن

أحمد عبدالله زەرۆ

کەلەپوری مللەتان وەك ئاشکرایەو مە ژی خواندیەو دیتی یە.. چ ژ خواندنا ژێدەرو چاپکریادە، یان درێکا تۆمارکرێت ئەرشیفی «سینەماو تەلەڤزیون» یان ژی ژ وان شینەوارێن کۆلای ژ نەخش ونیگارێن برێ ل دیوارێت شکەفت وکەڤنە ئاڤاهی یا.. ئەڤەو پترتر ژ هندێ کوب رێکا پسپورێت فولکلوری و ڤەکۆلڤاناو گوتویا شیاینە هەتا نهو گەلەك ئالییێت ڤی کەلەپوری ب ئاوایەکی زانستی بپارێزن و لدوی بچن. وەسا خویا دبیت کەڤناریا گەلەك تەخێن ڤی کەلەپوری، نەخاسمە ژ وان باوەرێن مللەتا ئەوێن ماین ب ئاوایێ چیڤانۆك وئەفسانەو داستان ومامك وگوتنێت پڕ ئامۆژگاری.. لەوا چەند سەراستیەك ژمەرا ئاشکرا دبیت نەخاسمە بارێ ژین وژیارا وان مللەتا ژ ئالیێ ئایینی وئابۆری وکومەلایەتی و رەوشەنبیری ڤە لوان سەردەما.

لەوا دبینین ئەڤ بیروباوەرە، رەوشت وتیتالە لبا زاناو شارەزایێت فولکلوری، بونە زانست، ژ رەوشەنبیریەکا موکم وکەڤنار هەر ژ بەری مێژوویێ، یان هەر ژ پەیدا بونا مرۆڤی.

ڤەکولین ولدوی چونا من بوڤی بلبەتی ژ چەند رەخ ورویێت چیڤانوکێ یەو بڤی ئاوایی دێ لسەر ئاخڤم:

١ - چیڤانوك چیە؟ وهزروبیرێت زانایێت ڤی بابەتی چنە..

٢ - دەورێ فرندەی د باوەرێن مللەتاندا.

٣ - هەڤبەرکرنەك دگەل چەند چیڤانوکێن کوردی دگەل یێن مللەتا.

### چیڤانوك خوارفە چیە؟

وەسا دیارە، گەر بنێرینە ژین وژیارا مرۆڤی هەر ژ پەیدابونا وی و هەتا نهو ژی هاڤلیەکا موکم هەیە دگەل جانەوەری و فرندەی پترتر ژ ئالیێت دی ژیانێ، چونکە مرۆڤی بوێ سادەیێ پێدڤیێ خوەرێ رۆژێ بو، لەوا هەردەم ب راڤ ونێچیرێ ڤە مژول بویان گرێدای بی.. سەروبەرێت ڤان فرندا لبا وی بونە چیروك وچیڤانوك ومامك وستران، یان ببونە باوەرێن ئۆلی.. لەوا ئەڤ توخمە جانەوەرە هاتە ڤەگرتن درەوشەنبیریا خویا سادەدا.. پشتی هنگێ بەرێ مرۆڤی دکەفتە توخمێت دی ل ژیانێ وپویتە ب بەفروبارانێ، باوبرویسی ودەریاوروبارا، وئەسمانێ پڕ ستێرو هەیڤ وتاڤێ دکت، هەروەسا داروبار، وهەمی رەخێت ڤێ ژینێ بون ئالاڤێ پویتە پێ کرنێ دژیانا خوەدا.

چیڤانوك، ئەو کورتە چیروکن یێن پڕ ئامۆژگاری، جانەوەر تێدا خویا دبن ل وێنەیا مرۆڤان ودئاخڤن، کریارا دکەن وەکی مرۆڤی.. هەر چەند رەوشتێت خوێێن جانەوەری دپارێزن چیڤانوك باوەری ب ئێك فەلسەفە هەیە فەلسەفا بارێ سەخت وگرانێ تێدا.(١)

هەر وەسا چیڤانوك کورتەو د هزرا مرۆڤی دا دمینت لەوا دەم بودەم مۆرا خوە ناگهورت ب تایبەتی مۆرا نەتەوەیی و ئایینی. چەوا فرندە د چیڤانوکێن هندیدا دبنە خوداوەند یان ب خوداوەنداڤە گرێدابن.. چونکە لبا وانە هەر فرندەکی خوداوەندەك بو. هەر وەسا لنك مللەتێ کورد ژی ئەڤ فرندەیە گرێدابن ب چەند پێغەمبەرەکا ڤە مینا نوحی یان سلێمان پێغەمبەری، یان هاڤلی دگەل عمری و علي و محمد پێغەمبەری ڤە هەبن.

لڤێرە خویا دبت هاڤلی یا چیڤانوکا کوردی ب ئایینێ موسلمانیەتیێ ڤە.. لێ بەری ڤی ئایینی وەکو گەلەك چیڤانوکێن بیانیا دگەرێن بو مێژوەکا کەڤنتر. بو دەمێ بوذی یاو زەردەشتیا.. یان بو بنەجهێ ژێدەرێت ڤان چیڤانوکا ل هندێ «ئەڤە لدوی بیروباوەرێن جوت برا «گریمی» دوزانایێت مەزنن وخودان خواندنگەهن د ئەدەبێ فولکلورێ جیهانیدا و ب تایبەتی لبابەت چیڤانوکا.

یان دگەرێن بو ئاینێت کەڤنتر ژ بوذیا چاخی زانا «بنفي» دهێن و هزروبیرێت گریمی لا ددەت وژێ دبت وسەروکانیێت چیڤانوکێ ل جیهانێ دگەرینیت بو باوەرێت کەڤنتر مینا [طەوطەمی و فیتیشی و دینامیکی و سروشتی].. ئەڤ ئۆلێت نەئاسمانی بەری بوذییەتێ هەبون و هێشتا نمونێت باوەرێت ڤان ئۆلا ماینە دڤی چەرخیدا، دەما دبینین ژ بو نمونە «شوفێرەك وێنەیەك شێری ل پارچە پەرۆکەکی ڤەدیفە دنێڤ ترومبێلا

خوه دهـهلگـريت، باوهري ب هنـدێيه كو بهرێ خوشيێ دێ بينت ئانكو شێر نيشانێ خوشيێيه دباوهريێن فيتيشي‌دا».
**حيكايه‌تێن جانه‌وه‌راو چيڤانوك:**

---

لڤيره، دبينم كو بابـهت تێكه‌ل نه‌بيت، ئانكو حيكايه‌تا جانه‌وه‌را ژ يێن چيڤانوكي و داستانا جانه‌وه‌را ژێك جودا بكه‌ين ژ چه‌ند ئاله‌كاڤه:

د هزرو بيـرێن زانـاييت فولكلوری كو حيكـايـه‌تێن جانه‌وه‌را كه‌ڤنتره ژ خورافـه‌ي و ئه‌و حيكـايه‌ته دهاتينه ڤه‌هاندن ژلايێ كه‌سانڤه يان دجڤاكه‌ك ره‌وشـه‌نبيـرُدا هاتينـه سازكـرن. حيكـايـه‌ت تنێ به‌حسێ فيـل و فه‌نـديا جانـه‌وه‌را دكـه‌ن به ئاوايـه‌ك ترانـه‌ڤـه. كێم شيـره‌ت و ئامـوژگـارييه و دجڤـاكـه‌ك ره‌وشنبيردا هاتينه سازكرن، لێ دەم و چاخ بسه‌ردا دهێتن دبنه چيڤـانـوك و مۆرا كه‌سی لێ نامينت و ئه‌و جانـه‌وه‌ر دهێنـه گرێدان ب بيرو باوه‌رێن ئاييني‌ڤه. هه‌ر وه‌سا دبينين چيڤانوك مه‌به‌سته‌كا سنجي دگريت، ذكـورتن و بدومـاهي نـه. [1] به‌لگـه ژی ئه‌وه بوذيـه‌ت و مۆسلمـانـه‌تي و ڤه‌لەييني ڤێ چه‌ندێ دچه‌سپينن دەما گرێددەن چ ب خوداوه‌نديت بوذيڤه يان خه‌فس بارينـا ل فرنـدا دئـاييـنێ موسلمان و فه‌له‌ياندا. نموونه ژ بو ڤێ چه‌ندێ، دبێژن وه‌شا دياره كو سه‌رهاتيێن فرندا گرێدانه‌كا هه‌ی ب كارو بارێن ئاييني‌ڤه. بو ڤێ باوه‌ريێ دبێژن فرنده نێزيكتره ژ هه‌ر جانه‌وه‌ره‌كێ دی سه‌ر ئه‌ردی بو ئه‌سماني و بلنداهيێ. [3] وه‌لێ دبينين، دنڤێژين كه‌ڤندا بازو سيمـه‌رخ فرنـدێت گۆر ـ گۆرێنه و گرێدانه ب مه‌زنترين خوداوه‌ندێن كه‌ڤنـارێت دەڤـه‌را [دەريـا سپی]. به‌لكـو زيـوس ئه‌و بخو باز بيت دڤان باوه‌ريادا و بئاوايێ فرنده‌یڤه دهێتن.

ئه‌ڤ فرنـده‌يـه دگـه‌ل باوه‌ريێت گه‌له‌ك ملله‌تان دهێتن و خه‌فس بارين ژی ئه‌نجـامێ وی فرنـده‌يه. چونكه وه‌كه دبێژن: ديتنا هه‌ر فرنده‌يه‌كێ ئه‌نجامه‌كا كۆر هه‌يه ـ يان مروڤ رويدانه‌كێ ژێ دبينيت. ئه‌ڤجا دبينين هنده جارا دوماهيێ كۆره يان دخوشيا مروڤي‌دايه.

بو ڤێ چه‌نده‌ی [له‌گله‌گه] ل ئه‌كوپليا هێلينێت خو دهێلن بەرێ هۆزا ـ ئێلا ـ (هۆن) ب سه‌ر باژێری‌دا بگرت و بسـوژت. [4]

يان دەمـا له‌گله‌گـه هێلينێت خوه دهێلن لســه‌ر بانێت مالا ـ هزرا خه‌لكی ئه‌وه يان به‌لگه‌يه‌كه ژ بو سوتنا خانی. [5]

يان (قـر) دەمـا كچه‌كا بچوك ئاگه‌هدار دكه‌ت چيڤانوكه‌كا ئايزله‌ندی‌دا و ژ كاره‌ساته‌كا نێزيك روی بدت. [6]

يان ره‌ڤێت قرا لبا هنده‌ك كوردان دەما دهێن نيشانێ به‌فر كه‌تنه‌كا زۆره. [7]

يان ژ بو مزگينيێ؛ كورد دبێژن، دەما ره‌ڤێت قرا دهێن ب قغ قغا وانڤه:

«قرێ خێر بيت، سه‌رێ نكلێ ته ب زێر بيت، هه‌كه خێره هرڤه وه‌ره، هه‌كه شه‌ره وێڤه هه‌ره». [8]

ـ بنيـاتێ چيڤـانوكێ كه‌ڤن و نوی خر دكه‌ت، ئانكو مێژويه‌كا ب دروست ل چوده‌ڤـادا نه‌هـاتيــه كوبيــژ ين، ل فلان ده‌مێ ده‌ست پێ كــريــه‌و به‌لاڤبويه. تنێ هه‌تا نهو ژی بيرو باوه‌رن ژلايێ چه‌ند زانايه‌كێن فولكلوری‌ڤه.

ژلايـه‌كێ دی، دبينين چيڤـانـوكێ گرێـدانـه‌كـا هه‌ی ب سحـرێ‌ڤـه نه‌خاسمه ئه‌وا پر به‌لاڤ ل ئه‌وروپا، تنێ جوداهی دلێكدان و گوتنێ دايه. هه‌كه روخسـارو ناڤه‌رۆك نێزيك ئێكن، دئێك مه‌به‌ست دانن.

چيڤانوك؛ گرێدايه ب گيانی ڤه (روح). چونكه هه‌ر ژمێژڤه هزره‌كا كويـر دهێتن كو كه‌ڤنتـرين وێنێت ئاييني لبـا مروڤی ئه‌و «بـاوه‌ر پێ هێنـانا گيـانی‌يـه». هزرا مروڤی ئه‌وه گيان دنێڤ هناڤێت مروڤی دايه و گرێدايه ل دانێ رۆژێ ـ لێ ده‌مـا دبيتـه شه‌ڤ ئه‌ڤ گيانه ئازا دبيت و ده‌ردكه‌ڤيت. ئه‌ڤ گيـانـه دچيڤانوكادا خويا دبيت دوينێ مشك و مارو فرنده‌كی‌دا. لێ هنـده‌ك وێنێت دی دگـرن. ژ هه‌مێ باوه‌را مكـومتـر ئه‌وه كو گيان دڤرتێ دوينێ فرنده‌كی‌دا چونكه دبێژن گيان سڤكه و دشێت بفريت دده‌مێ خه‌ونێدا. [9]

دچيڤـانـوكـا [مـاخاندل بوم]دا گيانێ برايێ بچوك ـ پێ كوشتی ـ دبته فرنده و ده‌ردكه‌ڤيتن و لاڤژا ب وێ زۆرداری‌يا ڤێ كه‌تی دبێژيت.

يان مه‌ليكا كوشتی دوينێ وه‌رده‌كه‌كێ‌دا ژ ئاڤێ ده‌ردكه‌ڤيت ڤێجا ئه‌ڤ گيانه ب فرنده‌ی‌ڤه گرێدايه چ ڤر بيت يان وه‌رده‌ك يان قاز.

هه‌ر وه‌سا دێ بێژ ين چه‌وا فرنده هێكێت زێری دكه‌تن؟ ئه‌ڤه پر به‌لاڤه دچيڤـانـوكادا، له‌وا ئه‌ڤ باوه‌ری‌يه هه‌نه ده‌ر راستا فرندا چاخێ بين و ژ بو ڤه‌كـولينـه‌كا مللی و چه‌ند پرسيلره‌كا به‌رهه‌ڤكه‌ين و به‌رسڤێ دنێڤ خه‌لكێ كورددا وه‌ربگرين، دێ چه‌ند نموونه‌يه‌كا ژڤان پرسيـارا پێش چاڤكه‌م:

١ ـ بۆچی ڤر ره‌شه؟
٢ ـ بۆچی په‌رێت فرندا دجوانن و ژكيڤه هينانه؟
٣ ـ له‌گله‌گه بۆچی نكل سۆره؟

- بۆچی كوتر ب زێماره ده‌ما دخوينيت؟
- بۆچی بلبل خوش دخوينيت؟
- بۆچی بنكۆرك /تۆك /ژ روناهيێ دور دكه‌ڤيت؟ [1]
- بۆچی هه‌ڤالێ ڤرێ نكل ب گوی‌يه؟ [1]
- ئه‌رێ فرنـدا زمـانـه‌ك تايـه‌تی بخوڤه هه‌نه كو ب ئێك و دو بگه‌هن: مروڤ هه‌نه لوان تێ بگه‌هن؟
- باوه‌ری هه‌يــه كو فرنــده هنـده‌ك په‌يڤـا د ئاخڤن ده‌مـا دكـه‌نـه گازی و دخوينن؟ مروڤ چه‌وا شروڤه‌دكه‌ت؟

كوتر ـ گاپل ـ ته‌ته‌دی ـ تۆك ـ كوكوختی ـ كه‌و... هه‌تاد.

- بۆچی زيچا بالاڤی‌يا كوريا خوه ده‌هژ ينيت؟
- ئه‌رێ راسته ده‌ما كومێت مێش و زلكێتا دهێن دبێژن دێ به‌فر كه‌ڤيت؟
- راسته بنكۆرك كچ بو و نه‌گوهداری ده‌يكا خو بو؟ خه‌فس لێ هاته.

کرن؟

هۆسـا پرسیـار دبن و بیرو باوەرێت مللەتێن سادە بەرسڤێ ددن و چەند چیڤانۆکا ل دورا دهینن و مینا ڤان نمونا:

- چونکـە سیمـەرخێ کیسـەلە دگەل خوو هلگرتبو فراند، لێ کەت - ژ بەر چی؟ چونکە سیمەرخێ نەد هێلا کیسەلە باخڤت - لێ ئاخڤت و کەت. . . .

- ڤرا رەش خودێ خەفس لێ کر ژ بەر پربێژیێ. .

- لەگلەگەی ئاگر ژ ئەسمانی هەلگرتبو هەتا نکل لێ سوتی. .

- یان دحیکایەتا گلگامێشی دا فرندەکێ بێ چەنگە گازی دکر کا چەنگێت من؟ ئەڤ فرندە بەری هنگێ شڤان بو. . بڤێ ئاوایی وپترتر بەرسڤ دبن و چیڤـانـۆك ژ ێـرا دهێنـە گوتن. . هەر مللەتەك ب رەنگەکی وسەلیقەکێ. دیسـان لدوی ڤان پرسیـاراو گەنگـەشـەیـا دمەنهەجەکی زانستی دا دشێین باوەرێت هەر مللەتـەکی خویـا بکین و تەڤنێت ئالوزیێن دیروکا هاتنا ڤان چیڤـانـۆکـا گرێکـا لێ ڤەکەین. . هەر چەند هەتا نهوراستیا چەرخێ ڤان چیڤانۆکا نەخویایە لبا زانایێت فولکلوری، ئەڤجا مللەتێ کورد نەیێ کێم باوەرە دڤی بابـەتی دە. . لڤێـرە پێـدڤی کۆمـەلـەك مەزنن ژڤان بیروباوەراو چیڤـانـۆکـا. . هەتـا ڤەکـولینێت موکمتـر ژ بـو بـسپـورا جهێت خوە بگرن دئەدەبێ فولکلورێ مللەتێ کوردا.

● پشکا سیێ ژڤی بابەتی چەند چیڤانوکێن کوردیو بیانییانن ل بابەتێ فرندەیدا:

- ڤر - ڤەل -: کەڤنترین سەرهاتیو پر بەلاڤ ژ بو ڤرێ ئەوە، ؛ ل دەمەکی، ڤر سپی بـو، لێ ؛ خەفس لێ باریورەش بوژ بـەر بەلـەنگـازیـیا وی، دبێـژ ن ئەوسزایـەك بوژ نوحی دەمـا تۆفـان رابیو هنـارتیـە جەم ڤرێ کو بهیت، لێ نەهـات، رێکـا خوگرت وچووکەتـە سەر پیسـاتیـاوژ ێ دخوار. . . لەوا خەفس لێ باری ژ بو گهورینا پەرێت وی. [١١]

دکـەلـەپـورێ میـسـرێدا، دەمـا ڤر ڤەگـەریـایە جەم نوحی دحیکایەتا (تـوفـانی)دا وگوتیێ کومن زەڤی نەدیت، نوح لێ تورە بوو فەرمـان دایێ بەرێت خوە رەش بکەت، دبێژ ن نوح تریێ سپی ددەستادا بوو دەما تورە بوی تری ددەستادا رەش بو. .

ژ بـو پشتەڤانیا ڤێ چەندێ دکەلەپورێ فەلانیدا دەما دبێژ ن: زاروێ پیروز - خەفس ل ڤرێ کر ژ بەر شێلی کرنا وی بو وێ ئاڤا دا ژێ ڤەخوت. . [١٢]

● هەر وەسـا کورد ژ ێ دبێـژ ن [ئـانکـو دەڤـەرەك] هەکە رەڤێت ڤرا بسەر گوندیدا گرت دەمێ بهارێ دبێژ ن ئەڤە نیشانا بەفر کەتنێ یە. . [١٣]

ئەڤ باوەرییە لبا چەند مللەتەکێن ئەوروپی لشونا بەفرێ (باران) دبارت.

- بوچێ کورد دبێژ ن «هەڤالێ ڤرێ نکل ب گوییە؛ ئەڤ چیڤانوکە لسەر ڤرێ هاتیـە وەکـو کورد دبێـژ ن: حاکمـەك هەبی، نەسـاخ بوژ بەر نەڤینا کچـەکـێ. . وێ شەرت دابـیـنـە بەر حاکـمـی. . لێ نەشیـابـی جەلبکەت. . . . حاکمی وەزیر کۆمکرن و کا شەرتێ کچکێ «خوینا پی شمقاری»یە دێ چەوا هینین. . نەخاسمە بەفرە، زڤستانە، فرندە نەشێن دادن چوجهـا. . گوتی سەرێ گرەکی کەلـەخـا رێزکەن وسەرژ ێکەن. . کەلـەخێ مەزن بو شمقـاریـیـە. . بلا مروڤەك بچیتە ناڤ. . هۆسا بریار دان. . شمقـار برسی بی ژ بـەر بەفروبارانێ وچوجهـ نەددیت خوارن لێ هەبت. . ئینـا شمقـاری هدهدە هنارتە دەرڤە ژ ێرا ل جهەکی خوارن لێ هەبیت. . هدهـدە وەزیـرێ شمقـاریە. . هدهدە گەریا - جهەك دیت هەر ل دورا زڤـری، لێ پێ زانی کو ئەڤ کەلـەخێن رێـزکـری تەڤنەو تەپکـە. . ئینـا گوتی دێ بێـژمـە شمقـاری من چ جهـ نەدیتن. . دەمـا ڤەگـەریـای وگوتییـە شمقـاری. . عنریوتێك چو. . هدهدە ژ وەزیریێ ئێخست. . گازی کرە ڤرێ. . گوتێ بـیـە وەزیـرو هەرە بنێـرە جهـەکێ خوارن لێ هەبیت. . ڤرێ ژ ێ ڤەشقەلانك دگەل خوە بر کو (شاهدە). . گەریان - گەریان ئەوجهـ دیتن وداڤان، ڤرێ تێر خوارو هندەك دگەل خوە ئینا. . گوتە شمقاری جهەکی بێ ڤام خوش وپر خوارن هەیە. .

عەدەتێ شمقـاریـیـە ب تنێ خوارنێ دخـوت ودەمـا چوینـە سەر کەلـەخـا، شمقـار ژ ێ کەتە سەر کەلەخێ بتنێ ومەزن لێ ئێکسـەر مروڤ ژ ێ دەرکەت و شمقار گرتی. . دەما هینای جەم حاکمی دیتی روندکێن ژ چاڤێن شمقـاری تێن. . حاکمی گوتـە وەزیـرێ خوە. . بوچی شمقـار دگـریت؟ وەزیـری گوت: ڤورسـان ئەوژ ێ وەك تە مەلکـە. . ما چێ دبت مەلـك بێـتـە کوشـتن. حاکمی گوت نەء. . تنێ بچـەك خوینێ ژ بێ شمقـاری دەربینن وبەر دەن. . ئینـا شمقـاری گوت. . [هەچی هەڤالێ ڤرێ بت نکل ب گوییە]. . هەردودەرێ خستن. . ڤر کەتەسەر پیسیێ و کەلەخا. . لەوا بویە چیڤانۆك کو جهێ ڤرێ هەر کەلەخ وپیساتیێ یە. [١٤]

● دکەلەپورێ دانیمارکیدا ڤرو خویا بونا وێ نیشانێ مرنا شەهنەگرێ دیریێ یە. [١٥]

● دیاوەریەك دیدا دبێژ ن ڤر چاڤێت کوشتیا دڤوقلینت.

د باوەرێیت مروڤێت [وێلز] دا کو مروڤێ کورە لبـا وان ئەوێن دلـوڤانیێ ب ڤرێ دبن، دێ شێن جارەکا دی ببینەڤە یان روناهی دێ هێتە چاڤێت وان. [١٦]

● دچیڤـانـوکێن چیکی دا دبێـژ ن خوارنـا سێ دلێت ڤرا دێ ژ کوشتنێ دویـربت. . وخوارنـا دلێت ڤرا دێ خودان چاڤ رونتـر بیت. . مینا ڤرێ دێ چاڤ تیژ بیت. [١٧]

● د کەلـەپـورێ عەرەبیدا ژ ێ ئەڤ باوەریـە هەنە: دبێژ ن: هەکە نکلێ ڤرێ لـستوێ مروڤیڤە بکەن وەکو رستکێ. . دێ ژ چاڤا دویر کەڤیت. یان خوارنا تحێلا - خال - خالك - ا ڤرێ چاڤ پێ رون دبت. زراڤا ڤرێ

سحرا ژ مروڤی بەتال دکت.

قەزوینی دبێژت: ڤرلسەر جانەوەرێت مەزن کوم دبت مینا حیشتری، هەسپ و گامێشا و هەتا مروڤا ژی، ئانکو ژێ ئەوە چاڤێن وانە ب قوقلینت.

● دبێژن ڤرب چاڤەکییە.. دیتنا وی ژی دژ وارە. ژ بوڤی چەندێ باوەرییا خەلکێ ئەوە: دبێژن ئاسنگەر چاڤەکی دگریت یان دڤەشێریت ب پێچکیدا ژ چریسکا بپارێزت.. ئەڤەژی ژڤی باوەریا ڤرێ هاتییە. عەرەب کوریێ [شؤم] ژ ڤرێ دبینن لەوا ئەڤ پەیڤانە ژ ناڤێ وی وەرگرتنە:

[الغربة ـ الاغتراب ـ الغريب غراب البين][19]

● ڤر دهندە وینەیادە دیتن فرندێ رەشەبایییە، بەری رەشەبا بێتن ڤر نیشانێ ددەت.. ئانکو پەیامێ رەشەبایییە.

هەروەسا تێتن وەکو فرندێ تاڤێ، پێغەمبەر، پاشەرۆژانە.

دلێکدانا ڤان وینەیادا.. دبینین هەر فرندێ مرنییە لێ گرێدانا وی ب بارۆڤەو رەشەباو باراناڤە.. ئەڤە دزڤریتن ژ بو چیروکا بونێ و توفانێ.

**چەك چەكیلە:**

بوچی ب شەڤ دەردکەڤیت.. دبێژن ئەوژی ژ فەرمانا سلێمان پێغەمبەری بولسەر فرندا کو پەرێت خو بوەرینن دا دوشەکەکی بو بەلقیسێ ژێ چێکەن.. ئینا چەوا جاب گەهشتییە تەیرا.. تێکسەر چەك چەكیلەی خو وەراند.. مەلکێ تەیرا شکایەت لبا سلێمان پێغەمبەری کر لێ هەر فەرمان دا.. ئینا چەك چەكیلەی گوتە سلێمان پێغەمبەری.. ئەز مامە رویس نەشێم ب روژێ دەرکەڤم ژ بەر فرندا.. ئەوی ژی فەرمان دا کو بشەڤێ دەرکەڤیت.. لەوا هەتا نها ژی هەر بشەڤ خویادبت..[20]

ـ هەروەسا دبێژن چەك چەكیلە شەڤ کویرهەیە ئانکو ب روژێ نابینیت وەکی بنکورکێ.

● د باوەرێت چیروکێت ئنگلیزیدا هەر چەند کەسێت وێ دارو بارو جانەوەرن، ئانکولهزرا (کراب)ی دا کێم خورانە هەبن دارو جانەوەر ڤێکرا بین و بلڤن و ڤێکرا باخڤن دبێژن:

جارەکی ـ لروژەکی فرندەکا دەریایی وپر کەلواش بازرگانی ب هریێ دکر، دگەل دوریێ و چەکچەکیلەی، هەرسێکا پاپورەك کرێ کرن و ب هرییی بارکرن.. لێ پاپور پەلخی وکومبەستا وان رویت بووژ بەر هندێ دبێژن چەك چەكیلە ڤەشارتییە ژ پێش چاڤا هەتا نیڤا شەڤێ ژ بەر دەینا. ئو فرندا دەریایی نوقی ئاڤێ دبت ول پاپورا پەلخی دگەریت و دارا دوریێ بەرهنگاری کەرێت پەزا دبیت دا هریێ ژ وان بکێشیت دەما دبەرا دبورن بەلکو بشێت بچەك ژ یا چوی بزڤرینیتەڤە.[21]

**حاجی رەشك:**

ئەڤ فرندەیە وەك باوەری لبا کوردان دبێژن:: سەیدە ـ لەواژێ دەم زارو یان جحێل دڤیان ڤی فرندەی بکوژن لسەر دارتێلا یان سیڤاندا... نەد هاتە کوشتن.. تەم دشێن بێژین ژی بارەك سایکولوژییە.. مروڤی گونەهێ ژێ دبنیت و نەڤێت بەرێ قوسکێ خوە لێ بدەت.

بوچی دبێژنێ حاجی رەشك لنك مللەتێ کورد:

ـ چونکە یەکەم ڤرندە بو گەهشتیە مەکەهێ بەرسڤ دایە محمد پێغەمبەری دەما عمر کەتیە تەنگاڤیاو لەشکرێ ڤرالی وی تەنگاڤ دکن دەما چوتە جەم وی دا بورێ رەش ژ پێغەمبەریرا بوبینت گوتوژی وەسا دیار دکەت بوچی کو دیڤێ وی دوتایە چونکە دوژمنی بەردانێ ب تیرا و تیرەك ب دیڤێ وی کەت و بو دوتا.. بەرێ هنگێ ئەو سەرێ خوە دناڤ خوینێدا ڤەدابو هەتا ستویی.. دەما پێغەمبەری دیتی بوێ خوینی زنی کو رویدانەك یابوی وئیمام تەنگاڤە.. لەوا حاجی رەشك بڤی ناڤ لێ هاتیە کرن و ئەو بخوژی ستو سورە..

**بم ـ بنکورك: (توك)**

براستی ئەڤ فرندەیە ژی کورد گەلەك کوریێ زێ دبینن، دەیباب حەز ناکن ڤی ڤرندەی بیننە مالێ دترسن کەسەك بمرت یان کارەساتەك بسەروان بهێت.

چاخێ چیڤانوك بێژیت: بنکورك کچا نانپێژەکێ بی، روژەکی خوداوەندیدا ژ ورا نانپێژیڤە، هەڤیردکرن، ژ وانرا خواست نانەك دا بخوتن، خودانێ نانی گرکەك دایێ، کچا وی نفرین لبابی کرن چونکە گرك بچەك مەستربو، لێ قسمەتێ وی بەلەنگازی بو، دایکێ گرك ژێ کێم کر، لێ گرکا هەڤیری دبێژن هەر بخویڤ بوو مەزن بوژ کەرەما خودێ.. لڤێرە کچا نانپێژی کرە هەوار....!

هیو... هیو... هیو

ئەوبو دەنگێ بنکورکی، وەسا خودای ڤیا ژ بو سزایێ وێ و چریکیا وێ، بکەتە بنکورك.. ئانکو خەفس لێ کر.

ـ کراپ ـ دبێژیت ئەڤ کارەساتە نە ئالوزە، چونکە وەسا دیارە ئەوێ ئەڤ چیڤانوکە دانای نە ئاکنجییەو بەلەنگازو خازوك و گەروکە.. بنکورك نە کچا نانپێژییە وەکو نمونەکا ئنگلیزی کو کچك ژ بنیادەك ناندەهـ بی مینا ڤێ سترانێ:

جارەکی ئەز دوتا پاشای بیم
دکوشا خانمەکێدا رونشتبیم
لێ ئەڤرو، ل شەڤا چەرخەچیمە
ئازا کریێ لنێڤ دارێت بیهوکامە
هو هو
ئو پێت من دتەزینە
دلوڤانیێ دخوازم
منرا دبینن ژارو پیرەکا بێ گونەهـ

جارەکێ ئەز دۆتا پاشای بیم
دکوشا بابێ دا رونشتبیم
لێ ئەڤرو بەلەنگازو ژارم
دنێڤ دارەکا خلولەدا ڤەشارتیمە . .

ـ گەلەك جارا ژنا نانپێژ ی . . یان کچا وی دبنە بنکورك لێ دبنە فرندێ دارستانا ئەوا دژ یتن لسەر کرمێت دارا ئەگەرێ ڤێ ژ ی ئەوە وەکو د . هاریس دبێژ یت :

فرندێ دارستانا ل دەمێت دور ـ دور باران چێکەرو فرندێ گور ـ گوری بی .

چونکە نەهێلانا باریا بارانێ ئانکویا وی ئەوە نەهێشتنا چێکرنا نانی یە . . ژ بو ڤێ چەندێ چیڤانوکا کچا نانپێژ ی ببتە فرندەو چیڤانوك پەیدابیت .

● گاپل : ئەڤ فرندەیە دبێژ ن ژ کوترێ مەسترە و دەما دخوینت ئەڤ رستەیە یان ئاخفتنە ژ ێ دەردکەڤیت :

«کەکو تو لێکە . . تو لێکە»

چیڤانوکا وی ئەوە دبێژ ن دوبرا هەبون ڤێکرا چونە ئاشی ، بارین خو ڤەکرن و دانا سەر کوتەلا ئاشی . . بو ڤەکێشك لناڤبەرا وانا . . ئێکێ د گوت دێ لێکم . . یێ دی دگوت نەء ئەزدێ لێکم . . . هەروەسا هەتا ئێك ژ هەردوا یێ دی هاڤێتە دناڤ کوتەلا ئاشی دا و کوشتی . . دبێژ ن برایێ مای ژ ڤەهرا برایێ کوشتی هەر ژ وی روژ ێ خودێ خەفس لێکری هەر ب زیمارو گری یە و گازی دکەتن :

«کەکو تو لێکە ـ تو لێکە»

ڤێجا بە ئەزمانێ فرندەی وەك نێزیك ڤان پەیڤا یێ کورد شروڤەکری یە وەسا چیڤانوك ژ یرا دانایە .

دئەنجامێ ڤێ ڤەکولینێ دا چەند خالەکێن سەرەکی خو دهەڤێژنە پێش چاڤێن مەو گرنگیا هەر بابەتەکی فولکلوری چەوا ریزو گرانیا خوە دبینیتن دئەدەبێ مللەتاندا! . . لەوا ژ ی زانایێت جیهانی دڤی باری دا خەم و پویت پێ کرینەو بووە زانست و هەمی تەخێت ژ ین وژ یارا مللەتان تێدا خویا دکە . . کورد ژ ی ئێکە ژ وان مللەتێن پڕ دەولەمەند د کەلەپورێ خودا لەوا من ب پێدڤی دیت ئەڤ بابەتە یان تاکە ژ باخچێ فولکلورێ کوردیێ مەزن لدوی بچم و هەڤبەری فولکلورێ مللەتێن بیانی بکەم .

(فرندە ـ بالندە) دەورەکی مەزن دبینە د ئەدەبێ سەر زارێ خەلکێ کورد داو ئەدەبێ نڤیسی ژ ی . . لەوا دبینین (فرندە) وەك گرێدانەکا ب مروڤی ڤەوژ یارا کەڤنارو هەتا نهو . . ئەڤ گیاندارە وەکو سەدا تاك و تەخێت ڤێ ژ یانێ خودژ یانا مروڤی دا دبینن چ دسترانێ دە یان گوتن و مامکا یان د چیروك و چیڤانوکادا . . لڤێرە ژ ی من تنێ لایێ چیڤانوکا گرتیەو هاڤلیا فرندەی پێڤە . .

(فرندە) دگەلەك دەڤادا نیشانە ژ بوژ یانا مروڤی و گرێدانەکا ئێکسەر ب مروڤی ڤە هەیە . .

هەر وەسا (فرندە) وەك هەر تاکەك دی ژ فولکلوری ئەگەرەك مەزنە ژ بو زمانەك موکم بو ئەزمانێ ئەدیبی . . هەر پارچەك نوی ئەگەرێ هندە پەیڤێت نوی نە ژ بو وی ئەزمانی .

گەلەك جاران فولکلوری کارکریەو دەولەمەندکریە د هزرو بیرێت شورشڤانی دا چاخێ چەند تابلویێت پەیڤتنێ دبینین دکاریت (باجرتسکی و سورکوف و ئاسیفی)دا . . چونکە گەلەك جاران فرندە بو (نیشان)ژ بو مێرانیا مروڤی یان خوشی و رەشی یا ژ یانێ . .

چیڤانوکێن کوردی گەلەك جاران دبینین رویدانێت وانە نە دورن ژ چیڤانوکێن ئەوروپی و روژهەلاتی دا . . گەلەك جاران و پشتی موسلمانەتیێ هاڤلی ب رەوشت و ئولێ موسلمانەتیێ ڤە هەیە .

ژ ێدەرو دەهەمەنێت بابەتی :


(١) علم الفولكلور // الكسندر هگرتی کراپ . . . ل١٢٣
(٢) روشنبیری نوێ . . نزار محمد سعيد ل١١٦ سالا ١٩٨٧
(٣) الحكاية الخرافية // فردريش فون لاين //وەرگیرانا د . نبيلة ابراهيم ل٧٤، ٧٦، ٧٧
(٤) علم الفولكلور /کراپ /ل ٣٨٥
(٥) ژ ێدەرێ بەرێ
(٦) ژ ێدەرێ بەرێ
(٧) ژ زاردەڤێ پیرەمێرەکی ناڤێ وی (سليمان احمد) دوسکی یە دژ یێ (٥٠) سالی دایە .
(٨) ژ زار دەڤێ ژنەکا کورد ناڤێ وێ (میرانە) دژ یێ (٥٠) سالیێ دایە خەلکا گوندێ بامەرنێ یە . نەخویندەڤانە .
(٩) الحكاية الخرافية // فردريش فون لاين // د . نبيلة ابراهيم وەرگیرایە بو عەرەبی // ل٧٧
(١٠) الدراسة العلمية للمعتقدات الشعبية // د . محمد الجوهري .
(١١) گوتنێت پێشیا // محمود دێرشەوی // ل٢٩٧
(١٢) الفولكلور ماهو؟ فوزي الفتيل // ل١١٣
(١٣) ژ ێدەرێ بەرێ // ل١١٣
(١٤) ز زار دەڤێ پیرەمێرەکێ دوسکی ناڤێ وی (سليمان احمد)
(١٥) ژ زار دەڤێ حەسو محو حەمو هاجانی ، ژ یێ وی نێزیك سەد سالانە ، خەلکێ بیزهێ یە قەزا زاخو ، نهو ئاکنجیێ قەزا سێمێلێ یە ، هەر وەسا ژ بو ڤێ چیڤانوکێ پرسیار ژ (محمد حسن رێکانی) هاتە کرن ، ژ یێ وی نێزیك (٦٥) سالە ئاکنجیێ دهوکێ یە برادەر محمد ئوسمانا

ئاليكـاري‌يـا من كريه دكومكرنا ڤان چيڤانوكادا، ئه‌وژى روژنامه‌نڤيسه ل هاوكارى كاردكه‌تن . .

(١٦) الفولكلور ماهو؟ فوزي الفتيل ل١٠٢

(١٧) ژێده‌رێ به‌رێ

(١٨) ژێده‌رێ به‌رێ

(١٩) ژێده‌رێ به‌رێ// ل١٠٣

(٢٠) ژ زار ده‌ڤێ حه‌سو محو حه‌مو هاجانى

(٢١) علم الفلكلور// الكسندر هگرتى كراپ

(٢٢) علم الفلكلور// كراپ

(٢٣) ژ زار ده‌ڤێ مامـوٚستـا قسيم محمـد حسن// سه‌يـدايێ زمـانێ كوردى‌يه ل ئاموژگه‌ها ماموستايێت دهوكێ دژيێ (٤٣) سالى دايه، هوزانڤانه .

---

## ملخص البحث


احمد عبدالله زرو


# الكورد والطير في مضمون الخرافة والاساطير


يتضمن البحث تعريفا بالخرافة وآراء العلماء والمفكرين حولها ومن ثم دور الطير في معتقدات الشعوب ومقارنة بين عدد من الخرافات الكردية وخرافات مشابهة لدى بعض الشعوب.

وهـذا المـوضوع كغيره من مواضيع الفولكلور له اهمية بالغة بالنسبة لأدب الشعوب ولهذا فقد أهتم به الدارسـون واستفاد منه الكتاب ولاسيما انه يظهر المعارف العامة وبعض مناحي حياة الشعوب ومظاهرها .

وللطيور دور كبـير في الأدب الشفـاهي الكوردي وكذلك في الأدب المدون، ونجد علاقتها الوثيقة بالأنسـان وعيشه في الماضي والحاضر. وتظهر صورتها في تفكيره وتعبيره عن ذاته وعن بيئته، فنجد الصورة في الاغنية والأمثال والحكم والقصص والألغاز والأسـاطير. . . الخ . اختار الباحث جانباً واحدا وهو صورة الطيور وانعكاسها في الخرافة نظرا لان الطير في اغلب الاحيان يأتي رمـزاً للحياة ومـرتبط بالانسـان ارتبـاطا مبـاشرا. والفـولكلور الخـاص به مفيد للغـة الكردية ويغنيها بالمفردات الكثيرة. ولمـوضـوع الـطيور جوانب تمثيلية تدعـو الى الشجـاعة وتعرض افراح الانسـان واحزانه . ولدى مقارنة الخرافة الكردية بمثيلتها لدى الشعوب الاوربية والشعوب المجاورة نجد تقاربا بين مضامينها ومدلولاتها .

# زاروك

## ل جڤاتامەدا



بەرهەڤكرنا: عیدو بابە شیخ

**ڕینینا جڤاتێ بو زاروكا:**

زاروك خەمل و خوشی‌یا ژیانێنە: مالا بێ زاروك وەك دارەكا بێ بەرە دیسان هەبون و مانا زاروكا ژپاش دای‌و بابڤە رەنگەكێ نەمری‌ی‌یە هەروەها ڤێت ئەم ژبیرنەكەین كو بچووك ل پێ‌ڕینینا بەهرا بتر ژمللەتاو ژوان جڤاتامە دانەكا خودێ‌یەو داخوازەكا هەر مروڤەكی‌یە ژ ئەزدایێ ژور هەروەكی ژڤێ سەبەڤێ بو مە رون دبت:

**ئیلەهیوتە ئەم ختێ‌كرین**
**ژبەری روژا ئەم بمرین**
**تەب وەلەدەكێ نیر شاهی‌كرین**

هەلبەت خەلكێ مەژی وەكی بەهرا بتر ژ خەلكێ روژهەلاتێ حەژ ژكورا كری‌یە بتر ژكیژا چنكو دگوتن كیژ ژخلكێ‌رانە یان ژی‌وەكی دقەولێ شەقەسەری داهاتی:

**كیژ نەوارە**
**بابەلیسك نە بەهارە**
**قیرات نە دارە[2]**

دیسان ژلایێ خودان كرن و ڤەژینێڤە باوری‌یا مللەتا یا كوور ب خودێ وە ل وان دكر خەما رزقێ وان نەخون و دگوتن ئەوێ سەری ب دەت دێ‌نانێ وی‌ژی ل گەل ڤرێكەت هەروەكی ژڤان سەبەڤا ژقەولێ مووسا دیاردبت:

**مووسا دبێژت: ب وی كەم ئێكی خەفوورە**
**ئەز روحا خو ناكەم دەستوورە**
**كولفەتێ من هێشی هوورە**

* * *

**وەدبێژن جبرائیلێ ئەمینە**
**یا مووسا بنی عەمرینە**
**رزقێ كولفەتێ تە وێ ل خودێ ل تە نینە[3]**

ئەڤجـار زاروك دانـەكـا خودىٰنـە ژلايەكى‌ڤە و رزقىٰ وان ژ باوى‌يە چاوا خەلـك پى‌شـانـابن و هەمـوو تشتى ژ پاريزتن و ساغلەمى‌يا وانرا ناكەن.

ئەم ژى ل گور زانيناخو وان ريزوتەرزو حەدو سەتيد ناڤ خەلكى مەدا هەين هەر ژ بوونا زاروكى هەتا دەهـ دوانزدە سالا ژ خوندەڤانيد هيـژارا ديـارو ئاشكـەرا ـ كەين ئوميـدەوارين مە خزمـەتەك گەهاندبتە كەلەپوورى خو:

**نەبـوونـا زاروكـا:** هەلبـەت هەكـە دوو سى سالا ژنكا ژنو شوكرى بچـووك نەبـا دى مالاوان بربـانـا نك كوچـەكـەكى يان فەقرايەكى دا ئاخـەك بورا نيتبـا هەلبـەت ئاخـا خاسەكى ئانكو بابچاكەكى ئيزدى‌يا ئەوان ژى ئاخ ژبەر وى خاسى دبرن ئەڤجار گەر خودىٰ حزكربا و كورەك دابايى ئەو كورا دكرنە خووكىٰ وى خاسى‌و هەر سال فتويى مجيـورى خاسى ل گەل سەربـرەكىٰ ددانىٰ يان هەكـە زاروكيد ئيكى نەمابانە دچون خو دهاڤيتنە لالشىٰ‌و هندەكا كورى ئيكىٰ‌دكرنە خووك ژيـرا ئەڤجـار گەز هاتبـاو خودىٰ كربـا خيـرو بچووك ژيرامابا يان دڤيا چەنـد سالا خزمـەتـا لالشىٰ كربـا يان ژى خنيكەك دستويىٰ زاروكى دكرن و فتويەكى بەها ددانانا سەردەريىٰ شيخادى ل گەل سەربرەكى‌و كورك ئازادكرن و دبو مال بو داى‌و بابىٰ خو و هندەك جاراژى نەبوونا زاروكا دبو بناسىٰ بەردانا ژنكىٰ يان ئينانا ژنەكادى و جار هەبو هەتا نەبوونا كورا دبو ئەگەر بوئينانا ژنەكا دى.

**بوونا زاروكى:** چاخىٰ ژنك دكەفتە بەر ژانا بچووك بوونىٰ دچونەپىٰ ژنـەكـا زانـا ب ڤى‌كارى دگوتنىٰ [داپيرك] ڤيجار داپيرك ب كارىٰ خو رادبـو و گاڤـا بچـووك دەردكـەفت نافكـا وى دبـرى‌و دپيچـاو لسـەر قونتـاخكى دادنـان و وەريـەك ل هاويـر ژنكىٰ‌و پيچـولكىٰ دريژدكرن و گيـنـەكى ئاسنى ل دەرىٰ خانى دادنـان و دوو دەزيـك ئيـك ژمـالا شيخيد بابادين كو دگوتنىٰ: مالا مەزن و ئيك ژمالا شيخەكى ئامادينا و ل هنـدەك دەڤـەرا كەسـەك ژ مالـەكا شيخيد ئامادينا هەفت شەڤا لبەر پيچولكىٰ‌را دنڤست و وەكى مە ژ شيخ خەتوبىٰ بابىٰ شيخ [٤] بهيستى ئيـك ژ ڤان شيخـا ئانكـو ژ شيخيـد ئامـادينـا بەرىٰ لبـەر قونتـاخكـا بچـووكيـد مالا ميـرارا دنڤست و وان ژى گايـەك يان بەرانـەك ژيـرا دكرنەفتو هەروەها ئەدەب تشتەك ژمالا خودىٰ بچووك دايىٰ دەركەفتبا هەتا ژهەفتى‌رانەبا و چى‌نەدبو ژنەكا پ چلى ئانكو هيشتا چل روژ سەر بچووكبوونيرا نەبورى چوبا نك ژنكا ژنو بچووك بوى يان هەتا دەنگىٰ وىٰ چوبـايىٰ بەلكـو هەر گيـاندارەكى ساڤاهەى چل روژى‌يى پ چلى‌يە، ديساڤيت ژبيرنەكەين و بيژين گاڤا بچووك ژنو دبو شير دمەمكىٰ دايكاويدا نەدبو ئەڤجار ژنەك دئينان و شيرددايى‌و جريدبەرىٰ ژ وىٰ شيردانىٰ دگوتنى (فرچك)و بەهرا بتر جارا دايكا كوركەكى بو فرچككرنا كوركا دئينان چنكو هەكە ئيك ژزاروكا كيژبا ژهنكى وەرا ئەو كيـژا ژوى كوريـرا گونـەهـ دبـو. چاخىٰ مروڤەكى بو جارا ئيكى قونتـاخـك ديتبـا دى گوتبـا: زيـدەيـ ڤى مالى پيروزبيت، پاشى دىٰ پرسيبا: گەلو هوون شيرن ئان رووڤينا يان هنەكە دگوتن: پتكە يان پسيكە ئانكو زيدەياوە كورا يان كچا ئەڤجار هەكە كورب دى گەلەك دلشاد با و گوتبا ل من نەگرن ڤى جارىٰ من نەزانى خەلاتى‌وە سەر من دكەڤت و هەكە بەرسڤ كچ با دىٰ ل ناڤ دلىٰ وان دابا و گوتبا: جوامير گيژ و كور ژبا خودى‌يە ئەوىٰ كيژابدەت دكارت كوراژى بدەت هەرچـەنـد نوكـە خەلـك دچنـە پيـروزى‌يـا كورو كچـا بى ڤڤـرتن و جودايى. ديسايە فەرە بيژين سپيدەيا بچووكبوونىٰ نان و شيرانى ددانە ژنـكـىٰ نەمـازە نان و دوشـاڤ هەروا س ژى ڤىٰ دومـيـكى گبـس دەست نەدكەفت كيركەك لبن سەرىٰ زاروكى دكرن و هندەك سوژن و دانكىٰ گورگى باليفكى‌ڤە ددروتن چنكو دگوتن جن ژ ئاسنى دترس و دانكىٰ گورگى ژ بەر جاڤ ليدانىٰ بو و ئەڤە ل ناڤ زوربەى كورد هەبو. هەروەها ل روژا هەفتى سەربرەك دكوشتن و زادەك دكرن و ئەويد دوروبەرىٰ خو خرڤەدكرن.

**موركـرن:** ل ناڤ مللەتيـد عيـراقى‌يـد كەڤنـاردا مروڤيـد نيـريـد نە موركـرى ژ پيـروزيىٰ درووتبـون ئانكـو موركـرن لوقـەتـەكى كەڤنـە د عيراقيدا لەوا ل ناڤ مللەتيدا مەدا مايە مينا برايىد مەيد فەلە و هەر ديسانك مەژى مايە وەلىٰ موركرن ل بامە دئاڤاكانى‌يا سپى‌دا ل گەليى لالشىٰ تيتەكرن چنكو ڤىٰ هندى بيژى بەهايى خو ل بامە ى‌هەى و دبيـژن دەمىٰ ئاڤـارەش (تـوفـان) رابوى ئاڤا كانى‌يا سپى مينا لوليەكا پەمبويى ل ناڤدا سپى‌دكر لەوا دبيژنىٰ كانى‌يا سپى هەر ديسا هەتا نهو دوعـايـەك ل دەف مەيـا هەى و هەر هەر ئيـزدييـەك نڤيژا خويىٰ‌دكەت دبيژت (كانى‌يا سپى مورا منە) ل هيرا ئەم دى باسا موركرنا زاروكا كەين هەلبەت هەر زاروكىٰ جارا ئيكىٰ دبەنە لالشىٰ داى‌و بابيد وى تەرونـەكـا صەوكـا و مريشكـەكـا صوركـرى‌و هـندەك شرينى و فتويىٰ سەردەرى و دەستـەكى جلكيـد سپى لبـەر زاروكى دكـرن و زاروك ل دەستىٰ سەردەريىٰ كانى‌يا سپى‌دكرن و ئەويژى سىٰ جارا دەستىٰ خو ل كانيىٰ دهلاند و ئاڤ ل بچوكى درەشاند و دوعالىٰ‌دكر و دئينادەر و دەستىٰ خو دانادكر و دايكا وى و خوشك و مروڤيد وان دەست ب هلهلاندن و چەپلە قوتانىٰ دكرن و شرينى سەر زاروكارا دهاڤيتن و ئەوانژى خو دهاڤيتە قەسب و ميـويـژا هەرچـەنـد مە بهيستى‌يە بەرىٰ كورك دبرنە كانى‌يا كوركا و كچك ل كانى‌يا كيژكا موردكرن كو هەردو ژ ئاڤاكانى‌يا سپى ژيك جودابن هەرديسـا شيـرپكى ل گەل تاوسىٰ دگيـرە بەرى ئاڤـا كانى‌يا

سپی تیْ‌دکرن لیْ نهو ژ گوندا تیْ‌دکەن و دبێژن ئاڤا کانیی‌یا سپی‌یا ب وی باوەرینا کو هەما دچو شیرپکێدا پیروز دبت لەوا ل سەر هەمو ئێزدی‌یا ڤەدکەن ل خر گوندا وەلیْ ل ناڤ کرمانجێد بسلمان دایك و زاروکیْ وی دوجارا دبرنە سەرشویی ل هەفتیی‌یا ئێکیْ و ب بورینا چلی‌یا هەلبەت خزم و هەڤالێد دایکیْ ل گەل دچون.

**ناڤ لیکرن**: هندی مە پرسیار ژ زاناو پیرەمیرا کر دەربارا حەدو سەدێد ناڤکرنا زاروکا هەموا گوت هەر ئێك ب دلیْ خو ناڤی ل زاروکیْ خو دکەت، وەلیْ فەقیر حەجیْ فەقیر شەموگوت: هندەك جار مروڤەکی خو دهاڤێتە خودیْ و خاسا ودهاتە بەر تاوسی داخودیْ زاروکەکی ب دەتیْ ئەڤجار سالادی ئەم دچوین ژ کەرەما خودیْ کبانی‌یا وی کورەك دبو ئینا ژمە دخواست ئەم ناڤەکی لیْ‌بکەین و دوعیەکیْ ژ وانرا لیْ‌بکەین مەژ ی ناڤەك ژێرا هەلدبژارت و دوعایا ژ ی درێژ یی ژ خودیْ دخواست، هندەك جارا خەلك ژچاڤا دترسیا ئەڤجار گەر زاروکیْ وان نی جوان و سورو سپی با ناڤیْ وی دکرنە زبلو یان کریت، پس،... یانژ ی ناڤیْ هەیڤا زاروك لیْ دهاتە جیهانیْ یان ناڤیْ دەمی یان جەژنیْ لەوا دبینی کچ دکرنە نیسان، بەهار، عیدیْ، طوافو، و کور دکرنە عیدو، حەجی گەر د جەژنا قوربانیْ با یان خدر، لیاس گەر ل جەژنا خدرلیاس با.... دیسان جار هەبو ناڤیْ میڤانی لیْ‌دکرن هەکە میڤان گەلەك خوش ڤیابانە یان ناڤیْ باپیریْ خو یان داپیرا خو و هندەك جارا زاروك دزکیْ دایکا خودا یان هەیڤێد بەریْ ژ بونیْ بابی وی عەمریْ خودیْ دکر ئەڤجار ناڤیْ بابی ل کوری دکرن هندەك جارا یی مامی ژ ی لیْ‌دکرنە ددەست و داریْ واسیدا.

**بسك گرتن**: ژ کەڤندا مو نیشانا زەلامی‌یی بویە ژ لایەکیڤە و نیشانا پیروزی و دینداری بویە ژ لایەکی دیڤە و ڤیْ چەندیْ لنك هەمو ئول و باوەرا سەرهەلدایە هەر ژچاخێدا دیریندا وەکو[د. فوزي رشيد) دنڤیسینەکا خودا دبێژت: خوون و مو پتر ژ هەمو توخمێد گیانی مروڤی ب کاردهاتن ل لوقەت و حەدو سەدێد ئایینیدا و تراشینا پوریْ ب لوقەتەکی ئایینی دادنان و ب قەدرگرانی و ب تەرز و فەرز دهاتە کرن...). هەلبەت پیروزی‌یا پوریْ ل ناڤ مللەتێد روژهلاتیْ‌دا یامای نەمازە ل ناڤ (صابئة) ل ژێری‌یا عیراقیْ ول ناڤ ئێزدی‌و کاکەیا ژ کوردا ئەڤجار ل هێرە ئەم دیْ باسا لوقەتەکی کەین هەتا بەریْ چەند سالەکا بەلکو هەتا نهو ل نك هندەك بنەمالا یامای ئەوژ ی بسکگرتنا. هەلبەت بەریْ دەست نەدهاڤێتنە پورا زاروکی هەتا شێخیْ وان نەهاتبە مالیْ ڤێجار هەما هاتبە دیْ زاروك هەلبەت کور نە کچ لبەر دانابانە ئەویژ ی دەستیْ خو لسەر سەری دادناو ئەڤ دوعایا خواریْ دگوت و ژنو داڤەك دیْ ژ پوریْ بری‌با و ئەڤ چەندیْ واسی دگەهاند کو ئەڤ کورا بو کەسەك ل ناڤ مالێدا چنکو وەکومەل دەرکەدید: گوتی کچ نە دادنان ژکێسێد مالیْ چنکو بو خەلکیْ بو ل پیْ‌رێنینا دان و گاڤا دوعا هەو دکر فتویێْ وی دادنیْ و ئەڤە ئەو دوعایا:

(بسکا بسکانا، بسکا شیخ ئالیْ شەمسانا، کاف بلندبون چونا عەزمانا دو چیا لێککەفتن وەکا بەرانا، وێد ناڤدا شێخیْ شێخانا، هاتنەخوار ژ عەزمانا لەیمون لەیلەتولڤەدر و سورەتلرەممان شێخ سەعید بن شێخ شەمس بدەتن نیشانا، شیخو بەکر سەرمەکانا یا شیخادی و مەلك شێخ حەسەن ژ مەدەست و ژ وە دوعانا توژڤیْ بسکیْ بکەی یا چل بسکانا، فتویێْ ڤیْ بسکیْ گایەو بەرانا).

هەلبەت هەرچەند ژکەسی ڤەنەدهات گای بەرانا بدەتە شێخی لیْ‌دیارە بەریْ ددان چنکو هەتا نهو هەکە ئێك پارەکی زور ژ ئێکی دی بستینت یی دومایی دیْ‌بێژت تە ببسکا من گرت ئانکو تە گەلەك پارە ژ من ستاند، ل ناڤ کرمانجێد مسلمان نەمازە ێد گەلەك ئولدار سەریْ زاروکی ئینن یا ئێکی دتراشین و بەرامبەری و مووا پارە یان زیر دکێشان و ددانە بەلنگازا.

**دان هاتن**: چاخیْ دانێد بچوکی ێد پێشی دیاردبون گەلەك کەیفا دایکیْ دهات و رادبو ڤەباغەکەکا دەهنوکا چێدکر و هندەك جارا شرینی ژ بوکوریْ خو و زاروکا دکرین ب ڤیْ بونیْ. هەلبەت ئەو دەهنوك یان نەهەك و باقلکێد کەلاندن بو مالێد دەرو جینارا دبرن ب بونا هاڤێتنا داناو وان ژ ی زاروك خەلات دکر.

**سونەت کرن**: مە نەڤێت ئەم گەلەك باسیْ سونەت کردنیْ بکەین چنکو سەیدا (خدر سليمان)(٦) بابەتەکی سەربەخو سەر ڤیْ چەندیْ‌یی بەلاڤکری لیْ حز دکەین بێژ ین حەرچەند سونەت کرن لوقەتەکا ل ناڤ گەلەك مللەتێدا دیدا یی‌هەی لیْ لنك مە ب ئاوایەکی جودا ئەوژ ی ئێك سونەتکرن نیشانەکا دیاربو دژ یانا زاروکێد مە چنکو خوش و شاهی‌یا پر دگەل دهاتەکرن هەروەکی شایا ژن ئینانیْ لیْ‌دهات و بچوك نەدهاتە سونەتکرن بیْ کریف و یاسیْ هەر بچوکەکی نێر ڤێت بێتە سونەتکرن خو هەکە پشتی مرنیْ کریڤەك ژێر ئینایە و دکوشیْ‌دا سونەتکرینە ئانکو سونەتکرن حەلالکرنە هەر ڤێت بێتە کرن ل با مە نەمازە ل دەڤەرا شێخان هەلبەت وەکی مە گوتی کەیفا زاروکا گەلەك ب سونەتکرنیْ دهات نەمازە هێڤارا سونەتیْ کو جلکێد نوێد کریڤیْ وی ژێرا ئینایێن ل بەرخو دکرن و بەریك تژ ی پارە دکرو ئەڤ تشتە هەروهەر ب دەست زاروکا نەدکەفت نەمازە بەهرا بتر ژ تاخێت بەلنگازو هەژار بون.

**کارو پەرا پێکرنا زاروکا**: هەلبەت بەهرا بترژ خەلکیْ مە جوتیار بون لەوا زاروکێد خوفێری رێزورسم ورێکێد ڤەنج دکرن ژ لایەکی دیڤا فێری کارو پیشیْ جوت وچاندنیْ وخودانکرنا پەزوتەرش دکرن وکیژ فێری شولیْ ناڤ مالیْ دکرن وهەردیسا دبرنە خەپارومشك ودروونا

نیسك ونوك وباقلكا و كور دبرنه جوتی و ل هاڤینی دبرنه سەر جینجەری لێ کەسانێد خودانێد زارۆکێد زاڤ و چاندنیەکە کێم هەی زارۆکێد خو ڤرێدکرنە بەرپەزی یان بەرخێد کەتخودایە یان وەکو روژنوبك ل گەل شڤانا یان چوسەر جینجەرێد خەلکێ یان شخرەکێشی دکر و کیژێد خو دیسا ڤرێدکرە شول و کاری خەلکێ دی لێ مرۆڤێد ئولدارو ماشخور زارۆکێد خو فێری قەول وقەسید ودوعایە دکرن نك قەولزانەکی وژ بچووکێدا دبرنه ناڤ مریدا دامرید زارۆکێد شێخ وپیرید خوبناسن نەکو ئەوبمرن وهەر دیسا هندەکا لسەر ڤێکێرا زارۆکێد خوفێری شولی ژی دکرن لێ نە هەمو فێری ڤی کاری دبوون نەمازە زارۆکێد قەوالا کو فێری دەف و شەبابا دکرن ل دومایێ دڤێت بێژین بەگ و ئاغایا زارۆکێد خوژ بچووکێدا دبرنە کوچك وجڤاتا دا فێری دان وستاندنێ بانە وهەتا ل گەل خول گوندو باژێرا دگێراندن لەوا زارۆکێد میرا هێشتا دوانزدە سالی دشیا دان وستاندنێ ل گەل پیرەمێرا بکەت، هەلبەت نهوبەهرا بتر بەرێ خو ددەنە خوندنگەهـ و زانینێ.

**ژێڤەکرنا زارۆکی ژ شیری:** بەرێ دایکێ شیری مەمکی ددا زارۆکی هندەك زارۆك سێ چار سالی دبون هێشتا مەمك دڤیان و دایکاخو بێزار دکرن ئەڤجار هندەك ژنکا سگوپکا مەمکی تەنیدکرن و هەکا سورانەبا تشتەکی تەعل پێڤەددا و هندەکا (دۆکانە) پێڤەددان و گەلەك شتێد دی دکرن هەتا زارۆکی بەلا خو ژێڤەدکر.

**نەخۆشێد زارۆکاو چارەکرنا وان:** تشتەکی ئاشکەرایە کو بەهرا بتر زارۆك توشی نەخوشی و نەساغییا دبن و هەکە ئەڤرو چارەسەرکرنا وان ئاسان برێکا خەستەو دختورو دەرمانا ژلایەکیڤەو تەناهی و خوشییا ژیانێ ژلایەکی دیڤە لێ ئەڤ تشتە بەرێ گەلەك ئی کێم بو چارەکرنا نەخوشییا بەهرا بتر ب رێکا خوزیو دوعا و دوزیکێدا کوچەك و پیرا ونڤشتکێد مەلایا ووان رێکێد واسیو ئەڤەژی چەند نەخوشێد زارۆکا ل گەل چارەکرنا ئاینی ژێرا:

**چاڤ لێدان:** یانکو دگوتنی نەزەر: هندەك جارا وەکو پاراستی ژ چاڤا هەکە بچوکێد ئیکی گەلەك نەمابانە یان دخشکوك و قەلەو بانا رادبون بەنکەکی مێروکید شین لبەردکرن یان رولکەك ب ملی ڤەدکر یان پێ هەیبا زیرکەك ب سەری ڤەدکرن یان نڤشتەك ب سەر ملیڤا دروتن دگوتن نەکو خەلك چاڤەکی لێبدەن وەلێ هەکە بچووك ژنشکێڤە نەخوش کەفتبا وبێبناسەکی دیار دیگوتبانە ئەڤە شولێ چاڤی‌یە ئەڤجار یان دیچوبانە لنك قەولزانەکی دا دوعایا نەزەرێ لسەر بچووکێ وان بێژت ئەویژی دگوتە وان هەرن هیکەکێ بومن بینن و هندەکا دزانی بێی گوتن هیك ل گەل خو دبرن و قەولزانی هیك سێ جارا ل هاویر سەرێ بچووکی رادگێراند و لبەررا ئەڤ دوعایە دگوت:

(یا جەبار یا جەبێر . یا پیری کار یا خندکاری بەرو بەحر یا خالقی لەیل و نەهار یارەبی ئسمەك ستار) و پاشی هەتاژی دهات ئەو هیکا ل قادێ ددا ئەڤەژی نیشانا وێ چەندێیە کو گیانەك دبەر سەرێ بچووکیرا گێرا یانکو قوربانکر چنکو هیکێ گیانەك پێ تێدا و لەوانەیە هاڤێتن و شکاندنا هیکێ گەلەك ژ دوعایێ کەڤنتر بت و چنکو هندەك جارا هێك دەست ناکەڤن لەوا هندەك قەولزان شولێ ئاسان دکەن و ب بەراتێ دوعایانەزەرێ دبێژن ژ وانا قەولزانێ ناڤدار فەقیر حەجیێ فەقیر شەمویێیە کو دبێژت ئەز هەر ب بەراتێ دبێژم هندەك ژی ژبو برینا نەزەرێ ئانکو چاڤلێدانێ زارۆکێد خو دبەنە بەر (دارا نەزەرێ) لگەلیێ لالشێ و هندەك (رصاص)ی ل راستە سەرێ بچووکی دحەلینن و ئەڤا دومایکێ ل ناڤ کرمانجێد بسلمانژی یا هەی

**کێما هەیڤێ:** چاخێ هەیڤ نو دبو گەلەك بچووك نەخوش دبوون و تایێ دهاتێو بژوانکێد وان دبوونە جوت، خەلکێ دگو: سەروبنێ هەیڤێنە ئەڤجار دچونە پێ کەسانەکی ژ مالەکا شێخێد فەخرا داخوزییێ ل بچوکێ وان بدەت یان هەکە گەلەك نەخوش با دبرنە بەرجیێ ئەختیارێ مەرگەهێ کو دبنە تارێدا جیێ شێخ فەخرێ ئادییایە و خوزی لێددان یان دەزیك بو راگرێددان و دگوتنیو هەتا سبەڤێ وەختی تەرنەکەن و هەکە چو شێخێد فەخرا نەبانا دچونە مالا مریەکی وان ئەویژی دەست و لنگێد زارۆکی ب تەنی دکرو هیڤییا ساغ بونێ ژ خودێ دخواست و جارنیە دایکا زارۆکی بەرێخود دا قەولزانەکی دا دوعا کێما هەیڤێ سەربچووکی گوتبارو قەولزانی پشتی دەست و لنگێد پچووکی بەتەنیێ نیشان دکر ئەڤ دوعایە دگوت:

[لمن و ڤی مالێ شێخ فەخرێ ئادییا پالا خو دابووا ستونا مالی، وی ب ڤرچی قەن فعلی، ژ قلبسا ژنێ ژخیسیا میری گرارا هێڤاری نەدرێ تەفالی ـ تەفال دێ [رابتە ناڤا مالی] هەلبەت ئەو ل وێ باورێ دابو کو زارۆك ب ڤێ دوعایێ چاك و ساغ دبو و ب راستی گەلەك جارا زارۆك ب خوزی و دوعا ون ژێکا ساغ دبو.

یا لبەر گوتنی دکەڤت ئەوە ژلایێ زانایاڤە یاهاتییە ئەسەح کرن کارێ هەیڤێ لسەر کاروبارێد جڤاتێ نەمازە هاتووچون و دەست وداری ژنکاو نەخوشێد دین و ژارا و هێشتا ئەو سەرڤێ رێ دبەر دەوامن.[11]

**میز ئەوقاندن:** گەلەك جارا بچوك توشی ڤێ نەخوشیێ دبون و نەدشیا بمیزن و لەشێ وان پێ نەخوش دبو و دایك و باب پێ بێزارو دل تەنگ دبون لەوما هاوارا خو دگەهاندنە بەر قەولزانەکی یان بەلنگازەکی چنکو ل وی زیدەتر نەبو، قەولزانی ژی دەستێ خو لسەر سەرێ زارۆکی دادنا و ئەڤ دوعایا خوارێ ب رێز دکر:

**چومە سەر کانییەکا هوریجان**

**دارەکە لسەر بوبێ رەهـ و بێرەنجال**

**تەیرەك ئی لسەر بوبێ پەری بێ‌نیشان**
**من كوشت بێ كێر و بێ سیكار**
**من براشت بێ ئاگر و بێ دوخان**
**من خوار بێ دەڤ و بێ ددان**
**یا هیمەتا شیخادێ چرێ میزێ وەرەخوار**[١٢]

پاش دەستێ خۆ ژ سەرسەرێ زاروكی ڕادكر و دوعایا هاتنا میزێ ژ خودێ دكر و فتوێی خۆ هلەگرت، ل هێرە هەر ئەڤ دوعایە لێ چنكو مە ب ئاوایەكی دی بهیستی‌یە لەوا ب فەرزانی ئەوێژێ ژ وەرا بنڤیسین:

**چومە سەركانی‌یا نوریجان**
**دارەك وێ لسەری بێ رینجان**
**تەیرەك وێ لسەر وێ دارێ، عەرش بێ‌نیشان**
**من ئەو تەیرگرت بێ دار و بێ گاسن**
**من كوشت بێ كێر و بێ دوزان**
**من كەلاند بێ ئاگر و بێ دوخان**
**من خوار بێ لێڤ و بێ ددان**
**بانگا منا شێخ شەمسێ تەترا**
**تەترەك ژوان بێتە صور و زەرا**
**بچتا لنك سلێمان داود پێخەمبەرا**
**ڤەكەت دەرێ دەفتەرا**
**ناڤێ وی تەیری بێتە دەرا**

بهیمەتا شەمسێ تەوریزی بافك پیڤاز كوشێ میزێ وەرەخوار.

**ب ریڤەنەچونا بچوكی**: بەرێ چاخێ ژیێ زاروكی دبو سالەك یان سال و نیڤەك ڕادبووە سەر پێچكا كەیفا دای و بابا ژێرا دهات وهندەكا رەوانوكێد داری بۆ ڕاپەیدادكرن دا زو ب ریڤەبچن یانژی ل دور دوەستاندن و بادكرنێ وەلێ هەكە هەیامەك تێ‌چوبا و بچوك بریڤەنەجوبا یان لنگێد خۆ نەدابانە بەرخۆ ناچاربون چارەكێ ژێرا ببینن ئەڤجار هندەكا دبرنە پیش یا گارانێ‌و دا بچوك ترسیاباو راباو خۆ قورتالكربا چنكو وان باوردكر هندەك بچوك ژ ترسێد كەفتنێدا و ژ شارازایی ب ریڤە نەدجون یانژی دێ‌بریانا بەر (بەرێ شباكێ) ل مالا (شێخێ وەرزیر) ل گوندێ بەحزانێ و بەندێ وی هەفت جارا ڤەدكرن و ددانە بەر گوری ل ئاڤدێ‌دا، هندەكا ژی بچووكێ قرۆم سەروێ دەوارێ سواردكرن ئەوا فەقیری (بەرات) لسەر دگێران ل ناڤ گوندا و هندەك دایكا میزەركا خۆ دهاڤێتە بەر لنگێد (بەتریاركی) گاڤا دهاتە دەڤەرێ یانژی دبرنە ل نك نەقیبی (دوعایەك) لێ‌دكر.[١٣]

**لالی یان لالەپتكی**: گەر ژیێ زاروكی با سێ چار سال و زمانێ نەگەریابا یان نەئی‌دروستبا دێ زەلامەك ژیر مالێ‌و پچەكی ئی‌زر شەرم لبەر میری یان مەتبەخجی یان قەوالێ ل كەل تاوس كونڤە هاتبا چاخێ فراڤینێ یان شیڤێ و گاڤاوی پاری دگەهاندە نیزیكی دەڤێ خۆ زەلامی ب دەستی دگرت هەلبەت ئەوژی ددنیا دیتی‌بون ل جیدا دزانی‌و دوعا ل زاروكی دكرن و زەلامی پاری ژ زاروكیرا دئینا و ب هیڤی‌یا ساغبون و ڤەبونا زمانێ وی‌بون.

**داركێ خەوێ**: هندەك زاروك ب شەڤ و رۆژ خەو ب‌ چاڤا ناكەڤت و دایك و بابێ ئێكجار بیزار و بێ سەروبەر دكەن ئەڤجار بەرێ بابێ زاروكی یان دایكاوی بەرێ‌خۆ ددا لالشێ و قەستا داركا خەوێ دكر كو دكەفتە بەرامبەری كانی‌یا سپی و ب ددانا دكەفتێ هەتا پرنكەك ژێ‌ڤەكربا و هندەك جارا دگوتن بێ‌بشێت ڤێت ئەو بخو ب دانا ژێ‌ڤەكەت پاش ئەو پرتكا یان لبن سەرێ بچوكی دادنان یان ل ناڤ باتەكی‌دا دروتن و لستوێ وی دكرن دا بنڤت.

**دەڤ كولی**: چاخێ دەڤێ بچوكەكی كول با ژنەك ڕادبو ئار ژ هەفت مالا خردكر بێ‌ئاخفتن، دكرە هەڤیرو پاشی هەفت پیشك (نان) ب دیواریڤە ددان و دهێلان هەتا هشك بن و خەلكێ مە واسی باوەردكرن كو چەند ئەو هەڤیر هشك بت دەڤێ زاروكی دێ ل گەل هشك با و دا ساغ ببا.

**ئارونە**: ئەگەر زاروك ب ئارونێ دكەفت ئانكو گری‌یەكا بێ‌وەستان دبرنە بەر ئاڤدا (پیر بووب). یان ژی دبرنە مالا پیرەكی هاجیالی.

**لاوازی**: ئەگەر زاروك هەر لاوازو بێ‌خێر با دێ هاڤێت بانە بەر (بەرێ بۆزا) كو دكەفتە گوندێ (بۆزا) ل دەڤەرا (ئەلقوش) ئەڤجار هەكە گرێ‌با ئانكو زاروك دێ‌چێبت و نامرت لێ هەكە نەگری‌با واتا زاروك ناژیت...!

**كول بونا كەل و پەلێد زاروكی**: گەر كەل وپەلێد (كیروگون)ێد زاروكی كول بانا دێ بربانا بەر (حەگی فێرس) ل گوندێ خەتارێ.[١٤]

**گلیزە**: هەكە زاروكەكی هەر گلیزە كربا ئانكو گلیزە گلیزە یان خوزی بەردەوام ژ دەڤی هاتبە دگوتن ڤیت خالەكی وی پانی یاخو ل دەڤی بدەت.

**كیان**: گەر زاروكەكی هەر دلێ وی لێداباو شیر هاڤێتبا ئانكو ڤەرەشیابا گەلەك دێ گوتبانە ڤێت ئەڤ زاروكا بێتە كیان ئانكو دێ‌بربانە لنك ژنەكا ئەڤ كارە دكر وێ ژنێ جاجمەك یان بوركەك دئینا و دوتا دكر و وێ ب لایەكی و كچاوێ یا نەخرینی ب لایەكی دیڤە دگرت و هەردووا هەتا ژوان دهات ل گەلێك دهلاڤێت و ئەڤە لبەررا دگوت:

**مەشكاكێ‌یە؟ مەشكا مەمێ شڤانا**
**ب دەستێ كێ‌یە؟ ب دەستێ دای‌و دوتانا**

پشتی (سێ) جارا ژهلاڤێتنێ زاروك ددانە دایكاوی و هیڤی‌و داخازا خوشیێ ژێرادكرن.

**خوون بەردان:** گەر دلێ زاروکی ئیشـابـا یان لێـر لێ هـاتبانا دگوتن ئەڤـە ژخـوونـا زیـدەیـە یان خوونـا وی‌یا پیـس بوی ئەڤجار دبرنە لنك ئێکی شارەزا بەهرا بتر جارا ژن بو ئەوێ‌ژی دوزان یان لڤێ دومایکێ دەڤکەك دئینا و ددایشتا زاروکی هەلبەت هندەك ساغ دبون و هندەك نەء و هندەکێد بەخت رەش ددەستادا دمرن نەمازە گەلەك جارا دەفك نەد دپاقژ بون یان وان دروستی نەدزانی خوونێ ژکێدەر بەردەن.

**صۆریـك:** هەلبـەت هەتـا ڤێ دومـایکێ خەلـك گەلەك ژ مۆریکێد زاروکا دترسیان چنکو دەرمان و دختور ل وی دەمی دکێم بون و وانژی چو چارەیا ڤێ نەخوشیێ نەدزانی ئەڤجار رادبون مێزەرك یان جاجمەکا صۆر لسـەر زاروکێ ب صۆریکا کەفتی دکرن و نەدهێلا خەلك بینن و دگــوتن ئەڤ مێــزەرکــا یان جاجمکــا صۆر دێ وەل صۆریکـا کەت ب دەقسن و دەرکەڤن چنکو ئەوژی وەکی وان باتا دصۆرن.

**خوریـك:** هەلبـەت خوریـك نە ژ صۆریکـا کێمتـرن ودبت گەلەك زاروك دمرن و گەلەك دکۆرە دبون ژ خوریکا و چارەیا ل با خەلکێ بەرێ ئەوبـو طاپـك و درگە و خانیێ زاروکێ نەخـوش تێـدا دصـوتن و دگوتن دیکولاوان دێ خوریکا هشك دکەتن و زاروکێ رەبەن ب سێ چارمەرشکا دنخاڤتن گەلەك جارا هەروان مەرشکاو دیکولێ زاروك دخەندقاند.

**مرنا زاروکا:** هەکە زاروك دروژا ئێکێ یان دهەفتا ئێکێ مربا ژنەکێ دپێچاو دبرین عەرد دکر لێ هەکە ببا دوسێ هەیڤێ دیـسایەك دو ژنکا یان زەلامەك بن عەرد دکر وەلێ گەر سێ چار سـالی با حەدوسەد ژێرا دکــرن و خێــروخێــرات و لبـن گۆردکــرن لێ بوێ دو سێ روژی مریشکەك دکوشتن و زادەك چێدکرن و هەلبەت هەتا زاروك ژ هەفت سـالێ نەبـۆری‌بـا دەرێ زەهمـانی ڤەنـەدکـرن بەلکـو ل رەخا گرکەکێ یان لبەر نیشانا خاسەکی ڤەدشارتن کووەکی زەهمانەکی تایبەتی بو ژ زاروکارا دیساهندەك بشکول ل هاوپرتربێ خردکرن دگوتن نەکو بشەڤ توری‌و درندە بێن بیهن بکەن و کە لەخێ زاروکی بینەدەر و بخۆن.

ژێدەر:

١ ـ خدرێ سلیمان، (گوندیاتی)، بەغدا، ١٩٨٥
٢ ـ جمعة کنجی، (العلاج الدینی للامراض لدی الیزیدیة)، التراث الشعبی، الـسنة السابعة، ١٩٧٦.
٣ ـ جریدة الثورة فی ١٩٨٧/٣/٢١.
٤ ـ فوزی رشید، (نشأة المیثولوجیا والادب)، افاق عربیة العدد ٦، ١٩٨٦.
٥ ـ بەهـرا بتـر ژ ڤان زانیـاری‌یـا مە دیتینـەو گوهلێبویە و هندەك جارا پرسیـارا پیـرەمێـرو پیـرەژنـان کری‌یە لێ تێکـتێد دوعایا من ژ دەفتەرا نادرێ شێخ میرزا کو ژ ئاکنجێد گوندێ بیبانی‌یە ڤەگوهاستینەو ئینایە سەر رێنڤیـسا کوردی‌یا دروست و وی ژدەفتەرا برویێ شێخ عەبدالێ بوزانی وەرگرتینە کویێ دویێ سەر زمانێ بابێ خونڤیـسینە ئەوژی ئانکو شێخ عەبدال قەولزان و دەرویێشەکی ب دەق و زمان بو لێ ئێك دوعا مە ژ زاردەڤێ کرێتێ شێخ سلێمان نڤیسیە و دەست نیشان کری‌یە.

پەراوێز:

(١)(٢)(٣) ئەڤ چەنـد سـەبـەقـە مە ژ پەرتـووکا (گوندیاتی) ژکۆمکرن و بەرهەڤکرنا. خدرێ سلیمان. بەغدا. ١٩٨٥ یاوەرگرتی
(٤) چاڤ پێکـەفتنـەك ل گەل شێـخ خەتـویێ بابێ شێـخ ل مالا وان ل بەعدرێ ل روژا ٢٠/٢/١٩٨٨
(٥) عبدالستار کاظم. الطفل فی العائلة الکردیة. مجلة نوروز العراق. العدد (٣) ١٩٨٧.
(٦) عبدالستار کاظم، نفس المصدر السابق،
(٧) فوزی رشید، نشأة المیثولوجیا والادب، افاق عربیة، العدد (٦)
(٨) عبدالستار کاظم. المصدر السابق
(٩) خدرێ سلیمان. گوندیاتی، بەغدا، ١٩٨٥
(١٠) عبـدالسـتـار کاظم، الطفـل فی العـائلة الکـردیـة. مجلة نوروز العراق، ١٩٨٧ العدد(٣)
(١١) القمـر والحیـاة، جریـدة الثـورة العدد الصادر فی ١٩٨٧/٣/٢١ دیسا چەند ژمارە ژ گوڤارا (علوم).
(١٢) ئەڤ دوعایە مە ژ زاردەڤێ بەهشتی کرێتێ شێخ سلێمان یاوەرگرتی ل هاڤینا ١٩٧٥ ل ئێـسفنێ.
(١٣) جمعـة کنجی. العـلاج الـدینی للامـراض لدی الیزیدیة. الـسنة السابعة، ١٩٧٦.
(١٤) نفس المصدر السابق

# الطفل في مجتمعنا

عبدو بابه شيخ

يحاول الباحث ان يستعرض مفهوم الطفولة في المجتمع الكوردي فيوضح لنا منظور الكورد للطفولة من خلال استعراض بعض الاغنيات التراثية المعنية بالطفولة، ثم يتناول بعض العادات والتقاليد المتوارثة في المجتمع فيما يخص نشأة الطفل ولاسيما الموجودة في المجتمع المحلي الخاص به، محاولاً مقارنتها بما كانت متبعة في العراق القديم وبما هي متبعة في المناطق الكوردية الأخرى. فيتطرق الى الأدعية وزيارة الأضرحة وتقديم النذور والأضاحي طلباً لأنجاب الطفل. وهناك عادة التبرع بشوطٍ من عمر الطفل بعد نيل المراد بولادته، ثم تحرير رقبة الوليد لقاء مال أو ثور أو كبش. ويذكر الطقوس الخاصة باحتفاء الناس بولادة الأطفال وتسميتهم وظهور أسنانهم كما ويبين المعالجات ماهو روحي وماهو بدائي.

ويمتاز البحث بالتطرق الى الطقوس الخاصة والطقوس التي تجري عند إصابتهم ببعض الأمراض ومن هذه المعالجات بمنطقة اليزيديين كتعميد أطفالهم في ماء نبع (كانيا سبى) الكائن في وادي (لالش) المقدس لديهم، وكمسك الزلف ودفن الأطفال في مقبرة خاصة وختان الاطفال حتى بعد موتهم اذا كانو قد بلغوا العام الواحد من العمر. فاستطاع الباحث تسجيل اكثر العادات والتقاليد الموروثة منذ القديم في منطقته حيث ان القسم الكبير منها في طريقه الى الزوال. واعتمد في تسجيلها على معايشته لواقع المنطقة وعلى ما جاء ببعض المصادر المكتوبة والنصوص المتداولة.

# وەرزانەی ڕۆشنبیری

سەرگوڵ تیمور

لە وەرزی ڕابــردوودا دەزگــا کوردی‌یــەکـان لە بەرایـان دا دەزگـای ڕۆشنبیــری‌و بڵاوکـردنەوەی کوردی لە بواری هونەرو ئەدەب و ڕۆشنبیری گشتی دا چالاکی جۆراوجۆریان نواندووەو نووسـەرو هونەرمەندانی کوردو کۆمـەڵـەوتیپە هونەری‌و ڕۆشنبیری‌یەکانی کوردستانیش لەم چالاکی‌یانەدا بەکـوڵ و جۆش بەشـداریـیـان کردوە بزووتنـەوەی ڕاپـەڕیـوی ڕۆشنبیری کوردیان پەرەپی‌داوە.

شایـانی باســە زۆربــەی ئەم چالاکی‌یــانــە لە بۆنــە نیشتیمـانی‌و شۆڕشگێــڕی‌یــەکــانی عیــراقی خۆشــەویــست دا بەئـەنجـام دراون، گەورەترین و پیرۆزترین بۆنەش یادی شۆڕشی نەمری ١٧ ـ ٣٠ی تەمووز بوە. ئەمەش کورتەیەکی ئەو هەواڵ و چالاکی‌یانەیە:ـ

## چالاکی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی لەبەغدا:

١) ئاهەنگێکی فراوان بەبۆنەی یادی شۆڕشی ١٧ ـ ٣٠ تەمووز لە بارەگای دەزگـاکـەمـان گێـڕرا. سـەرەتـای ئاهەنگەکە بە خوێندنی سورەتی فاتیحا دەستی پی‌کـرد ئینجـا بەڕێـز مامـۆستـا مصلح جلالی وتـەیـەکی بەنرخی پێشکـەش کرد، باسی شۆڕشی ١٧ ـ ٣٠ی تەمـووزو دەسکـەوتەکانی بۆ گەلی عیراق کرد. پاشان ئاهەنگی موسیقاو گۆرانی‌و هەڵپەرکێ دەستی پی‌کرد.

٢) پێشـانگـایـەکی هونـەری شیـوەکـاری بۆهونـەرمـەند أحمد مصطفی زەهاوی لە هۆڵی مۆزەخانەی نیشتیمانی لە ٢٢ / ٥ کرایەوە.

٣) لە هۆڵی مۆزەخـانـەی نیشتیـمـانی لە بەغدا دەزگاکەمان پێشانگایەکی هونەری شیوەکاری بۆ هونەرمەند برهان هەژار سازکرد.

٤) لە ڕۆژی ٢٠ / ٥ / ١٩٨٩دا دەزگـاکـەمـان میوانداری تیپی شانۆگەری بەهـدینـانی کردو شانـۆگـەری (دیتن)ی پێشـکـەش کرد نووسینی جمیل بیانی‌و دەرهێنانی (بائیز عمر) لەسەر هۆڵی (منتدی الادباء الشباب) لە بەغدا.

## لە شاری سلیمانی:

١ ـ لە چالاکی‌یەکانی دەزگاکەمان لە ڕانیە لە ڕۆژی ٢٠ / ٥ / ١٩٨٩دا بۆ ماوەی سێ ڕۆژ پێشانگای خۆشنووسی عمر یوسفی کرایەوە.

٢ ـ بەیارمەتی دەزگای ڕۆشنبیری‌و بڵاوکردنەوەی کوردی لقی سلیمانی لە ڕۆژی ١ / ٦ / ١٩٨٩دا لە هۆڵی مۆزەخــانــەی سلیمــانی پێشــانگـای کاریکاتیری هونەرمەند سەرچل شەوقی کرایەوە.

## هەولێر:

١ ـ لەمـانگی مایـسی / ١٩٨٩دا وەرزی ڕۆشـنبـیـری لقی دەزگـاکـەمان لە هەولێـر بە کۆڕێکی شیـعـری منـداڵان دەستی پی‌کـرد. لەم کۆڕەدا پەنجا منـــداڵ شـیـعــری خۆیــان خوێنــدەوە پاشــان کاك ڕۆستــەم باجـەڵان لێ‌ی‌کۆڵینەوە ـ یەکی لەسەر خوێندنەوە.

٢ ـ لەکـۆتـایی مانگی ٥ / ١٩٨٩دا دەزگـاکەمان لە هەولێر ئێوارە کۆڕێکی میـوانـداری دکتۆر مارف خەزنەداری کرد، لەیادکردنەوەی چرۆك نووسی خوالێ خۆشی بوومەم دا.

٣ ـ لەمانگی ٦ / ١٩٨٩دا لقی دەزگاکەمان لەهەولێر دوو کۆڕی ڕەخنەیی سازکــرد. یەکـەم تەرخـان بووبۆنووســەر ئیــمـاعیـل أمین دووەمیش بۆ خوێندنەوەی چیرۆکی (تەرم)ی چیرۆك نووس صلاح عمر کەخۆی پێشکەشی کرد.

## دهۆك:

١ ـ دەزگـاکـەمـان پێشـانگـایـەکی وێنەی فۆتۆگرافی بۆهونەرمەند ابوبکر ابراهیم بیتواتەیی لە ١٦ / ٤ / ١٩٨٩دا لە شاری دهۆك سازکرد.

٢ ـ لە ٢٠ / ٧ / ١٩٨٩دا دەزگـاکـەمان میهرجانێکی شیعر خوێندنەوەی لە ناحیـەی سەرسـەنگ سەزکردو ئەم شاعیرانە بەشدار بوون: ابراهیم علی هاجـانی، عبـدالله علی حسن، عزالـدین حمیـد مزوری، عمـر احمد عمر، محمد برواری، نظیف نایف.

## ئەمینداریتی گشتی رۆشنبیری و لاوان

١ ـ بەڕێوەبەرایەتی گشتی رۆشنبیری و روان لە شاری سلیمانی لە ئێوارە ٦/٧/١٩٨٩دا کۆڕێکی ماتەمی بۆ چلەی شاعیر ئەحمەد ڕێوار تەرخان کرد.

٢ ـ ئەمینداریەتی رۆشنبیری و لاوان یەکەم پێشانگای فۆتۆگرافی بۆ وێنەگران (ابو بکر ابراهیم) و (یونس محمد) لە هۆڵی میدیا لە هەولێر کردەوە.

## بەڕێوەبەرایەتی پەروەردە

١ ـ لە مانگی نیسانی ١٩٨٩دا لە شاری سلیمانی ناوەندیی زانیاری و ناوەندیی رەنگینی کچان و قوتابخانەی سلیمانی سەرەتایی پێشانگای سالانەی خۆیان کردەوە.

٢ ـ لە رۆژی ٢٧/٤/١٩٨٩دا لە شاری سلیمانی پێشانگای سالانی قوتابخانەی پەیام و پشکۆ کرایەوە.

٣ ـ لە رۆژی ٣/٥/١٩٨٩دا و بۆ ماوەی چەند رۆژێك قوتابخانەی ئامادەیی پیشەسازی بەکرەجۆ شانۆنامەی (ژیانەوەی سەگەکەمان)، پێشکەش کرد.

٤ ـ لە ١٦/٥/١٩٨٩دا بەڕێوەبەرایەتی پەروەردەی سلیمانی لە هۆڵی مۆزەخانە پێشانگایەکی هونەری تەشکیلی ڕێك خست کە (١٢) قوتابی بەشدارییان تێداکردبوو.

## باوەڕنامەی زانستی:

١ ـ لە ٢٤/٥/١٩٨٩دا لە هۆڵی ئیدریسی کۆلیجی ئادابی زانکۆی بەغدا وتوویژ و لیدوانی نامەی دکتورای مامۆستا فؤاد حمە خورشید دەستی پێ کرد، نامەکەش بەناوی (ئەفغانستان و ستراتیجی سوڤیات) بوو کە بە پلەی ئیمتیاز باوەڕنامەی دکتۆریی پێ بەخشرا.

٢ ـ قوتابی کامل صابر سعید لە رۆژی ١٥/٦/١٩٨٩دا لە کۆلیجی کشتوکالی زانکوی بەغدا باوەڕنامەی ماجستێری بە پلەی ئیمتیاز وەرگرت.

٣ ـ ئێوارەی ٢٠/٥/١٩٨٩ لە کۆلیجی پەروەردە قوتابی اکرم شیرخان کە درچووی بەشی کوردییە، وتوویژ لەسەر نامەی ماجستیرەکەی کە بەناو نیشانی «گیروگرفتەکانی خوێندنی دەرسی خوێندنەوەی زمانی کوردی بۆ قۆناغی ناوەندی لە ناوچەی ئۆتۆنومی کوردستان دا لە گوشەنیگای مامۆستاکانەوە» کراو پلەی ماجستیری پێ بەخشرا.

## دوو رۆژنامەی تازە
## ئاسۆ و بزاف

١ ـ یەکەم ژمارەی رۆژنامەی رۆژانەی (بزاف) لە بەغدا بە (٨) لاپەڕە لە رۆژی ١/٨/١٩٨٩دا بەشێوەی کرمانجی ژووروو دەرچوو. سەرنووسەر و خاوەن ئیمتیاز د. نافع ئاکرەیی یە و جارێ هەفتەی ژمارەیەکی لێ دەردەچێ.

٢ ـ رۆژی سێ شەممەی /٧/١٩٨٩ ژمارە (٠) رۆژنامەی رۆژانەی ئاسۆ دەرچوو. ئەویش رۆژنامەیەکی رۆژانەی سیاسی گشتی یە جارێ هەفتەی ژمارەیەکی لێ دەردەچێ. خاوەن ئیمتیاز و سەرنووسەری کاك عبدالوهاب طالبانی یە.

## چاپەمەنیی تازە

١ ـ دێ گەهینە ئێك — شعر ـ عبدالعزیز خیاط
٢ ـ رابەری سەرچاوەی — زمانەوانی ـ د. ئەورحمانی حاجی معروف
٣ ـ بیلوغرافیای دووصەد سالی کتێبی کوردی — بیلوگرافیای ـ مصطفی نەریمان
٤ ـ بوونەوەرە هۆشمەندەکانی بۆشایی ئاسمان — وەرگێرانی ـ اسماعیل موسی مرادو ئازاد حمە شەریف
٥ ـ شاری سلیمانی — بەرگی دووەم ـ ئەکرەمی مەحموودی سالحی رەشە
٦ ـ حەیرانۆك: ژکەلەپووری کوردی — فۆلکلور ـ حجی جعفر

## کتێبی رۆشنبیری نوێ

لە بلاوکراوەکانی گۆڤارەکەمان کتێبێکی تایبەت بە لێکۆڵینەوەی ئەدەبی بەناوی (میهرەجانی مەولەوی) بەچاپێکی جوان و لە بەرگێکی ڕێکوپێك دا کەوتە بازارەوە ئەم کتێبە بریتی یە لە کۆمەڵێك وتار و لێکۆڵینەوە دەربارەی مەولەویی شاعیری گەورەی کورد، مامۆستایان: ئەمین نەقشبەندی، فاتح مەلا کەریم مدرس، محەمەدی مەلا کەریم، رؤوف عوسمان، دکتور عزالدین مصطفی رسول، محمد أمین حبیب، لەیلان خان، خەسرەو جاف، ئومێد ئاشنا، حەسیب قەرەداغی، کامل ژیر، عثمان محمد هەورامی، محمود زامدار. لەو میهرەجانەدا خوێندیانەوە کە لە ٢٤ ـ ٢٥ی ٨/١٩٨٨ لە سلێمانی دەزگاکەمان ڕێکی خست، شایانی باسە لە میهرەجانەکەدا مامۆستا مصطفی نەریمان وتاری بەڕێوەبەری گشتی مامۆستا مصلح جەلالی خوێندەوە.

روشنبيري نوى
مجلة فصلية تعنى بالدراسات
تصدر عن دار الثقافة والنشر الكردية
وزارة الثقافة والاعلام
بغداد

ROSHINBIRY NWE
QUARTERIY MAGAZINE
FOR STUDIES AND RESEARCHES
PUBLISHED BY: THE KURDISH
CUL TURAL AND PUBLISHING HOUE
MINISTRY OF CUL TURE AND
INFORMATION
BAGHDAD - IRAQ



العنوان دار الثقافه والنشر الكرديه
الوزيرية قرب المعهد القضائي
تلفون ٤٢٥١٨٤٦ بدالة (٤) خطوط
ص.ب ١٤٠١٦

الثمن ٥٠٠ فلس
دار الحرية للطباعة
بدل الاشتراك السنوي ٤دنانير

